


# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک



## تەندروستی و خزمەتە تەندروستییەکانی کەرکوک
## وەرزش و یانە وەرزشییەکانی کەرکوک

سەرپەرشتیاری گشتی نووسین و پێداچوونەوە

سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

بەرگی حەوتەم

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك

## بەرگی حەوتەم

- تەندروستی و خزمەتە تەندروستییەکانی کەرکوك
- وەرزش و یانە وەرزشییەکانی کەرکوك

سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە
سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

٢٠٢٣




بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیریی
جەمال عیرفان ٢٠٢٣
زنجیرە: (١٤٤)

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

**ناوی کتێب: ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک- بەرگی حەوتەم: تەندروستی و خزمەتە تەندروستییەکانی کەرکوک. - وەرزش و یانە وەرزشییەکانی کەرکوک.**
**نووسینی: کۆمەڵێك نووسەر**
**سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)**
**سەرپەرشتیاری زانستی و ئەکادیمی: د. یوسف گۆران**
**سەرپەشتیاری کارگێڕی: زاهیر شکور**
**دیزاینی ناوەوە: ئەنجام سەعید**
**دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی**
**تایپ: زەینەب حەمید**
**نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٣**
**تیراژ: ٥٠٠ دانە**
**چاپ: چاپخانەی تاران**

**لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی (٢٠٠٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ پێ دراوە**

Tel: 0533202936 07736959302
email: jamalerfan99@gmail.com
jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر قەیوان تاوەر

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

## بەرگی حەوتەم

- تەندروستی و خزمەتە تەندروستییەکانی کەرکوک
- وەرزش و یانە وەرزشییەکانی کەرکوک


بەشداران

د. ئیبراهیم خەلیل سەعید
سەربەست کەرکوکی
د. محەمەد عەبدوڵڵا کاکە سوور
د. دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان
فەرهاد عەبدولعەزیز
زاهیر شوکر
سمکۆ بەهرۆز
سەلاحەدین عەبدولحەمید
ستار عەبدوڵڵا بەرزنجی
د. قاسم ئەلجومەیلی

د. عەلی شاکر عەلی
پیرۆت تاڵەبانی
ڕزگار شوانی
عیماد محەمەد شەریف
عەلی کاراتی
نوری فەقێ
زاگرۆس نانەکەلی
ئەحمەد عەبدوڵڵا جاف
حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ
عەباس دیک



٢٠٢٣

## بەشی یەکەم

# تەندروستی و خزمەتە تەندروستییەکانی کەرکوك

### * سەرەتاکانی تەندروستی لە کەرکوك:

سمکۆ بەهرۆز

یەکێك لەو بوارە گرنگانەی کە ژیانی مرۆڤایەتی لە کەرکوکدا دەوری بینیوە تێداو بە یەکێك لەو هەڵویستە گرنگانە دادەنرێت کە ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر بنیاتنراوە ئەوەش باری لەش ساغی مرۆڤەو تەندروستییە. مرۆڤ لە چاخە بەردینەکان لەو سەردەمەدا کەوا ژیان دەستی پێکردوە، کەرکوك یەکێکە بووە لەوەی کەوا پێشەنگی ئەو سەردەمە یا ئەو ناوچانە بووە وەکو شارستانییەکانی (چەرمووو بەردە بەلکەو مەتارە)و ئەو شوێنە گرنگانەی (قادیشی گەورەو بچووك).

مرۆڤ لە سەرەتادا بەربەرەکانی کردووە لەگەڵ ژینگەی ئەو شوێنانەی کە تێیدا ژیاوە بۆیە لە هەوڵدانی بەو گرنگییەی بایەخی داوە بە ژیانی خۆی بۆ پاراستنی لەش‌و ئەو ژینگەیەی خۆی بۆ ئەوەی تەندروستی گونجاوە بێت، بۆیە دەبینین هەر لەو ئەشکەوتەی کە تیایا ژیاوە بایەخی داوە هەر لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کەوا هەولی داوە دەورووبەری ژینگەکەی خۆی پاك بکاتەوەو رێکوپێکی بکات هەروەها هەولی داوە پاشەرۆی ئاوەرۆکان دروست بکات بۆ ئەوەی کەوا ئەوئاوە نەخۆشی بۆ پەیدا نەکات چونکە بەتەجروبەی ژیان بۆی دەرکەوتووە کە ئەگەر ئەو ئاوە بەرفراوان بێت تووشی نەخۆشی‌و گەلێك کێشەی تووشی نەکات دەبینین ئەگەر سەیری ئەو هەڵکۆڵینانە بکەین کەوا لە چاخە بەردینەکان هاتووە شوێنی ئاوەرۆ هەیەو شوێنی چێشتلێنان هەبووە هەروەها شوێنی ناشتنی مرۆڤەکان هەبوو بۆیە وورده وورده دەبینین لە دواڕۆژدا سەیر ئەکەین لە چینەکانی سەرووتری چاخە بەردینەکان ناشتنی مرۆڤ لە دەرەوەی شار بوو یان لە دەرەوەی ناوچەکانی ژینگەکەی خۆی بوو ئەمەش جۆرێك لە بیرکردنەوەی تەندروستی بۆ ئەوەی کەوا خۆی بپارێزێت لە پاڵ ئەو بۆچوون‌و سرووت‌و ئاینانەی کەوا لەو ناوچانە هەبوو، بۆیە هەولیداوە کە جۆرێك لە هاوکێشەو هاوتەریبی دروست بکات بۆ ئەوەی بتوانێت بەردەوام بێت لە ژیانیان‌و تەندروستییەکی گونجاو بۆ خۆی دروست بکات.

لە سەردەمەکانی مێژوو یان دوای چاخە بەردینەکان بە تایبەتی لە شارستانێتی هوری میتانییەکان‌و ئاشورییەکان ومیدیەکان‌و شارستانیەتی ئەوانەی کە لە سەرەتاکانی مێژوو سەری هەڵدا دەبینین خەڵکی کەرکوك یا ئەو شارستانییەتەی کە لەو ماوەیەدا بوونە پێشەنگی گەلێك لەو بارە تەندروستییەمان بۆ بەجێماوە لەوەی کە وا خەڵکی کەرکوك بایەخیان پێ داوە بە بازرگانی کردن بە کەرەستە تەندروستییەکان‌و پزیشکییەکان بە تایبەتی هوری میتانییەکان لە کەرکوك لە نوزی‌و کوروخانی دەورێکی گرنگیان بینیوە لەو شارستانیەتیە، دەتوانین بڵێن یەکێك لەو بازرگانیانە ناوچەکەی پێ بەناوبانگ بووە کە هوری میتانییەکان لەگەڵ ناوچەکانی میسر لە گەڵ ناوچەکانی شارستانیەتیەکانی تری دەورووبەری ئالوگۆری ئەو کەرەستانەیان کردووە، دەبینین کەرەستە پزیشکییەکان لە پێشەنگی ئەو کەرەستانەن بۆ نموونە دەبینین جۆرە دارێك لە ناوچەکانی نوزی‌و کوروخانی رواوە تیایدا کە پێ دەلێن (کۆکنار) دەتوانین بڵێن جۆرێك لە تلیاك بووە کە بە کاریان هێناوە لە کەرەستەی پزیشکیدا وەکو جۆرێك لە بەنج بە کاریان هێناوە کە ئەمە دەتوانین بە یەکێك لەو هۆکارە گرنگانە دابنێن کەوابایەخی پزیشکی خۆی هەبوو بۆ نموونە یەکێك لە پزیشکە بە ناوبانەکان (سینوهە) کە هاتۆتە ئەم ناوچەیە بە تایبەتی کە لە یاداشتەکانیا باسی شارستانیەتی هوری میتانییەکان ئەکات وئەو نەشتەگەرییانەی کەوا کردوویەتی لەو ناوچەنەدا باسی پێشکەوتنی ئەم ناوچەیە دەکات کە کەرکوك بەشی رۆژهەلاتی ئیمبراتۆرییەتەکەیە.

باسی ئەو پێشکەوتنە پزیشکیانە دەکات کە خەڵکی ئەو ناوچەیە بە کاریان هێناوە لە جۆری ئەو کەرەستە پزیشکیانە لە جۆری ئەو دەرمانانەو جۆری گرتنەوەی ئەو دەرمانانەی لە گڵۆگیا دروستیان کردووە کە ئەمە بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە ئەو سەردەمە کە میتانییەکان ئالووێرانیان کردووە لەگەڵ ئەو ناوچەنەی دەورووبەری بایەخ‌و گرنگی خۆی هەبوو ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کەوا لیستی ئەو ئاوانەی کە ئالووێری پێکراوە لیستە پزیشکییەکان یان کەرەستە پزیشکییەکان‌و گڵۆگیایەکان سوودی هەبووە لە ئالووێرە بازرگانییەکان دەوری بینیوە لەگەڵێك چارەسەرو بۆ نموونە جۆری ئەو ئاوانەی بە کارهاتووە وەك کەرەستەی قیر بەکار هاتووە، جۆری ئەو

کەرەستانەی کەوا لە نەوت هەڵچنراوە کەوا هەموو دەوری بینیوە یان سوودی بینییوە لە کەرەستە پزیشکییەکان.

"یەکێك لەو زانستانەی کەلە ئەراپخادا پێشی بە ناوبانگ بوو، ئەویش زانستی کیمیا بوو، کەبە ناوبانگ بوو لە گەلێك پیشەگەری وەکو ئەو پیشەگەرییانەی کە لە کاروو چالاکی کیمیاگەری تێدا بەکار دەهێنرێت کە نموونەی پیشەگەری پیشەسازی شووشە، پیشەسازی ئاڵتون سازیو دروستکردنی بەرهەمی (برۆنز)و گەلێکی تر. کە ناوچەکە لەو مادەیەدا بەم جۆرە پیشانە بە ناوبانگ بووە. ئەم جۆرە پیشەسازیانەش قۆرخ کرابوو لەلایەن کۆمەڵێك خێزانی دیاری کراو کەلەم پیشەیەدا کاریان کردووە، هەروەها تۆماری لێکۆڵینەوەکانیان بە هێمای تایبەتی ڕەشنووس دەکرد. تابۆ ئەوەی کەس لێی تێنەگات.

لە لێکۆڵینەوەکاندا لە کاتی کنەو پشکنیدا لە (نوزی) و (کوڕوخانی)دا، گەلێك لە پاڵاوگەو دەفری جۆراوجۆریان دۆزیــووەتــەوە، ئــەو پــاڵاوگــانــە لــە قــوڕی ســـووڕەوە کــراو دروستکراوەو دەمەکەی بە خووری داپۆشراوە بۆ پاڵاوتنی شلەمەنییەکان، کە ڕێـژەیـەکـی بـەرچـاوی لـە کوڕوخـانـی دۆزراوەتـــەوە، هــەروەهــا گەلێکی کـە قــوولــەی مــل درێــژ دۆزراوەتــەوە کە دەمێکی بچووکی هەبوو، ئەم جۆرانە بۆ ئامادەکردنی لە کاروباری سەیدەلیدا بە کاردەهێنرا.

هــەروەهــا کــەرەســتــەی شـلـەگـر بـە کـارهـێـنـراوە بۆ جیاکردنەوەی ئەو مادە جۆراوجۆرانەی کە تێکەڵ نابێت، بە تایبەتی لە پیشەسازی بۆندا زیاتر بە کارهێنراوە"[1]، "هەروەها ئەم ناوچەیە بە ناوبانگ بووە بە زانستی ئاژەڵداری، بە تایبەتی لە کاتی هاتنی هوری – میتانییەکان، چونکە دەستێکی باڵایان هەبوو، لە ئەسپ سواریو بەخێوکردنی ئەسپ، گەلێك دەسنووس دۆزراوەتەوە لە (نوزی) دەربارەی زانیاری زۆر لە سەر پـەروەدەکـردنـی ئـەسـپ"[2]، "خەڵکی ئەم ناوچەیە تا کۆتای سەردەمی ئاشوری نوێ دەوریـان هەبوو لە بەخێوکردنی ئەسپ داو لە یەك لە دەستنووسەکان ئاماژە بەوە دەکات، کە ڕێژەیەکی زۆر لە ئەسپ لە (ئەراپخا) و(لاخیرۆ) نێردراوە بۆ پارێزگای نەینەوا"[3].

ئەگەر سەیری بیروباوەرە ئایینیەکان کەوا لەو سەردەمەدا بڵاوبونەتەوە لە ناوچەکەدا بۆ نموونە ئایینی زەردەشت، دەبینین لە پیرۆزترین پیشەکان کەوا ئەو پیشانەی باو بووە پزیشکی بووە یان سەیدەلی بووە بۆ نموونە دەبینین وشەی سەیدەلی وشەیەکی عەرەبی نەبووە بەڵکو وشەیەکی زەردەشتی بووە کە سەیدی سەیدەلانی بەو کەسەوتراوە کە لە گژوگیا دەرمانی دروستکردووە بۆیە دەبینین ئەم وشەیە لە فەرهەنگی کوردیو فارسیو عەرەبیو زەردەشتی یەکێکە لەو وشە گرنگانەی وەك خۆی ماوەتەوە کە ناوچەی کەرکوك بەشێکی گرنگی ئەو کاریگەرییە بیروباوەرە ئایینە بووە کە لەو ناوچەیە دەوری بینیوەو سوودی خۆی هەبوو تا سەردەمانێکی زۆریش پیشەی سەیدەلی یان ئەوی کاری لە گژوگیا کردوە لەم ناوچەیەدا ناوبانگی هەبووەو پێگەیەکی گرنگی هەبووە.

دەتوانین لە پاڵی ئەوانەی کەوا بیروباوەری زەردەشتیان بڵاوکردوتەوە کە ئایینێکی ڕەسمی ساسانییەکان بووە بەڵام ئەگەر سەیری قۆناغەکانی دوای ئەوە بکەین کەوا ئایینی ئیسلام سەری هەڵدا لە هەموو ناوچەی کوردستانا کەرکوك بەشێکی گرنگ بووە دەبینین پیشەی ئەوانەی کە کاری پزیشکیان کردووە پیشەیەکی پیرۆز بووە خەڵکەکە بایەخی خۆی پێداوە بۆ نموونە دەبینین کە لەو زانا ئایینانەی کەوا بەرهەمەکانیان بە جێماوە لە گەلێ شوێندا گرنگیان بە تەندروستی باری مرۆڤ داوە لە ڕووی ئایینەوە پێناسەیان کردووە هەروەها لە ڕووی ئەوەی کە سوودی هەبووە بۆ مرۆڤ پێناسەیان کردووەو هەروەها هەندێ دەسنوسەکان ئەوانەی کە بۆمان بەجێماوە لە زانایانی کەرکوك هێڵکاری لەشی مرۆڤیان کردووە وەکو ئەوەی (مەلا محێددینی گلەزەردە)، کە پێکهاتەی لەشی مرۆڤ بریتیە لە چ بەشێكو بەشەکانیان هەموو دیاری کردووە ئاماژەیان بە هەموو بەشەکان کردووە لە ڕووی فەرهەنگەوەو لە ڕووی زمانەوە بایەخێکی گرنگی هەبووە، هەروەها بەشێك لە زانایانی کەرکوك کتێبیان دەربارەی زانست نووسیوە، وەکو (ڕەنجووری) شاعیر کە بەرهەمەکانی بریتی بووە لە:

– (تسکین القلوب)، نامەیەك دەربارەی پزیشکیو ئەو دەرمانانەی کە لەوکاتەدا باو بووە کە ڕەنجووری بە پێی ئەزموونی خۆی سوودی لێ بینیوەو بە زمانی فارسی بووە.

– دوو دەستنووس دۆزراوەتەوە کە ڕەنجووری لە ساڵی (١٧٩٥) نووسیویەتی دەربارەی چۆنێتی هەڵسوکەوتی ژنو پیاو لەگەڵ یەکتریدا کە یەکێك لە دەستنووسەکانی لەلای (عەبدولرەقیب یوسف)ە.

بەڵام ئەگەر سەیری هەموو قۆناغەکانی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام بکەین هەتا قۆناغی کۆتایی کە سەردەمی ڕووخاندنی ئیمپراتوری عوسمانی بوو دەبینین لە کەرکوکدا دروستکردنی نەخۆشخانە گرنگی خوی هەبووە ئەو پزیشکانەی لێرە دەرچوونە توانایەکی باشیان هەبووە لە چارەسەرکردنی نەخۆشییدا.

یـەکـێـك لــەو نـەخـۆشـخـانـانـەی کـە لـە سـەردەمـی عـوسـمـانـیـیـەکـان لـە (کـاتـدارئـی) مـەسـیـحـیـیـەکـان کـە لە سـەر قـەڵا بـوو عوسمانییەکان ئـەو نەخۆشخانەیەیان تا ماوەیەکی زۆر کردووە بە یەکێك لە نەخۆشخانە گرنگەکانی خۆیـانو نەخۆشیان تیا چارەسـەر کـردووە لە سەردەمی عوسمانییەکاندا دوای ئەوەی کە عوسمانییەکان ڕۆیشتوونە، لەگەڵ کڵێسە سوورەکە تەقاندویانەو لە ناویان داوە، بەڵام خۆی لە خۆیدا یەکێك بووە لەو نەخۆشخانە گرنگانەی کە دەوڵەتی عوسمانی بایەخی پێداوە چونکە سەربازەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەو فرقە سەربازییانەی لە کەرکوك بوونە لێرە چارەسەر کراون.

هەروەها گەلێك لەو گەشتیارانەی کە سەردانی ئێرەیان کردووە یەکێك لەو گەشتیارانە کە گەشتیارێکی بەریتانی بووە هاتۆتە کەرکوك یەکێك لە توێژنەوەکانی ئەنفلونزا لە کەرکوك باس ئەکات کە لە ساڵی (١٩٢٧)دا ڕوویداوە باس ئەکات، کە چۆن نەخۆشی لە کەرکوك بڵاوبووەتەوەو خەڵکێکی زۆر پێوە بووە وئەو ڕێژەیەی باس کردووە کە ئەو خەڵکە تووش بووە

هەروەها یەکێك لە شاعیرەکانمان (رەنجووری) لە یەکێك لە شیعرە درێژەکانیدا باسی نەخۆشی (تاعون) ئەکات کە چۆن لە کەرکوك بڵاوبووەتەوەو خەڵکێکی زۆر رەوی کردووە چارەسەر نەکراوەو خەڵکێکی زۆر مردووە لە وەسفێکی شیعری جواندا باسی ئەو کارەساتەی کردوە کە لە گەرەکەکانی ئیمام قاسم و ئاخورحوسێن کۆرەویان کردووەو چوونەتە شوێنی چۆڵەوانی وخەڵکێکی زۆر لە ماڵەکان مردووە بە هۆی ئەو نەخۆشییە تا ماوەیەکی زۆر ئەمە بەردەوام بووە هەروەها گەلێك سەرچاوەکان باسی ئەوە ئەکەن کە گەلێك نەخۆشی وپەتای وەکو کولێرا یان وەکو سورێژە یان رشانەوە تا ماوەیەکی زۆر ئەم شارە پێوەی ناڵاندوەو خەڵکێکی زۆر تووشی بووە.

هەندێ لە سەرچاوەکان باسی ئەوە ئەکەن کە لە ساڵانی هەزارو شەسەتەکان و هەزارو حەوسەتەکان یان لە پێش هاتنی ئینگلیزەکان ئەم نەخۆشیانە لە کەرکوك بڵاوبوتەوەو چارەسەری لە هەندێ باردا گران بووە یان ئەو کاتە ئەو توانایە نەبووە تاکو چارەسەریان بکەن. بەڵام هاتنی ئینگلیزەکان قۆناغێکی زۆر گرنگ بوو لە مێژووی تەندروستی لە کەرکوکدا دەتوانین بڵێن ئینگلیزەکان لەو کارە گرنگانەی کە کردیان لە رووی بیناکاری هەروەها لە رووی تەندوروستیەوە راهێنانی ئەو پزیشکانەی کەوا لە دەرەوە بوون بۆ نموونە پزیشکی هیندی و بەریتانی و پزیشکی ئەورووپیان هێنا کە ئەمانە لە هەمووبوارەکان کاریان کردووەو پزیشکی ئەرمەنیان هێنا کە دەتوانین بڵێن ناوبانگیان هەبوو لە کەرکوك تا ماوەیەکی دوورو درێژ گەلێك نەشتەگەری گەورەیان کردووە دەتوانین بڵێن ئەو پسپۆرییەی کە ئەوان هێنایان ببێتە هۆی ئەوەی کە باری تەندروستی بە گشتی لە عێراقدا بوو بە بناغەیەکی گرنگ کە هەموو عێراق سوودی لێوە ببینێ، بۆیە ئینگلیزەکان هەنگاوێکی گەورەیان نا ئەویش بەرنامەی جۆر بە جۆریان دارشت لە پێناو ئەوەی کە وا هەندێ لەو نەخۆشیانەی کە وا زۆر بڵاوبیبوو وردەوردە هەندێ لە زۆنگاووگۆماوانەی کەوا پیسییەکی زۆری لێ بوو لە لادێ و شوێنەکان هەموویان لەناو برد ئەمانە قۆناغێکی گرنگ بوو کەوا ئینگلیزەکان هەستان بە دروستکردن لە رووی بیناکاری و گەلێك نەخۆشخانەی گەورەیان داناو نۆرینگەی زۆریان لە شارەکان و بەشێك لە لادێکان دروستکرد ئەمانە هەنگاوێکی گرنگ بوو کەوا لەرووی تەندروستییەوە ئەم شارە بایەخ و تایبەتمەندی خۆی هەبوو لەوەو دوا قۆناغەکانی تر دێت کە حکومەتە یەك لە دوای یەکەکان و بە پێی پێویست و بە پێی ئەو پرۆگرامەی بۆی دانرابوو توانیان چارەسەری کێشە تەندروستییەکان بکەن. پرۆژەی باری تەندروستی لە کەرکوك پەیوەست بوو بەو بارە سیاسییەی کە کەرکوك تیایدا ژیاوە لە بەر ئەوەی کە کەرکوك هەموو کاتێك لە بارێکی سیاسی ناجێگیر بووە ئەمە وای کردووە کەوا هەموو ئەو بوارانەی کە لە کەرکوك کاریان کردووە کەوتونەتە ژێر کاریگەری بارە سیاسیەکەی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراقەوەو کەرکوك پێشەنگی ئەو کاریگەرییە بووە بۆیە دەبینین کاریگەری باری تەندروستی لەو کاریگەرییە بەدەر نەبووە ئەوەش کەوا دکتۆر وەکو پێویست دەور ببینێت، نەخۆشخانە نەیتوانیوە وەکو پێویست دەور ببینیت بۆ نموونە هەندێ جار پزیشك کەوتۆتە ژێر کاریگەری رژێمی بەعس بەوەی کەوا هەندێ کاری نارەواو نامرۆڤایەتی پێکردووە لە پێناو ئەوەی کە ژیانی خۆی بپارێزێ ئەمە یەکێکە لەو کاریگەرییانەی کە دەرهاویشتەی ئەنجامەکانی کاری کردە سەر باری تەندروستی لە کەرکوکدا.

بەڵام ئەگەر بگەرێینەوە بۆ دوا رۆژی تەندروستی کەرکوك کە لە دوای پرۆسەی ئازادی رزگارکراوە ئێمە پێویستمان بەوەیەکە پرۆژەیەکی درێژخایەن و کورتبین وتەکنیکمان هەبێ بۆ ئەوەی کەوا بتوانین چارەسەری هەموو کێشە تەندروستییەکانمان هەبێ ئەوەش لە رێگەی دروستکردنی نەخۆشخانەی جۆراوجۆرو گەورە، پسپۆربێت لە بواری منالبوون و یان دل یان شێرپەنجە بۆ ئەمەش پسپۆری شارەزا بێنن لە دەرەوە یان ئەوانەی کە چوونەتە دەرەوە کاتی خۆی لە دەست رژێمی بەعس رایان کردوەتە دەرەوەی وڵات پێویستە هیمەتێك لە کەرکوك دروست بکەین بۆ ئەوەی ئەوانە بگێرینەوە لەو نەخۆشخانانە کاربکەن، ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە پێویستە پرۆژەی تر بکرێت لە فەرمانگەی تەندروستی کەرکوکەوە چاك سازی لە هەموو ئەو کۆڵان و گەرەکانەی کەوا هەیە ئەو چاك سازیەش لەوە دا خۆی ئەبینێتەوە کە رێنمایی رۆشنبیری دروست بکەین ئێمە پێویستمان بە رۆشنبیری تەندروستی هەیە ئەوەش ئەبێت لە روانگەیەکی منالانی سەرەتاییەوە هەنگاوی بۆ بنێن چونکە ئەو هەنگاوانە زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بتوانین رۆشنبیرییەکی تەندروستی دروست بکەین ئەو کاتەش دەتوانین کۆمەڵگەکەش پاك بکەینەوە، بەڵام ئێستا ئێمە ژینگەیەکی پیسمان هەیە دەتوانین بڵێین نەگونجانێك هەیە لەنێوان شارەوانی و تەندروستی لە کەرکوکدا ئەمەش خۆی لەوە دەبینێتەوە کە پرۆژەیەکمان نییە یان رۆشنبیرییەکمان نییە کەوا قۆناغ بە قۆناغ ئەو دەورە ببینێ، ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە پێویستە قەزاو ناحییەکان نەخۆشخانەیان تێدا بکرێتەوە هەندێ لە لادێ گەورەکان پێویستە کەوا نەخۆشخانەی لێ بێت بۆ ئەوەی بە کاری خۆی هەڵسێ بەڵام بە داخەوە دەبینین بەشێکی زۆری لادێکان بە پێی پێویست کاریان بۆ نەکراوە یان لە قەزاو ناحییەکان بە هەمان شێوە بۆیە ئەم پێشنیارە بە بەشێکی گرنگ دادەنرێت بۆیە پێویستە هەوڵی بۆ بدرێت هەروەها کاری رۆتین لە دەزگا تەندروستییەکان نەمێنێ دەبێتە هۆی لاوازی بواری تەندروستی بۆیە یان ئەو میلاکانەی کە زۆرن دەبێت بە شێوازێك دابەش بکرێت کە خزمەتی بواری تەندروستی بکات.


* سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

١. کۆڤاری (سۆمەر)، بەرگی یەکەم و دووەم، جلدی ٢٦، بەغدا، ١٩٧٠، (تل الفخار حفريات الموسم الأول)، نووسینی: یاسین محمود الخالصي.

٢. (العلوم والمعارف)، فاروق ناصر الراوي، حضارة العراق، الجزء ٢، بغداد، ١٩٨٥.

٣. (ارابخا (كركوك حاليا) دراسة سياسة، حضارية ٣٥٠٠ – ٥٣٩ ق. م)، عبير عدنان يوسف النجار، نامەی ماستەر، ٢٠١١، لاپەرە (١٠١).

## * سەرەتاکانی تەندروستی لە سەردەمی عوسمانییەکان:

د. ئیبراهیم خەلیل سەعید

بەپێی پێویست لە ویلایەتەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەکان بایەخیان داوە بە تەندروستی وەکو هەموو بوارەکانی تر، لە سەرەتادا ئەو بایەخدانانە تەنها چڕکرابووەتەوە لە ویلایەتەکانی ناوەندی ئیمپراتۆرییەتەکە بە تایبەتی لە ئەستەمبوڵ، بەڵام وردە وردە گۆڕانکاری روویدا لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا بە تایبەتی لە ماوەی ئەو چاکسازییانەی کە بەسەر ئیمپراتۆرییەتەکە هات لە هەموو بوارەکاندا کە تەندروستیش بەشێکی گرنگی بوو لەو گۆڕانکارییانە، کەرکوکیش تا رادەیەك بەدەرنەبوو لە بنەماکانی گۆڕانکاریو هەنگاوەکان بەرەو چاکسازی لەو بوارەدا.

هەر چەندە کەرکوك بەشێکی زۆری سوپای عوسمانی لێ بوو بەڵام پێویستی بەوە دەکرد باری تەندروستی گونجاو بۆ ئەو سوپایە برەخسێندرێت، بۆیە هەوڵدانەکانیان لەو ماوەیەدا هەرچەندە سەرەتایی بوو بێت، بەڵام هەنگاوێکی باش بووە بۆ چارەسەرکردنی کاروبارە پزیشکییەکان.

"کەرکوك لە چوارچێوەی ویلایەتی موسڵداو لەو هاوپەیوەستییەی کە هەیبوو لەگەڵ ویلایەتەکە توانیوویەتی بایەخەکانی تەندروستیش لە بەرژەوەندی خۆیدا چڕ بکاتەوە بە شێوەیەکی ئەوتۆ هەر چەن سەرەتایی بوو بێت سوودی لێ بینی بێت. بۆیە ماوەی نێوان هەزارو هەشسەد تا هەزارو نۆسەدو هەژدە گەلێك هەنگاوی هەڵبەزو دابەزی بریوە لەو پێناوەدا، بۆ نموونە لە ساڵی (١٨٩٧) دا لە سەردەمی والی (رەجەب پاشا) نەخۆشخانەی کەرکوك (کەرکوك خەستەخانەسی) کە نەخۆشخانەی سەربازی بوو لەلایەن ئەو والییەوە بریاری دروستکردنی درا لە شوێنی نەخۆشخانەی (جمهوری) ئێستا کە ناوەکەی کرا بە نەخۆشخانەی (مەجیدیە) (مەجیدیە خەستەخانەسی) ئەویش بە ناوی سوڵتانی عوسمانی (عەبدولمەجید)ەوە کە دوا پاشای عوسمانییەکان بووە.

لە کاتی هاتنی ئینگلیزەکان بۆ کەرکوك لە ساڵی (١٩١٨) دا ناوی ئەم نەخۆشخانەیە گۆڕا بۆ (نەخۆشخانەی سەربازی بەریتانی) ژمارە (٢٣)، ئینگلیزەکان هەستان بە هێنانی گەلێك داوو دەرمانو کەرەستەی پزیشکیو توێکاری تازە لەو سەردەمە لە ژێر سەرپەرشتی کارگێڕی سوپای عوسمانی تاکو ساڵی (١٩٢٣)، بەڵام لە دواییدا کاروبارەکانی خرایە ژێر دەسەڵاتی وەزارەتی مەعاریف کە بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی گشتی سەرپەرشتی دەکرد، ناوەکەشی کرا بە نەخۆشخانەی پاشایەتی عێراقی کە لەلایەن بەڕێوەبەرەکەی دکتۆر (دەنلوب) یاریدەدەری دکتۆر (سائیب شەوکەت) بەڕێوەدەبرا کە ژمارەیەکی زۆر کەم لە دکتۆری عێراقی بەڕێوەی دەبرد.

لە ساڵی (١٩٢٤) سێ دکتۆری عێراقی نێردران بۆ ئەم نەخۆشخانەیە، ئەمانەش بریتی بوون لە (شاکیر ئەلسویدی، ئیبراهیم عاکف ئەلئالوسی، تۆفیق روشدی)، لەگەڵ شەش پەرستاری عێراقی، کە سێ پەرستاری ئینگلیزی رایاندەهێنا لەسەر چۆنێتی کارکردنیان لەو بوارەدا، ئەم نەخۆشخانەیە گەلێك یەکە جۆراوجۆری لە بواری پزیشکیدا هەبوو کە ژمارەی قەرەوێڵەکانی (٥٠٠) قەرەوێڵە دەبوو، لە ساڵی (١٩٢٩)دا هۆڵی نەشتەرگەی بۆ کرایەوەو لە سەردەمی کۆماریدا ناوەکەی گۆڕا بۆ (نەخۆشخانەی ئەلجمهوری)"[1].

"ئەگەر سەیری ماوەی نێوان ساڵانی (١٧٧٢) تا (١٩٣١) بکەین دەبینین گەلێك پەتا و نەخۆشی جۆراوجۆر لە کەرکوك و دەورووبەریدا روویانداوە وەك نەخۆشی (کولێرە، رشانەوە) لەپاڵ گەلێك نەخۆشی جۆراوجۆری تر کە لە هەندێك ساڵدا بووە بەهۆی لەناودانی بەشێکی زۆری خەڵکی شارەکەو وای لێیان کردووە رەو بکەن لە شارەکە:

١. لە ساڵی (١٧٧٢)دا نەخۆشی (کولێرە) بە شێوەیەکی بەرچاو لە شارەکەدا بڵاوبووەوە کە لە ئەستەمبوڵەوە ئەم نەخۆشییە گەیشتبووە ئەم شارەو بەشێکی زۆری خەڵکەکەی لە ناودا، کار گەیشتە ئەوەی خەڵکێکی زۆر رەویان کرد.
٢. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (کولێرە) لە ساڵی (١٨٢١).
٣. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (کولێرە) لە ساڵی (١٨٢٧).
٤. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (کولێرە) لە ساڵی (١٨٣٢).
٥. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (کولێرە) لە ساڵی (١٨٣٣).
٦. دەرکەوتنی نەخۆشی (رشانەوە) لە ساڵی (١٨٤٥).
٧. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (کولێرە) لە ساڵی (١٨٤٦).
٨. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (کولێرە) لە ساڵی (١٨٧٣).
٩. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (رشانەوە) لە ساڵی (١٨٨٤).
١٠. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (کولێرە) لە ساڵی (١٨٨٨).
١١. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (کولێرە) لە ساڵی (١٨٩٤).
١٢. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (کولێرە) لە ساڵی (١٩٢٣).
١٣. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (کولێرە) لە ساڵی (١٩٢٧).
١٤. بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (کولێرە) لە ساڵی (١٩٣١)"[2].

*سەرچاوەکان:-

١. (الطب في كركوك، دراسة تاريخية)، دکتۆر ئیبراهیم خەلیل سەعید، چاپخانەی (الفضولي)، کەرکوك، ٢٠١٠، لاپەرە (١٧- ١٨).
٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٧٦ - ٧٧).

## * راپۆرتی پزیشکی و تەندروستی لە کەرکوك لەکاتی هاتنی بەریتانییەکان:-

**و: سەربەست کەرکوکی**

*** پزیشکی و تەندروستی[1]:**

ئەم راپۆرتە لەلایەن (R.HAY)ی پزیشك و نەشتەرگەری دەڤەری کەرکوکەوە ئامادەکراوە.

کارەکان لە ماوەی ساڵەکەدا ئەمانە بوون:

**١. کاروباری پزیشکی:**

– کردنەوەی خەستەخانەیەکی مەدەنی لە کەرکوك.
– کردنەوەی دەرمانخانەیەکی مەدەنی لە کفری.
– کردنەوەی دەرمانخانەیەکی مەدەنی لە ئاڵتوون کۆپری.

**٢. پاکوخاوێنی:**

پاککردنەوەی شارەکانی کەرکوك، ئاڵتوون کۆپری و کفری چەسپاندنی سیستەمی پشکنین و چاودێریکردن، کۆمەڵی بەرێوبەرایەتی و دەزگاو شوێنە جۆراوجۆرەکانی ژیان و گوزەرانی ناو شارەکە، بەتایبەت ئەوانەی کاریگەرییان بۆ تەندروستی خەڵك هەیە.

**(١) کەرکوك:**

**أ. تەندروستی:**

١. خەستەخانە مەدەنییەکان مانگی شوباتی ساڵی ١٩١٩ کراونەتەوە[2].

٢. دکتۆر (نووری ئەڵلاوێردی) هەر لە سەرەتاوە بە پلەی لێپرسراوی پزیشکی دانراوە[3].

٣. کاپتن (G. S. Woodman) ئەرکی نەشتەرگەری گشتی کەرکوکی پێ سپێردراوە. لە (١)ی ئاداری ساڵی (١٩١٩)وە دەستی بە کار کردووەو لە تەمووزدا چووەتەوە بۆ بریتانیا.

٤. کاتێ (R. Hay) بووە بە سەرۆکی نەشتەرگەرییەکان، دکتۆر نووری تا مانگی تشرینی دووەم کاری کردووە بۆ کاپتن (Woodman).

٥. هەر لە سەرەتاوە نەخۆشی خەوتوو لە خەستەخانەکەدا تیمارو چارەکراوە.

٦. ژمارەی گشتی ئەو نەخۆشانە تیمارو چارەکراون:
– لە دەرەوەی خەستەخانە ١٥,٦٣٨.
– لە ناوەوەی خەستەخانە (نەخۆشی خەوتوو) ٥١٥.

٧. بەم رێژانەی خوارەوەش کارکراوە بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشانە:
– مەلاریا و چارەسەرکردنی ٧٠٪.
– نەخۆشی سیل ١٠٪.
– نەخۆشی میزو زاوزێ ١٦٪.
– دیزانتری نەخۆشییەکانی ناوسك ٣٪.

٨. لە (٥٠٪)ی نەخۆشی چاو لێرە نەخۆشی تەراخۆمایە.

٩. دکتۆر پێی وایە (١٠٠٪)ی دانشتوانی گوندەکانی دەوروبەری کەرکوك، نەخۆشی مەلاریایان تێدا بلاوە، مێشوولە ئەنۆفیلیس Anopheles لە سەرتاسەری دەڤەرەکەدا بلاوە.

١٠. ئەو نەخۆشانەی کە لە خەستەخانەکە خەوتوون:
– ٤٠٤ پیاو.
– ٧٦ ژنن.
– پۆلیس و ژاندەرمە ١٥٦.
– سۆزانییەکان ٦٧.
– بەندییەکان ١٤.

١١. ژمارەی ئەو نەخۆشانە کە پارەیان لێ سەنراوە، ٥ کەسن.

١٢. ئەو نەخۆشانەی لە خەستەخانە مردوون ٣٨ کەسن (٧٠٪).

١٣. لە ساڵێکدا ٢٦ نەشتەرگەری (عەمەلیات) کراوە.

١٤. لە ساڵێکدا چەندین وتار، سەبارەت بە نەخۆشییەکانی چاو، نەخۆشی سەفلس، یا خۆپاراستنە سادەکان بۆ خۆدوور خستنەوە لە نەخۆشییەکانی چاو، لەلایەن (د. نووری)یەوە نووسراون لە رۆژنامەی (نجمە)دا بلاوکراونەتەوە.

١٥. مەلاریا: هەموو پرۆژەیەك بۆ پاراستن و دوورخستنەوەی دانیشتووان لە نەخۆشی مەلاریا، پێویستی بە برە پارەیەکی زۆر دەبێ، کە پێویستە بۆ چاککردنەوەی بنیاتی سیستەمی جۆگەو زێرابەکان، چاودێری شەقام و جادەکان، هەروەها چاودێری ئاوەڕۆمان لە ناو چەمە نزمەکاندا.

**ب. پاکوخاوێنی:**

**١. ئاوی خواردنەوە:**

ئەو رووبارەی کە بە شارەکەدا رەت دەبێ (مەبەستی خەری خاسەیە، وەرگێر)، بەشە کۆنەکەی شارەکە لە بەشە تازەکەی دادەبڕێ. مەبەست ئەو بەشەیە کە نزیکەی ٥٠ ساڵ لەمەوبەر دروستکراوە (بەپێی بۆچوونی ئەم راپۆرتە، بەشە تازەکەی شاری کەرکوك، کە زیاتر قۆرییەی پێ دەگوترا، دەبێ لە پاش ساڵی (١٨٧٠)ەوە دروستکرابێ، وەرگێر). چەندین جۆگەی ئاو لە دەوروبەری شارەکە لە یەك دادەبڕێ و هەندێکیشیان دەرژێنە ناو شارەکە. دانیشتووان، ئاوی خواردنەوە بە نزیکترین جۆگە وەردەگرن. ئەم جۆگانە هەر لە رۆژهەڵاتەوە، بە چەندین شێوە لێڵ و لیخن دەکرێن.

بۆ چاکتر راگرتنی ئاو و سەرچاوەکانی ئاو، ئەم هەنگاوانە نراون:

– لە رۆخی جۆگەی سەرەکی کەرکوك. پێش گەیشتنی بە شار، چەندین گوند هەیە. فەرمان بە کوێخاو بەرپرسانی ئەو گوندانە دراوە کە دەبێ ئەوان وەك ئەرکی سەر شان، پاکوخاوێنی ئەو جۆگەو جۆبارە رابگرن. (سێ پۆلیسی ئاودێری) بە مانگی ٢٥ رووپیێ بۆ چاودێری دەستنیشانکراون.

جۆگە بچووکەکانی ناو شار پاککراونەتەوە. عەمباری ئاوی حەمامەکانی شارەکە پاککراونەتەوەو بە بەردەوامی چاودێری دەکرێن: چەندین ئاودەستخانەی گشتی لەسەر جۆبارەکە لابراون و قەدەغەکراون. جۆگە دەرچووەکان لە رووبارەکەوە راست و پاککراونەتەوە. شایەنی باسە، بۆرییەکی باش بۆ گواستنەوەی ئاوی خواردنەوە زۆر پێویستە.

**٢. شتوومەکی خواردن:**

– ڕۆژانـە هەموو ئـەو دوکانانەی کە کەرەستەی خـواردن دەفرۆشن لـەلایـەن پشکنێری تەندروستییەوە چاودێـری دەکرێن.

– پسوولـەی مۆڵـەتی چاپکراو بـە خـاوەنـدی قـاوەخـانـە، چایخانە، سەرتاشخانە، لۆقنتە خانەو قەسابەکان دراوە (لۆقنتە: وشەیەکی فەرەنسییی (لوکانتە) لە کۆتایی سالانی حوکمی دەوڵـەتی عوسمانییەوە لە ناوچەکانی باشووری کوردستاندا تا سالانی چل‌و پەنجاش لەباتی چێشتخانە بەکارهاتووە، وەرگێڕ).

– قەسابخانە کۆنەکە ڕووخێنـرا، قەسابخانەیەکی نوێی گشتی، بە ئەرزییەتێکی لێژی چیمەنتۆڕێژو ئاوەڕۆیەکی ڕێـك‌و پێـکـەوە دروسـتـکـراوە. گشت پـاشـمـاوەی ئـاژەڵـە سەربڕەوەکان لە تەنوورێکی داخراودا، کە بۆ ئەم مەبەستە دروستکراوە دەسووتێنرێ.

– هەموو دوکانی قەسابخانەکان کۆکراونەتەوەو لە یەك جادەدا دانراون، فەرمان‌و ڕێنمایی تایبەتییان بۆ دەرکراوە، سەبارەت بە چۆنیەتی پاراستنی گۆشتەکانیان لە مێش‌و مەگەزو میکرۆب.

**٣. هەنگاوەکانی پاککردنەوەی شارەکە، ئەمانەن:**

– ڕوونکردنەوەو ڕێ‌و شوێن دراوە بە هەموو موختارەکان، سەبارەت بە چۆنیەتی پاکوخاوێنیی گەڕەکەکانیان.

– ١٠٦ دوکانی ناشایستە، چۆڵ کراوەو داخراوە.

– ١٩٠ دوکانی چۆڵ چاککراوەتەوەو جارێکی تر کراوەتەوە.

– ٥٢ ماڵ بۆ پاراستن لە پیسی دیواری بۆ کراوە.

– ٢٢٠ تەپۆڵـکەو کـۆمـەڵـە زبـڵ‌و پیسی کـۆکـراوەتـەوە، گواستراوەتەوە لە دەرەوەی شار سووتێنراوە.

– ١٣ جـادەی نـاو شـار بـە شێوەیەکی کاتی داخـراوە، تا بەتەواوی پاکژکراوەتەوە.

– دەباغخانەکەی شار گواسترایەوە بۆ شوێنێکی شیاوتر، جۆگەیەکی تایبەتی بۆ ڕاکێشراوە. ئەم جۆگەیە، ڕۆژانە پاك دەکرێتەوە.

– شوێنە چاڵ‌و قوڵت‌و قووڵەکان وردە وردە پڕ کراونەتەوە.

– بیست چاڵی ئاودەست پاککراونەتەوە، یا پڕکراونەتەوەو داخراون.

**٤. فرێدانی ڕەبیین‌و پیسایی:**

لـە سـەرەتـای سـاڵـدا، سیستـەمـەکـە وابـوو کـە ئـەو پیسایییانەی پیاوان دەیانکرد، هەر لەو پاڵانەدا دەمانەوەو هیچ سیستەمێکی فرێدان‌و چارەسەرکردن نەبوو. ئێستا ئاودەستخانەی گشتی ئامادەکراون، ژمارەیان زۆرتر بووە، تەنەکەی تایبەت لە هەر ئاودەستێکدا دانراوەو ڕۆژانە پاك دەکرێتەوە. ئاودەستخانەی تایبەت بە ژنان، تەنیا لە هەندێ دەزگاو خانووی تایبەتدا بواری دروستکردنی دراوە. فڕێ سووتاندنی پیسایی‌و ڕەبیین هێشتا بنیات نەنراوە، بۆیە پیسایی مرۆڤ بە عەرەبانەی دەستی دەبرێ‌و لە دەرەوەی شار لە چاڵدا ڕۆدەکرێ.

**٥. پاکو خاوێنی شارەکە:**

بەسەر سێ بەشدا دابەشکراوە، چاودێرو هەندێ کەناس بۆ هەر بەشێ دەستنیشانکراوە.

– حەفتاو یەك کەناس لە سەرەتای مانگی تشرینی دووەمی (١٩١٩)ەوە کاردەکەن.

– جادەکان هەموو ڕۆژێ، خاوێن‌و ئاوپرژێن دەکرێن.

– زبـڵ هـەمـوو ڕۆژێ کـۆدەکـرێـتـەوە، لـە شـوێنی تایبەت فرێدەدرێ.

– پـانـزە گـوێـدرێـژو دە عـەرەبـانـەی دەسـتی بـۆ ئیشی پاککردنەوە تەرخانکراون‌و بەردەوام لە کاردان.

**٦. نەخۆشییە گوێزراوەکان:**

هیچ نەخۆشییەکی گوێزراو لە کەرکوك بڵاو نەبووەتەوە.

٥٠٠ حاجی لە ڕێگەی کەرکوکەوە بەرەو بەغدا چوون، پێش گەیشتنیان بۆ ناو شاری کەرکوك هەموو پشکێنراون.

– هەزارو دووسەدو بیست کەس کوتراون.

– حەوسەدو چل‌و هەشتیان ئەنجامی کوتانەکەیان باش بووە.

– بوار نەبوو سەدو نەوەدوحەوت کەس بکوترێن.

– دووسـەدو حەفتاو هەشت کەس پاش کوتان، ئەنجامی کوتانی خۆیان بە چاودێران ڕانەگەیاندووە.

**٧. ئاماری گرنگ:**

مـوخـتـارەکـان ڕۆژانـــە ژمـــارەی مـــردووان، هۆیەکانی مردنیان، هەروەها ژمارەی لەدایکبوونی گەڕەکەکانی خۆیان ڕادەگەیێنن:

لەو ساڵەدا ئەمانە ڕاگەیێنراوە، لە دایکبووان (١١٠) کوڕو (١١٦) کچ، مردووان (١٦٥) پیاو و (١٦٧) ژن.

لەماوەی سێ مانگی ڕابـردوودا، ژمـارەی لە دایکبوون زیادی کردووە.

**٨. دەزگا گشتییەکان:**

– قوتابخانەکان‌و هـەژارخـانـە، بە شێوەیەکی بـەردەوام پـشـکـێـنـراون، سیـسـتـەمـی ئـاودەسـتـخـانـەی گشتی دامەزرێندراوە، ئێستا تەنەکەی پیسی دانراوەو بەکاردێت.

– **بەندیخانە:**

چـوارسـەدو بیـست‌و پێـنـج کـەس لـە دەرمـانـخـانـەی بەندیخانە تیمار کـراون. هـەنـدێ نەخۆشی نـێردراون بۆ خەستەخانە مەدەنییەکەو، لەوێ چارەسەر کراون.

– ئێستا ژمارەی بەندییەکان (٧٠)یە.

بەندیخانەکە، بەتەواوەتی پاککراوەتەوە، ئاودەستخانەو شوێنی سووتاندنی زبڵ‌و پیسیی تێدا دانراوە. چەندایەتی‌و چۆنایەتی خواردن لە بەندیخانەدا، بە شێوەیەکی پێویست نەبووە، بۆیە حاڵی حازر خـواردن‌و جۆری خواردنەکە لە لێکۆڵینەوەو چاوپێداگێڕانەوەدایە.

سیستەمێکی ئەوتۆ نییە بۆ پاکژکردنەوەی جلوبەرگ لە میکرۆب‌و نەخۆشی.

ئەمەش ئێستا خراوەتە بەر چاودێری‌و لێکۆڵینەوە.

- **پۆلیسخانە:**

لە (۱)ی کانوونی دووەمی ۱۹۲۰ بەدواوە، لەبری جەندرمە، پۆلیسی مەدەنی بەرپرسی و ئەرکی گرتوەتە ئەستۆ.

بیناکەی جەندرمە، بە جوانی چاك و، بەتەواویش پاككراوەتەوە و، پێویستییەکانی خاوێنی و ڕاگرتنی پاك و تەمیزی بۆ دابینکراوە.

**۹. سۆزانییەکان:**

سۆزانییەکان، هەفتانە لە خەستەخانەی مەدەنی تاقی دەکرێنەوە.

هەر هەموویان بەدرێژایی ساڵ لە بینایەکی تایبەتدا کۆکراونەتەوە و نیشتەجێ کراون، لەرووی پاك و تەمیزی و تەندروستییەوە، چاودێری دەکرێن.

نەخۆشییەکانی زاووزێ لە شارەکەدا، زۆرەو بەربڵاون، گفتوگۆ کراوە سەبارەت بە دامەزراندنی خەستەخانەیەکی تایبەت بەم جۆرە نەخۆشیانەوە، ڕەزامەندیش وەرگیراوە. دەبێ لە ماوەیەکی کورتدا بناغەی پێوست بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی زاووزێ دابنرێ.

**۱۰. نەخۆشی هاریی ئاژەڵ:**

مۆڵەت دراوە بە سەگ ڕاگرتن، سەگی بێ خاوەن و بەرەڵڵاش تۆپێنراون.

**۱۱. سەرپێچیکەر:**

۲٦۷ کەس سەرپێچیکەر، لەبەر گوێ نەدان بە داواکارییەکانی پاکوتەمیزی ناوشار، لەماوەی ساڵەکەدا جەزایان لێ سەندراوە. گەورەترین جەزا (۲۰) رووپێ بووە.

**۱۲. دکتۆری ناوچەیی:**

فەرمانبەری کاروباری پاکوتەمیزی و تەندروستی (دکتۆری ناوچەیی)، ماوەی (۱۰) رۆژ بۆ رێنمای وەرگرتن و فێربوون لە بەرێوەبەرێتی پاکوتەمیزی بەغدا ماوەتەوە.

**(۲) ئاڵتوون کۆپری:**

**أ. تەندروستی (پزیشکی):**

۱. دەرمانخانەیەکی مەدەنی، مانگی چواری ساڵی ۱۹۱۹، لە شارەکەدا کرایەوە. پێنج ئەفسەری سوپا لەو ساڵەکەدا کاروباری پزیشکی شارەکەیان جێبەجێ کردووە.

۲. ئەوانەی کە لە دەرەوەی تیمارخانە چارەسەر کراون، ۱۱۷۹ کەسن.

۳. ئەوانەی کە خۆیان سەریان لە تیمارخانەکە داوە، رۆژانە (۸٪- ۹٪)ن.

٤. ئەوانەی کە بۆ چارەسەر سەریان لە دەرمانخانەکە داوە، بەپێی زانیارییەکان، ئەمەی خوارەوە نەخۆشییە بڵاوەکانی ناویانە:

- (مەلاریا، نەخۆشییەکانی پێست، نەخۆشییەکانی چاو، نەخۆشییەکانی هەناسە و سی).

- ئەوانەی کە دەرەوەی تیمارخانە چارەسەر کراون، (۱۱۷۹) کەسن.

- ئەوانەی خۆیان سەریان لە تیمارخانەکە داوە، رۆژانە (۸٪ - ۹٪)ن.

- ئەوانەی کە بۆ چارەسەر سەریان لە دەرمانخانەکە داوە، بەپێی مەلاریا، نەخۆشییەکانی پێست، نەخۆشییەکانی چاو، نەخۆشییەکانی هەناسە و سی.

**ب. پاکوتەمیزی:**

۱. ئاودەستخانەی گشتی، شوێنی کۆکردنەوەو سووتاندنی زبڵ بنیات نراون. شەقامەکان پاك و خاوێن دەکرێنەوە. زبڵی ماڵەکان، رۆژانە کۆدەکرێتەوەو هەڵدەگیرێ.

۲. هیچ کوتان و دەرزی لێدانێك جێبەجێ نەکراوە.

۳. بۆ گشتی، هیچ نەخۆشییەکی بەربڵاو لە ساڵەکەدا دەرنەکەوتووە. دوو حاڵەت نەبێ: یەکێکی هەژاری هەڵگرتنی زانیارییە پێویستەکان، هیچ زانیارییەکی ترمان سەربارەت بە ئاڵتوون کۆپری نییە.

پ. لەبەر نەبوونی بەرپرسێکی بەردەوامی کاروباری پزیشکی و تەندروستی لە ئاڵتوون کۆپری، کارەکانی تەندروستی جێی ڕەزامەندی نەبوون. ئەفسەری بەرپرسی ئێستا، جامدار س. ئ. س. یواکیم موئیدی ئ. م. س. زۆر کاری باش دەکات و، کۆمەڵێك پێشنیاری بەسوودی هێناوەتە بەرچاو، هەر هەمووی بۆ فراوانکردن و بەرەوپێشەوەبردنی پێویستییەکانی تەندروستی و پزیشکی دەشێن و دەکرێ بەجێ بهێنرێن. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم بەرپرسەش سوپا دایمەزراندووە، لەوانەیە هەموو کاتێك بگوازرێتەوە بۆ شوێنی تر. من وای دەبینم، هەر فراوانکاری و بەرەوەپێشەوە چوونێکی ئەم بوارە، دەبێ ئەم شتانەیان بۆ بکرێ:

۱. دەزگای دانەمەزراوەی تایبەت.

۲. شوێنی تایبەت هەبێ بۆ هێشتنەوەو خەواندنی نەخۆشەکان، بۆ چارەسەری دەردەکانیان.

۳. نەخۆشخانەو ئامرازەکانی پزیشکی پێویستن. هەروەها پێم وایە تا دابینکردنی چاودێرێکی کاریگەر، پارەو کەرەستەکان بەفیڕۆ نەچن، تەنانەت ئەگەر بۆ فراوانکردنی دەزگاو شوێنە تەندروستییەکانی...هتد، ئێستاش خەرج بکرێن.

**(۳) کفری:**

**أ. تەندروستی:**

۱. دەرمانخانەیەکی مەدەنی لەم مانگە کراوەتەوە.

۲. ژمارەی ئەو نەخۆشیانەی سەردانی دەرمانخانەکەیان کردووە: نەخۆشییەکانی دەرەوە ٦,۹۰٤ نەخۆشە.

۳. دەردە زاڵەکان: مەلاریا و نەخۆشییەکانی چاو.

٤. ئاماری گرنگ: لە مانگی حوزەیرانەوە تا کۆتایی کانوونی یەکەم: ٤۷ ژن خواستن، ٥۳ مردن، ٥۳ لە دایکبوون.

**ب. پاك و خاوێنی:**

١. شارەکە بە گشتی پاککراوەتەوە، کۆڵە زبڵ و پیسایییەکانی فڕێ دراون.

٢. ئاودەست و چاڵی پیسایی لە سەرتاسەری شارەکەدا سازکراون و بەکار دەهێنرێن.

٣. چاڵەکانی پیسایی مرۆڤ، پاککراونەتەوەو سەر لە نوێ سەریان داپۆشراوەتەوە.

٤. لە دەزگاو خانووە تایبەتەکاندا، ئاودەستخانەو تەنەکەی تایبەتی ئاودەست ئامادەکراون.

٥. رۆژانە بەردەوام، دوکان و ماڵەکان چاودێریی پاکوتەمیزییان دەکرێ.

٦. تەنیا یەك دەردە تاعوون لە شارەکەدا کەوتەوە، ئەویش کەسێك بوو لە بەغداوە هاتبوو. بۆیە خاڵی چاودێری تەندروستی لە دەرەوەی شارەکە دانراوە، بۆ ئەوەی حاڵەتی وا روونەداتەوە.

٧. ئاماری تر کە پەیوەندی هەبێ بەم راپۆرتەوە، لەبەر دەستدا نییە، ئەوە نەبێ کە (٢٠٨) پشکنینی بەپەلەو چاودێری تەندروستی لە کفری ئەوە روون دەکەنەوە دەرمانخانەکە دەبێ لە بارودۆخی ئێستادا دابخرێ، تا چاودێریو کۆنترۆڵیکردنێکی چاکی کاری تەندروستیو پزیشکی لە ئارادا نەبێ، دەرمانخانە بۆ تیمارو چارەسەرکردن و هێشتنەوەی نەخۆشەکان بکرێتەوە.

ئەم راپرۆتە بە زانیاری وەرگرتن لەم راپۆرتانەی خوارەوە ئامادەکراون:

١. راپۆرتی دکتۆر نووری ئەڵلاوێردی، لە کۆمیتەی پزیشکیی بەرپرسی خەستەخانەی گشتیی کەرکوك.

٢. راپۆرتی دکتۆر فەتحوڵلا، فەرمانبەری تەندروستیو پاکوتەمیزی لە شاری کەرکوك.

٣. راپۆرتی میستەر (A. E. woods)ی پشکنەری تەندروستیی شاری کەرکوك.

٤. دکتۆر جەمیل، لە کۆمیتەی پزیشکی کەرکوك.

٥. راپۆرتی جومادار (S.A.S.S) بانکوم وێردی، (I.M.D) لە کۆمیتەی پزیشکی ئاڵتوون کۆپری.

٦. راپۆرتی دەمی (زارەکی)ی میستەر (Meier)، دوایین پشکنەری تەندروستی شاری کفری.

*** سەرچاوە:**

١. دەسەڵاتی عەسکەری بریتانی، هەر لە کۆتای ساڵی (١٩١٨)وە، کە بە تەواوەتی کۆنترۆڵی هەرسێ ویلایەتەکەی کرد، یەکێ لەو کێشانەی کە رووبەرووی بووەوە، کێشەی پاکوتەمیزیو تەندروستی خەڵکەکەی بوو. کە سەربازەکان و سەرجەمی ئەو خەڵکانەی کە پەیوەندییان بە لەشکرەکەوە تێکەڵاویان لەگەڵیاندا هەبوو، بەتایبەت کێشەی پاکوتەمیزی ناو شارو شارۆچکەکانیان بۆ ئاشکرا بوو، بەرەو رووی چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییە گرانانە بوونەوە کە رۆژانە بە کۆمەڵ خەڵکە هەژارەکەی بەرەو مەرگ و مردن دەبرد. بۆیە هەر زوو سکرتاریەتێکی تایبەتی بۆ تەندروستی دامەزراند، بە سەرپەرشتی سەرهەنگ (W. R. Battye) کە لە بەغداوە بە سەرپەرشتی کاروباری تەندروستی و پلاندانانی چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشە تەندروستییەکانی هەموو ناوچەکانی میسۆپۆتامیای دەکرد. (بروانە: لاپەرە (١٠٨)ی (IRAQ 1900-1950).

ئینگلیزەکان کاتێ یەکەم هەنگاویان نا بۆ تێگەیشتن لە بارودۆخی تەندروستی ناوچەکە، بەراشکاوی ئەوەیان بە دی کرد کە لە پێنجدا چواری خەڵکەکە، بەهۆی کەمی خواردن و پیس و پۆخڵییەوە، تووشی دەیان نەخۆشی وەك مەلاریا بوون، رێژەی مردنی منداڵانیش گەورەترین رێژە بوو لە هەموو دنیادا، بۆیە وەك چارەسەرییەکی بەپەلە بڕیاری کردنەوەی ٥٠ نەخۆشخانەو تیمارگەیان لە سەرتاسەری شارەکانی میسۆپۆتامیا دەرکرد، چەند دانەیەك لەو تیمارگەو نەخۆشخانانە بەر دەڤەری کەرکوك کەوتبوون (بروانە: لاپەرە (١١٢- ١١٣)ی (review)کەی مسز بێل).

٢. لە راپۆرتەکەدا مێژووی کردنەوەی خەستەخانەکەی کەرکوك و تیمارخانەکەی کفری نەنووسراون، دیارە لە بیرکراون. بەڵام بەپێی زانیارییەکانی مسز بێل بێ و هەروەها بەوەی کە کاپتن (وردمان) ئەرکی نەشتەرگەری خەستەخانەکەی لە (١)ی ئاداری ساڵی (١٩١٩)دا وەرگرتووە. دەبێ خەستاخانەی کەرکوك لە مانگی شوباتی هەمان ساڵدا کرابێتەوە.

٣. من پاش پرسیارکردنیش، پێم نەکرا بزانم ئەم دکتۆر نووری ئەڵلاوێردییە کێیە. بەڵام بەپێی زانیارییەکانی مسز بێل و مستەر ستڤن لۆنگریگ بێ، زۆربەی دکتۆرەکان و ستافەکانی خەستەخانەو تیمارگەکان خەڵکی ناوچەکە بوون. لەناو ئەوانەشدا زۆربەیان ئەرمەنی بوون (بروانە: لاپەرە (١١٢)ی (review)ی مسز بێل) پاش گەرانێکی زۆر، گۆڕی دکتۆر نووری، کە لە ساڵی (١٩٣٧) کۆچی کردووە، لە قەبرستانی کڵێسە سوور دۆزرایەوە. ئیتر نازانم ئەوە دوکتۆر نوورییە یان نە؟! بەڵام رێی تێناچێ، لەناو کەرکوکێکی ئەو زەمانەدا، چەند دوکتۆر نوورییەك هەبووبێ.

## * بارودۆخی تەندروستی لە کوردستانی عێراق ( ١٩٢١- ١٩٥٨ ) لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە

د. محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسوور

### پێشەکی

شارەزا بوون لە بارودۆخی تەندروستی کوردستانی عێراق، یارمەتیدەر دەبێ لە تێگەیشتن لە بارودۆخی کوردستان، تاکو ئێستاش لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ بۆ ئەو بابەتە تەرخان نەکراوە، بەڵکو ئەوەی هەیە ئاماژەکردنێکی خێرایە بە هەندێ لایەنی بابەتە لە دوو توێ هەندێ کتێب یان بە شێوەی وتار. بۆیە بە پێویستم زانی کە" بارودۆخی تەندروستی لە کوردستانی عێراق ١٩٢١ – ١٩٥٨" بکەم بە ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەم.

لێکۆڵینەوەکە دابەشکراوەتە سەر دەروازە بەناونیشانی کورتەیەك دەربارەی بارودۆخی کوردستانی عێراق لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، وە چەند تەوەرێك: تەوەری یەکەم بە ناونیشانی " گرینگترین ئەو نەخۆشیانەی لە سەردەمی پاشایەتی لە کوردستانی عێراقدا باو بوون، تەوەری دووەم بە ناونیشانی" گرینگترین هۆیەکانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی بە رادەیەکی زۆر لە کوردستاندا" کەمی ژمارەی پزیشکەکان" تەوەرێکی تری بابەتەکەیە.

تەوەرێکی تریش تەرخان کراوە بۆ" ژمارەی نەخۆشخانەو بنکە تەندروستییەکان لە کوردستانی عێراقدا".

بۆ نووسینی ئەو لێکۆڵینەوە سوود لە ژمارەیەکی زۆر لە سەرچاوە وەرگیراوە کە هەندێکیان لە لیستی سەرچاوەکاندا تۆمار کراون و هەندێکی تریان لێکۆڵەر بۆ تێگەیشتنی باشتری لە بابەتەکە سوودی لێ بینیوە. لەوانە کتێبی (محەمەد سەعید مەحموود)ە بەناوی" یادداشتەکانم" کەباس لە هەندێ لەو نەخۆشیانە دەکات کە لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا باو بووە، نووسەر وەکو کەسێکی ئیداری هاوچەرخی ڕووداوەکان زانیاری باشی بۆ تۆمارکردووین.

لە سەرچاوە عەرەبییەکانیش کتێبی (د. مەتی عەقراوی) بەناوی " العراق الحديث" کە تیایدا نووسەر زانیاری گرنگی سەبارەت بە بارودۆخی تەندروستی کوردستانی عێراق بۆ تۆمار کردووین و کتێبەکەش لە سەردەمی پاشایەتی لە عێراق دەرچووە. لە گرینگترین ئەو گیروگرفتانەی ڕووبەڕووی لێکۆڵەر بوونەتەوە پەرش و بڵاوی سەرچاوەکان بووە. کە هیچ یەکێك لەو سەرچاوانە بە تەواوی بۆ بارودۆخی تەندروستی لە کوردستانی عێراق تەرخان نەکراون، تەنانەت هەندێك لەوانە تەنها چەند ڕیزێکی کەمیان سەبارەت بە بابەتەکە تیادایە، کە ئەویش پێویستی بە کاتێکی زۆر هەبوو بۆ وەرگرتنی زانیارییەکان دواتر بەکارهێنانیان.

هەروەها بە کارهێنانی سەرژمێرییەکان سەبارەت بە ژماری نەخۆشخانەو پزیشکەکان کارێکی پێویست بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا لە بەر هۆی جیاوازەوە، لەوانەیە گرینگترینیان بە هەڵە داچوون و ئەنجام نەدانی کارەکان بە وردی هەندێ لەم سەرژمێریانە هەڵەیان تیادایەو جێگای گومان لێ کردنن، هەر بۆیەش بە پارێزەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە.

لە کۆتایشدا کارێکی ئاوا بەبێ کەمو کوری نابێ بەڵام هیواداریین ببێتە بنەمایەك بۆ لێکۆڵینەوەو کارێکی فراوانتر.

کورتەیەك دەربارەی بارودۆخی کوردستانی عێراق لە سەرەتایی سەدەی بیستەمدا" هەرچەندە کە زاراوەی کوردستانی عێراق لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەکار نەدەهات و لەگەڵ دروست بوونی دەوڵەتی عێراقی لە سەرەتای بیستەکانەوە ئەم زاراوەیە بەکارهێنراوە. بەڵام لە دوایدا بەکارهاتووەو خۆی چەسپاندووە.

سەبارەت بە سنووری کوردستانی عێراقیش نووسینی زۆر نووسراوە، بەڵام بە گوێرەی یەکێك لە لێکۆڵەرەوەکان سنووری کوردستانی عێراق بەم جۆرەیە:

لەناو قەدی عێراقەوە لە باشوری ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی بەدرە لە پارێزگای واست دەستپێدەکات بەرەو باکوور تا پردی نەوت لە ڕۆژئاوای شارۆچکەی مەندەلی هەڵدەکشێ، بە تەنیشت بەرزاییەکانی حەمرینەوە تا فەتحە دەرواو شان بە شانی ڕووباری دیجلە سەردەکەوێ ولە باکووری شاری موسڵ بەرەو باشووری ڕۆژئاوا بادەداتەوە بە ئاراستەی شارۆچکەی حەزەر پاشان بەرەو ڕۆژئاوا بە ئاراستەی سنووری عێراق – سوریا لە باکووری شارۆچکەی بەعاج[1].

لە ڕووی ئاووهەواوە، ئاووهەوای شێدارو نیمچە وشك تیایدا زاڵە، بە بەراوردکردن لەگەڵ ناوچەکانی تری عێراق، فێنکترەو زۆرترین بڕی بارانی لێ دەبارێ، هەروەها تاك هەرێمە کە بەفری لێ دەبارێ[2] بێگومان ئاووهەواش کاریگەرییەکی زۆری بەسەر بارودۆخی تەندروستییەوە هەیە.

لە ڕووی سیاسییەوە کوردستانی عێراق بەشێك بوو لە کوردستانی عوسمانی، واتە کورد یەکەیەکی سیاسی نەبوو، گرنگی بە بارودۆخی کوردستان لەوانەش بارودۆخی تەندروستی بدات، ئەمەش ڕەنگدانەوەیەکی نەرێنی بەسەر بارودۆخی تەندروستی لە کوردستانەوە هەبوو. سوڵتان عبدولحەمیدی دووەم بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی چاکسازی خوازەکان هەڵستا بە هاندانی سۆفیگەریەتی تەکییەکان، پەیمانگا ئایینییەکان، نزیك کردنەوەی زانا ئایینییەکان لە کوردستاندا[3].

ئەمەش کاریگەری بەسەر لایەنی تەندروستی خەڵکی کوردستانەوە هەبووە، چونکە خەڵك لە کاتی نەخۆشی، و بەهۆی نەبوون و کەمی پزیشکەوە، ڕوویان دەکردە پیاوانی ئایینی بەتایبەتی شێخەکان، بۆ ئەوەی نوشتەیان بۆ بکەن و نەخۆشییەکانیان چارەسەر بکەن. هەرچەندە ئەمەش شێوازێکی سەرەتایی و ساکار بوو لە مامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆشەکاندا، بەڵام لە ڕووی دەروونییەوە تا ڕادەیەك یارمەتی هەندێ لە نەخۆشەکانی دەدا چاك ببنەوە، لە هەمان کاتیشدا ژمارەیەکی تریش دەبوونە قوربانی ئەم جۆرە شێوازە ساکارو سەرەتاییە لە چارەسەرکردن، هەندێ کەس تەڵەکەبازیش بەناوی شێخایەتیەوە دەستی خەڵکیان

دەبری و تووشی چەندەها کارەساتیان دەکردن.

لەم ڕووەوەش کەسایەتییەکی وەکو شێخ عبدولسەلامی بارزانی کە تووشی نەخۆشییەکی چاو(تراخوما) دەبێ، تەنها حەکیمێکی ئێزیدی گەڕۆکی دەستدەکەوێت، کە دەیەوێت ڕێگایەکی سەرەتایی چارەسەری نەخۆشییەکەی بکەن، بەڵام شێخ بە دوور بینی خۆی بە باشی دەزانی کە پرس بە پزیشکێکی نێردەیەکی موژدەگەری موسڵ بکەن، بەڵام لە کۆتایدا نە چارەسەری حەکیمە ئێزیدیەکەو نە ئەو نەشتەرگەریەی پزیشکە ئینگلیزەکەی قبوڵ نەکرد[٤].

ئەم نموونەیەش کەمی و دەگمەنی پزیشك لە ناوچەکانی کوردستان پیشاندەدا. لایەنی تەندروستی کۆمەڵگا پەیوەستە بە لایەنەکانی تری ژیانی کۆمەڵگاکە لەم ڕووەوەش لە سەرچاوەیەکدا هاتووە کە: تەندروستی بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ پەیوەستە بە ئاستی ڕۆشنبیری و داهاتی ئابووری هەر کۆمەڵگەیەك ئەگەر هاتوو لایەنی ئابووری و ئاستی ڕۆشنبیری کۆمەڵگە بەهێز بێت ئاوا ژیانێکی تەندروست باش بۆ تاکەکانی کۆمەڵ دابین دەکرێ بەڵام پێچەوانەشی ڕاستە[٥].

ئاستی ڕۆشنبیری کورد نزم بووە لەم ڕووەوەش سەعید نورسی لە گۆڤاری (کورد تەعاون و تەرەقی جەمعیەتی) لە ساڵی (١٩٠٨) نووسیویەتی: لە هەزار کەس لەناو کوردا تەنیا یەك کەس دەتوانێ ڕۆژنامە بخوێنێتەوە[٦].

لەبەر ئەوەی زۆربەی کوردە نیشتەجێیەکان لە گوندەکان بوون، و ژمارەیان لە شارەکان کەمتر بوو[٧].

بەشێکیشیان هەر بە کۆچەری مابوونەوە. بۆیە خراپی بارودۆخی ئابووری کوردستانیش دواکەوتوو بوو، کە ئەمەش ڕەنگدانەوەی بەسەر بارودۆخی تەندروستییەوە دیار بوو.

### * گرینگترین ئەو نەخۆشیانەی لە سەردەمی پاشایەتی لە کوردستانی عێراقدا باوبوون:

هەرچەندە کارێکی ئاسان نییە بەشێوەیەکی ورد گرنیگترین و باوترین نەخۆشییەکان لە سەردەمی پاشایەتی لە کوردستانی عێراقدا دەست نیشان بکەیت بەڵام هەوڵ دەدەین بە پشت بەستن بە هەندێ لەو سەرچاوانەی لە بەردەست دان ئەم کارە ئەنجام بدەین.

دیارە ڕادەی مردنی منداڵان لەهەر کۆمەڵگایەك بە یەکێك لە پێوەرەکانی ئاستی تەندروستی ئەو کۆمەڵگایە دادەنرێ، کە ئەگەر منداڵ تیایدا زۆر بمرێ بەتایبەتی پاش ماوەیەك لە دایکبوونی، ئەو نیشانەیە بۆ نزمی ئاستی تەندروستی لەو کۆمەڵگەیەداو، بە پێچەوانەشەوە.

سەبارەت بە کۆمەڵگای کوردی ئەو ماوە مێژووییەش چەند سەرچاوەیەکمان لە بەردەست دایە ئاماژە بە بەرزی ئاستی منداڵ مردن دەکەن، نووسەرێك لەم ڕووەو نووسیویەتی " هەموویان ئەزانین لەم چل پەنجا ساڵی دواییە. بەدوواوە ڕادەی منداڵ مردن لەناو کوردەواریدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە کەمییە، لە چاو ساڵەکانی پێش ئەو ماوەیەدا، جاران ئەگەر لە دە منداڵ چوار منداڵ بە ڕێك و پێکی بمانایەو گەورە ببونایە ئەو پەڕی خۆشحاڵی و بەختیاریی بوو کەس و کاری منداڵە مردووەکان چاویان پێ هەڵنەهێنان و بەخیلیان بە دایك و باوکیان ئەبرد[٨].

ئافرەتێکی پزیشکی ئەوروپی کە لەو ماوەیدا سەردانی عێراقی کردبوو، دەڵێ: لە هەر سێ منداڵێك لە عێراقدا، منداڵێك دەمرد[٩]، کە دیارە بارودۆخی کوردستانیش بەشێك بووە لە بارودۆخی عێراق، ئەگەر خراپتریش نەبووبێ باشتر نەبووە. بە گوێرەی سەرچاوەیەکی تر منداڵ بوون لەسەر زەوی یان لەسەر پارچە حەسیرێك ڕووی دەدا[١٠]. کە ئەمەش ئەگەر چی زێدەڕۆیەکی تیادایە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی نزمی ئاستی ڕۆشنبیری تەندروستی خەڵکی پیشان دەدا. لە زۆربەی بارودۆخەکانیش هۆی مردنی ئەم منداڵانە دەگێردرایەوە بۆ چاو پیسی و ئیرەیی پێبردن[١١].

نەك خراپی ئەو ژینگە تەندروستییەی منداڵەکەی تیایدا لەدایکبووە. بە شێوەیەکی گشتی دەکرێ هۆی زۆری منداڵ مردن بگەڕێنینەوە بۆ کەم خۆراکی دایك و منداڵەکە پیسی بارودۆخی منداڵ تیا بوونەکەو چارەسەر لە کاتی تووش بوون بە نەخۆش. بارودۆخی جەنگی یەکەمی جیهانی ببووە مایەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و هەموو چەشنە پەتایەك[١٢].

دوای تەواو بوونی شەڕو دواتر دامەزراندنی ڕژێمی پاشایەتی لە عێراقدا، کاریگەری و پاشماوەی ئەو نەخۆشیانە هەر مابوونەوەو بە توانا هەبوو نەدەکرا چارەسەر بکرێن و هەوڵی بنبڕکردنیان بدرێن. ئەندازیارێکی ئەوروپی کە لە ساڵی ١٩٢٨ لە کوردستانی عێراقدا لە دروستکردنی ڕێگادا کاری دەکرد باس لەوە دەکات کە نەخۆشی (مەلاریا) لە سپیلك دا بڵاوبیبوەوە[١٣].

شایانی باسە ئەم نەخۆشییە زۆربەی ناوچەکانی عێراقی گرتببوەوە، هۆی سەرەکیش کۆبوونەوەی ئاوی پیسە[١٤].

هەر لەم ڕووەوەش لەسەر چاوەیەکدا هاتووە کە لە ناوچە چیاییەکان ئەگەری بڵاوبوونەوەی پەتای مەلاریا لە وەرزی زستانیشدا زۆرە[١٥].

زیاتر لەسەرچاوەیەك باس لە بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە لە ناوچەیەك لە ناوچەکانی کوردستاندا دەکات لەم ڕووەوەش کاربەدەستێکی ئیداری لە (٢١)ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٦) بەکاری ئیداری گواستراوەتەوە ناحییەی چناران (میرزا ڕۆستەم).

نووسیویەتی: " بەڵام بەشێوەیەکی گشتی زۆر جار نەخۆشی بڵاوئەبووەوە وەکو مەلاریا لەرزوتا[١٦].

لەم سەرچاوەنەدا بەدیار دەکەوێ کە مەلاریا یەکێك لە نەخۆشییە هەرە بڵاوەکانی عێراق و کوردستان بووە. کە دیارە ئەمەش خراپی بارودۆخی تەندروستی کوردستان پیشان دەدا چونکە دەکرا بە گرتنە بەری هەندێ ڕێ لە شوێنی تەندروستی بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە بەم ڕادە فراوانە نەبێ، وەکو چۆن لە سەرچاوە خەرجیەکانی حکومەتی عێراقیش ئاماژە بە فراوانی بڵاوبوونەوەی تەنانەت لەناو قوتابیانیشدا کراوە[١٧].

نەخۆشی چاو ئێشە بە شێوەیەکی گشتی یەکێك لەو نەخۆشیانە بووە کە خەڵك تووشی بووە[١٨].

ئەمەش شتێکی ئاساییە، چونکە چەندین جۆری نەخۆشی چاو ئێشان هەیە، کە هەندێك بۆماوەیی و هەندێك بەهۆی پشت گوێخستن و هەندێکی بە تەمەن چووندا بڵاودەبێتەوە. لە ڕۆژنامەی ژیان لە سالی (٢٩) ئەیلوولی سالی ١٩٣٤ باسی نەخۆشییەکی تر کراوە: "لەم ڕۆژانەدا، لەسایەی دوکتۆرەکانمانەوە، نەخۆشی کەم خوێنی ڕوو لە کزیە "(١٩). مەبەست لە نەخۆشی کەم خوێنیە، کە دیارە یەکێك لە هۆ سەرەکییەکانی کەم خۆراکییە. ئەمەش باشترین نموونەیە لەسەر ئەوەی کە چۆن خراپی بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی خراپی بارودۆخی تەندروستی. لە سەرچاوەیەکی تردا باسی نەخۆشی ژانە سەرو خەنات کراوە کە لە سییەکاندا لە کوردستاندا بڵاوبووەتەوە(٢٠).

کە دیارە ئەم دوو نەخۆشییە بە شێوەیەکی گشتی زۆر بڵاون، بەتایبەتی ئەگەر خۆپاراستن وەکو پێویست فەراهەم نەکرابێ.

یەکێك لەو نەخۆشیانەی تر کە لەسەردەمی پاشایەتی لە کوردستاندا بڵاوبووەوە نەخۆشی سیل بووە، لە سالی (١٩٤٤) کۆمەڵی بنبڕکردنی سیل پێك هێنرا کە ئامانجی ئەم کۆمەڵەیە بنبڕکردنی سیل بوو لە هەموو لیواکانی عێراقدا(٢١).

دیارە ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی ئەم نەخۆشییە یەکێك لە نەخۆشییە هەرە بڵاوەکانی عێراق بووەو خەڵکێکی زۆر بەدەستییەوە ناڵاندویانە.

ئەمە سەرەڕای چەندین نەخۆشی تر کە لە سەرچاوەکاندا وەکو پێویست ئامارەیان پێ نەکراوە یان لە بەردەست دانین، چونکە وەکو وترا کارێکی ئاسان نییە هەموو نەخۆشییەکانی ئەو سەردەمە دەست نیشان بکرێن.

*** گرینگترین هۆیەکانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی بە ڕادەیەکی زۆر لە کوردستاندا**

دەکرێ لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی هۆیەکە بگێڕدرێتەوە بۆ نەبوونی سیستەمێکی تەندروستی باش، ئەمەش لەبەر خراپی بارودۆخی دارایی و ئابووری کە وای کردبوو بەرەو پێشەوە چوون لەم لایەنەوە زۆر لەسەرخۆبێ (٢٢).

سەرچاوەیەکی تر بەشێکی هۆی خراپی بارودۆخی تەندروستی دەگێڕێتەوە بۆ کەمی نەخۆشخانەو بنکە تەندروستییەکان لە کوردستاندا بە بەراورد کردن لەگەڵ ناوچەکانی تری عێراقدا (٢٣).

دەکرێ بڵێین ئەمە سەرەڕای ئەوەی ڕێگر دەبێ لە بەردەم چارەسەرکردنی نەخۆشی بەشێوەیەکی باشتر، لەهەمان کاتدا دەشبێتە هۆی زۆرتر بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکانیش لە بارودۆخی نائاسایی شەڕی دووەمی جیهانیش ڕادەی نەخۆشییەکان زیاتر دەبوو بەتایبەتی جۆری خواردنی خەڵکەکە بە شێوەیەکی گشتی خراپ دەبوو، لەم ڕووەوەش خەڵکی لیوای هەولێرو سلێمانی بەهۆی کەمی دانەوێڵەو بەرزی نرخەکەی ناچار بوون کە جۆرە نانێك بخۆن کە لە ئاردی بەڕوو دروست دەکراو دەبووە مایەی نانەوەی گیروگرفتی تەندروستی بۆیان (٢٤).

لێکۆڵەرێك باش بۆ بابەتەکە چووە کاتێك نووسیویەتی بارودۆخی تەندروستی لە هەموو عێراقدا بەدەست گیروگرفت و قورسییەوە دەیناڵاند ئەمەش بەهۆی جۆر بەجۆرەوە بوو لە گرینگترییان دواکەوتوویی گشتی لاوازی هۆشیاری تەندروستی، هەروەها وەکو پێویست نەبوونی تەرخان کراوە داراییەکان بۆ خزمەت گوزارییە تەندروستییەکان کە گەیشتە ٤٦٪ لە بووجەی گشتی سالی (١٩٤٦)وبەرزترین ڕێژەش پێشکەوتنی ڕژێمی پاشایەتی ٥، ٦٪ بوو(٢٥).

*** (کەمی ژمارەی پزیشکان)**

بە شێوەیەکی گشتی ژمارەی پزیشك لە کوردستان و لە هەموو عێراقیشدا کەم بووە، لە سەرەتادا زیاتر پەنا بردراوەتە بەر دەرمانی میللی کە لە کوردستاندا پێ ووتراوە دەرمانی کوردەواری یان هەندێ جار پێی دەوترێ پیرێژنان لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئافرەتی بەتەمەن شارەزاییان لێ هەبووە هەروەها دەلاکەکان سەرەڕای سەرو ڕیش تاشینیش، منداڵیان خەتەنە کردووە هەندێ نەخۆشی تریشیان بە گوێرەی شارەزاییان چارەسەرکردووە، پیاوانی ئاینیش زۆر جار ڕۆڵی پزیشکیان بینیووە لە چارەسەرکردنی هەندێ نەخۆشیدا یان هەوڵی چارەسەرکردنیاندا.

گیروگرفتەکەش هەر لە کەمی ژمارەشیان بە تەنیا نەبووە بەڵکو لەوەشەوە بووە کە ئارەزوویان نەبووە لە شوێنە دوورەکان لە شارە گەورەکان دابمەزرێن چونکە لەو شوێنانەدا ڕەوشی کۆمەڵایەتی بەرز نییەو هۆیەکانی خۆشگوزەرانی فەراهەم نیە، بۆیە وەکو لەسەرچاوەیەکدا هاتووە زۆربەی دکتۆرەکان لە بەغداو بەسرەو موسڵ کۆدەبوونەوەو دکتۆرەکان لە دەرەوەی ئەو شارانە کەم بوونە تەنانەت لە هەندێ شاری وەکو هەولێرو سلێمانی نەجەفیش(٢٦).

جا ئەگەر بارودۆخەکە لە دوو لیوای وەکو هەولێرو سلێمانی ئاوابێ ئەوە بێگومان شارۆچکەو گوندەکاندا زۆر خراپتر بوو لەم ڕووەوەش سەرچاوەیەك باس لە بارودۆخی تەندروستی ڕواندز لە سیەکاندا دەکات و نووسیوتی " لێکۆڵینەوەی خزمەتگوزاری تەندروستی ماندوومان ناکا، چونکە ناوچەی لێکۆڵینەوەکەمان هیچ دکتۆری نیشتەجێی لە دەرەوەی شاری هەولێر نەبوو"(٢٧).

دیاردەیەکی تر هەیە سەبارەت بە پزیشکەکان ئەو ژمارە کەمەی کە هەش بوون هەندێکیان کورد نەبوون یان لە کەمایەتیە ئایینییەکان بوون لەم ڕووەوەش سەبارەت بە شارۆچکەی کفری نووسراوە" لە کفری دکتۆرێك برین پێچیك و ئافرەتێکی نێرس هەبوو جوولەکەی شاربوو ناوی (ڕەحمە ڕەحمانی) بوو لە چاو ئێشە شارەزابوو بە باوکی ووت زوو کورەکەت بگەیەنە نەخۆشخانەی (میر ئەلیاس) لە بەغداد پزیشکی بیانی تیادایە"(٢٨).

تاکو سالی (١٩٢٧) کۆلیجی پزیشکی لە عێراقدا نەبوو، لەو سالەدا دووەم کۆلیج کە کۆلیجی پزیشکی بوو لە زانکۆی بەغدا دامەزرا، لە مانگی نیسانی هەمان سالدا شا فەیسەلی یەکەم کۆلیجە نوێیەکەی کردەوە، (٢٩) لە سالی ١٩٢٨ بە

كۆلیجی پزیشكی شاهانەی عێراقی ناونرا[٣٠].

لە سالی خوێندنی یەكەمدا قوتابی لە كۆلیجەكەدا وەرگیران، ولە سالەكانی دواتردا ژمارەی قوتابییەكان زیاتر كرا[٣١].

حكومەتی عێراقی هەستی بە پێویستی زیاد بوونی ژمارەی قوتابیانی كۆلیجی پزیشكی كردووە، بۆیە لە سالی (١٩٤٤- ١٩٤٥) فشاری خستۆتە سەر ئیدارەی كۆلیجی پزیشكی بۆ ئەوەی ژمارەی قوتابیانی وەرگیراو لە كۆلیجەكە لە ٢٥ كەس بۆ (٧٠) كەس زیاد بكات، بەلام ئیدارەی كۆلیجەكە بەتایبەتی مامۆستا ئینگلیزەكان زیاتر لە نیوەی ئەو قوتابیانەیان دەرنەچوواندووە[٣٢].

ئەمەش نیشانەی ئەوەیە كە حوكومەتی عێراقی هەولی دەدا ژمارەی دكتۆرەكان زیاتر بكات، بەلام مامۆستاكانی كۆلیجەكە زیاتر جەختیان لەسەر جۆری پزیشكەكان نەك ژمارەیان كردۆتە. ئەوەی جێگای سەرەنجیشە ژمارەی قوتابیانی وەرگیراوی جوو لە سالی خوێندنی یەكەی كۆلیجەكە (١٠) قوتابی لە كۆی (٧٠) قوتابی بووە كەرێژەیەكی بەرز بووە لە چاو ژمارەی جوو لە عێراقدا، لە كاتێكدا ژمارەی قوتابیانی كوردی وەرگیراو لەم كۆلیجە بە دەستەوە نییە، بەلام هەر دەبێ ژمارەیەكی كەمیان لێ وەرگیرا بێ، چونكە بە شێوەیەكی گشتی پزیشك لە كوردستاندا كەم بووە. ولە سالی (١٩٢٦) حكومەت كۆلیجی دەرمانسازیو كیمیایی كردەوە، وماوەی خوێندن تیایدا چوار سال بووە، وسالی یەكەم (١٤) قوتابی وەرگیران كە دەبووایە خوێندنی ئامادەیی لقی زانستی بوونایە، ولە سالی (١٩٤٠) یەكەم خولی قوتابیان كە (١٢) كەس بوون دەرچوون[٣٣].

پێ ناچێ قوتابیانی كورد بە هیچ ڕێژەیەك لەم كۆلیجە وەرگیرابن چونكە تا ماوەیەكی دەرنگ پسپۆری زانستی لەم بووارەدا نەبووە. كەمی پزیشك گیروگرفتێكی سەرەكی عێراق بوو، ئەو وولاتەی كە پركردنەوەی پێویستییەكانی لە پزیشك پێویستی بە چەند هەزار پزشیكێك هەبووە، لە كاتێكدا تاكو سالی (١٩٤٦) كۆلیجی پزیشكی زیاتر لە پەنجا قوتابی لە كۆلیجەكە وەرنەدەگرت[٣٤]. لە سالی (١٩٥٣) كۆلیجی پزیشكی ددان لە بەغداد كرایەوە لە سەرەتادا سەر بە راگرایەتی كۆلیجی پزیشكی بوو خوێندن تیایدا بۆ ماوەی پێنج سال بوو، ئینجا سالێكی تریشی بۆ زیاد كرا[٣٥].

بەهەمان شێوەش هیچ بەلگەیەكی ئەوتۆمان بە دەستەوە نیە كە قوتابی كورد لەم كۆلیجەدا وەرگیرا بن، بەتایبەتی كە پسپۆری پزیشكی ددان لە ناو كوردا لە ماوەی لێكۆلینەوەكەدا نەبووە. لە پێشتر ئاماژە بەوە كرا بە هۆی كەمی پزیشك لە عێراق پزیشك لە دەرەوەی وولات دەهێنران، سەبارەت بە كوردستانیش ژمارەی پزیشكانی كورد لە كوردستان دەگمەن بووە، بۆیە سەرنجی ئەوە ئەدەرێ كە ئەو پزیشكانەی كە هەش بوون ژمارەیەكیان بیانی یان لە ناوچەكانی تری عێراق بۆ كوردستان هێنرا بوون لەم ڕووەوەش ئەگەر بێتو سەیری پزیشكەكانی لیوای سلێمانی لە سالی (١٩٤٦) بكەین، دەبینین كە:

١ - دكتۆر عیزەتی عارف پزیشكو نەشتەگەری نەخۆشخانەی شاهانە لە شاری سلێمانی لەدایكبووی سالی ١٩١٤ شاری موسل بووە[٣٦].

٢- دكتۆر نوری توحی سەرۆكی تەندروستی لیوای سلێمانی كە هەرچەند لەدایكبووی شاری سلێمانییە[٣٧]. بەلام ناوەكەی پێدەچێت عەرەب بێ.

٣- دكتۆر هاشم دۆغرەمەچی، پزیشكی سەنتەری قەزای هەلەبجە خەلكی هەولێر بووە[٣٨].

ئەگەر بێتو سەیری پزیشكەكانی لیوای كەركوكی سالی (١٩٤٧) بكەین دەبینین كە ٦ عێراقیو ٢ میسری بوونە:

١ - دكتۆر ئەحمەد نەقیب پزیشك لە قوتابخانەی سەربازی لە كەركوك، لەدایكبووی شاری كەركوكە

٢ - دكتۆر نەجیب رەزوقی میخائیل پزیشك لە نەخۆشخانەی سەربازی لە كەركوك لەدایكبووی شاری موسلە.

٣ - دكتۆر فازل رشید عەقراوی پزیشكی سەربازی.

٤ - دكتۆر پۆل لی مەلیك پزیشكی نەشتەرگەر لە نەخۆشخانەی تەندروستی پێشووی لیوای كەركوك لە بەغداد لەدایكبووە خێزانەكەی دەگەرێتەوە بۆ لیوای دلێم.

٥ - دكتۆر توركین بابازیان پزیشك لە نەخۆشخانەی شاهانەی كەركوك.

٦ - دكتۆر جەمیل جومعە پسپۆری نەخۆشییەكانی مندالان لە نەخۆشخانەی شاهانە لە كەركوك لەدایكبووی موسلە.

٧ - دكتۆر جەمیل ئیحسان پزیشك لە نەخۆشخانەی شاهانە لە كەركوك لەدایكبووی ئەسكەندەرونەیە.

٨ - دكتۆر عەزیز زەكی پزیشكی مەعاریف لە كەركوك، میسریی بووە.

٩ - دكتۆر عەتار رەشید سالحی پزیشكی پێشووتری نەخۆشخانەی شاهانە لە كەركوك.

١٠ - دكتۆر فەوزی ئەمین، پزیشكی چاو لە نەخۆشخانەی شاهانە لە كەركوك[٣٩].

بە گوێرەی سەرچاوەیەكی تر ژمارەی دانیشتووانی لیواكانی كوردستانی عێراقو ژمارەی پزیشك لە هەر لیوایەكو بری هەر چەند كەسێك بۆ پزیشكێكمان لە سالی (١٩٥٠)دا بۆ دەردەكەوێت[٤٠].

| لیوا | ژمارە دانیشتووان | ژمارەی پزیشك لە لیواكەدا | ڕێژەی تەرخان كراو بۆ هەر پزیشكێك |
| --- | --- | --- | --- |
| كەركوك | ٢٨٥٨٧٨ | ٥٤ | نزیكەی ٥٠٠٠ |
| هەولێر | ٢٤٠٢٧٣ | ١٥ | نزیكەی ١٦٠٠٠ |
| سلێمانی | ٢٢٢٧٣٢ | ١٣ | نزیكەی ١٧٠٠٠ |

لەم خشتەیە دەردەكەوێت لیوای كەركوك بارودۆخی

لەرووی ژمارەی پزیشکەوە لە لیوای هەولێرو سلێمانی باشتر بووە، هی لیوای هەولێریش لە سلێمانی باشتر بووە. بە گوێرەی هەمان خشتە بارودۆخی لیوای بەغداو بەسرە لە بارودۆخی هەموو لیواکانی تری عێراق باشتر بووە، بەڵام لیوای موسڵ بارودۆخی لە لیوای کەرکوك خراپتر بووە[41].

بە شێوەیەکی گشتی حکومەتی عێراقی زیاتر گرنگی بە شارە گەورەکان داوە، هەروەها پزیشکەکان خۆشیان زیاتر ئارەزووی ئەوەیان هەبوو لە شارە گەورەکاندا نیشتەجێ بن و کار بکەن. بەتایبەتی ئەگەر خۆشیان خەڵکی ئەو شارە بووان، زیاتر حەزیان کردووە لەو شارانە بمێننەوە، شتێکی ئاساییە کە بەهۆی پێشکەوتووتر بوونی بارودۆخی خوێندن لە شارە گەورەکاندا بەتایبەتی لە بەغدادی پایتەخت رێژەیەکی زیاتری پزیشك لە خەڵکی ئەم شارە پێ بگەن، هەروەها ئەو پزیشکە بێگانانەی دەهاتنە عێراقیش زیاتر لە پایتەخت و شارە گەورەکان کاریان کردووە لە ساڵی (١٩٥٣) خشتەیەکی ترمان لەبەر دەستدایە کە ژمارەی پزیشکەکانی

| لیوا | ژمارەی دانیشتووان | پزیشکەکان |
| --- | --- | --- |
| کەرکوك | ٢٨٦ ٠٠٥ | ٤٨ |
| هەولێر | ٢٣٩ ٧٧٦ | ١٢ |
| سلێمانی | ٢٢٦ ٤٠٠ | ١٠ |

هەر سێ لیواکەی بەم جۆرە پیشانداوە[42].

بە گوێرەی ئەم خشتەیە بێ دەبێ ژمارەی پزیشکەکانی هەر سێ لیواکە بەراورد لەگەڵ سێ ساڵی پێشووتر کەم نەبووەتەوە، کە ئەمەش شتێکی نائاسییە، چونکە دیارە خەڵك بە تێپەڕبوونی کات زیاتر پێویستی بە پزیشك دەبێ، ئەوەی زیاتریش سەرنج ڕادەکێشێ هەر بەگوێرەی ئەم خشتەیە ژمارەی دانیشتووانی کەرکوك و سلێمانی دوای سێ ساڵ زیاد بووە، بەڵام ئەوەی نائاساییە ژمارەی دانیشتووانی شاری هەولێر بە کەمتر دانرابێ، بۆیە جۆرە گومانێك لەم خشتانە دەکرێ، کە لەوانەیە زیاتر لە ئەنجامی خەمڵاندن داندرابێ نەك لە ئەنجامی زانیاری ورد، چونکە دەبوایە ژمارەی دانیشتووانی هەولێریش لەو ماوەیەدا پتر بووایە، بەتایبەتی کە لەو ماوەیەدا هیچ کارەساتێکی ئەوتۆ لە لیوای هەولێر ڕووی نەداوە. بە گوێرەی هەمان سەرچاوەش ژمارەی پزیشکەکانی سێ لیواکە لە ساڵی(١٩٥٤)بەم شێوەیە بووە:[43].

| لیوا | پزیشکەکانی وەزارەتی تەندروستی | پزیشکە تایبەتییەکان | پزیشکە بێگانەکان | پزیشکەکانی وەزارەتەکانی تر | کۆی |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| کەرکوك | ١٦ | ٣ | ١٩ | ١٣ | ٥١ |
| هەولێر | ١٢ | – | – | ٣ | ١٥ |
| سلێمانی | ٨ | – | ٢ | ١ | ١١ |

لێرەدا هەست بەوە دەکەین کە لە ساڵی (١٩٥٤) ژمارەی پزیشکەکانی هەر سێ لیواکە پتر بووە لە ساڵی (١٩٥٣)، بەڵام بە بەراورد کردن لەگەڵ ساڵی (١٩٥٠) ژمارەی پزیشکەکانی لیوای کەرکوك و سلێمانی پتر بووە، هەولێر هەروەکو خۆی ماوەتەوە. لە ئەنجامی کەمی پزیشك بەم ڕادەیە " هەندێك خەڵك لە ئەنجامی ئەزموون یان لە دانایی و ژیری خۆیانەوە جۆرەها دەرمانیان دروستکردووە شارەزاییان پەیدا کردووە، ژمارەیەك نەخۆشیان چارەسەر کردووە. ئەم جۆرە کەسانە بە زمانی خەڵکی ناوچەکە پێیان ووتراوە (جراح) بۆ مەبەستی کارەکەشیان تەنها ئامرازی سەرەتاییان لە بەردەست دابووە، وەك ئاوی گەرم، لە دوای دەرکەوتنی سابوون ئتر ئەمیش بە کارهێنراوە بۆ شێلانی شوێنی شکان یان لە جێچوونەکە هەروەها (پێستە، قامیش، مۆم، هێلکە) یان بەکارهێناوە. پزیشکێکی میللیش لە شاری هەولێر هەبوو بە ناوی (ئەحمەد تەبیب) لە بەشێکی تایبەت لە ماڵەکەی خۆیدا چارەسەری نەخۆشی شکان و هەندێ نەخۆشی تری دەکرد، دکتۆر عەبدولرەزاق دەباغ ستایشی زانیارییەکانی کردووە و ووتویەتی لە بنەماکانی پزیشکی دەگەیشت و لە زۆر بارودۆخدا دەستنیشان کردنەکەی ڕاست دەبوو[44].

*** ( ژمارەی نەخۆشخانە و بنکە تەندروستییەکان لە کوردستانی عێراقدا )**

| لیوا | نەخۆشخانەی تەواو | نەخۆشخانە | بنکەی تەندروستی پلە یەك | بنکەی تەندروستی پلە دوو |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| هەولێر | – | ١ | ٦ | ٢ |
| سلێمانی | – | ٢ | ٣ | ٢ |
| کەرکوك | ١ | ٣ | ٥ | ١٣ |

لە ساڵی (١٩٤٣) لیواکانی کوردستانی عێراق ئەم بڕە نەخۆشخانە و بنکە تەندروستییانەی تیا بووە:[45].

ئەگەربێت و ئەم ژمارانە بە ژمارەی نەخۆشخانەکانی لیواکانی دلێم و حیللە و مونتەفیك بەراورد بکرێ دەردەکەوێ کە پێشتر ناوچەی کوردی لە خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان

لە بەشەكانی تری عێراق كەمتر بوو[٤٦].

لە ساڵی (١٩٤٦) لە لیوای سلێمانی نەخۆشخانەیەكی گەورەی تەواو هەبووە، هەروەها چەندین بنكەی تەندروستیش لە لیواكەدا هەبووە، هەروەها نەخۆشخانەیەك و بنكەیەكی تەندروستی لە هەڵەبجە دامەزرابوو[٤٧].

لە ساڵی (١٩٤٧) بینایەكی نوێ بۆ نەخۆشخانەی ڕەواندوز دروستكرابوو كە بەپێی سەرچاوەیەك بەرچاوترین بینایەی شارەكەدا بووە[٤٨].

لە ساڵی (١٩٥٠) ژمارەی نەخۆشخانەو بنكە تەندروستییەكانی حكومەی ئەهلی لیواكانی كوردستانی عێراق بەم جۆرە بوو[٤٩].

| لیوا | نەخۆشخانە حكومییەكان | ئەهلییەكان | بنكە تەندروستییە حكومییەكان | بنكە تەندروستییە ئەهلییەكان |
|---|---|---|---|---|
| كەركوك | ٤ | ١ | ٢٨ | ١ |
| هەولێر | ٤ | – | ٢٩ | – |
| سلێمانی | ٤ | – | ٢٤ | – |

لەم خشتەیە دەردەكەوێ كە زیاتر نییە ژمارەی نەخۆشخانەو بنكەی تەندروستی لەم سێ لیوایەدا، بەر لیوای كەركوك كەوتووە ئینجا هەولێر بە پلەی دووەم و لیوای سلێمانی بە پلەی سێیەم دێن.

ئەوەی جێگای سەرنجیشە نەخۆشخانەو بنكەی تەندروستی ئەهلی تەنها لە لیوای كەركوك هەبووە، لیواكانی تری كوردستان لێ بێبەش بوو. هەر لە هەمان ساڵدا بەغداد زیاترین ژمارەی لە نەخۆشخانەو بنكەی تەندروستی بەركەوتووە[٥٠].

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ژمارەی دانیشتووانیشی لە شارەكانی تری عێراق زیاتر بووە بۆیە شتێكی ئاساییە پێویستی بە خزمەتگوزاری تەندروستی زیاتر بوبێت. كاربەدەستێكی ئیداری لە پەیمانگاكاندا ئاماژەی بە بوونی چەند نەخۆشخانەیەك لە هەندێ ناوچەی كوردستاندا كردووە و لەو ڕووەوە نووسیویەتی" چەند ساختمانێك لە (هەریر)و (سەلاحدین)و (شەقڵاوە)دا تەواوكران بۆ خوێندنگاو خەستەخانەو حەوانەوە"[٥١].

لە ساڵی (١٩٥٦) باس لە دهۆك كراوە نووسراوە" بێجگە لەوە سێ نەخۆشخانە (مستوصف) لە ناوچەكەدا هەبوون"[٥٢].

بەڵام سەبارەت بە گوندەكان ئەوە لە نەخۆشخانەو بنكەی تەندروستی بێ بەش بوونەو زۆر بە زەحمەت توانیویانە نەخۆشەكانیان بگەیەننە نەخۆشخانەكان، كە لە شارەكان و شارۆچكەكان هەبوون. بەتایبەتی كە زەحمەتی هاتووچۆی ئەو سەردەم بهێننە بەرچاوی خۆمان، بۆیە دەتوانین بڵێین كە ئەم نەخۆشخانەو بنكە تەندروستییەكان بەشێوەیەكی گشتی كاریگەریی خراپی بەسەر بارودۆخی تەندروستییەوە هەبووە.

* دەرئەنجام

لە ئەنجامی ئەم لێكۆڵینەوەیە دەركەوت:

١- بارودۆخی تەندروستی لە كوردستانی عێراق بەشێوەیەكی گشتی خراپ بووە، هۆی ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ كەمی پزیشك و نەخۆشخانەو زۆری نەخۆشی بەتایبەتی، حكومەتی عێراق توانایەكی ئابووری وای نەبووە كە بارودۆخێكی تەندروستی باش بۆ هەموو عێراق دابین بكات، زیاتر گرنگی بە پایتەخت و شارە گەورەكان داوە.

٢- شانبەشانی پزیشكی نوێ پزیشكە میللییەكان بەشدارییان لە چارەسەركردنی نەخۆشییەكان كردووە بەتایبەتی ڕادەی نەخۆشخانەو پزیشكەكان كەم بوون، ئەگەرچی ئەم پزیشكە میللیانە كەموكوڕیشیان زۆر بووە، بەڵام هەندێكیشیان هەبوون كە خزمەتی باشیان پێشكەش بە بارودۆخی تەندروستی لە كوردستاندا كردووە، لەوەی جێگەی سەرنجیشە ئێستا لە ئەوروپا و وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاش گرنگی بە دەرمانی میللی و گژوگیا دەدرێ، بۆیە نابێ بە چاوێكی سووك سەیری پزیشكی میللی بكەین.

٣- دواكەوتوویی كۆمەڵگای كوردی لە بوارە جۆربەجۆرەكاندا بووەتە هۆی خراپ بوونی بارودۆخی تەندروستی لە كوردستاندا، لە هەمان كاتیشدا خراپی بارودۆخی تەندروستیش بووەتە هۆی خراپتربوونی بارودۆخی ئابووری و كۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری كۆمەڵگای كوردیش.

٤- ئاین بەشێوەیەكی گشتی كاریگەرییەكی باشی بەسەر لایەنی تەندروستی خەڵكی كوردستانەوە هەبووە، چونكە زۆربەی خەڵكی كوردستانی عێراق موسڵمان بوونەو ئایینی ئیسلامیش گرنگی بە پاك و خاوێنی دەدات، بەتایبەتی لە ڕێگای دەستنوێژ شووشتن كە دەگاتە پێنج جار لە ڕۆژێك دا ئەمەش بەشێوەیەكی گشتی بووەتە هۆی چاكتربوونی بارودۆخی تەندروستی لە ناوچەكەدا، لە ئایینی مەسیحیشدا بەشێوەیەكی كەمتر گرنگیی بە پاك و خاوێنی جەستە دراوە هەرچی ئاینی ئێزدییە، ئەوە مەسەلەی خۆشتن و دەستنوێژ شتنی تیا نییە، بۆیە ناتوانین بڵێین كاریگەرییەكی باش بەسەر لایەنی تەندروستی و پەیڕەوەكانی هەبووە، بەڵام بە شێوەیەكی گشتی ئاین لە لایەنی گیانییەوە ئارامییەك بە مرۆڤ دەبەخشێت و هەندێ جار نەخۆش هەستدەكات لە ڕێگای هەندێ دەقی ئاینی پیاوانی ئایینەوە چاك دەبێتەوە ئێمەش یارمەتی دەردەبێ لەسەر زووترچاك بوونەوەی هەندێ لە نەخۆش یان نەخۆشییەكان.

٥- بە شێوەیەكی گشتی كوردستانی عێراق لە ڕووی سروشتییەوەو بەهۆی لە بارتربوونی كەش و هەوایەكەی لە ڕووی تەندروستییەوە لە ناوچەكانی تری عێراق لە بارتر بوو، بەتایبەتیش ناوچە هاوینە هەوارەكانی.

٦- بەدرێژایی ماوەی لێكۆڵینەوەكە هیچ دام و

ئەزگایەکی وا لە ناوچەی لێکۆڵینەوەکە نەبووە کە کارمەندی تەندروستی پێ بگەیەنێ ئەمەش کاردانەوەیەکی خراپی بەسەر بارودۆخی تەندروستییەوە هەبووە.

٧- قوتابخانەکان ڕۆڵێکی باشیان هەبووە لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری‌و ڕۆشنبیری تەندروستی لەنێوان قوتابییەکانیاندا، ئەگەر چی ئەم لایەنە بە تەواوەتی هەموو کۆمەڵگاشی نەگرتبێتەوە، بەڵکو زیاتر پەیوەست بووبێت بە توێژی قوتابیانەوە.

* سەرچاوە و پەراوێزەکان:


١-کۆمەڵێک مامۆستای زانکۆ، جیوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ١٩٨٨، لاپەرە ١٩.

٢-دکتۆر سلێمان عەبدوڵڵا ئیسماعیل، چەمك‌و سنووری هەرێمی کوردستانی عێراق سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی (گۆڤار)، ژمارە (٣) ساڵی دوانزەهەم، تشرینی دووەمی ٢٠٠٤، لاپەرە ١٨.

٣-جەرجیس فەتحوڵڵا، يقظة الكرد تأريخ سياسي، ١٩٠٠ - ١٩٢٥، هەولێر، دار ئاراس للطباعة والنشر ٢٠٠٢، الصفحة٥٥.

٤-دبليو - ئای - ويگرام، ادگار - تی - ای - ويگرام، مهد البشرية الحياة في شرق كردستان، وەرگێرانی فەتحوڵڵا، هەولێر، چاپخانەی پەروەردە، ٢٠٠١، الصفحة ١٢٣.

٥-دکتۆر سەلیم سەعید زەنگەنە بەرەو تەندروستییەکی باشتر، هەولێر، چاپخانەی زانکۆی سەلاحددین، ٢٠٠٥ لاپەرە١٢.

٦-نەوشێروان مستەفا ئەمین، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەوانی کوردی ١٨٩٨- ١٩١٨، سلێمانی، لاپەرە٨٤.

٧-م. س. لازاريف، المسالة الكردية ١٨٩١- ١٩١٧، وەرگێرانی ئەکبەر ئەحمەد، سلێمانی مرکز کردستان للدراسات الاستراتيجية، ٢٠٠١، الصفحة ٤٣.

٨-عەبدولقادر قەزاز، پەندو ئامۆژگاری‌و هەندێ بابەتی تر، بغداد شركة الخنساء للطباعة المحدودة، ٢٠٠٢، الصفحة ١٥٧.

٩-ايلونابورسكا، طبيبة في بيت البرزنجي، بغداد العشرينيات و بداية والثلاثنيات في ذاكرة إمراة شيكية، وەرگێرانی: حوسێن العامل، دمشق، ٢٠٠٢، الصفحة ١٨٨١.

١٠-باسيل نيكيتين، دراسة سوسولوجيةو تأريخية، نقله من الفرنسيةو علق علية الدكتور نوري طالباني، اربيل دار آراس للطباعة، ٢٠٠٤

١١-المصدر والصحفة نفسه.

١٢-احمد خواجه، چيم دی، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بغداد، چاپخانەی شفيق بغداد، ١٩٦٧، لاپەرە ٨.

١٣-ای - ام - هاملتون، طريق في كردستان، ترجمة جرجيس فتح الله المحامي، بغداد، دار الجاحظ، ١٩٧٣، الصفحة ٦٣.

١٤- العراق - وزارة المعارف - التقرير السنوي عند سير المعارف لسنة ١٩٤٥ - ١٩٤٦، بغداد مطبعة المكومة، ١٩٤٧، الصفحة ١١٦.

١٥-هنري فيلد، جنوب كردستان- دراسة انثروثولوجية، نقله الى العربية جرجيس فتح اللة، اربيل، مطبعة التربية، ٢٠٠١، ص١١.

١٦-محەمەد سەعید مەحموود، یادداشتەکانم ئەزموونی ژیانم لە بواری ئیدارەو تیشکێك بۆ سەر ڕابردوو، لندن، دار الحكمة، ٢٠٠٤. لاپەرە ٣٦.

١٧- الحكومة العراقية - وزارة المعارف - التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٤٦ - ١٩٤٧، بغداد، مطبعة الحكومة، ١٩٤٨، ص، ١٢٣.

١٨-مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، بغداد، دار الحرية للطباعة، ١٩٩٤، لاپەرە ٢٦.

١٩-لە: کەمال ڕەئووف محەمەد، مستەفا سابیب ئەستێرە گەشەی کورد، کوردستان، سلێمانی، دەزگای پەخش و چاپی سەردەم، ١٩٩٨، لاپەرە ١٩٦.

٢٠- پرۆفیسۆر پاکیزە رفیق حیلمی، کوردو ژیانێکی پڕ ئەندێشە، هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیری ٢٠٠٠، لاپەرە ٤١ - ٧٧.

٢١- عەبدولرەزاق ئەلهیلالی، معجم العراق، الجزء الثاني، بغداد، مطابع دار الكشاف للنشر والطباعة، الصفحة ٣٩.

٢٢- كوينسي رايت، حكومة العراق، ترجمها اكرم الركابي، القاهرة، المطبعة السلفية، ١٩٢٧، الصفحة ١٨.

٢٣-عەزیز حەسەن، البارزاني والحركة القومية الكردية التحررية في كوردستان العراق ١٩٣٩ - ١٩٤٥، اربيل، مطبعة وزارة التربية، ٢٠٠٢، الصفحة ٦٨.

٢٤- زوهێر ئەحمەد ئەلنوحاس، التموين في العراق ١٩٣٩ - ١٩٤٨، نامەی ماستەر بلاونەبوو، كلية الاداب - جامعة الموصل، ١٩٨٩، الصفحة ٦٣.

٢٥- الدكتور اسماعيل شكر رسول، اربيل دراسة تأريخية في دورها الفكري والسياسي (١٩٣٩ - ١٩٥٨)، اربيل، كوردستان العراق، الصفحة ١٠١.

٢٦- الدكتور متى عقراوي، العراق الحديث، عربه المؤلف د. مجيد خدوري، الجزء الاول بغداد، مطبعة العهدة ١٩٣٦، الصفحة ١٦٣.

٢٧-ئی - ئار - لیچ، ڕەوشی ئابووری و کۆمەلایەتی کوردی ڕەواندز، وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە، عەزیز گەردی، سلێمانی، چاپخانەی ڕووون ٢٠٠٥، لاپەرە ٣٠.

٢٨- نەریمان، سەرچاوەی پێشوو ٢٦.

٢٩- بورسكا، المصدر السابق، الصفحة ١٨٨.

٣٠- الدليل العراقي الرسمي السنة ١٩٣٦، بغداد، محل زكور للطبع والنشر، ١٩٣٦، الصفحة ٢٣٥.

٣١- بورسكا، المصدر السابق، الصفحة ١٨٩.

٣٢- الدكتور مهدي عبد الامير السماك، مذكرات و خواطر طبيبن بغدادي، بغداد دار الشؤون الثقافية العامة، ٢٠٠١ الجزء الاول، الصفحة ٦١.

٣٣- عبد الحميد العلوجي، تأريخ الطب العراقي، بغداد، مطبعة اسعد، ١٩٦٧، ص ٣٠٤.

٣٤- عبد الرزاق الظاهر، الاقطاع والديوان في العراق، مصر، مطبعة السعادة، ١٩٤٦، الصفحة ١١٠.

٣٥- العلوجي، المصدر السابق، الصفحة ٣٠٠.

٣٦- عبد المجيد فهمي حسن، تأريخ مشاهير الألوية العراقية، الجزء الاول، بغداد، مطبعة الزمان، ١٩٤٦، الصفحة ٧٦.

٣٧- المصدر نفسها، الصفحة، ٧٩.

٣٨- المصدر نفسها، الصفحة، ٩٨.

٣٩- عبد المجيد حسن، مشاهير الألوية العراقية، الجزء الثاني، بغداد، مطبعة دجلة، ١٩٤٧، الصفحة، ٧٦ - ٢٠٠٢.

٤٠- عبدالرزاق الهلالي، نظرات الى اصلاح الريف، بيروت، مطابع دار الكشاف، ١٩٥٤، ص ٣٧.

٤١-عبد الرزاق الهلالي، معجم العراق، الجزء الثاني، بغداد، مطابع دار الكشاف للطباعة والنشر، ١٩٥٦، الصفحة ٢٦٤.

٤٢-المصدر نفسه، الصفحة ٢١٤ - ٢١٥.

٤٣- ئەیوب ڕۆستەم، هەورامان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی کولتووریە، سلێمانی، چاپ و ئوفسێت، ٢٠٠٤، لاپەرە ٢٩٧ - ٢٩٨.

٤٤- الدكتور ابراهيم طاهر معروف الرياتي، معجم اطباء محافظة اربيل، مطبعة تربية اربيل ٢٠٠٤ الصفحة ١١٢.

٤٥- العلوجي، المصدر السابق، الصفحة ٢٠٣.

٤٦- البارزاني، المصدر السابق، الصفحة ٦٨.

٤٧-عەبدولمەجید حەسەن، المصدر نفسه، الجزء الاول، الصفحة ٢١.

٤٨-الظاهر، صور من العراق، مصدر، مطبعة السعادة، ١٩٤٧، الصفحة ١٣.

٤٩- الهلالي، نظرت، الصفحة ٣٥.

٥٠- المصدر والصفحة نفسه.

٥١- شاكر فتاح، ئاوێنەی ژیانم، ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەی ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٣، لاپەرە ٥٤٢.

٥٢- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٥٤٨.

*** سەرچاوەکان بە زمانی کوردی: -**

١-ئەیوب ڕۆستەم، هەورامان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی - کولتووریە، سلێمانی، چاپ و ئوفێستی قانیع ٢٠٠٤.

٢-ئی - ئار - لیچ، ڕەوشی ئابووری و کۆمەلایەتی کوردی، ڕەواندز، وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە، عەزیز گەردی، سلێمانی، چاپخانەی ڕوون، ٢٠٠٥.

٣-احمد خواجە، چیم دی، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغداد، چاپخانەی شفیق، ١٩٦٨.

٤-پرۆفیسۆر پاکیزە ڕەفیق حیلمی، کوردو ژیانێکی پڕ ئەندێشە، هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیری ٢٠٠٠.

٥-دکتۆر سەلیم سەعید زەنگەنە، بەرەو تەندروستییەکی باشتر، هەولێر، چاپخانەی زانکۆی سەلاحدین، ٢٠٠٠.

٦-شاکر فەتاح، ئاوێنەی ژینم، ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەی ئەحمەد سەعید عەلی بەرزنجی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ٢٠٠٣.

٧-عەبدولقادر قەزاز، پەندو ئامۆژگاری و هەندێ بابەتی تر، بەغداد، ضاڤخانەی الخنساء للطباعة ٢٠٠٢.

٨-کەمال ڕەئوف محەمەد، مستەفا سایب ئەستێرە گەشەی کورد، سلێمانی دەزگای بەخش و چاپی سەردەم ١٩٩٨.

٩-کۆمەلێك مامۆستای زانکۆ جیۆگرافیای هەرێمی

کوردستانی عێراق، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ١٩٩٨.

١٠-محەمەد سەعید مەحموود، یادداشتەکانم ئەزموونی ژیانم لە بواری ئیدارەو تیشکێك بۆ سەر ڕابردوو، لندن، دار الحكمة، ٢٠٠٤.

١١- مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، بغداد، دار الحرية للطباعة ١٩٩٤.

١٢- نەوشیروان مستەفا ئەمین، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەوانی کوردی ١٨٩٨ - ١٩١٨، سلێمانی.

* سەرچاوە حکومییەکان: -

١-العراق - وزارة المعارف - التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٤٥ - ١٩٤٦ بغداد، مطبعة الحكومة، ١٩٤٧.

٢-الحكومة العراقية - وزارة المعارف - التقرير السنوي عن سير المعارف لسنة ١٩٤٦ - ١٩٤٧، بغداد، المطبعة الحكومة، ١٩٤٨، ص ١٢٣.

* سەرچاوە عەرەبییەکان: -

١-الدكتور ابراهيم معروف الرياتي، معجم اطباء محافظة اربيل، اربيل، مطبعة تربية اربيل، ٢٠٠٤.

٢-الدكتور اسماعيل شكر رسول، اربيل دراسة تأريخية في دورها الفكري والسياسي (١٩٣٩ - ١٩٥٨)، اربيل، كوردستان العراق، ٢٠٠٣.

٣-اي - ام. هاملتون، طريق في كوردستان، ترجمة جرجيس فتح الله المحامي، بغداد، دار الجاحظ، ١٩٧٣.

٤- ايلونا بورسكا، طبيعة في بيت البرزنجي، بغداد العشرينات وبداية الثلاثنيات في ذاكرة امراة تشيشكية، ترجمة حوسێن، دمشق، ٢٠٠٢.

٥-باسيل نيكيتين، دراسة سوسولوجية وتأريخية، نقله من الفرنسية وعلق الدكتور نوري طالباني، اربيل، دار اراس للطباعة والنشر، ٢٠٠٤.

٦-جرجيس فتح الله، يقظة الكرد تأريخ سياسي ١٩٠٠-١٩٢٥، اربيل، دار آراس للطباعة والنشر، ٢٠٠٢.

٧-دبلير. اي. ويطرام، ادگار، تي. اي. ويگرام، مهد البشرية الحياة في شرق كردستان، ترجمة جرجيس فتح الله، اربيل، مطبعة التربية، ٢٠٠١.

٨- زهير علي احمد النحاس، التموين في العراق ١٩٣٩ - ١٩٤٨، رسالة ماجستير غير منشورة، الكلية الآداب - جامعة الموصل ١٩٨٩.

٩-عبدالحميد العلوجي، تأريخ الطب العراقي، بغداد مطبعة اسعد ١٩٦٧.

١٠-عبد الرزاق الظاهر، الاقطاع والديوان في العراق، مصر، مطبعة السعادة ١٩٤٦.

١١- عبد الرزاق الهلالي، نظرات في اصلاح الريف، بيروت، مطابع دار الكشاف ١٩٥٤، معجم العراق، الجزء الثاني، بغداد، مطابع الكشاف للطباعة والنشر ١٩٥٦.

١٢- عبد المجيد فهمي حسن، تأريخ مشاهير الاولوية العراقية، الجزء الاول، بغداد مطبعة الزمان، ١٩٤٦. عبد المجيد فهمي حسن، مشاهير الألوية العراقية، الجزء الثاني، بغداد، مطبعة دجلة ١٩٤٧.

١٣- عزيز حسن، البارزاني والحركة القومية الكردية التحررية في كردستان العراق ١٩٣٩ - ١٩٤٥، اربيل مطبعة وزارة التربية، ٢٠٠٢.

١٤- كوينسي رايت، الحكومة العراق، ترجمها اكرم الركابي، القاهرة. المطبعة السلفية، ١٩٢٧.

١٥- م. س. لازاريف، المسالة الكردية ١٨٩١ - ١٩١٧، ترجمة اكبر احمد، السليمانية، مركز للدراسات الاستراتيجية، ٢٠٠٢.

١٦- الدكتور متي العقراوي، العراق الحديث غربه المؤلف ومجيد خدوري، الجزء الاول، بغداد، مطبعة العهد، ١٩٣٦.

١٧- الدكتور مهدي عبد الامير السماك، مذكرات و خواطر طبيب بغدادي، بغداد دار الشوؤن الثقافية العهد، ٢٠٠١.

١٨- هنري فيلد، جنوب كردستان - دراسة انثرو ثولوجية، نقله الى العربية جرجيس فتح الله، اربيل، مطبعة التربية، ٢٠٠١.

## * بارودۆخی تەندروستی لە کەرکوك لەنێوان ساڵانی سەردەمی پاشایەتی تا ساڵی (١٩٥٨):

د. دڵشاد مەحموود

بارودۆخی تەندروستیی گشتی و ژینگەی نیشتەجێبوون پەیوەندییەکی توندو تۆڵیان بە کایە ئابووری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە. لێکۆڵینەوە لە بارودۆخی کۆمەڵایەتیی هەر شارو ناوچەیەك بەبێ باسکردنی ڕەوشی تەندروستی و خزمەتگوزارییە گشتییەکان کارێکی ناتەواوە. بۆیە لەم تەوەرەدا هەوڵدەدەین، بابەتییانە، باس لە واقیعی تەندروستی و خزمەتگوزارییە گشتییەکانی شاری کەرکوك بکەین لە سەردەمی پاشایەتیدا.

### أ. واقیعی تەندروستی:

بارودۆخی تەندروستی لە سەرتاسەری عێراقدا، بە درێژایی ڕۆژگاری پاشایەتی، لە دەست گیروگرفت و کۆسپی گەورە دەیناڵاند. فاکتەرەکانی دروستبوونی خراپی بارودۆخی تەندروستییش، دواکەوتنی گشتیی کایە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان و لاوازیی ئاستی هۆشیاریی تەندروستی بوو لەنێو ڕەمەکی خەڵك. هەروا بێ توانایی حکومەت لە تەرخانکردنی دارایی پێویست و دابینکردنی دامەزراوەی تەندروستیی پێشکەوتوو، بۆ ڕاپەڕاندنی خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان، هۆیەکی بنەڕەتی بوو. بۆیە پێویست دەکات واقیعی تەندروستی لە دوو ڕوانگەی جیاوە باس بکرێت:

### ١. خەڵك و نەخۆشییەکان:

لە ئەنجامی بوونی کۆمەڵێك کێشەی ڕاستەقینەی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سروشتی و ئاست نزمی ڕۆشنبیریی دانیشتووان لە سەردەمی پاشایەتیدا، واقیعی تەندروستی لە ناوچەکانی عێراق لەنێویشیاندا شاری کەرکوك، زۆر پەرێشان بوو. خەڵکی ڕەمەك (عوام)، کە بەشی گەورەی دانیشتووانی پێکدەهێنا، سەبارەت بە سادەترین ڕێساکانی تەندروستی نەخوێندەوارو ناشارەزابوون[١]. بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکان ڕێگەیان بە باشکردنی خۆراك و شوێنی نیشتەجێبوونی تەندروست نەدەدا، کە زۆربەی هەرە زۆری خانووەکان تێکهەڵکێش و خاوەن کۆڵانی پێچاوپێچی تەسك و ڕووەو دارمان بوون. سەرباری ئەوەی بەشێکی دیاری دانیشتووان لە کوخ و کۆلیت و لە ژێر کەپر (صریفە) ژیانیان دەگوزەراند، کە هیچ مەرجێکی تەندروستییان تێدا نەبوو. وێرای بەخێوکردنی ئاژەڵ و پەلەوەر لەنێو ماڵەکاندا[٢]. سێ بەشی خانووەکانی شاریش زیاتر لە خێزانێکی دەگرتەخۆ، زۆر خانووی وا هەبوون لە یەك تاکە ژووردا زیاتر لە (٨) سەرخێزان پێکەوە دەژیان[٣].

دەبێت تێبینی ئەوەش بکرێت، گرفتی گەورەی تەندروستی لە شاری کەرکوك لە سەرەتای سەردەمی پاشایەتیدا، بریتیبووە لە گرفتی گەیشتنی ئاوی پاك بۆ نێو ماڵەکان. چونکە لە ڕۆژگاری عوسمانیدا، پرۆژەیەکی دروستی ڕاکێشانی ئاوی پاك، نەك بۆ نێو ماڵەکان بەڵکو بۆ نێو شاریش، بوونی نەبوو. لەو ڕۆژگارەدا، خەڵکی شار، زۆرتر، بەهۆی گوێدرێژەوە لە دەرەوەی شار ئاوی پاکیان بۆ نێو شار گواستووەتەوە[٤]، کە لەو ئەنجامەدا بنەماڵەیەکی دیاری کەرکوکی پەیدابوون بەناوی (ئاوچی)یەوە.

کەمیی ئاوی پاك بووەتە هۆیەکی سەرەکی لە بڵاوبوونەوەی دەردو پەتا. بە گوێرەی ڕاپۆرتە بەریتانییەکان نەخۆشی (مەلاریا)، کە لە ئاوی پیس و مێشوولەوە (ئەنۆفیلیس) (*Anopheles*) سەرهەڵدەدا[٥]، نەخۆشییەکی کوشندە بووە لە شاری کەرکوك و ساڵانە ژمارەیەکی زۆری دانیشتووان بە دەست ئەم نەخۆشییەوە گرفتار بوونە. ڕاپۆرتی کارگێڕیی بەریتانی بۆ ساڵی (١٩١٩)، جەخت لەسەر ئەم ڕاستییە دەکاتەوەو ئاماژە بەوە دەدات کە (٧٠٪)ی نەخۆشە چارەسەرکراوەکانی کەرکوك نەخۆشیی (مەلاریا) یان هەبووە، کە لەنێو نەخۆشکەوتووەکاندا[٥] نەخۆشیان مردوون. دیارە لەو قۆناغە مێژووییەدا دەسەڵاتی سیاسی لە توانایدا نەبووە چارەیەکی بنەڕەتی ئەم ڕەوشە بکات، بۆیە ڕاپۆرتەکە درێژە بە باسەکە دەدات و دەنووسێت: "هەر پلانێك بۆ پاراستن و دوورخستنەوەی دانیشتووان لە نەخۆشیی مەلاریا، پێویستی بە برە پارەیەکی زۆر دەبێت، کە پێویستە ئەنجام بدرێت لەپێناو چاککردنەوەو بنیاتنانی سیستەمی جۆگەو زێرابەکان و چاودێری شەقامەکان و نەهێشتنی زەلکاوەکان"[٦].

بەپێی زانیاریی سەرچاوە مێژووییەکانیش، دەردەکەوێت نەخۆشییەکانی (کولێرا، سیل، ئاولە (خوریکە)، کەڵەشێر جقە (قورباقە)، سورێژە (سۆریکە)، تیفۆ، مێکوتە) بەربڵاو بوونە. هەرچی نەخۆشییەکانی (مەلاریا و تەراخوما و بەلهارزیا) بوون باوترین نەخۆشییەکان بوون، دەبوو هەموو مرۆڤێك لە ژیانیدا دووچاریان ببێت[٧]!

واقیعی تەندروستیی شاری کەرکوك، وەك لە خشتەی سەرەوەدا خراوەتەڕوو، لە دواکەوتندا بووە. بە بەڵگەی ئەوەی نەخۆشییەکان ڕێژەیان لە بەرزبوونەوەدا بووە. بەپێی کۆمەڵە ئامارێکی دیکە ساڵی (١٩٢٨)، ژمارەی نەخۆشە چارەسەرکراوەکان لە نەخۆشخانەی کەرکوك خۆیدا لە (٨٣٩) کەس و نەخۆشە چارەسەرکراوەکانی دەرەوەی نەخۆشخانەش گەیشتووەتە (١٣٣٩٣٦) نەخۆش[٩]. ئەم ژمارەیە ئەگەر بێت و لەگەڵ ژمارەی دانیشتووان بەراورد بکرێت، دەردەکەوێت یەك کەس لەو ساڵەدا تاسەر لەشساغ نەبووە. بە دڵنیاییەوە، ژمارەی تووشبووان بە نەخۆشیی (مەلاریا) ڕێژەی بەرچاوی نەخۆشییەکانی شاری کەرکوکی بەرکەوتووە. بەپێی ڕاپۆرتەکانی دەسەڵاتدارانی ئینتیدابی بەریتانی خەڵکێکی زۆری کەرکوك لە سییەکاندا بەدەست نەخۆشیی (مەلاریا)وە گرفتار بوونە. ڕەنگە خستنەڕووی ئامارێك لەم بارەوە وێنایەکی گشتی سەبارەت بە واقیعی دواکەوتووی تەندروستیی شارەکە بدات بە دەستەوە.

**خشتەی ژمارە (١)**

**نەخۆشییە چارەسەرکراوەکانی ناوەوەو دەرەوەی نەخۆشخانەکان لەنێوان ساڵانی (١٩٢٣-١٩٢٦)دا[٨].**

| ناوچە | ١٩٢٣ | | ١٩٢٤ | | ١٩٢٥ | | ١٩٢٦ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ناوەوە | دەرەوە | ناوەوە | دەرەوە | ناوەوە | دەرەوە | ناوەوە | دەرەوە |
| کەرکوك | ٥٢٧ | ٦٠٠٥٨ | ٤٥٨ | ٧٧٣٠١ | ٥٧٦ | ٧٨٤٥٩ | ٦٧٣ | ١١٩٤٠٧ |
| عێراق | ١٣٦٣٢ | ٨٨٦٢٩٤ | ١٥٤٠٢ | ١٠٧٠٨٨٦ | ١٦٥٣٢ | ١٢٩٨٦٠٤ | ١٨٧٥٦ | ١٦٠٤٩٧١ |

**خشتەی ژمارە (٢)**

**ژمارەی تووشبووانی کەرکوك بە نەخۆشیی (مەلاریا) لەنێوان ساڵانی (١٩٢٨-١٩٣٠)دا[١٠].**

| ساڵ | ژ. تووشبووان بە مەلاریا | ژ. هەموو نەخۆشەکان | ڕێژەی سەدی مەلاریا لە سەرجەم نەخۆشییەکاندا |
|---|---|---|---|
| ١٩٢٨ | ٦٧٤٠ | ٥٠٥٥١ | ٪ ١٣,٣٤ |
| ١٩٢٩ | ٤٩٤٨ | ٥٣٤٧٤ | ٪ ٩,٢٥ |
| ١٩٣٠ | ٥٧٣٧ | ٥٢٤٢٤ | ٪ ١٠,٠٤ |

لە سایەی سەروەربوونی ئەم واقیعە (واتە بەربڵاوی نەخۆشییەکان و کەمیی خزمەتگوزارییە ساغڵەمییەکان)، جێی سەرسووڕمان نییە، کاتێك لە شاری کەرکوکدا بیرو باوەڕە پڕوپووچەکان بەنێو دانیشتووانەدا بڵاو بوونەتەوە. ڕەنگە نموونەی ئەم فاکتە لەنێوان دێڕی نووسینەکەی (سیسیل جۆن ئیدمۆندز) ئەفسەرو ڕاوێژکاری سیاسیی بەریتانی لە کەرکوك، ڕوون ببێتەوە ئەو کاتەی توانجی لە ڕێگە چارەی چاککردنەوەی هاری و مارانگازانی (تەریقەتی ڕفاعی) گرتووە، بەوەی گوایە ئەوان لە گیاندارێکی ناسروشتی (جەلجەلوت)، (لە فێڵەکانی خۆیاندا) یارمەتی وەردەگرن[١١]. شاعیری ناسراو (شێخ ڕەزای تاڵەبانی)، بە دێڕە شیعرێك لە میانەی شیعری (هێستری دیاری)دا جەخت لەم کەرامەتەی (شێخی ڕفاعی) کردووەتەوە:

"گەر قەڵەو بێ ئەم ئەجنە نێرە، لێرە چاری ناکرێ، مەگەر شێخی ڕفاعی عیلاجی کا بە ئیسمی جەلجەلوت"[١٢].

هەرچەندە هەندێکجار، پەنابردنە بەر دەرمانی خۆماڵی (میللی) چارەسەری هەندێك نەخۆشی کردووە، بەڵام هەرگیز لە بنبڕکردنی نەخۆشییەکان هاوشانی ڕێگەی نوێی زانستی نەبووە[١٣]. لە شاری کەرکوك ئەوەی گرفتاری نەخۆشییە دەروونی و دەمارییەکان دەبوو، سەردانێکی مەزاری (ئۆمەرمەندان)یان پێدەکرد. ئەوەی نەخۆشیی پێستی هەبووایە دەچووە زیارەتی (بابا گوڕگوڕ). بۆ ئەزۆکی ڕوویان لە (بابا گوڕگوڕ) و (شێخ جومجومە) و مەزاری (دانیاڵ) دەکرد.

ئەو نەخۆشییانەی سووکتر بوون، دەرمانی گیایی و ئاژەڵییان بۆ بەکاردەهێنا. دەرمانخانەکانی ئەو ڕۆژگارە بریتیبوون لە دوکانی عەتتارەکان. هەر نەخۆشییەکیش گیر بووایەو چارەسەری زەحمەت بووایە لای (شێخێکی پیر)! (واتە دوعاگیرو بە ناودەنگ) نوشتەو دوعایان بۆ دەکرد، ئەوەش باوەڕێکی بەهێز بوو لەنێو دانیشتووانی شارێك، کە پڕ بوو لە تەکییەو خانەقای هەمەچەشنە تەریقەت[١٤].

واقیعی تەندروستیی شاری کەرکوك، بە هاتنی ئینگلیزەکان هەرچەندە پێی نایە قۆناغێکی نوێوە، بەڵام هێشتا زۆر هەنگاوی گەورەی دەویست. لە دوای تەواوبوونی قۆناغی ئینتیدابی بەریتانی، ڕەوشی تەندروستی وردە وردە بەرەو باشتر چوو، بە تایبەت لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە، خەڵك زاناترو وشیارتر ببوون. بارودۆخی شار لە ڕووی نیشتەجێبوون و دابینکردنی ئاوی پاکەوە بە بۆری هەنگاوی لەسەرخۆی نابوو[١٥]. بەڵام نەبوون و کەمیی دامەزراوە تەندروستییەکان، وەك لە دواتردا باسی دەکەین، ڕۆڵی بەرچاویان لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکاندا بینیوە. لە ڕۆشنایی ئامارە فەرمییەکانی حکومەت ڕوون دەبێتەوە خەڵکێکی زۆر ساڵانە چارەسەرکراون.

**خشتەی ژمارە (٣)**

**نەخۆشە چارەسەرکراوەکانی کەرکوک لەنێوان ساڵانی (١٩٤٦-١٩٥٤)دا[١٦].**

| ناوچە | ١٩٤٦ | ١٩٤٨ | ١٩٤٩ | ١٩٥١ | ١٩٥٢ | ١٩٥٣ | ١٩٥٤ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کەرکوک | ٢٠٩٠٤٤ | ٢٠٢٢١٩ | ٢٠٦٥٥٦ | ٢٣١٠٣٤ | ٣٠٤٤٢٥ | ٢٢٢٢٢٢ | ٢٨٠١٩٤ |
| عێراق | ٥٤٠١٦٨٧ | ٥٦٥٦٤٧١ | ٥٨٧٦٣٣٦ | ٧٠٠١٤٦٢ | ٦٧١١٦٠٨ | ٦٩٥٧٥١٨ | ٩٨٥٠١٤٠ |

ئەم خشتەیە ئەوە دەردەخات کە تێکڕای ئەو نەخۆشانە لە دامودەزگا حکومییەکان لە کەرکوک چارەسەرکراون لەو ساڵانەدا گەیشتووەتە (٢٣٦٥٢٧) نەخۆش. بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە ساڵانە ژمارەیەک بەم ئەندازەیە لە کەرکوک سەردانی دامەزراوە تەندروستییەکان بکەن. چونکە زۆرێک لەو نەخۆشانە چەند جارێک دووچاری هەمان نەخۆشی بوونەتەوەو هەندێکیشیان زیاتر لە نەخۆشییەکیان هەبووە. بەوەش کۆی گشتیی ژمارەکە بەرزبووەتەوە.

لە لایەکی دیکە دەبێت تێبینی ئەوەش بکرێت کە ئەم ژمارانە، ئاماری راستەقینەی نەخۆشکەوتووەکان ناخەنەڕوو. لەبەر ئەوەی زۆرێک لە نەخۆشەکان، بەهۆی جۆربەجۆرەوە، سەردانی دامەزراوە تەندروستییەکانیان نەکردووە[١٧]. ئەگەر ساڵی (١٩٥١) وەک ناوەندی تێکڕای نەخۆشە چارەسەرکراوەکان وەربگرین، ڕوون دەبێتەوە ڕێژەی کەرکوک بریتی دەبێت لە (٣,٣٠٪) لە کۆی گشتیی نەخۆشە چارەسەرکراوەکانی عێراق لەو ساڵەدا.

هەرچی نەخۆشییە باوەکانی عێراق بوو لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە، بریتیبوون لە سێ پەتای بەربڵاو: (مەلاریا، تەراخوما، بەلهارزیا). بەڵام سەبارەت بە کەرکوک تەنها دوو نەخۆشی: (تەراخوماو مەلاریا)، گرفتی ڕاستەقینەی ژیانی تەندروستیی هاووڵاتیان بوو. بەپێی چەند کۆمەڵە ئامارێکی فەرمی لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٤ - ١٩٥٧)دا، ژمارەیەکی بەرچاو لە خەڵکانی کەرکوک دووچاری ئەم دوو نەخۆشییە بوونە، وەک لە خشتەی ژمارە (٤)دا خراوەتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (٤)**

**پۆلێنکردنی نەخۆشییە باوەکانی عێراق سەبارەت بە کەرکوک لە ساڵانی (١٩٤٤-١٩٥٤)دا[١٨].**

| ساڵ | نەخۆشی مەلاریا | نەخۆشی تەراخوما | نەخۆشی بەلهارزیا |
|---|---|---|---|
| ١٩٤٤ | ٩٣١٥ | ١٢٩١٦ | ١٤ |
| ١٩٤٦ | ٣٤٤٦٤ | ٣٧٨٧٥ | ٥ |
| ١٩٤٨ | ٢١٠٩٢ | ٢١٣٨٤ | ٢٧ |
| ١٩٥٠ | ٢٨٧٢٣ | ١٨٤٩٨ | ١٣ |
| ١٩٥٢ | ٢٣٧٨٦ | ٢٤٨٩٦ | ٣٠ |
| ١٩٥٤ | ١٧٣٧٠ | ١٧٣٢٧ | ٧ |
| ١٩٥٦ | ٣٧٨١ | ١٦١٦٠ | ٤٢ |
| ١٩٥٧ | ١١٥٠ | ١٣٧١٣ | ٢٩ |

لە خشتەی ژمارە (٤)دا تێبینی ئەوە دەکرێت نەخۆشیی (تەراخوما) بە شێوەیەکی گشتی بڵاوتر بووە لە نەخۆشیی (مەلاریا). هەروەها ئەوەش بە ڕوونی دەردەکەوێت نەخۆشییەکان لە ساڵی (١٩٥٢) بە دواوە بەرەو کەمبوونەوە دەچن و باری تەندروستی گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەمەش لە ئەنجامی باشبوونی بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی عێراق دێت بەهۆی چەند لایەنێکەوە:

(دامەزرانی ئەنجوومەنی ئاوەدانکاریی لە ساڵی (١٩٥٢)دا[١٩]، مۆرکردنی پەیماننامەی هەموارکردنی جیاووگەکانی نەوت (اتفاقیة تعدیل الامتیازات النفطیة) و دابەشکردنی وەك یەکی قازانجەکانی نەوت (١٩٥٢)، هەروا دامەزرانی وەزارەتی تەندروستی (١٩٥٢))[٢٠].

**٢. پزیشك و نەخۆشخانە و تیمارگەکان:**

خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان لە سەرەتای سەردەمی پاشایەتی لە بارێکی زۆر دواکەوتوو دابوو. لە ساڵی (١٩٢٣) لە سەرتاپای عێراق یەك پزیشك بۆ هەر (٢٨٠٠٠٠) کەس و یەك قەرەوێڵەی نەخۆشخانە بۆ هەر (٢٩٠٠) کەس هەبوو. ئەمە لە کاتێکدا بوو لە وڵاتانی وەك ئینگلتەرا و فەرەنسا هەر پزیشکێك بەر تەنها (١٥٠) کەس دەکەوت. واتە بەو مانایەی ژمارەی ئەو کەسانەی لە عێراق بەر یەك پزیشك دەکەوتن (١٩) جار هێندەی ژمارەی ئەو وڵاتانە زێتربووە[٢١]. سەبارەت بە شاری کەرکوك رەوشەکە زۆر لەوە خراپتر بوو. ساڵی (١٩١٩)، لە هەموو شاردا (١) دکتۆری خۆماڵی هەبوو بە ناوی (نووری ئەڵڵاوێردی)(*) کە لەو ساڵەدا پۆستی لێپرسراوی پزیشکیی شاری پێسپێردراوە[٢٢]. بۆیە بەریتانییەکان لە ساڵانی ئینتیدابدا، ناچاربوون دەستی هاوکاری بۆ لەبارکردنی رەوشی تەندروستیی ناوچەکان درێژ بکەن، پزیشکانی سەربازی و مەدەنی بەریتانی، تەنانەت ئەفسەرانیش بە سیفەتی کادری ئیداریی تەندروستی، لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی عێراقدا کەوتنە کار.

لە شاری کەرکوکیش بە هەمان شێوە چەند دکتۆرو ئەفسەرو دەرەجەدارێکی بەریتانی وەك کادری پزیشکیی لە ساڵانی ئینتیدابدا کاریان کرد[٢٣]. ئەم هەڵوێستەی کاربەدەستە بەریتانییەکان هەر بە تەنها لەپێناو راگرتنی ئاستی تەندروستییدا نەبوو تا نەخۆشییەکان بەنێو دانیشتوواندا بڵاونەبنەوە و نەگەنە هێزە سەربازییەکانیان، بەڵکو لەو روانگەیەشەوە بوو ئەوان درکیان بەوە کردبوو کە خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان کاریگەریی سیاسییان بەسەر خەڵکەوە هەیە و ئەوانیش لە کۆششدا بوون لەپای بەدەستهێنانی رەزامەندی خەڵك، بۆیە رێکخستنە تەندروستییەکان چاکترین ئامرازی پروپاگەندەبوو بۆ بەریتانیا[٢٤].

هێزە سەربازییەکانی بەریتانی هەر زوو بەر لە دەستپێکی سەردەمی پاشایەتی لە شاری کەرکوك، کۆتاییەکانی ساڵی (١٩١٨)، نەخۆشخانەیەکی سیڤیلی (٣٠) قەرەوێڵەییان کردەوە و دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانیشیان، لە کادری پزیشکی و داوودەرمان، گرتەئەستۆی خۆیان[٢٥].

لە سەرنجدانی واقیعی تەندروستی، دەردەکەوێت دوای تێپەرینی ماوەیەکی زۆر رەوشەکە هەر بە دواکەوتوویی ماوەتەوە. خزمەتگوزارییە تەندروستییە فەراهەمکراوەکانی دەسەڵاتداران بە بەراورد بە قەبارەی نەخۆشییەکان لە لایەك و لە لایەکی دیکە، کەمیی کادری پزیشکی لە چاو ژمارەی دانیشتووان نەدەگەیشتنەوە یەك و نێوانیان زۆر بوو[٢٦]. وێرای ئەوەی ژمارەی خزمەتگوزارییە پزیشکییەکان (دکتۆر، نەخۆشخانە، تیمارگە) ساڵ دوای ساڵ لە قۆناغی ئینتیداب لە زۆربووندا بوو، بەڵام ئەم زۆربوونە شتێکی بچووك بوو بە بەراورد بە پێویستیە پزیشکییەکانی ئەو ساڵانەی دانیشتووان.

لە شاری کەرکوك تا کۆتایی قۆناغی ئینتیداب لە هەر هەموو لیوای کەرکوکدا تەنها (١٦) بنکەی تەندروستی لە نەخۆشخانە و تیمارگە هەبوو[٢٧]. ئەمەش لە زۆر باردا بۆ پلانە نەگونجاوە تەندروستییەکانی حکومەت دەگەرایەوە.

لەگەڵ ئەوەی پارە تەرخانکراوەکانی تەندروستی و خزمەتگوزارییەکانی ساڵی (١٩٢١) گەیشتە (٥,٩٪) لە بوودجەی دەوڵەت، کەچی لە ساڵانی دواتر کەمکرایەوە، بەو رادەیەی لە ساڵی (١٩٢٥)دا بووە (٣,٨٪). بەڵام دواتر بەرزبۆوە بۆ (٥,١٧٪) لە بوودجەی دەوڵەت[٢٨]. وەنەبێت ساڵانی دواتر، ئەم رێژەیە، هەڵکشانی بەخۆوە دی بێت، کە زۆر پێویست بوو بە پێودانی پەرەسەندنی دیمۆگرافیا ئەویش پێ بە پێ بەرەو ژوور بچێت، کەچی ئەمە وا نەبوو. بەپێی چەند زانیارییەك، ساڵی (١٩٣٧)، خەرجییە تەرخانکراوەکانی تەندروستی، لە تێکرای بودجەی دەوڵەتی عێراق، تەنها بریتی بووە لە (٤,٤٪) ساڵی (١٩٤٦)، خەرجییە تەرخانکراوەکانی تەندروستی، بووەتە (٤,٦٪) لە بوودجەی دەوڵەت و کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتییش، ئاستی هەرە بەرزی لەم رووەوە دیوە، ئینجا گەیشتووەتە (٦,٥٪) لە تێکرای بوودجەی دەوڵەت، واتە بەو مانایەی پشکی هەر تاکێکی عێراقی لە بوودجەی گشتیی خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان لە ساڵی (١٩٣٧)دا، تەنها (١٤١) فلس و ساڵی (١٩٤٦)، تەنها (٢٢٥) فلس و ساڵی (١٩٥٧)یش تەنها (٧٣٦) فلس بووە[٢٩].

لە ناکامی ئەم پلانە چەوتانەی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراقەوە، نەخۆشخانەکان باریان زۆر پەرێشان بوو، تەنها بەناو نەخۆشخانە و تیمارگە و بنکەی گەرۆك بوون. (ئەورەحمانی میرزا عەبدوڵڵا) کە لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٢) دا کراوە بە بەرێوەبەری نەخۆشخانەی مەیدانی لە تیپی دووەمی سوپای عێراق، کە مەڵبەندەکەی لە شاری کەرکوك بوو، راشکاوانە، جەخت لەسەر ئەم فاکتە دەکاتەوە[٣٠]. تەنانەت ئەم راستییانە لە زۆرێك لە راپۆرتە بەرزکراوەکانی موتەسەریفیەتی لیوای کەرکوك بۆ وەزارەتی ناوخۆیش بە روونی دەردەکەوێت: کەمی کادرو خزمەتگوزاریی تەندروستی، نابەجێیی شوێنی مەڵبەندی تەندروستی، بێ سەروبەری بەرێوەچوونی کاروبارەکانی تەندروستی و زۆر لایەنی دیکە لەو دۆسیەیەی وەزارەتی ناوخۆدا زەق کراوەتەوە[٣١]. وێرای ئەو هەموو یادداشت و راپۆرتانە موتەسەریفیەتی کەرکوك، دەسەڵاتدارانی ئەو رۆژگارەی عێراق هەنگاوی جیدییان نەهاویشتووە. بۆیە تا پەنجاکانی سەدەی بیستەم ژمارەی پزیشکەکانی کەرکوك جێی ئومێدی دانیشتووانی شارەکە نەبووە. بروانە خشتەی ژمارە (٥).

**خشتەی ژمارە (٥)**

**ژمارەی پزیشکە تۆمارکراوەکان و مۆڵەتپێدراوەکانی لیوای کەرکوک**

**( ١٩٤٦-١٩٥٠ )[٣٢]**

| لایەنی پزیشکی | ١٩٤٦ | ١٩٤٧ | ١٩٤٨ | ١٩٤٩ | ١٩٥٠ |
|---|---|---|---|---|---|
| تەندروستی | ١١ | ١٢ | ١٢ | ١٦ | ٢١ |
| کۆمپانیای نەوت[*] | ١٦ | ٢١ | ٣١ | ٧ | ٤ |
| مەعاریف | ١ | ١ | ١ | ١ | ١ |
| بیانی | - | - | - | ٢٦ | ٢٢ |
| سوپا | ١٣ | ٧ | ٩ | ٨ | ٦ |
| کۆی گشتیی لیوا | ٤١ | ٤١ | ٥٣ | ٥٨ | ٥٤ |
| تێکرایان لە عێراق | ٦١٩ | ٦١٢ | ٦٨٤ | ٧٩٧ | ٨١١ |

ئەم خشتەیە، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە هەر یەکە لە کۆمپانیای نەوتی عێراق و تیپی دووی سوپای عێراق، کە بنکەکانیان شاری کەرکوک بوو، دەکەوتنە دەرەوەی دەسەڵاتی بەڕێوەبەرایەتی تەندروستیی عێراق، ساڵی (١٩٥٠)، لە ڕووی کادری پزیشکییەوە، پشکی شێریان بۆ خۆ پچڕیوە. کەچی ئەو پزیشکانەی لەسەر میلاکی فەرمانگەی تەندروستی بوون، ژمارەیان تەنها (٢١) پزیشك بووە. ژمارەی کادری پزیشکی لە کەرکوك، بەپێی لۆژیکی پەرەسەندن، لەبری ئەوەی ساڵ بە ساڵ ڕوو لە زیادبوون بچێت، کەچی بە پێچەوانەوە ساڵ دوای ساڵ لە کورتی داوە. بەپێی بڵاوکراوەی فەرمیی ئاماری ژیانیی و ساغڵەمی لە وەزارەتی تەندروستی بۆ ساڵی (١٩٥٨)، کۆی ژمارەی پزیشکانی لیوای کەرکوك، لە کۆی گشتیی پزیشکانی عێراق، کە لەو ساڵەدا ژمارەیان گەیشتووەتە (١١٩٢) پزیشك، تەنها بریتی بووە لە (٥٨) پزیشك! کە لەو ژمارەیەشدا، تەنها (٣٦) پزیشکیان سەر بە وەزارەتی تەندروستی بوونە[٣٣]. لە بەراوردکردنی ژمارەی ئەو دوکتۆرانە بە ژمارەی تێکرای دانیشتووانی لیواکە، ڕوون دەبێتەوە کە هەر دوکتۆرێك لەو (٥٨) دوکتۆرە، زیاتر لە شەست و حەوت هەزار تاکە کەسی بەردەکەوێت[٣٤]! خۆ ئەگەر بێت و سەرنجێکی وردتر بدرێتە ڕەوشی پزیشکایەتی کەرکوك، لە ڕووی ڕەگەزەوە، ئەوا زۆر ڕووتر ئاستی دواکەوتووی خزمەتگوزارییە تەندروستییەکانی لیواکە دەردەکەوێت. بە گوێرەی سەرچاوەیەك، ساڵی (١٩٥٤)، تەنها یەك پزیشکی ئافرەت بە ناوی (مارگرێت بەشیر ڕەسام)، لە شاری کەرکوکدا هەبووە[٣٥]. هەموو ئەو ڕاستیيانە، هۆیە سەرەکییەکانی ئەو بارودۆخە تەندروستییە دواکەوتووە دەردەخەن، کە لەو سەردەمەدا سەرومری وڵاتی گرتبۆوە. دیارە تەشەنەسەندنی نەخۆشیی هەمەچەشن، دەگمەنیی نەخۆشخانەو تیمارگا، کەمایەسیی لە چارەسەرو هەروا کەمیی کادری پزیشکی، ئاکام و هۆیەکی هەرە بنەرەتی ئەو بارە ناهەموارەی بارودۆخی ساغڵەمی بوون[٣٦].

سەبارەت بە بنکەکانی چارەسەریی نەخۆشییەکانی لیوای کەرکوك، لە (نەخۆشخانە، تیمارگا، تاقیگە، بنکەی تەندروستی گەڕۆك و.. هتد)، ئەوا هەرگیز بارودۆخیان لە ڕووی ژمارەوە، باشتر نەبوو. بەپێی کۆمەڵە ئاماری گشتیی ساڵانەی (١٩٤٩)، لە کۆی گشتیی نەخۆشخانەکانی سەرتاسەری عێراقدا، کە ژمارەیان گەیشتووەتە (٧٤) نەخۆشخانە، لەو ژمارەیە تەنیا چوار نەخۆشخانە لە لیوای کەرکوکدا هەبووە[٣٧]. ئەوەی سەرنج ڕاکێشترە، بە دانپێدانانی هەمان کۆمەڵە ئاماری فەرمییە، بەوەی لە کۆی گشتیی (٢٩٣) قەرەوێڵەی ئەو چوار نەخۆشخانەیە، تەنیا حەڤدە قەرەوێڵەیان لە جۆری نمرە یەك بوونە[٣٨].

ئەمواقیعە، کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتی، گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەردا نەهات. بە گوێرەی بڵاوکراوەی فەرمیی ئاماری ژیانیی و ساغڵەمی لە وەزارەتی تەندروستی، ساڵی (١٩٥٧)، ژمارەی نەخۆشخانەکانی لیوای کەرکوك، لە کۆی گشتیی نەخۆشخانەکانی عێراق، کە ژمارەیان لەو ساڵەدا گەیشتووەتە (١٠٣) نەخۆشخانە، تەنها شەش نەخۆشخانە بووە. جێی سەرنجە، بنکە تەندروستییەکانی دیکە، حاڵیان لەمیش خراپتر بوو، کە بەم شێوەیە بوون: (٣٦) تیمارگا، لە کۆی گشتیی (٤٨٧) تیمارگا لە عێراق. یەك دانە تیمارگەی گەڕۆك، لە کۆی گشتیی (٣٥) تیمارگای گەڕۆك لە عێراق. حەوت بنکەی تەندروستیی دەرەکی، لە کۆی گشتیی (١١١) بنکەی لەو شێوە لە عێراق[٣٩]. هەرچی دەرمانخانەو کۆگا پزیشکییەکانیش بوون لە لیوای کەرکوکدا، ئەوا بارودۆخیان لە لایەنەکانی دیکەی خزمەتگوزارییە ساغڵەمییەکان چێتر نەبوو.

بەپێی کۆمەڵە ئاماری گشتیی ساڵانەی (١٩٥١)، لە کۆی گشتیی (٨٣) دەرمانخانەی نەخۆشخانە حکومی و ئەهلییەکانی عێراق، تەنها پێنج دەرمانخانەو لە کۆی گشتیی (٣٩٤) دەرمانخانەی تیمارگا حکومییەکانیش، تەنها (٢٥) دەرمانخانە لە لیوای کەرکوك هەبووە. هەرچی کۆگا پزیشکییەکان بوو، ئەوا لە کۆی گشتیی (٨٣) کۆگای پزیشکی لە عێراق، تاکە کۆگایەك چییە لە لیوای کەرکوکدا نەبووە[٤٠].

دواجار ماوەتەوە ئاماژە بەوە بکەین لە نێو شاری کەرکوکدا، کۆمەڵێك ڕێکخراو و دامودەزگای خێرخوازیی دیکە هەبوون، کە گرنگییان بە ژیانی ساغڵەمی دەدا، لەوان بۆ نموونە: (ڕێکخراوی منداڵ پارێزی) لە سییەکان و (ڕێکخراوی خاچی سووری ئەرمەنی) لە چلەکاندا[٤١]. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی، ئەمانە قورسایی و ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نەبوو.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

1. Hashim Witry، Health Services in Iraq، Jerusalem، 1944، P.22.

وەرگیراوە لە: عماد احمد الجواهري، (تاريخ مشكلة الاراضي)، الصفحة (٣٨٠).

٢. بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: خليل علي مراد، (الاحوال الاجتماعية في العراق)، الصفحة (٥٦٤).

٣. بگەڕێوە بۆ تەوەری یەکەمی بەشی یەکەم.

٤. ڕاکێشانی ئاوی پاك بە بۆری لە سەرەتای سەدەی بیستەم تەنانەت لە بەغدادیش باو نەبووە. بڕوانە: البرت م. منتشاشفيلي، (العراق)، الصفحة (٧٩).

٥. (ئیدمۆندز) بەسەرهاتی کارەساتباو سەبارەت بە تێکەڵبوونی جۆگەلەی ئاوە پیسەکان بە ئاوە پاکەکان لە شاری کەرکوك دەگێڕێتەوە. بڕوانە:
C.J. Edmonds، Op.cit، P.286.(لە وەرگێڕانە کوردییەکەدا، لاپەڕە ٣٤٧)

6. Iraq Administration Reports (1914-1932)، Vol: (4)، 1919، P.407. (لە وەرگێڕانە کوردییەکەدا، لاپەڕە ١١٢-١١٣)

٧. دورين وارنير، المصدر السابق، الصفحة ٢٤٥.

8. Iraq Administration Reports (1914-1932)، Vol: (8)، 1925-1927، P.236.

9. Iraq Administration Reports (1914-1932)، Vol: (9)، 1928-1930، P.229.

10. Iraq Administration Reports (1914-1932)، Vol: (9)، 1928-1930، PP. 60، 235، 419.

11. C.J. Edmonds، Op.cit، P.293.(لە وەرگێڕانە کوردییەکەدا، لاپەڕە ٣٥٧)

١٢. ئەم دێرە شیعرە بە شێوەی جیاواز تۆمار کراوە، بڕوانە: موکەڕەم تاڵەبانی، (شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ژیانی، پەروەردەی، بیروباوەڕیو شیعری)، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، لاپەڕە ٢٧٧.

13. S.H. Longrigg، Iraq، Op.cit، P.383. (في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الثاني، الصفحة ٦٢٧).

١٤. بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: شاكر صابر ضابط، (كركوكده اجتماعى حيات)، الصفحة ٤٣-٤٥.

١٥. عبد المجيد فهمي حسن، المصدر السابق، الجزء الثاني، الصفحة ٧٩.

١٦. بڕوانە:
- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥١)، الصفحة ٦٠.
- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٤)، الصفحة ٢٨١.

١٧. بڕوانە: هاشم جواد، المصدر السابق، الصفحة ٨٩-٩٠.

١٨. بڕوانە:
- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٤٩)، الصفحة ٥٤-٥٥.
- الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٠)، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٢، الصفحة ٥٥-٥٦.
- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٤)، الصفحة ٢٧٥-٢٧٨.
- (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٧)، الصفحة ٣٢٩، ٣٣١.

١٩. دەربارەی ئەنجوومەنی ئاوەدانکاریی‌و بڕستی کارەکانی، بڕوانە: توماس بالوك، (سياسة الاعمار الاقتصادي في العراق)، (ترجمة: د.محمد سلمان حسن)، بغداد، ١٩٥٨، الفصل الثالث، الصفحة ٣٢-ومابعدها.

٢٠. (قانون احداث وزارة الصحة رقم (٢٨) لسنة ١٩٥٢)، جريدة (الوقائع العراقية)، العدد (٣٠٧٦)، بغداد، ٢٤ آذار ١٩٥٢.

٢١. احمد فكاك احمد حمد البدراني، (احوال العراق الاجتماعية بين الحربين العالميتين ١٩١٨-١٩٣٩)، اطروحة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية التربية بجامعة الموصل، ٢٠٠١، الصفحة ١٦٩.

(*) وەرگێڕی (ڕاپۆرتی کارگێڕیی دەڤەری کەرکوك ١٩١٩)، (سەربەست کەرکوکی)، پێی وایە ئەم دکتۆرە بە ڕەچەڵەك ئەرمەنییەو ساڵی (١٩٣٧) کۆچی دوایی کردووەو لە (گۆرستانی کڵێسە سوور) نێژراوە. بەڵام لە ناوەکەیەوە دیارە ئەرمەنی نییە. بڕوانە: سەربەست کەرکوکی، (ڕاپۆرتی کارگێڕیی دەڤەری کەرکوك ١٩١٩)، لاپەڕە ١١١.

22. Iraq Administration Reports (1914-1932)، Vol: (4)، 1919، P.407.(لە وەرگێڕانە کوردییەکەدا، لاپەڕە ١١١)

23.
- Iraq Administration Reports (1914-1932)، Vol: (4)، 1919، P.407(لە وەرگێڕانە کوردییەکەدا، لاپەڕە ١١١).
- C.J. Edmonds، Op.cit، P.286.(لە وەرگێڕانە کوردییەکەدا، ل٣٤٧)

٢٤. متي عقراوي، المصدر السابق، الجزء الاول، الصفحة ١٥٩.

25.
- Iraq Administration Reports (1914-1932)، Vol: (2)، 1918، P.435.
- Iraq Administration Reports (1914-1932)، Vol: (4)، 1919، P.407. (لە وەرگێڕانە کوردییەکەدا، لاپەڕە ١١٠)

٢٦. بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: رحيم عجينة، (الحالة الصحية في العراق)، مجلة (المثقف)، العدد (١)، بغداد، تشرين الاول ١٩٥٨، الصفحات ٧٠-٩٦.

٢٧. دنكور الياهو ودرويش محمود فهمي، المصدر السابق، الصفحة ٢٤٥.

٢٨. خليل علي مراد، (الاحوال الاجتماعية في العراق)، الصفحة ٥٦٤.

٢٩. موسيس ديرهاكوبيان، (حالة العراق الصحية في نصف قرن)، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨١، الصفحات ١٩٤، ٢١٦-٢١٧.

٣٠. ئەورەحمانی میرزا عبدالله، (میستەر چاپمان لە كەركوك)، گۆڤاری (رەنگین)، ژمارە (١١٥)، بەغداد، ١٤ی ئابی ١٩٩٨، لاپەرە ٩.

٣١. د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، ملفات ديوان وزارة الداخلية، رقم الملفة: ٦٧٧١/ ٣٢٠٥٠، العنوان: تقارير لواء كركوك، (١٩٣٩-١٩٥٥).

٣٢. (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٠)، الصفحة ٢٨.

(*) بەپێی قسەی (لۆنگریگ) بێت، نەخۆشخانەی كۆمپانیای نەوتی عێراق لە كەركوك یەكێك لە باشترین نەخۆشخانەكانی رۆژهەڵاتی ناوەراست بووە. ستيفن همسلي لونكريك و فرانك ستوكس، المصدر السابق، الصفحة ١٦٢.

٣٣. الجمهورية العراقية، وزارة الصحة، مديرية الإحصاء الحياتي و الصحي، (نشرة الإحصاء الحياتي و الصحي لسنة ١٩٥٨)، بغداد، ١٩٦٠، الصفحة ٦٧.

٣٤. تێكرای دانیشتووانی لیوای كەركوك، لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)دا، بریتی بوو لە (٣٨٨,٨٣٩) كەس.

٣٥. الهيئة التحررية، فعاليات النقابة: اجتماعات اللجنة العليا، مجلة (المهن الطبية)، العدد (٣)، المجلد (٢)، بغداد، ايلول ١٩٥٤، الصفحات ٢٢٠-٢٢٢.

٣٦. بۆ زانیاریی زیاتر، بروانە: موسيس ديرهاكوبيان، المصدر السابق، الصفحات ٢٠٣-٢٠٦.

٣٧. لە هەر هەموو قەزای كفری، كە ژمارەی دانیشتووانی بەپێی سەرژمێرییە فەرمییەكەی ساڵی (١٩٤٧)، خۆیدا لە (٤٣,٤٠٠) كەس، ساڵی (١٩٤٣)، یەك دانە تیمارگای هەبووە. ئەمەش بووەتە مایەی بە دەنگ هێنانی نوێنەرێكی بە پەرۆشی لیوای كەركوك لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقیدا. بروانە: م.م.ن، الدورة الانتخابية العاشرة، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٤٣، بغداد، ١٩٤٣، محضر الجلسة الخامسة والعشرين، الصفحة ٣٢١.

٣٨. (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٤٩)، الصفحة ٢٨.

٣٩. الجمهورية العراقية، وزارة الصحة، مديرية الإحصاء الحياتي و الصحي، (نشرة الإحصاء الحياتي و الصحي لسنة ١٩٥٧)، بغداد، ١٩٦٠، الصفحات ٥٢، ٦٣، ٦٨-٦٩.

٤٠. الحكومة العراقية، وزارة الاقتصاد، الدائرة الرئيسية للاحصاء، (المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥١)، بغداد، ١٩٥٤، الصفحة ٥٣.

٤١. بروانە:

- م.م.ن، الدورة الانتخابية التاسعة، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة ١٩٣٩، بغداد، ١٩٣٩، محضر الجلسة السادسة، الصفحة ٨٨.

- دیمانەیەك لەگەڵ ڤرێش نزارێت چەتاڵیان، بە مێژووی (٣١ی مایسی ٢٠٠٥)، كەركوك.

*** چالاکی نوێنەرانی کەرکوك دەربارەی خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان:**

**١- خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان:-**

پارێزگای کەرکوك لە بواری سازمانە تەندروستییەکاندا لاوازو نەدار بوو چونکە دەبینین تا ساڵی (١٩٤٠) ژمارەی سازمانە تەندروستییەکان بە هەموو بەشەکانیەوە نەگەیشتووە ئەو ژمارەی پێویستە بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بەردەوامی تەندروستی بۆ هاووڵاتیان.

ژمارەی خەستەخانەکانی دەرەوەی شارو سازمانە بەردەوامە تەندروستییەکان نۆزدە بوو، لە کاتێکدا لە پارێزگاکەدا تەنها (٣) بیمارستان دەبینرا[1]. و ئەمەیش لە رادەی پێویستدا نییەو داخوازییەکانی جێبەجێ ناکات، بۆیە نوێنەرەکانی کەرکوك کەوتنە هەوڵی داخوازی لە حکوومەتەکانی یەك بە دوای یەکی عێراقدا بۆ گرنگی پێدانی ئەم لایەنە لەبەر بایەخداربوونی جگە لە پیادەکردنی بە پەلەی پرۆژە تەندروستییەکانو دوانەکەوتنی حکوومەتەکان لە جێبەجێکردنیاندا حکوومەتی یاسین هاشمی (١٧) ئازاری ساڵی (١٩٣٥) ٢٩ تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٣٦) مەبلەغی پارەی بۆ دروستکردنی بیمارستانێك لە کەرکوکدا[2] تەرخانکردبوو، بەڵام کارە پێویستییەکان بۆ ئەنجامدانی بە هێواشی دەرۆیشتە رێگەوە ئەمەیشە نوێنەری کەرکوك فایەق تاڵەبانی هاندا کە داخوازی ئیستملاکی ئەو زەوییانەی کە کارێز لەژێریاندا نییە بکات، دوای ئەوەی وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی حەمدی پاچەچی هۆی ئەم کارەی شیکردەوەو خستیەروو[3].

حکوومەتی نوری سەعیدی یانزەهەم لە (١٥)ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٠ تا ١٠ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٢) لایەحەی یاسایی پشتڕاستکردنەوەی دووەم یاسای خزمەتگوزارییە تەندروستییەکانی ژمارە (٤٨) ساڵی (١٩٤٧) پێشکەش بە ئەنجوومەنی نوێنەران کرد، لایەحەکە لەلایەن چەند نوێنەرێکەوە تاوتوێ کرا، نوێنەری کەرکوك " علی خادم السجادە" پێشوازی لەم لایەحە کرد، چونکە خزمەتی پزیشکەکان دەکاتو خۆشگوزەرانیان بۆ دابین دەکات، هەروەها لە رەوشی هەندێ لە پزیشکەکان رەخنەی گرتو وتی: جگە لەمانە دەسکەوتی تر بەدەست دەهێنن، بۆیە تکامان وایە لێیان کە مرۆڤدۆست بن نەك مادیی‌و پارەپەرەست وەکو هەندێ لە پزیشکەکان کردویانەتە پیشەیان لە فڕاندنی پارەی نەخۆشەکانیان‌و گیرفان چۆڵکردنیاندا[4].

کاتی دەنگدان سەبارەت بە لایەحەکە دەستی پێکرد بە کۆی دەنگی نوێنەرانی ئامادە بوو کە ژمارەیان (٧٦) نوێنەر بوو کە لەنێوانیاندا شەش نوێنەری کەرکوك کە بریتی بوون لە: ئەحمەد یەعقوبیی‌و داود جافو عەبدوڵڵا سلێمان بەیاتیی‌و عەلی رەفیق (خادم السجادە)و عەبدولوەهاب تاڵەبانیی‌و ناجی هورمزی دەبینرانو ئەم نوێنەرانە کە بریتی بوون لە محەمەد نوعمان وەنداویی‌و ئەمین هەمەوەندی، لە دانیشتنەکەدا ئامادە نەبوون[5].

قەزای کفری بایەخێکی تایبەتی لەلایەن نوێنەری کفری سەر بە پارێزگای کەرکوك داود جافەوە پێدرا لە چەندین دانیشتنی ئەنجوومەنی نوێنەراندا جەختی لەسەر نەبوونی خزمەتگوزاری تەندروستی لە قەزاکەدا کرد، داخوازی دامەزراندنی چەند مستەوسەفێکی تەندروستی لە گوندەکانی ناحیەی شێروانەو پێبازداو بیمارستانێك لە کەلاردا کرد[6].

وا دیارە دووپاتکردنەوەی داخوازییەکانی ئەم نوێنەرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆیە کە داخوازییەکانی جێبەجێ نەکرا بوو، یا وەك لە پیادەکردنیدا کەم تەرخەمی دەبینرا.

حکوومەت کەوتە هەوڵی پیادەکردنی پێداویستییەکانی دروستکردنی بیمارستانێك لە کەلار[7].

نوێنەری کەرکوك سەلمان بەیات بایەخێکی تایبەتی بەنەخۆشیە درێژخایەن دابوو ئەوەبوو لە کاتی تاوتوێکردنی سکاڵای وەڵامدانەوەی وتاری پاشاییدا کە حکوومەتی عەبدولوەهاب مەرجان لە (١٥ی کانوون یەکەمی ساڵی ١٩٥٧- ١ ئەیاری ساڵی ١٩٥٨)دا ئامادەی کردبوو داخوازی بایەخدانو چاودێری نەخۆشەکانو بنەماڵەکانیان کە دووچاری نەخۆشی (سیل) بوون کردو هەندێ لە داهاتی بەنزینو پولی دارایی بۆ پێداویستییەکانی بنەماڵەکانی سیل دارەکان تەرخان بکرێت[8].

هیچ کاربەدەستێك سەبارەت بە وتارو داخوازی ئەم نوێنەرە وەڵامێکی نەدایەوە.

**٢- چالاکی نوێنەرانی کەرکوك دەربارەی فێرکردن.**

فێرکردن بایەخێکی یەکجار زۆری لەلایەن نوێنەرەکانی کەرکوکەوە پێدرا چونکە فێرکردن چی لەسەردەمی دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا[9]. یا لە سەردەمی داگیرکەرانی بەریتانیادا بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدرابوو بایەخدان بە فێرکردن لە دەرەوەی دەوڵەتی نیشتمانیدا خۆی نواندو لە سەردەمی حکوومەتەکەی ناجی شەوکەتدا (٣ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٢- ١٨ ئازاری ساڵی ١٩٣٣) گەیشتە پۆپەکەی.

بەرنامەی وەزارەتەکەی چاودێری فێرکردنی لەسەر بنەمای فراوانکردنی خوێندنی سەرەتایی‌و بەشێوەیەك لەگەڵ پێداویستییە ناوخۆییەکاندا زۆرتر سازگاربێت[10] بەخۆوەگرت.

هەروەها خوێندنی پیشەسازی بایەخێکی تایبەتی لە لایەن نوێنەرەکانی کەرکوکەوە پێدرا، چونکە ئەو قوتابخانەی پیشەسازییەی کەرکوکە، کە مێژووی دامەزراندنی بۆ سەردەمی عوسمانییەکان دەگەڕێتەوە پشتگوێ خرابوو‌و سوودی لێ وەرنەدەگیرا. سەبارەت بەمە نوێنەرەکانی کەرکوك کە بریتی بوون لە سەعید حاجی حوسێن‌و محەمەد رەفیق (خادم السجادە)و (نەشئەت ئیبراهیم) پێشنیازێکیان بە ئەنجوومەنی نوێنەران پێشکەش کرد چەند نوێنەرێکی پارێزگاکانی تریش بەشدارییان لە گەڵیاندا کردو لەو پێشنیازەدا هاتبوو، دروستکردنی قوتابخانەی پیشەسازی لە وڵاتدا دەبێتە هۆی پێشکەوتنی وڵاتو هەروەها کاروباری گشتی بەرەو گەشەکردن دەبات چونکە هۆیەکی سەربەخۆیە

بۆ بەردەوامی ژیانی لێکەوتوان و هەتیو و هەژاران.
لە سەردەمی حکوومەتی ئەماوی رابوردودا لە شاری کەرکوك قوتابخانەیەکی پیشەسازی دامەزرا کە حکوومەت بارودۆخێکی پێدرا، کە سەرچاوەیەکی داهات بوو لە سەردەمی داگیرکەراندا، وکوێ ئەدرایە بارودۆخەکەی تا گەیشتە حاڵەتێکی خراپ و ئەمیشە لەگەڵ نیازە سەرکیەکەدا ناگونجێت کە ئاوەدانکردنەوەی وڵات و خۆشگوزەرانی دانیشتووانەکەیەتی ئێمە بە گشتی پێشنیاز دەکەین کە وەزارەتی مەعارف ئەم قوتابخانەیە بە هەند وەربگرێت و بایەخێکی شایانی پێبدات[11].
ئەم پێشنیازە درایە لێژنەیەکی کاروباری مەعارف و ئەم ئەنجامەی لێکەوتەوە، کە قوتابخانەکە نەمێنێت و بەلاوە بنرێت چونکە توانای پێویست بۆ زیندوکردنەوەی لە ئارادا نییە (نەشئەت ئیبراهیم) نوێنەری کەرکوك بە هاوکاری نوێنەری مووسڵ (سەعید حاجی سابت)، سەبارەت بە بریاری لێژنەکە لاری خۆیان نیشانداو نەمان و بەلاوەنانی ئەم قوتابخانەیان بە ناراست و زیانبەخشیدا بە قەڵەم و قۆرخکردنی پیشەسازی لە بەغدادا نەگونجاوە، لە هەمان کاتدا سابت وتی:
ئەم کارە بە راست و سەرکەوتوو نایەتە بەرچاوم و هەریەکێك لەم دوانە پێشنیازێکیان بۆ چاکسازی ئەم قوتابخانەیە لە جیاتی بەلاوەنانیەوە پێشکەشکرد، کاتێ کە پێشنیازەکەی نەشئەت خرایە دەنگدانەوە چونکە هەردووکیان بۆ یەك مەبەست پێشنیازیان کردبوو ئەنجوومەن هەردوو پێشنیازەکەی بە زۆربەی دەنگ قبوول نەکرد[12].
هەروەها نوێنەری کەرکوك سلێمان فەتاح داخوازی کردنەوەی قوتابخانەکانی پیشەسازی کە سەرجەم پارێزگاکانی عێراقدا کرد چونکە نیازە لە بەغدادا قوتابخانەیەکی گەورەی پیشەسازی بکرێتەوە بۆ ئامادەکردنی قوتابیان بۆ ئەم قوتابخانەیەو لەبەر گرنگییە گەورەکەی لە لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوەو لەم بارەوە وتی: بەڵکو منداڵانی هەتیو و بێ باوك و دایك لێرەدا کۆبکرێنەوەو بحەوێنەوەو بژێوی ژیانیان دوای تەواوکردنی ئەم قوتابخانەیە دابین بکەن، فێرکاری پیشەسازی قوتابیانی کە ئەم قوتابخانەیان تەواوکردووە ئامادە دەکات کە هەلی کار بەدەستبێنن و بەم جۆرە باری میللەت سووك دەبێتەوە[13]. وا دیارە فێربوونی پیشەسازی هەندێ گرنگی پێدرابوو لە لایەن حکوومەتە بەدوای یەکتریدا هاتوەکانی عێراقەوە[14].
نوێنەری کەرکوك (نەشئەت ئیبراهیم) بایەخێکی تایبەتی بە فێربوون دەدا، زۆربەی لایەنەکانی خستنە نێو گفتوگۆو باسەوە، کاتێ کە قوتابییەکان خۆیان پیشاندانێکیان ئەنجامدا سەبارەت بە دۆسیەکەی "انیس النصولی" کە کتێبێکی بە نازناوی (دەوڵەتی ئەمەوی) لە وڵاتی شامدا بڵاوکردەوە نارەزایی و ئیعترازاتێکی زۆر لە بەغدا لێکەوتەوە و لە کاتی خۆیدا چەند بریارێك دەرچوو کە یەکێکیان دەرباری دەست لە کارکێشانەوەی (نسولی) و هەڤاڵەکانی بوو جگە لە دەرکردنی ژمارەیەك لەو قوتابیانەی کە خۆپیشاندانیان کردبوو و ئەم بریارەیان سەبارەت بە مامۆستاکان بە نارەوا ژماردو داکۆکی لەوە دەکات لە وڵاتدا ئازادی بیرو بۆچوون نییە[15].
نوێنەری کەرکوك (نەشئەت ئیبراهیم) ئۆباڵی ئەم رووداوانەی خستە ئەستۆی وەزارەتی مەعارف "معارف" ولەم رووەوە وتی: وەزارەت لە توانایدا بوو تەدبیری پێویست سەبارەت بە رێگرتن لەم خۆپیشاندانەیەی بکردایەو دەیتوانی رێگری لە روودانی ئەم دۆزەی بکردایە کە ئەنجامەکەی زیانێکی گەورە بوو کە لە رۆڵەکانی ئەم نیشتمانە کەوت و بیرو فکری خەڵکی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە[16].
بەڵام وەزیری مەعارف (عەبدولمەهدی ئەلمونتەفیکی) سەبارەت بەم دۆزە هیچی نەگوت و تەعلیقێکی نەدا[17].
(نەشئەت ئیبراهیم) نوێنەری کەرکوك داخوازی یەکسان کردنی جل و بەرگی قوتابیانی کرد و جل و بەرگێکی تایبەتی کە هێمایەکی تایبەت بە خۆیی هەبێت بە مەرجێك جل و بەرگەکە لە پارچەیەکی دروستکراوی نیشتمانی بێت[18].
لێرەدا بانگهێشتی نوێنەری کەرکوك لە لابردنی جیاوازی لە نێوان رۆڵەکانی میللەتداو پاڵپشتی پیشەسازییە نیشتمانییەکان و بەستنی هاووڵاتی بە وڵاتەکەیەوە بە روونی دەردەکەوێت لەبەر مەترسی نەخوێندەواری بەسەر کۆمەڵگاوە نوێنەری کەرکوك سلێمان فەتاح داخوازی فێرکردنی نەخوێندەوارەکان و پەرەپێدانی ئەم پرۆژەیەی کرد تا ئەو کاتەی یاسای فێرکردنی زۆرە ملێ (الالزامی)، پترکردنی ئەو پارەتییەی کە بۆ ئەم مەبەستەو ئامانجە تەرخانکراوە سەردەکەوێت و سەقامگیر دەبێت[19].
لە هەمان کاتدا نوێنەری کەرکوك (عەلی خادم ئەلسوجادە) سەبارەت بەو سەختی و دژوارییانەی کە رووبەرووی قوتابیانی سەرکەوتوو دەبێتەوە گفتوگۆی کرد، وتی: هۆدەی تر نادۆزنەوە بۆ ئەوەی بیکەنە جێگای خوێندن و فێربوون، قسەکەی واقیعیەتی خوێندن و پێداویستییەکانی لە عێراقدا دەخستەروو کە وتی: کەسانێ هەن کە داخوازی فێربوونی زۆرەملێ دەکەن لە قوتابخانە سەرەتایەکاندا فێربوون هەنووکە بەپێی ویستەو (ئەختیارییە) و قوتابی شوێنێك لە قوتابخانەیەکی نوێدا بە سەختی نەبێت، دەستی ناکەوێت پرسیار ئەوەیە بارودۆخ و چوونی لێدێت ئەگەر فێرکردنەکە بکرێتە زۆرەملێ..؟
داخوازی دابینکردنی پێداویستیەکانی رەحەتی و ئاسایشی مامۆستاکانی لە پاداشتی هەوڵ و تەقەلایانەوە کرد[20] و پێش ئەو سەبارەت بە خۆشگوزەرانی و ئاسایشی مامۆستاکان نوێنەری کەرکوك (سلێمان فەتاح) داخوازی کردبوو[21].
کاتی تاوتوکردنی وتەکانی عەرش کە حکوومەتی جەمیل مەدفەعی شەشەم (٢٩ کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٣ – ٥ ئەیاری ساڵی ١٩٥٣) ئامادەکاری کردبوو نوێنەری کەرکوك داود جاف داخوازی پەرە پێدانی فێرکردنی لە قەزای کفریدا لە رێگەی کردنەوەی قوتابخانەکانی سەرەتایی لە ژمارەیەك لە دێهاتەکانی ناحییەکانی پێبازو شێروانەدا کرد هەروا داخوازی قوتابخانەی گۆرانی ناوەندی کفری بەدواناوەندی کرد تا سەرجەم قوتابییەکانی قەزاکە بکرێتەبەر خوێندن هەروەها داخوازی دامەزراندنی قوتابخانەیەکی ناوەندی بۆ

کچان لە کفریدا کرد جگە لە مانە داخوازی قوتابخانەیەك گەڕۆکی کردبۆ فێرکردنی ڕۆڵەکانی عەشایرەکان وادیارە حکوومەت داخوازییەکانی ئەم نوێنەرەی خستبوە لاوە، بۆیە داخوازییەکانی لە دانشتنی ئەنجوومەنی گیردراوی (١٦ کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٤) دووپاتکردەوە، وەزیری مەعارف" عەبدولمەجید قەساب" وەڵامی دایەوە کە داخوازییەکانی نوێنەر بەهەند وەردەگیرێت سەبارەت بە کردنەوەی قوتابخانی داواناوەندی.

* سەرچاوەکان:-

١- الدورة الانتخابية التاسعة، الميزانية العامة لسنة (١٩٤٠) المالية، ص ٨٩.

٢- م. م. ن، الدورة الانتخابية السادسة، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة (١٩٣٥) الجلسة (٥) في ٢٤ اب (١٩٣٥)، ص ٤١.

٣- المصدر نفسه الدورة الانتخابية، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة (١٩٣٥) الجلسة (٥) في ٢٤ اب (١٩٣٥)، ص٤١.

٤- م. م. ن، الدورة الانتخابية الثامنة عشرة، الاجتماع الاعتيادي لسنة (١٩٥١) الجلسة (٣٦) في ٤ (١٩٥٢)، ص ٤٩٤.

٥- المصدر نفسه، ص ٤٩٩- ٥٠٠.

٦- المصدر نفسه، الدورة الانتخابية العاشرة، الاجتماع الاعتيادي لسنة (١٩٤٣) الجلسة (٢٥) في ١٧ ايار (١٩٤٤)، ص ٢٣١، المصدر نفسه، الدورة الانتخابية الثالثة عشرة، الاجتماع الاعتيادي لسنة (١٩٢٥) الجلسة (٥٠)، في ١٦ ايار (١٩٥١)، ص ٩٠٣.

٧- المصدر نفسه، الدورة الانتخابية الخامسة عشرة، الاجتماع الاعتيادي لسنة (١٩٥٥- ١٩٥٦)، الجلسة (١٤) في ١٩ كانون الثاني (١٩٥٦)، ص٢٦١.

٨- المصدر نفسه، ص٢٥٩.

٩- بۆ زانینی بارودۆخی فێرکردن لە سەردەمی عوسمانیەکاندا، ص ١٤٩.

١٠- جمال اسد مزعل: نظام التعليم في العراق مطبعة جامعة الموصل، ص ٦٤.

والی مەدحەت پاشا ساڵانی (١٨٩٦ - ١٨٧٢) ئەم قوتابخانەیەی لە ساڵی (١٨٧١) دامەزراند لە هەوڵدانێکدا بۆ گەشەسازی هەندێ لە پیشەسازییەکان و لە سەردەمی داگیرکەرانی بەریتانیادا (١٩١٤ - ١٩٢٠) بەرەو نەمان و دارمان ملی ناو بایەخنەدانی گەیشتە ڕادەیەك کە هیچ شتێك سەبارەت بەم قوتابخانەیە لە سەردەمی پاشاییدا نەدەبیسرا دوایی بەلاوە نرا، بەڵام ساڵی (١٩٤٥- ١٩٤٦) دووبارە کرایەوەو جێگەی خۆی لەو مێژووە لەنێوان قوتابخانە پیشەسازییەکانی عێراقدا کردەوە.

١١- نوێنەرەکانی تر بریتی بوون لە هبة الله مفتي واسحاق افرايمء نوري البريفكاني وحازم شمدين ئاغا الموصل وميرزا فرج زكي ومحمد صالح سليمان وعبدالله مخلص واسماعيل رواندوزي اربيل والياس النقيب ديالي. انظر: الدورة الانتخابية الاولى، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة (١٩٢٥) الجلسة (٢٣)، في (١٥ ايلول ١٩٢٥)، جريدة الوقائع العراقية العدد (٣٤) في ٢٤ ايلول (١٩٢٥).

١٢- م. م. ن، الدورة الانتخابية الاولى، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة (١٩٢٥) الجلسة (٢٣) في ٥ ايلول (١٩٢٥). جريدة الوقائع العراقية، العدد (٣٧٢)، في ٢٣ تشرين الاول (١٩٢٥).

١٣- الدورة الانتخابية السادسة، الاجتماع الاعتيادي لسنة (١٩٣٥) الجلسة (٣٧)، في ٢٧ شباط (١٩٣٦)، ص ٦٣٦.

١٤- الراوي واخرون، المصدر السابق، ص ٤٥- ٤٦.

ئەنيس نسۆلی"انيس النصولی" مامۆستايەك بوو كە حكوومەتی عێراق لەگەڵ چەند مامۆستايەكی تردا لە سورياوە بۆ وانەوتنەوە لە عێراق بە گرێبەست بانگهێشتی كردبوون.

١٥- احمد، تطور التعليم، ص (٢٨٢- ٢٨٣).

١٦- م. م. ن، الدورة الانتخابية الاولى، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة (١٩٢٧)، الجلسة (١١) في ١٦ ايار (١٩٢٧)، ص ١٠٤٦.

١٧- المصدر نفسه، الجلسة (١٢) في ١٧ ايار (١٩٢٧)، ص ١٠٥٥.

١٨- المصدر نفسه، الجلسة (١١) في ١٦ ايار (١٩٢٧)، ص ١٠٤٦ - ١٠٤٧.

ئەوە شايانی باسە ياسای فێركردنی زۆرەملێ و لەنێوبردنی نەخوێندەواری پيادەنەكرا لە سەردەمی حكومەتی شۆڕشدا لە ساڵی (١٩٧٩). مزعل، سەرچاوەی پێشوو، ص ١٠٨.

١٩- م. م. ن، الدورة الانتخابية السادسة، الاجتماع الاعتيادي لسنة (١٩٣٥) الجلسة (١٤) في ٣١ كانون الاول (١٩٣٥)، ص ١٩٢.

٢٠- المصدر نفسه، الدورة الانتخابية الثانية عشرة، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة (١٩٤٨)، الجلسة (٢٤) في ١٨ تشرين الثاني (١٩٤٨)، ص ٣٠٣.

٢١- المصدر نفسه، الدورة الانتخابية العاشرة، الاجتماع الاعتيادي لسنة (١٩٤٥) الجلسة (١٤) في كانون الثاني (١٩٤٦)، ص ١٢٤.

*** پێشکەوتنی کارگێڕی پزیشکی لە لیوای کەرکوك:**

زاهیر شوکر
سمکۆ بەهرۆز
فەرهاد عەبدولعەزیز
حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ

"دوای ئەوەی عێراق لە رووی کارگێڕییەوە دابەشکرایە سەر (١٤) لیوا بۆیە سەرۆکی پزیشکی بەرپرس بوو لەسەر لیواکەی لە بواری خزمەتکردنە تەندروستییەکان، بۆیە هەر یەکە لە (دکتۆر فەتحوڵلا)و (دکتۆر عیسا نووری) لە بواری تەندروستیدا دامەزران، ئەوەی دووەم یەکەم پزیشك بووە کە کاروباری کارگێڕی تەندروستی لیواکەی وەرگرتووەو یەکەم نەخۆشخانە لە سەردەمی پاشایەتیدا کرایەوە بە ناوی (مستشفی کرکوك الملکي)، کە لە بەردو گەچ دروستکرابوو لە شوێنی قوتابخانەی دواناوەندی (الصنائع) بەرامبەر قاوەخانەی (مەجیدیە)،

ئەم نەخۆشخانەیە لە دوو نهۆم پێك هاتبوو، نهۆمی ژێرەوەی بەلای دەستە راستدا هۆڵی نەشتەرگەری بوو لە بەرامبەریشدا هۆڵی توێکاری‌و برینپێچی بوو، لەلای دەستە چەپیشەوە هۆڵی کارگێڕی‌و بەڕێوەبەری بوو لە هەمان کاتدا شوێنی سەرۆکایەتی تەندروستی کەرکوك بوو کە یەکەم شوێنی فەرمانگەی تەندروستی کەرکوك بوو، هەروەها هۆڵی نەخۆشییەکانی هەناو تێکەڵا بوو کە نۆرینگەی دەرەوە لێی جیا دەکرایەوە لە یەکەی دەرمان کە لە تەنیشیتدا ژووی برینپێچی‌و چارەسەر بووە، بەڵام نهۆمی دووەم بەجێهێڵدرابوو وەکو کۆگا"[1].

"لە ساڵی (١٩٢٩)دا بەشێکیان لە فەرمانگەی گومرگی کەرکوك دابڕی کە هاوپەیوەست بوو بە نەخۆشخانەی کەرکوکەوەو خستیانە سەر نەخۆشخانەکە بۆ ئەوەی فراوان بێت، بۆیە هەر یەکە لە دکتۆرو دکتۆری سەیدەلی گوازرانەوە بۆ شوێنە تازەکەیان، بەڵام بەشە کۆنەکەی مایەوە وەکو هۆڵی نەخۆشەکان، دوای ماوەیەکی تر گەلێك گۆڕانکاریان تێدا کرد تاوەکو ئەوەی شێوەی نەخۆشخانەیەکی گشتگیری وەرگرت"[2].

"لە رۆژی (٢٨)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٢٩)دا دکتۆر (فایق شاکر) کە سەرۆکی تەندروستی لیوای موسڵ بوو کرا بە موتەسەریفی لیوای کەرکوك، لە ساڵی (١٩٤٢) دەست کرا بە کارکردن بۆ بنیاتنانی نەخۆشخانەی (الجمهوري) لە شەقامی (سەرای) کە لە ساڵی (١٩٣٩) ناوەکەی گۆڕا بۆ شەقامی (غازی).

"بەڵام کۆنترین لەو دکتۆرانە کە لە چلەکانی سەدەی رابردوودا کاریان کردووە لە کەرکوك بریتییە لە (دکتۆر عەبدوڵلا بەرسوم) کە لە دواییدا بوو بە سەرۆکی تەندروستی کەرکوك، (دکتۆر عومەر ئەلئەستەوانی)، (دکتۆر ماك داول)"[3].

بەڵام لەگەڵ گۆڕانکاری ئەو پێشکەوتنانەی کە بەسەر دەزگاکانی تەندروستیدا هات دەوری بینی لە پێشکەوتنی بوارەکانی تەندروستی لە کەرکوك، بەڵکو تەنها لەنێو شاری کەرکوکدا نەگیرسایەوە، بۆیە لە هەموو گوندو ناحییەو قەزاکانی دەوروبەری بەپێی پێویست خزمەتی بۆ کراوەو لە هەندێ شوێندا نۆرینی گەرۆك لە گوندو ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوکدا کارگوزاریی تەندروستییان پێشکەش کردووە.

*** یەکە کارگێڕییەکانی تەندروستی پارێزگای کەرکوك لە ساڵی (١٩٤٧)دا:**

"یەکە کارگێڕی‌و دەستەکانی تەندروستی لە پارێزگای کەرکوك پێکهاتبوو لە:

*** ژمارەی دکتۆرەکان:**

لە کەرکوك بریتی بوو لە (٨) دکتۆر، کە شەشیان عێراقی بوون‌و دووانیان بە رەچەڵەك میسری بوون:

١. دکتۆر بەشیر سەرسەم، سەرۆکی تەندروستی کەرکوك.
٢. دکتۆر بۆل مەلیك.
٣. دکتۆر جەمیل ئیحسان.
٤. دکتۆر گۆرگین بابازیان.
٥. دکتۆر جەمیل جومعە، دکتۆری منداڵان.
٦. دکتۆر فەوزی ئەمین، دکتۆری چاو، بە رەچەڵەك میسری.
٧. دکتۆر نەجیب عەبدولنور، بە رەچەڵەك میسری.
٨. دکتۆر یونس نادی عەبدوڵلا.

*** نەخۆشخانەکان:**

١. نەخۆشخانەی (کەرکوکی پاشایەتی) – مستشفی (کرکوك الملکي).
٢. نەخۆشخانەی (العزل).

*** بنکەی تەندروستی:**

١. بنکەی تەندروستی شاری کەرکوك:
- بنکەی تەندروستی منداڵان.
- بنکەی تەندروستی بۆ پیاو.
- بنکەی تەندروستی بۆ ئافرەت.
- بنکەی تەندروستی چاو و لووت‌و قوڕگ.

٢. بنکەکانی تەندروستی قەزای داقوق:
- بنکەی تەندروستی داقوق.
- بنکەی تەندروستی قادر کەرەم.
- بنکەی تەندروستی تۆپزاوە.
- بنکەی تەندروستی خورماتوو.

٣. بنکەکانی تەندروستی قەزای کفری:
- بنکەی تەندروستی کفری.
- بنکەی تەندروستی قەڵا.
- بنکەی تەندروستی قەرەتەپە.
- بنکەی تەندروستی کەلار.

- بنکەی تەندروستی پێباز.
- بنکەی تەندروستی کولەجۆ.
٤. بنکەکانی تەندروستی قەزای چەمچەماڵ:
- بنکەی تەندروستی چەمچەماڵ.
- بنکەی تەندروستی ئاغجەلەر.
- بنکەی تەندروستی سەنگاو.

٥. بنکەکانی تەندروستی ناوەندی قەزای کەرکوك:
- بنکەی تەندروستی ئاڵتون کۆپری.
- بنکەی تەندروستی شوان.
- بنکەی تەندروستی لەیلان.
- بنکەی تەندروستی مەلحە.
- بنکەی تەندروستی تازە خورماتوو.

لە هەمان ساڵدا ژمارەی کارمەندانی تەندروستی بە هەموو بەشەکانییەوە بەم شێوەیە بووە:
١. پەرستار (٨) کەس، کە سەرۆکی پەرستاران بە ڕەچەڵەك بەریتانی بوو.
٢. مامان (٣) کەس.
٣. برینپێچ (٨) کەس.
٤. دەرزی لێدەر (١) کەس.
٥. پشکێنەر (٨) کەس.
٦. ووردبینی مەلاریا (٥) کەس.
٧. کرێکاری مەلاریا (٣٠) کەس.
٨. فەرمانبەری تەندروستی (٨) کەس"[٤].

*** بنکەی تەندروستی کەلار:**

بەپێی گێڕانەوەی هەندێ لە دانیشتووانی کەلار، بنکەی تەندروستی لە ساڵی ١٩٣٧ دامەزراوە. محەمەدی مەلا مستەفا دەڵێ: لەوانەیە لە سەردەمی مەلیك غازی یان لەدوا ساڵەکانی حکومی مەلیك فەیسەڵی یەکەمدا دامەزرابێت. بینای ئەو بنکەیە بە بەردو گەچ و شێلمان لەسەر شێوازی بیناسازیی ئەودەمەی بنکە تەندروستییەکان دروستکراوە. هۆڵێکی لاکێشەیی گەورە کە دەرگای ژوورەکانی بەسەردا دەکرانەوە. بەشێکی بۆ چارەسەری نەخۆش و دەرمان وەرگرتن و بەشێکیشی وەکو کۆگا بۆ هەڵگرتنی دەرمان. ژوورەکان لە پێویستیی بنکەکە زیاتر بوون. ئەو برینپێچانەی پێیان دەگوتن (دوختۆر) خێزاندارو لە بەشی باکووری بیناکەدا نیشتەجێ دەبوون و بە پەردەیەك ماڵی دکتۆرو جێگای سەردانی نەخۆش لەیەك جیا دەکرانەوە. لە برینپێچ و پزیشکە ناسراوەکانی ئەو سەردەمە (عەبدورکازم، فیکتۆر، هەمزە، سەڵاح، بەهجەت ئەفەندی و ئەحمەد ئەفەندی) و کەسانی تر، ئەم بنکەیە دەرمان و دەرزی بەخۆرایی دەدایە نەخۆش. نەشتەرگەری تیا ئەنجام نەدەدرا. بیناو بنکەی تەندروستی کەلار تا ئەمڕۆش (٢٠١٢) لە جێگەی خۆیدایەو کارایە[٥].

*** بارودۆخی تەندروستی ناوچەی چەمچەماڵ:**

بەحوکمی ئەوەی کەچارەسەری پزیشکی زۆر درەنگ گەیشتووەتە کوردستان بە گشتی و ناوچەی چەمچەماڵ بەتایبەتی، ناچار خەڵکی هەر لەسەر هەمان ڕێبازی سەردەمی کۆنی باوباپیرانی خۆیان بەرێوەچوون، بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانیان پەنایان بۆ دەرمانی کوردەواری و، پزیشکی میللی و، نوشتەی مەلاو شێخ و گۆری پیاوچاك و پیرەکان بردووە. بەجۆرێك بۆ هەر جۆرە نەخۆشییەك، یەکێك لەمانەیان بە چارەسەر زانیوە.

پزیشکی میللی، لەبیست و سییەکانی سەدەی بیستەم دا، لە ناوچەکەدا بەشێوەیەکی زۆر بەربڵاوبوونیان هەبووە بە هەموو جۆرەکانییەوە، هەر لە (بۆنچی)یەوە بیگرە، تا دەگاتە (جەڕڕاح، مامان، خەتەنەکار، دانسازو، . ... تاد). لە چەمچەماڵ، حاجی هەندی و، دایە زەکیە، سەید عەلی)، پزیشکی میللی بوون و دەرمانی کوردەوارییان لەلا دەستکەوتووە. (خانم خەلیفە مەحموود، ئامینەی کەریم بالە (مامان)، حەمە ئەمین فرەنتۆ، ڕەشیدی کوری، حاجی ڕەمەزان کافرۆشی (جەڕڕاحی میللی)، وەستا مەردان کە (خەتەنەکار) بووە[٦].

پزیشکە میللییەکان، بۆ چارەسەری نەخۆشەکان گژوگیای کوردەواری و چارەسەری میللییان بەکارهێناوە، هەرچەندە ئەو شێوازانەی کە لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکاندا گرتوویانەتەبەر، شێوازی کۆن و دواکەوتوو بوون، بەڵام بۆ سەردەمی خۆی کە خزمەتگوزاری تەندروستی لە ناوچەکەدا دەست نەکەوتووە، کەم تا زۆر خزمەتیان بە بواری پزیشکی کردووە. ئەوەی جێگەی هەڵوەستەکردن و سەرنج دانە لێرەدا ئەوەیە کە ئەو پزیشکە میللییانە چارەسەری هەموو جۆرە نەخۆشییەکیان لەلا نەبووەو لە بەرامبەر هەندێ نەخۆشیدا، دەستەوەستان ماونەتەوە. خەڵکەکەش ناچار پەنایان بۆ لێکدانەوەو بیروباوەری پڕوپووچ بردووەو ویستوویانە لەو ڕێگەیەوە ئارامی بە ڕۆحی خۆیان ببەخشن. بۆ نموونە بۆ نەخۆشی گزاز (شەوە)، جۆرە لێکدانەوەیەکیان دارشتووە. کە گوایە هۆی مردنی منال لە ڕۆژەکانی سەرەتای تەمەنیدا، ئەوەیە کە دێوو جنۆکە کەناویان لێناوە (شەوە)، خۆیان لە مەلۆتکەکان نزیك دەخەنەوەو دەیانخنکێنن چارەسەری ئەم حاڵەتەشیان بەوە کردووە کە مناڵە تازە لەدایکبووەکانیان بەتایبەت لە شەواندا بەتەنها بە جێ نەهێشتووە، بۆیە زۆر لە ماڵەکان ئەگەر منداڵێکیان بووبێت، بە تایبەت مناڵەکە (کوڕ) بووبێت، بۆ ماوەی حەوت شەوی تەواو ئێشکیان گرتووەو دانیشتوون بەدیارییەوە. لەو شەوانەدا کوروکاڵ و پیاوانی ئاوایی لە دوای نوێژی شێوان لە دەوری مەلۆتکەکە کۆبوونەتەوەو، ئەو شەوەیان بە قسەی خۆش و مەتەڵ و یاری جۆراوجۆرو شەوچەرەوە ڕۆژ کردووەتەوە[٧].

زۆری دەردو پەتاو نەخۆشی لە کوردستاندا بە گشتی و لەم مەڵبەندەدا بە تایبەتی، سەرباری کەمی خزمەتگوزاری تەندروستی، هۆکارەکەی بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ بایەخ

نەدانی خەڵکی بەباری تەندروستی خۆیان‌و، هەژاری گەڕاوەتەوە. لە ماڵی گوندییەکاندا مەگەر بەدەگمەن ئەگینا سەراو (ئاودەست)بوونی نەبووە، خەڵکی لە قەراخی هەمان ئەو چەم‌و کانیاوانە خۆیان بەتاڵکردووەتەوە کە ئاوەکەیان ئەگەر بۆ خواردنەوەش بە کاریان نەهێنا بێت، بەلایەنی کەمەوە بۆ پاککردنەوەی جلوبەرگ‌و ئەو قاپ‌و قاچاخانە بەکارهێناوە کە ژەمەکانی ڕۆژانەیان تیایان دا خواردووەو خواردۆتەوە. نەبوونی سابوون‌و هیچ هۆکارێکی تری پاکژکردنەوە نەك لە گوندەکاندا بە تەنها، بەڵکو تەنانەت لەناو شارەکانی ئەم مەڵبەندەشدا، خەڵکەکەی ناچار کردووە لەبری ئەوانە پەنا بۆ سروشت‌و دەوروبەری خۆیان بەرن، بۆ نموونە ئافرەتان لە پاککردنەوەی قژی سەریاندا جۆرە گڵێکیان بەکارهێناوە کە (گڵەسەر)یان پێ گوتووە. هەروەها گیای (ئەسپون)، کە جۆرە گیایەك بووە لەناو ئاودا کەڤ کردووە، بۆ خۆشوشتن بەکارهاتووە. لە شوشتنی جلوبەرگەکانیشیاندا (گلاکوتك)یان بەکارهێناوە[٨]، هەروەها لەبەر نەبوونی (گەرماو) لە ماڵەکانیانداو هەم لەبەر ئەوەی کەکێشانی ئاو بۆ ناو ماڵەکان کارێکی گران بووە، ژنان‌و پیاوان لە سەر چەم‌و کانیاوەکانی نزیك بە گوندەکانیان خۆیان شوشتووە[٩]. ئەم خۆشوشتنە کە (کولکانی) پێ ووتراوە، وەك پێویست نەبووەتە هۆی پاکبوونەوەی لەشیان. چونکە لەبەر سەرمای ئەو شوێنەو نەبوونی هۆکاری پاکژکردنەوەی پێویست، هەروەها بە هۆی کەمی دووبارە بوونەوەی خۆشتنەوە، بە تایبەت بە هۆی هاتنی وەرزی سەرماوە کە وایکردووە زۆر جار نێوان دوو کولکانی زیاتر لە مانگێکی پێ بچێت. ئەنجام بووەتە هۆی بڵاوبوونەوەی کێچ‌و ئەسپێ، زۆر بە بەربڵاوی لە لەشی مرۆڤەکانی ئەم ناوچەیەدا[١٠]. کێچ‌و ئەسپێ[١١]، بەدەر لەوەی بۆ لەش مایەی بێزاری بوونە، هۆکارێکیش بوون بۆ گواستنەوەی چەندین جۆر لە نەخۆشی لەنێوان مرۆڤەکاندا[١٢].

ئەو شێوازەی کە خانووی کوردەواری لەسەر دروستکراوە بە تایبەت لە گوندەکاندا، هۆکارێکی تری بڵاوبوونەوەی چەندین نەخۆشی بووە لە ناو خەڵکەکەیدا، چونکە شێوازی دروستکردنی ئەو خانووانە بەشێوەیەك بووە، کە هیچ مەرجێکی تەندروستییان تێدا نەبووە، چونکە خانووەکان بە گشتی لە چەند ژوورێکی تەنگەبەرو تاریك پێکهاتبوون، کە مرۆڤ و ئاژەڵەکانیان بە هاوبەشی تیایاندا ژیاون. ژیانی ئاژەڵ لەنێو ماڵەکانیاندا، دەتوانین بە خراپترین نەریتی کوردانی لە قەڵەم بدەین، کە ئاکامی خراپی لەسەر لەش ساغیان بە جێهێشتووە[١٣].

ئەم خانووانە تاك‌و تەرایان نەبێت، تێکرا گشتییان نزم‌و بێ پەنجەرە بوون، لە کلاو ڕۆژنەو دەرگاوە نەبێت، لە هیچ جێگەیەکی ترەوە، ڕێی هاتنە ژوورەوەی (خۆرو هەوا)یان نەبووە[١٤]. لەناو ژووری دانیشتنەکانی ئەم خانووانەشدا، ئاگردانێك هەبووە کە بۆ خۆ گەرم کردنەوە لە وەرزی زستاندا دانراوەو داری تێدا سووتێنراوە، ژوورەکەی پڕ کردووە لە دووکەڵی‌و ڕەشایی، کەجگە لە کلاوڕۆژنە بچووکەکان نەبێت، جێیەکی تر نەبووە بۆ دەرچوونی ئەو هەموو دووکەڵەی کەئەو ئاگرە درووستی کردووە[١٥]. ئەمەش وایکردووە کەژوورەکانیان هەمیشە ڕەش‌و چڵکن‌و پڕ لە دووکەڵ‌و بۆنی دووکەڵ بن‌و، ببنە مایەی چەندین نەخۆشی بۆ سییەکان‌و چاوەکانیان[١٦].

ناو حەوشەکانیشیان ئەگەرچی کەمێك خاوێن بووە، بەڵام دەرەوەی ماڵ‌و کۆڵانەکانیان تەسك‌و پڕ لەزبڵ‌و پاشماوەی ئاژەڵ بووە، کەبووەتە شوێنێکی گونجاو بۆ کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر لەمێش‌و مەگەز[١٧]. بەجۆرێك پاش گەرم بوون‌و گۆڕانکاری کەشی ناوچەکە بەلای گەرمیدا، کەشێکی لە باریان تێدا سازبووە بۆ بڵاوبوونەوەی مێش‌و مەگەزو بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە رزوتاو مەلاریاو چەندین نەخۆشی تری جۆراوجۆر[١٨] بەپێی یەك لەبەڵگەنامەکان (لە ١٠٠٪ی دانیشتووانی گوندەکانی کەرکوك‌و دەوروبەری، نەخۆشی مەلاریایان تێدا بڵاوبووەو مێشوولەی (ئەنۆفیلس – anopheles) لە سەرتاسەری دەڤەرەکەدا بوونی هەبووە)[١٩]. ئەم بارەش گوندییەکانی ناچارکردووە، کەلەتاو مێش‌و مەگەزو کێچ‌و ئەسپێ لەگەڵ هاتنی وەرزی بەهاردا خانووەکانی خۆیان بەجێبهێڵن‌و لە دەرەوەی گوندەکەو لە قەراغ زەوی‌و زارەکانیان، لەژێر ڕەشماڵ‌و کەپرو ساباتدا تاکو هاتنی وەرزی پاییز ژیان بەسەربەرن[٢٠].

لە کاتێکدا کە ڕەوشی تەندروستی خەڵك لەو بارە خراپ‌و ناهەموارەدا بووە، کەچی کاربەدەستانی عوسمانی بەهەمان شێوەی ناوچەکانی تری کوردستان، بەهیچ شێوەیەك ئاوریان لە خەڵکی ئەم ناوچەیەش نەداوەتەوەو خزمەتگوزاری تەندروستیان پێ نەگەیاندوون. بەجۆرێك تا ئەوکاتەی کە ئینگلیزەکان ناوچەکەیان داگیرکردووە، تەنها یەك بنکەی تەندروستیش لە سەرانسەری ناوچەی چەمچەماڵدا بوونی نەبووە. بۆ یەکەمجار بنکەی تەندروستی لە ناوەندی قەزای چەمچەماڵ‌و ناحییەکانیدا، ئەو دەمە دامەزراوە کە دەستی ئینگلیزەکان گەیشتووەتە ناوچەکەوە داگیریانکردووە لە ساڵی (١٩١٨)ی زاینیدا. چونکە ئەفسەرو کاربەدەستە ئینگلیزەکان، هەر زوو هەستیان بەکەمی خزمەتگوزاری تەندروستی‌و گرنگی بایەخدان بەو لایەنە کردووە. ئەوەتا ئەفسەرێکی وەکو (ئەدمۆندن)، پێویستی ئەوەی نیشانداوە کە ئینگلیزەکان کاتێك داوای باج دەکەن، دەبێ لەبەرامبەردا بەلایەنی کەمەوە جیا لە دانانی پێگەی پۆلیس‌و یاسای سزادان، بەشێك لە ئەرکی کۆمەڵایەتی لە ئەستۆ بگرن‌و هیچ نەبێت چەند ناوەندێکی تەندروستی لە ناوچەکەدا دابمەزرێنن[٢١].

ئەو بنکە تەندروستییانەی کە ئینگلیزەکان دایان مەزراندووە، گەر لە سەرەتاوە، مەبەست لێیان چارەسەری سەربازەکانی خۆیان بووبێت[٢٢]، لە هەمانکاتدا خەڵکی ئەو ناوچانەش سوودیان لێ وەرگرتوون، ئاکامیش هەر ئەو بنکانە بوون بە بناغەی دامەزراندنی چەند بنکەیەکی تەندروستی لە ناوچەکەدا. ئەوەتا پاش جێگیربوونی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی بەشێوەیەکی ڕەسمی لە سەرەتادا لە چەمچەماڵ‌و، پاشتریش لە چەند ناحییەیەکی سەر بەو شارەدا بنکەی تەندروستی دامەزراون‌و پەرستاریان

بۆ ڕەوانە کراوە[٢٣].

هەرچەندە بەدرێژایی ماوەی نێوان هەردوو شەڕی جیهانی (١٩١٨- ١٩٣٩)و زۆر پاش ئەو مێژووەش، ئەو بنکانە هەر لە شێوازی خۆیاندا چەقیان بەستووەو، بە (بنکەی تەندروستی) ماونەتەوەو نەگۆڕاون بە (نەخۆشخانە)، هەروەها ئەو کارمەندە تەندروستیانەش کە بۆ بنکەکانی ناوچەکە ڕەوانە کراون، هیچیان پلەی دکتۆرییان نەبووە، مەگەر بە دەگمەن، ئەگینا ژمارەشیان لە یەك کەس تێپەڕی نەکردووە. زۆربەشیان کەم شارەزا بوونو هیچ جۆرە پسپۆڕییەکیان نەبووە، تەنانەت لە کۆتایی سییەکاندا لە بنکەی تەندروستی چەمچەماڵ پەرستارێك کە ناوی (تەحسین موزەمید) بووە دەوامی کردووە، کە هەر خوێندەواریشی نەبووە. سەبارەت بەو دەواو دەرمانانەش کە گەیشتوونەتە بنکە تەندروستییەکانی ناوچەکە، لە ڕووی پێکهاتەوە تەنانەت لە چاو ئەو سەردەمەشدا پێشکەوتوو نەبوون. لە ڕووی بڕیشەوە، پێداویستی ئەو ژمارە زۆرەی لە نەخۆشەکانی ناوچەکەی پڕ نەکردووەتەوە، چونکە بۆ هەر یەك لەو بنکانە لە ماوەی (٦) مانگدا تەنها یەکجار دەرمان ڕەوانە کراوە[٢٤].

ئەم هۆکارانە پێکەوە وایان کردووە کە هەم بنکەکان نەتوانن ئەرکی خۆیان بەجێ بهێنن لە چارەسەرکردنی نەخۆشەکاندا، هەم خەڵکەکەش بڕوایان بەو بنکانەو چارەسەرییەکانیان نەمێنێت، بۆیە ئەوەندەی پەنایان بۆ هۆکاری تر بردووە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانیان، نیوەی ئەوە سەردانی بنکە تەندروستییەکانیان نەکردووە.

گەر چاوێك بە تۆمارەکانی دادگای سزادانی چەمچەماڵدا بگێڕین، چەندین دەعوامان بەرچاو دەکەوێت کە لەلایەن کارمەندی ئەو بنکانەوە تۆمارکراون لە دژی ئەو نەخۆشانەی سەردانی بنکەکانیان کردووە کە بەهۆی نەبوونی چارەسەرو دەرمانی پێویستو خراپ تر بوونی باری تەندورستی نەخۆشەکانیانەوە، کێشەو دەمەقاڵەیان بۆ دروستکردوون. یەك لەو دەعوایانە لەلایەن (یونس ماهر ئەفەندی) مەئموری تەندورستی چەمچەماڵەوە لە دژی (سدیقە خانم کچی سەید عەلی) ناوێك تۆمارکراوە. لە ڕۆژی (٢٦)ی تەموزی ساڵی (١٩٣٢)، چونکە (بە شهادە شاهد تحققی کرد کە متهمە صدیقە خانم جنێوی بە دقتورو کوڕو کچی داوە بناء علیە بەپێی مادده (٢٥٥) لە ق ع ب حکم کرا بە سەر متهمە بە یەك دینار جزای نقدی اگر نیدا بە هژدە ڕۆژ حەپسی شدید لە ماڵ مختار قصبەی چەمچەماڵ. ..)[٢٥].

هەندێ جار ئەم کێشانە لە قاڵبی دەمەقاڵەو دەنگ بەرزکردنەوە تێپەڕیان کردووەو کار گەیشتۆتە ڕادەیەك نەخۆشەکان هەڕەشەی کوشتنیان لە کارمەندە تەندورستییەکان کردووە[٢٦].

بە درێژایی ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩١٨ - ١٩٣٩، جگە لەسێ بنکەی تەندروستی دواکەوتوو، لە ناوەندی قەزای چەمچەماڵو ناحییەکانی سەنگاوو ئاغجەلەردا، هیچ بنکەیەکی تری تەندروستی لەهیچ کام لە گوندو ناوچەکانی تری چەمچەماڵدا بوونیان نەبووە. لە کاتێکدا لە هەمان ئەو ماوەیەدا، (٢١) بنکەی پۆلیس لە ناوچە جیاجیاکانی مەڵبەندەکەدا دامەزراون کە (١٢٨) پۆلیس بە پلەی جیاجیا کاریان تێیاندا کردووە[٢٧].

ئەم پشتگوێ خستنەی حکومەت بۆ بارودۆخی تەندروستی ناوچەکە لە کاتێکدا بووە کە خەڵکەکەی بەدەست نەخۆشی هەمەجۆرەوە ناڵاندوویانە. هەرچەندە ئێمە لیستی ڕاستەقینەمان لەبەر دەستدا نییە، تاڕاستی ئەو زیانانە بخەینەڕوو کە لەسەر ئاستی مرۆڤەکان لە ناوچەکە کەوتوون، بەڵام قەبارەی گۆڕستانەکانی هەر گوندێکی ناوچەکە گەواهییەکی حاشا هەڵنەگرن لەسەر بەرزی ژمارەی مردن لە ناوچەکەدا بە تایبەت لە ناو مناڵاندا کە لە سەرجەم ئەو گۆڕستانانەدا ڕووبەڕێکی گەورەیان بۆ خۆیان داگیرکردووە.

*** باری تەندروستی خەڵکی ناوچەی کفری:**

لەسەردەمی عوسمانی لە شاری کفری بەهۆی نەبوونی نەخۆشخانەوە خەڵکی چوونە لای دکتۆریان نەدەزانی، زۆرتر پیرە پیاوو پیرەژن دەرمانی نەخۆشیان دەکرد، شێخو مەلا نووشتەیان بۆ ئەنووسینو دوعایان بەسەرا ئەخوێندن، دەلاك بەنەشتەرەپیسو چڵکنو ژەنگاویەکانیان دومەڵو برینەکانی ئەمو ئەویان هەڵئەدڕیو کێمیان پێ ئەکرد[٢٨]، ئەمەش ئەوە دەخاتە ڕوو لە سەردەمی حوکمڕانی عوسمانیدا هیچ بایەخ بەلایەنی تەندروستی خەڵکی ناوچەکە نەدراوە.

وەك لەڕاپۆرتی دوکتۆر (ولیام کۆرنەر)دا هاتووە کە لە ساڵی (١٩٢٣) دوای پشکنینێکی زۆر لە بارەی بەتای لە رزوتای کەرکوك دارشتبوو، لەو ڕاپۆرتەدا وا دەردەخات ئەوانەی تووشی ئەم پەتایە بوون (٥٣٪)ی پارێزگاکەیەو ٥٥,٥٪ لە ناوشارەکەدایەو لەوشوێنانەی کە ئاوی پەنگ خواردووو زەلکاوو کشتوکاڵکاری تێدایە، لە ناوچەی (قەرە تەپە) ژمارەی پەتا گرتوو (٢٣,٩٪)یەو (٧٦,٥٪) لە ناوچەی (کفری)یە، وەرزی ئەم پەتایە لە مانگی حوزەیرانەوە دەست پێدەکاتو لە ناوەندی مانگی تشرینی دووەمدا کۆتایی دێت[٢٩].

لە کوردستاندا لە باکوورەوە تا خانەقین لە خوارێو لە ڕۆژئاوا ئەرزنجانو مووش بەهۆی شەڕی هێزو دەستە چەتەو ڕێگرەکان بە تەواوی وێران ببووە، برسێتیو بێ ماڵو حاڵی، تێفۆسو نەخۆشییەکانی دیکە هەریەکەی بەشی خۆیان بردبوو[٣٠].

بەهۆی بڵاوبوونەوەی هەندێ نەخۆشی لە گوندەکاندا وەك مەلاریاو سك چوونو ئەو نەخۆشیانەش کە بەهۆی کرمەوە بڵاو دەبوونەوە وەك (کرمی بەلهارزیا) کاریگەری لەسەر گوزەرانی گوندنشینەکان هەبوو[٣١].

دەردو نەخۆشییە بڵاووزاڵەکان بریتی بوون لە مەلاریاو نەخۆشییەکانی چاو، ئاماری گرنگ (لەمانگی حوزەیرانەوە تا کۆتایی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩١٩) کراوە کە ڕێژەی مردنو لەدایکبوون بەرامبەر بووە، (٥٣) مردن، (٥٣) لە دایکبوون، هەر لەو ساڵەدا دەرمانخانەیەك لە کفری کرایەوەو (٦٩٠٤) نەخۆش سەردانیان کردووە،

جگە لەوەش چاودێری تەندروستی لە کفری ئەوە روون دەکاتەوە کەوا دەرمانخانەکە دەبێ لەو بارودۆخەوا دابخرێ، تا چاودێری و کۆنترۆڵکردنێکی چاکی کاری تەندروستی و پزیشکی لە ئارادا نەبێ نەکرێتەوە، دەرمانخانەکە بۆ تیمارو چارەسەرکردن و هێشتنەوەی نەخۆشەکان بکرێتەوە، راپۆرتی دەمی (زارەکی)ی میستەر (meier)، دوایین پشێکنەری تەندروستی شاری کفری[32]، کەش و هەوای ناوچەی کفری گەرمەو کاریگەری لەسەر تەندروستی مرۆڤەکان هەیە بەتایبەت لە وەرزی هاویندا زۆر گەرمە، ساڵی (١٩٢٢) سێ کەس لەنێوان داقوق و دووزخورماتوودا مردن بەهۆی ئەوەی لە کۆتایی مانگی تەمووزدا گرەو گەرما بردنی[33]. تەحسین عەسکەری[34] کە موتەسەریفی لیوای کەرکوک بووە لە ساڵی (١٩٣٠) سەردانی شاری کفری کردووە، بە گوێرەی راپۆرتی پزیشکی ئاوی کفری مەرجی تەندروستی بۆ خواردنەوە تێدا نەبووە، فەرمانی داوە بەهۆی بۆری ئاسنەوە لەسەرچاوەکەیەوە ئاوی خواردنەوە بۆ دانیشتووانی شار دابین بکرێت، لەلایەن دامودەزگاکانی ئیشغالەوە ئەو کارە ئەنجام بدرێت[35] ئەو هەموو پەتاو نەخۆشیانە لە ئاکامی ئەوە بووە حکومەتە فەرمانڕەواکانی ناوچەکە بایەخیان بەلایەنی ژینگەو تەندروستی خەڵکی ناوچەکە نەداوە.

*** یەکە کارگێڕییەکانی تەندروستی کەرکوک لە پەنجاکانی سەدەی رابردوودا:**

"لە ساڵی (١٩٥٠)دا ژمارەی دکتۆرە تۆمارکراوەکانی کەرکوک (٥٥) دکتۆر بووە، کە تەنها (٢٢) دکتۆریان بە رەچەڵەک بیانی بوونە، بەڵام لە ساڵی (١٩٥٣)دا هەستان بە فراوان کردنی نەخۆشخانەی کەرکوک بە دروستکردنی دوو هۆڵی گەورە لە پاڵ هۆڵەکانی پێشوودا، لە هەمان کاتدا کردنەوەی نەخۆشخانەیەکی تایبەت بە (گرانەتا) لە بەشی دواوەی گۆرەپانی نەخۆشخانەکە، لە هەمان ساڵدا بناغەی بنکەی تەندروستی (موسەڵلا) کە بەرامبەر قوتابخانەی سەرەتایی (موسەڵلا) بوو کە لەلایەن (عەبد ئەلکاڤ عارف) موتەسەریفی ئەو کاتەی کەرکوکەوە کرایەوە.

لە ساڵی (١٩٥٥) ژمارەی دەزگا تەندروستییەکانی کەرکوک (٣١) دەزگای تەندروستی بووە لەنێوان نەخۆشخانەو بنکەی تەندروستی کە (٢٤) دەزگایان لە قەزاو ناحییەکانی وەکو (کفری، خورماتوو، ئاڵتون کۆپری) بوو"[36].

*** یەکە کارگێڕییەکانی تەندروستی کەرکوک بریتی بوو لە[37]:**

١. دکتۆر (سەلیم نەحاس)، سەرۆکی تەندروستی لیوای کەرکوک.
٢. دکتۆر (فەخری محەمەد سالح ئەلدەباغ)، دکتۆر لە نەخۆشخانەی کەرکوک.
٣. دکتۆر (مارگرێت سەرسەم)، دکتۆر لە بنکەی تەندروستی منالان.
٤. دکتۆر (سەلاحەددین ئەلجەراح)، دکتۆری تایبەت بە نەخۆشییەکانی چاو.
٥. دکتۆر (فەرید ئەحمەد تەقیەددین)، دکتۆری نەخۆشخانەی کەرکوک، بە رەچەڵەک لوبنانی بوو.
٦. دکتۆر (عەبدوڵڵا ئەلرازی)، دکتۆری نەخۆشخانەی خورماتوو.
٧. دکتۆر (عەتا خورشید ئەلسالحی)، سەرۆکی تەندروستی مەعاریف.
٨. دکتۆر (رەزا تاهیر عوسمان).
٩. دکتۆر (وەحیدەدین کەتانە).
١٠. دکتۆر (ئەحمەد مستەفا قروت).
١١. دکتۆر (عەبدولحەکیم محەمەد زەکی).
١٢. دکتۆر (عومەر ئیسماعیل دزەیی)، دکتۆری تایبەت بە نەشتەرگەری.
١٣. دکتۆر (عەبدولقادر تاڵەبانی).
١٤. دکتۆر (نازم قیردار).

*** نەخۆشخانەی سەربازی کەرکوک:**

"ئەم نەخۆشخانەیە لە سەرەتادا سەر بە فیرقەی دوو بوو، تایبەت بوو بە سەربازو ئەفسەرەکانی کەرکوک، شوێنی ئەم نەخۆشخانەیە بەرامبەر بە قشلەی کەرکوک بوو، ئەم نەخۆشخانەیە لە سەرەتادا لە ساڵی (١٨٧٤)دا لە سەردەمی موتەسەریفی کەرکوک (نافیز پاشا) دروستکراوەو بەکارهێنراوە وەکو کۆگا بۆ پێویستییەکانی خواردن و خۆراکی ئەو سوپایەی کە لە کەرکوکدا بووە، بەڵام لە دواییدا کراوە بە نەخۆشخانەی سەربازی.

لە سەرەتای سییەکاندا هەمان شوێنی گۆڕاوە بۆ بنکەی (قیادة الانضباط العسکري) تا حەفتاکانی سەدەی رابردوو، کە لە ئێستادا بنکەی (جمعية المحاربين القدامى)یە، بەشێکی تریشی کراوە بە حانووت و یانەی سەربازی.

لەو کاتەدا نەخۆشخانەی سەربازی گوازراوەتەوە بۆ شوێنی تر لە نێو سەربازگەی کەرکوک، لە ماوەیەکی تر فراوانخوازی بۆ کراوەو شوێنی نەشتەرگەری و هۆڵی نەخۆش و فرگەی نیشتنەوەی هەلیکۆپتەری بۆ کراوەو بووە بە یەکێکە لە نەخۆشخانە سەربازییە سەرەکییەکانی ناوچەی کوردستان، بەڵام لە ساڵی (٢٠٠٣)ەوە بووە بە شوێنی نیشتەجێبوونی خەڵکی.

ئەو دکتۆرانەی کە لە سەرەتادا لەم نەخۆشخانەیە کاریان کردووە بریتی بوونە لە:

١. دکتۆر فازل رەشید عەقراوی.
٢. دکتۆر نەجیب رەزوقی میخائیل.
٣. دکتۆر سەید ئەحمەد ئەلنەقیب.
٤. دکتۆر عەلی رەزا ئەلغەزالی.
٥. دکتۆر محەمەد زەکی.
٦. دکتۆر قەیسەر توعمە.
٧. دکتۆر ئیحسان خەیروڵلا.
٨. دکتۆر خەلیل تەها.
٩. دکتۆر رەفعەت قوتب.
١٠. دکتۆر عادل عەبدولمەجید عەبدوڵڵا تەرزی.
١١. دکتۆر کەمال خاوەر.

١٢. دکتۆر بەهجەت ئەلرەسام.
١٣. دکتۆر ئەدمۆند خەیات.
١٤. دکتۆر مەنسور میخائیل شەماس.
١٥. دکتۆر کەمال ئەحمەد.
١٦. دکتۆر نیهاد محەمەد رەفعەت.
١٧. دکتۆر ئیسماعیل محەمەد جەمیل.
١٨. دکتۆری سەیدەلانی محەمەد نوری.
١٩. دکتۆر محەمەد عەلی ئیمامی.

هەروەها لە پەنجاکانی هەمان سەدەدا دەزگای تەندروستی هەبوو تایبەت بە بەروبوومی ئاژەڵی بۆیە گەلێك بنکەی تەندروستی کرابووەوە لە قەزاو ناحییەکانی کەرکوك، وەکو:
١. بنکەی تەندروستی ئاڵتون کۆپری.
٢. بنکەی تەندروستی داقوق.
٣. بنکەی تەندروستی قەرەتەپە.
٤. بنکەی تەندروستی سەنگاو.
٥. بنکەی تەندروستی شوان.
٦. بنکەی تەندروستی پێباز"[٣٨].

* **پیشەی ددانسازی لە کەرکوك:**

"دەربــارەی ئــەم پیشەیە لــە کــەرکوك لێکۆڵینــەوەو زانیاریمان کەمە دەربارەی سەرهەڵدانی سەرەتاکانی ئەم پیشەیە، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شارەزابوون لە بـواری ددانسـازیدا پێویستی بە توانـاو سـەرچاوەی گرنگ هەیە بۆ ئیشکردن لێی، سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ پەنجاکانی سەدەی رابـردوو کە گەلێك دکتۆری ددانو ددانساز سەری هەڵدا کە هەندێك لە خەڵکی کەرکوك لە پاڵ پیشەی سەرتاشیدا لە بواری ددانسازیدا کاریان کردووە.

* **دکتۆرەکانی ددان بریتی بوون لە:**
١. دکتۆر عەلی رەزا ئەلغەزالی.
٢. دکتۆر بەهجەت ئەلرەسام.
٣. دکتۆر عەباس قەلەندەر.
٤. دکتۆر سامی نوری.
٥. دکتۆر جاوید حوسێن محێدین.
٦. دکتۆر سەعدی یونس موحسن حەمود.
٧. دکتۆر فیکرەت حوسێن محێدین.
٨. دکتۆر لوتفیە غێدان.
٩. دکتۆر سەعید سدیق قەلەنچی.
١٠. دکتۆر عەبدولعەزیز غەفور.
١١. دکتۆر سالم عەسکەر.
١٢. دکتۆر رەشید نوعمان رەشید بیلال.

* **ددانسازەکانی کەرکوك:**
١. میخائیل نوری.
٢. پۆلس حەنا شابۆ.
٣. دانیال.
٤. دیکران.
٥. عەبدولعەزیز بەیاتی.
٦. سەید سەعدون.
٧. داوود.
٨. مەلا عەبدوڵڵا بەربەر.
٩. فوئاد بەربەر، لەناو بازاڕی حەڵواچییەکان کە کاری دکتۆری دەکرد.
١٠. عەلی بەربەر.
١١. مەلا عەبدولکەریم زەینولعابیدین.
١٢. سالح بەربەر.
١٣. حوسێن مەلا وەهاب.
١٤. تۆفیق بەربەر.
١٥. نوری بەربەر.
١٦. قادر بەربەر.
١٧. قادر ددانساز"[٣٩].

"لە یاداشتەکانی دکتۆر سەیدەلی فەخریدا بەم شێوەیە باسی بەشێك لە مێژووی ئەوانە دەکات کە لە بواری تەندروستیدا کاریان کردووە:
١. دکتۆر وەحدەدین کەتانە، دکتۆرێکی تورکمان بوو.
٢. دکتۆر زەکی میسری، کە بەبنەڕەت خەڵکی وڵاتی میسر بوو.
٣. دکتۆر مەلیك، بەبنەڕەت ئاسووری بوو، دکتۆرێکی بەناوبانگ بوو.
٤. دکتۆر فوئاد میسری، بەبنەرەت خەڵکی وڵاتی میسر بوو لەنێوان ساڵانی (١٩٥٢ - ١٩٥٦).
٥. دکتۆر رەزا تاهیر عوسمان، دکتۆرێکی تورکمان بوو.
٦. دکتۆر عەبدولقادر تاڵەبانی، لەساڵی ١٩٦٠ لەکەرکوك بوو.
٧. دکتۆر عوسمان ئەحمەد، کە ئەم دکتۆرە بەفیتی دکتۆر رەزا تاهیر لەکەرکوك دوور خرایەوە بە تایبەتی لە دوای ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٥٩) لە کەرکوك.
٨. دکتۆر موزەفەر حەساری، کە ئەمیش هەڵهات بەرەو بەغدا بە تایبەتی لە دوای ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٥٩) لە کەرکوك کە لەلایەن تورکمانەکانەوە چەند جارێك ئۆتۆمبیلو ماڵی سوتێنرا.
بێجگە لەمانەی کە باسمان کرد چەند کەسێك هەبوو لە کەرکوك ناوبانگیان هەبوو بەکاری دکتۆری لەوانە:
١. (فاتەی باقر) هەبوو لەکەرکوك لەگەڕەکی (بلاخ) کە کورد بوو کەچەڵی چاك دەکردەوە.
٢. مامانێك هەبوو ناوی (سەوسەن) کە گاور بوو، کاری دکتۆری دەکرد لە قەڵاو سەری لە هەموو شتێك دەردەچوو.
٣. (حاجی عەلی) هەبوو کە نزیکەی پەنجا ساڵ خزمەتی چاککردنی شکاوی دەکرد کە یەکێکی تریش لە شۆڕیجە هەبوو.
٤. (حاجی دکتۆر) هەبوو، زۆر شارەزا بوو لەکاری دکتۆری کە ماڵەکەی لەلای تەکییەی تاڵەبانی بوو لەلای ماڵی قابیل.
بێجگە لەم جۆرەکارانەی دکتۆری، لەبەر نەزانی ئەو کاتەی خەڵك، خەڵکی دەچوونە لای شێخ عەبدولقادر لەگەڕەکی

بلاغ، کەلە شەکریان دەبردوو دەچوون بۆ لای کە دووعاو نووشتەی دەکرد، کە گوایە گرانەتاو مەلاریا چاك دەکاتەوە، ئەم شێخە بەبنەچە خەڵکی ناوچەی چەمچەماڵ بوو"[٤٠].

* **پیشەی دەرمانسازی (سەیدەلی):**

"ئەم پیشەیە هاوتەریب بووە لەگەڵ سەرهەڵدانی پیشەی تەندروستیدا بووە، چونکە دەستنیشان کردنی هەر نەخۆشییەك پێویستی بە دەرمان هەبوو بۆ چارەسەرکردن، مرۆڤی کەرکوك لە رابردوودا دەورێکی بالآیان هەبووە لە دەرمانسازیداو گەلێك شارەزابوونە لە بواری جۆرەکانی گژوگیا بۆ ئامادەکردنی دەرمانو چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان.

لە سەرەتادا لە کەرکوك خەڵکی بۆ بەدەستهێنانی دەرمان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان دەرمانیان لە نەخۆشخانەی گشتی کەرکوك وەردەگرتو دەبوایە هەر نەخۆشێك بۆ چارەسەرەکەی شووشەی بەتاڵی لەگەڵ خۆی بېردایە بۆ وەرگرتنی دەرمان، بەڵام لە دواییدا دەرمانخانەی تایبەت کرایەوە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانو وەرگرتنی دەرمان.

لەو ماوەیەدا گەلێك لە دەرمانخانەی جۆراوجۆر کرانەوە کە نموونەکانیان بریتییە لە:

**١. دەرمانخانەی (ئەلعێراق):**

ئەم دەرمانخانەیە لە ساڵی (١٩٢٧)دا لەلایەن (خاچیك هاکۆب ترزیان) کرایەوە کە خۆی دەرچووی قوتابخانەی دەرمانسازی بوو لە ئەستەمبول، شوێنی دەرمانخانەکە لە نزیك پردی بەردینی کۆن بوو، کە لە ساڵی (١٩٥٣)دا رووخێنراو گوێزرایەوە بۆ شەقامی (ئەوقاف)، لە دواییدا (ناسیر سلێمان هیندی) ئەم سەیدەلییەی بەڕێوەبردووە تا ساڵی (١٩٦٢)، لە دوای ئەمیش هەر یەکە لە (نەدا لیۆن سەمیر جیان، گەرەبیت بیدرۆس تەبیبیان، عەبدولرەحیم ناجی ئەلزەوبەعی، بێتون حەبیب، موئەیەد سلێمان هیندی) دەرمانخانەکەیان بەڕێوە بردووە.

**٢. دەرمانخانەی (غازی):**

ئەم سەیدەلییە لە ساڵی (١٩٣٨) لەلایەن (مەلا عەلی برادەر) لە شەقامی مەجیدیە دروستکراوە، کە (سەلاحەددین عەبدولحەمید پاشا) ئەم دەرمانخانەیەی بەڕێوە بردووە، خۆی لە بنەرەتدا خەڵکی سوریا بووەو دبلۆمی لە سەیدەلەدا بەدەستهێناوە، لە ساڵی (١٩٥٠)دا خۆی دەرمانخانەیەکی بە ناوی (سەلاحەددین) کردووەتەوە لە شەقامی (مەلیك فەیسەل) تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کردووە لە ساڵی (١٩٥٩).

**٣. دەرمانخانەی (ئەلشیفا):**

ئەم دەرمانخانەیە لە ساڵی (١٩٤٠) لەلایەن (ئیبراهیم سەنتوب)ەوە کە جوولەکە بووە دامەزراوە، کەوتبووە شەقامی (مەجیدیە) لە نزیك یانەی ئەفسەران، بەڵام لە ساڵی (١٩٥٠) دەرمانخانەکەی فرۆشت لەو کاتەی کە جوولەکەکان کۆچیان کرد بەرەو ئیسرائیل، بۆیە لە دوایدا هەر یەکە لە (ناسیر سلێمان هیندی، ئیبراهیم شەماس، حەقی تاهیر، نەعوم جۆرج نەعوم) تا ساڵی (١٩٦٠) بەڕێوەیان بردووە.

**٤. دەرمانخانەی (یوسف ئەڵلاویردی):**

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (یوسف ئەڵلاوێردی) لە ساڵی (١٩٥٢) لە نزیك قشڵەی ئێستا کردووەتەوە، لە ساڵی (١٩٥٤) دا گواستویەتییەوە بۆ بازاری (قۆریە) لە (ئەحمەد ئاغا) تاوەکو ساڵی (١٩٧٠) بەردەوام بووە لە بەڕێوەبردنی ئەو دەرمانخانەیەدا تاوەکو ئەوەی کورەکەی (عیسمەت یوسف ئەڵلاوێردی) دەرمانخانەکەی بەڕێوەبردووە، بەڵام جارێکی تر لە ساڵی (١٩٨٠) لە گەرەکی (شۆریجە) کراوەتەوە، لە ئێستادا لە شەقامی (دکتۆرەکان)ە، هەر یەکە لە (داوود پۆلس سۆمۆ، کەماڵ محەمەد عەلی، نەعوم جۆرج نەعوم، جاوید ئەحمەد مەجید) کاریان کردووە لەم دەرمانخانەیە.

**٥. دەرمانخانەی (رەئوف):**

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (کاکە رەئوف)ەوە کراوەتەوە لە دواییدا گوازراوەتەوە بۆ سلێمانی.

**٦. دەرمانخانەی (ئەلئەهالی):**

ئەم دەرمانخانیە لەلایەن (یەشوع) ناوێکەوە لە شەقامی (کۆماری) دامەزراوە.

**٧. دەرمانخانەی (ئەلئیعتیماد):**

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (روفائیل) ناوێکەوە بەرامبەر سینەما (حەمرا) کراوەتەوە.

**٨. دەرمانخانەی (ئەلشەرقییە):**

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (جۆن ئیبراهیم داوود) لە شەقامیم (مەجیدیە) لە ساڵی (١٩٤٣) کراوەتەوە.

**٩. دەرمانخانەی (ئەلرافیدەین):**

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (یۆبرت) کراوەتوە لە شەقامی (کۆماری).

**١٠. دەرمانخانەی (کەرکوك):**

ئەم دەرمانخانیە لەلایەن (مەجید حاجی حەسەن)ەوە لە شەقامی ئەوقاف کراوەتەوە.

**١١. دەرمانخانەی (ئەلنەسر):**

ئەم دەرمانخانیە لەلایەن (زەکی سەمحیری) پیاوی دکتۆرە (مارگریت سەرسەر) کراوەتەوە.

**١٣. دەرمانخانەی (سوبحی):**

ئەم دەرمانخانیە لەلایەن (سوبحی سابیر عەبدولقادر) لە شەقامی (کۆماری) دامەزراوە"[٤١].

**١٢. دەرمانخانەی (فەخری):**

"ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن دکتۆر سەیدەلانی (فەخری عومەر حەمە عەلی)ەوە کراوەتەوە، لە ساڵی (١٩٥٩) لە شەقامی (کۆماری)و تاوەکو ئێستاکە بەردەوامە"[٤٢].

**١٣. دەرمانخانەی (تەدمور):**

"ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (رەشاد نەزار بوترۆس) کراوەتەوە، لە شەقامی (حەجاج).

**١٤. دەرمانخانەی (ئەلئیحسان):**

ئەم دەرمانخانیە لەلایەن (ئیحسان کامیل گەرابیت) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

**١٥. دەرمانخانەی (ئەلئیخلاس):**

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (زومورود کەماڵ محەمەد) کراوەتەوە، لە شەقامی (تسن).

١٦. دەرمانخانەی (ئەلئیسرا):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (مەنال قادر مەجید) کراوەتەوە، لە شەقامی (حەجاج).

١٧. دەرمانخانەی (ئەلئەسیل):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (رەفا محەمەد عەلی) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

١٨. دەرمانخانەی (ئەلئوفوق):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئەرسان مستەفا کەماڵ) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

١٩. دەرمانخانەی (ئەلئەقسا):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (فەرەیدون حەبیب مستەفا) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٢٠. دەرمانخانەی (ئەلئیمام):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (حەسەن محەمەد مەولود) کراوەتەوە، لە شەقامی (رێگای بەغدا) بەرامبەر مزگەوتی (ئەلنور).

٢١. دەرمانخانەی (ئەلئومەرا):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (فوئاد جەوهەر خورشید) کراوەتەوە، لە شەقامی (پارێزگا).

٢٢. دەرمانخانەی (ئەلئەنوار):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (زولفیقار عەبدوڵڵا) کراوەتەوە، لە شەقامی (شۆریجە).

٢٣. دەرمانخانەی (ئەلبەرا):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (عیسام موعتەسەم نامیق) کراوەتەوە، لە شەقامی (کۆماری).

٢٤. دەرمانخانەی (ئەلبورج):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (نیزامەددین محەمەد عومەر) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٢٥. دەرمانخانەی (ئەلبەسمە):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سوها میخائیل عەزیز) کراوەتەوە، لە شەقامی (کۆماری).

٢٦. دەرمانخانەی (ئەلبوشرا):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (عومەر محەمەد عەلی) کراوەتەوە، لە شەقامی (شۆراو).

٢٧. دەرمانخانەی (ئەلبیلاد):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (محەمەد سدقی عەبدولعەزیز) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٢٨. دەرمانخانەی (ئەلتاج):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئومێد موحسن حەسەن) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٢٩. دەرمانخانەی (ئەلتەئمیم):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (شەموئێل بوترس لازار) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٣٠. دەرمانخانەی (ئالتون کۆپری):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (زوهێر نیعمەت) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٣١. دەرمانخانەی (ئەلجەماهیر):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئەحمەد عومەر) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٣٢. دەرمانخانەی (ئەلحیکمە):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (عەلی سەعید عەلی) کراوەتەوە، لە شەقامی (کۆماری).

٣٣. دەرمانخانەی (ئەلحەیات):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئۆراڵ محەمەد بەکر) کراوەتەوە، لە شەقامی (رێگای بەغدا).

٣٤. دەرمانخانەی (ئەلدونیا):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (دونیا محەمەد محێدین) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٣٥. دەرمانخانەی (ئەلدەوا):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (فەرەیدون فازڵ سابیر) کراوەتەوە، لە تەك کڵێسەی (مار یوسف).

٣٦. دەرمانخانەی (ئەلرونیا):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (نورهان سلێمان) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٣٧. دەرمانخانەی (ئەلرەبیع):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئەیسر غازی عەبدولکەریم) کراوەتەوە، لە شەقامی (رێگای بەغدا).

٣٨. دەرمانخانەی (ئەلزەنبەق):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (گوڵدەران محەمەد ئەمین) کراوەتەوە، لە شەقامی (رێگای بەغدا).

٣٩. دەرمانخانەی (ئەلزهور):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (گوڵتن عەبدولغەنی جەعفەر) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٤٠. دەرمانخانەی (ئەلساقی):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (حەسەن ساقی رەزا) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٤١. دەرمانخانەی (ئەلسەحەر):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (نەوزاد مەحموود رەشید) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٤٢. دەرمانخانەی (مینا):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (بان عەبدولواحید) کراوەتەوە، لە شەقامی (کۆماری).

٤٣. دەرمانخانەی (ئەلسەنابل):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سەراب ئەحمەد مستەفا) کراوەتەوە، لە تەنیشت کڵێسەی (مار یوسف).

٤٤. دەرمانخانەی (ئەلسوها):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سوها لوتفی ئەسکەندەر) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

٤٥. دەرمانخانەی (ئەلشەفەق):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (لەیلا واجد عوسمان) کراوەتەوە، لە شەقامی (کۆماری).

٤٦. دەرمانخانەی (ئەلشەمماس):

ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (مەریوان فەتاح حوسێن) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).

**٤٧. دەرمانخانەی ( ئەلشەمس ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (گونەڵ یونس ئەحمەد) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٤٨. دەرمانخانەی ( ئەلشۆریجە ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئەمل هیدایەت محەمەد) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (شۆریجە).
**٤٩. دەرمانخانەی ( ئەلسەباح ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (جیغدەم سەباح ڕەشید) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٥٠. دەرمانخانەی ( ئەلسیحە ئەلمەرکەزیە ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئۆزجان زەینەڵ) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٥١. دەرمانخانەی ( فارما ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئومێد عومەر دەروێش) کراوەتەوە، لە شەقامی (ئەلماس).
**٥٢. دەرمانخانەی ( ئەلمەرکەزیە ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (تۆباز محەمەد ئەمین) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٥٣. دەرمانخانەی ( ئەلعەقاقیر ئەلتوبییە ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئومێد جەلیل عەباس) کراوەتەوە، لە شەقامی (کۆماری).
**٥٤. دەرمانخانەی ( ئەلفائیزە ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (زەینەب جەلال محەمەد) کراوەتەوە، لە شەقامی (تسن).
**٥٥. دەرمانخانەی ( ئەلفاروق ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (محەمەد ئەحمەد سەعید) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٥٦. دەرمانخانەی ( ئەلفەجر ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (عەباس محەمەد عەواد) کراوەتەوە، لە شەقامی (ئەلئەسرا وەلمەفقودین).
**٥٧. دەرمانخانەی ( ئەلقەلعە ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (موسەڵلا).
**٥٨. دەرمانخانەی ( ئەلکەمال ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (پاکیزە محەمەد حەبیب) کراوەتەوە، لە شەقامی (تسن).
**٥٩. دەرمانخانەی ( ئەلکەوسەر ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (بیلال حەسەن سەعید) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٦٠. دەرمانخانەی ( ئەللوئلوئە ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئینتیسار ئەحمەد یوسف) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٦١. دەرمانخانەی ( ئەللەبلاب ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (شەن جەماڵ محەمەد) کراوەتەوە، تەنیشت دەرمانخانەی (ڕەفعەت).
**٦٢. دەرمانخانەی ( ئەلمەحەبە ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (عەمار شاکر سلێمان) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (شۆریجە).
**٦٣. دەرمانخانەی ( ئەلمەدینە ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سوهێل حوسێن محەمەد) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٦٤. دەرمانخانەی ( ئەلمەرجان ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (عەبدولوهاب تاهیر) کراوەتەوە، لە (بازاڕی قەیسەری).
**٦٥. دەرمانخانەی ( ئەلموروج ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (فیدوە جەمال عیسا) کراوەتەوە، لە شەقامی (کۆماری).
**٦٦. دەرمانخانەی ( ئەلمستەفا ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (مستەفا فاتیح حەسیب) کراوەتەوە، لە شەقامی (کۆماری).
**٦٧. دەرمانخانەی ( ئەلمەلاك ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (هیجران حوسێن سادق) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٦٨. دەرمانخانەی ( ئەلمەلیك ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سەوسەن نورەددین) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (ڕەحیم ئاوا).
**٦٩. دەرمانخانەی ( ئەلمونتەزیر ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئیلهام حوسێن عەباس) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (ئەلحەجاج).
**٧٠. دەرمانخانەی ( ئەلنیبراس ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سیروان محەمەد ساڵح) کراوەتەوە، بەرامبەر دەرمانخانەی (ڕەفعەت).
**٧١. دەرمانخانەی ( ئەلنجوم ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ترکان کەماڵ محەمەد) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٧٢. دەرمانخانەی ( ئەلنەدا ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (نەدا ناسیح عەبدوڵلا) کراوەتەوە، لە (ڕێگای بەغدا).
**٧٣. دەرمانخانەی ( ئەلنەرجس ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (نەهلە میخائیل خەمو) کراوەتەوە، بەرامبەر دەرمانخانەی (فەخری).
**٧٤. دەرمانخانەی ( ئەلنەسیم ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سەراب قەنبەر) کراوەتەوە، لە (ڕێگای بەغدا).
**٧٥. دەرمانخانەی ( ئەلنەسر ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (فەدر سلێمان ئیلیاس) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٧٦. دەرمانخانەی ( ئەلنەورەس ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئیلهام حەسەن) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٧٧. دەرمانخانەی ( ڕۆژگار ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (هودا یەحیا شەمیر) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (ڕەحیماوا).
**٧٨. دەرمانخانەی ( ئەلهودا ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (فەرەح عەبدولکەریم) کراوەتەوە، لە نزیك بنکەی تەندروستی (بابا گوڕگوڕ).

**٧٩. دەرمانخانەی (ئەلهیلال):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئوسامە محەمەد فائین) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٨٠. دەرمانخانەی (ئەلوەفا):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سەراب محەمەد کەریم) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (تسن).
**٨١. دەرمانخانەی (ئەلیاقوت):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سۆزان عیزەت تەها) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٨٢. دەرمانخانەی (ئەلسەرمەدی):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئیمان عەبدوڵڵا ئەحمەد) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٨٣. دەرمانخانەی (ئیمام قاسم):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (یەلماز حەسەن حوسێن) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٨٤. دەرمانخانەی (ئومێد):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئومێد ئیسماعیل) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (عەرەفە).
**٨٥. دەرمانخانەی (ئایە):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (تەیمور سەمیر مەحموود) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (تسن).
**٨٦. دەرمانخانەی (بابا گوڕگوڕ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (فائیدە فازڵ مەحموود) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٨٧. دەرمانخانەی (بەغداد):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئەحمەد ئینعام مستەفا) کراوەتەوە، بەرامبەر نەخۆشخانەی (ئەلسەلام)ی ئەهلی.
**٨٨. دەرمانخانەی (دونیا ئەلدەوا):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (محەمەد جاسم) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (عەرەفەی تازە).
**٨٩. دەرمانخانەی (تریفە):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (تریفە حوسێن عەلی) کراوەتەوە، لە شەقامی (ئەلئومەرا).
**٩٠. دەرمانخانەی (تسعین):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (فائیزە محەمەد عەلی) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (تسن).
**٩١. دەرمانخانەی (ئەلئەمین):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ئەسین ئەمین خەلیل) کراوەتەوە، لە شەقامی (کۆماری).
**٩٢. دەرمانخانەی (دار ئەلحیکمە):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سورەیا محەمەد سوداد) کراوەتەوە، نزیك نەخۆشخانەی (دار ئەلحیکمە ئەلئەهلی).
**٩٣. دەرمانخانەی (دار ئەلدەوا):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (پەرهان نەجات عەبدوڵڵا) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**٩٤. دەرمانخانەی (دار ئەلشیفا):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (بوشرا مەحموود بیلال) کراوەتەوە، بەرامبەر نەخۆشخانەی (کەرکوکی گشتی).

**٩٥. دەرمانخانەی (هیوا):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (هێمن فائیق) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (شۆریجە).
**٩٦. دەرمانخانەی (دلاوەر):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (دلاوەر عەبدولحەمید ئەحمەد) کراوەتەوە، لە گەڕەك (ڕەحیماوا).
**٩٧. دەرمانخانەی (ڕەفعەت):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (ڕەفعەت شەوکەت ڕەفعەت) کراوەتەوە، لە شەقامی (کۆماری).
**٩٨. دەرمانخانەی (ڕۆژ):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (جەمال فائیق عەزین) کراوەتەوە، لە شەقامی (پەریادی).
**٩٩. دەرمانخانەی (سەنا):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (عەدنان سوهێل ڕەسمی) کراوەتەوە، لە شەقامی (دۆمین).
**١٠٠. دەرمانخانەی (سینان):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سینان محەمەد عەلی) کراوەتەوە، لە شەقامی (ئەلحەجاج).
**١٠١. دەرمانخانەی (سۆزان):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سۆزان عەلائەددین) کراوەتەوە، لە شەقامی (دکتۆرەکان).
**١٠٢. دەرمانخانەی (سەید فاتیح):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (فائیزە عەبدوڵڵا خدر) کراوەتەوە، لە شەقامی (کۆماری).
**١٠٣. دەرمانخانەی (سیهان):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (سیهان سوبحی نورەددین) کراوەتەوە، لە شەقامی (دۆمین).
**١٠٤. دەرمانخانەی (شادان):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (شادان ئەحمەد وەیس) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (ئیسکان).
**١٠٥. دەرمانخانەی (شێروان):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (شێروان محێدین ئەحمەد) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (شۆریجە).
**١٠٦. دەرمانخانەی (شەیما):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (شەیما عیسمەت سابیر) کراوەتەوە، بەرامبەر قائیمقامیەی کەرکوك.
**١٠٧. دەرمانخانەی (سحە و عافیە):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (موسەنا ڕێسان) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (عەسکەری).
**١٠٨. دەرمانخانەی (مستەشفا دار ئەلسەلام):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (بەناز کەمال مەحەمەد) کراوەتەوە، لە گەڕەکی (شاترلو).
**١٠٩. دەرمانخانەی (عەلی):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (غازی محەمەد ساڵح) کراوەتەوە، لە تەنیشت سەیدەلی (ڕەفعەت).
**١١٠. دەرمانخانەی (عەلی تاڵب):**
ئەم دەرمانخانەیە لەلایەن (عەلی تاڵب غالب) کراوەتەوە، لە شەقامی (پارێزگا).

*** ئاماری ئەوانەی لە بواری پزیشکیدا کاریان کردووە لە کەرکوك لە ساڵی (١٩٥٨)[11]:**

| جۆر | ژمارە |
| --- | --- |
| دکتۆر | ٥٨ |
| دکتۆر ددان | ٧ |
| سەیدەلی | ١٨ |
| یاریدەدەری سەیدەلی | ٣ |
| پەرستار | ٥١ |
| مامان | ٤٤ |
| برین پێچ | ٩١ |
| وێنەسازی نەخۆشی | ٢ |
| یاریدەدەری تاقیگە | ٣ |
| کارمەندانی پزیشکی | ٢٩ |
| چاودێری پزیشکی | ٣ |
| ددانساز | ٧ |

* سەرچاوە:-

١. بڕوانە:

- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٧)، وزارة الصحة، مديرية الإحصاء الحياتي، چاپخانەی (سلمان الاعظمي)، بەغدا، ١٩٦٠، لاپەڕە (٨).
- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٨)، وزارة الصحة، مديرية الإحصاء الحياتي، چاپخانەی (سلمان الاعظمي)، بەغدا، لاپەڕە (٩).

٢. بڕوانە:

- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٧)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠).
- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٨)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٢).

٣. بڕوانە:

- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٧)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١١).
- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٨)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٨، ٣٦).

٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٢).

٥. بڕوانە:

- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٧)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٤).
- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٨)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٦).

٦. بڕوانە:

- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٧)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٧).
- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٨)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٨).

٧. بڕوانە:

- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٧)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٥).
- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٨)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٨).

٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٨).

٩. بڕوانە:

- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٧)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨١).
- (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٨)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٧).

١٠. (نشرة الإحصاء الحياتي والصحة لسنة ١٩٥٨)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٦).

١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٧٠).

*** بەڕێوەبەرە گشتییەکانی بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی کەرکوك:-**

- دکتۆر مستەفا نەسرەت:-
لە بنەڕەتدا تورك بوو لە سەردەمی کەماڵ ئەتاتورکدا، دژی بووە بۆیە هەڵهاتووەو هاتووەتە عێراق لە سەردەمی مەلیك فەیسەڵی یەکەم، لەکاتی خۆیدا بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەرچووە، کە ماوەیەك سەرۆکی تەندروستی کەرکوك بووە، بەڵام لەبەر ئالوودەبوونی بە مەی لە کارەکانی دوورخراوەتەوە.
- دکتۆر عیسا نوری:-
لەدوای دکتۆر مستەفا نەسرەت کاروباری تەندروستی گرتۆتە ئەستۆ
- دکتۆر عەبدوڵڵابەرسووم:-
لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو سەرۆکی تەندروستی کەرکوك بووە.
- دکتۆر کەمال عارف قەفتان.
- دکتۆر (بەشیر حەنا سەرسەم) باوکی دکتۆرە مارگریت بووە.
- دکتۆر (سەلیم نوحاس):-
لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردووە سەرۆکی تەندروستی بووە.
- دکتۆر عوسمان ئەحمەد.
- دکتۆر ڕەزا تاهیر
- دکتۆر یونس عوسمان
- دکتۆر سوبحی موفتی
- دکتۆر شەرەف پاسەوان
- دکتۆر موزەفەر ئەلحوسێن
- دکتۆر مۆفەق ئەلعوبێدی
- دکتۆر مونز ئەلعوبێدی
- دکتۆر عەلی بەیاتی
- دکتۆر محەمەد سالح عیسا
- دکتۆر سەباح ناجی
- دکتۆر حەسەن ئەلنەجداوی
- دکتۆر ڕیاز جابر ڕەشید
- دکتۆر عەلی موخێف کتاب
- دکتۆر مفتاح عەلی سالم
- دکتۆر ڕەعد عەلی جاسم
- دکتۆر نەوفەل حازم محەمەد
- دکتۆر شامیل غانم عەبایەچی
- دکتۆر حەمید محەمەد عوبێد
- دکتۆر سەباح ئەمین ئەحمەد
- دکتۆر سدیق عومەر ڕەسوڵ
- دکتۆر سەباح ئەمین
- لەدوای ١٦ی ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠١٧ ناوبراو (د. کەریم وەلی) کە بە ڕەگەز تورکمانە بە وەکالەت کراوە بە بەڕێوەبەری تەندروستی کەرکوك.

*** ڤێتەرنەری کەرکوك:-**

مێژووی پزیشکی ڤێتەرنەری لە عێراق دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم بە تایبەتی لە ساڵی (١٩٢١)، بەناوی بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ڤێتەنەری بە سەرپەرشتی دکتۆ (کۆلۆنێل جادویك) کە دکتۆری ڤێتەرنەری هەڵگری ڕەگەزنامەی بەریتانیانی بوو. کە لە سەرەتادا سەر بە وەزارەتی ئابووری‌و هاتووچۆ بوو.

یەکەم هەنگاوی ئەم دکتۆرە، دامەزراندنی تاقیگەیەکی ڤێتەرنەری بوو بۆ بەرهەمهێنانی (Black Leg. Hs. An-thrax) بە ڕێگای کە بە ناوبانگ بوو بە (Flask Fermen-tation).

بە کرێگرتنی یا بەکارهێنانی یەکەکانی نیشتەجێبوون یان یەکەکانی سەربازی وەکو ژینگەیەکی دروستی ئاژەڵی لە پارێزگاکانی (بەغدا، موسل، بەسرە)، کارەکانیشی پشتی بە دکتۆری ڤێتەنەری بەریتانی‌و هیندی دەبەست، بەڵام لە دوایدا هەستا بەکردنەوەی خولی جۆراوجۆر بۆ عێراقییەکان‌و ڕاهێنانیان لە پێناوی دروستی ئاژەڵ‌و پاراستنی لە فەوتاندن.

ساڵی (١٩٣٣) یەکەم دەستەی لاوانی عێراق نێردرایە هیند بۆ خوێندن لە زانکۆکانیان کە نموونەیان وەکو د. سادق خەیات کە لە دوایدا بووە بەڕێوەبەری گشتی ڤێتەنەری عێراق‌و لە ساڵی (١٩٥٥) کۆلێژی پزیشکی ڤێتەنەری لە عێراق دامەزراند لە دوای ئەویش ئەم بەڕێزانە دەوریان هەبوو لە گەشەکردن‌و دامەزراندنی پزیشکی ڤێتەرنەری لە عێراق:-
د. خالید ئایار، د. شوناسی عەبدولوەهاب، د. عیسا فەهمی، د. هیشام بەرزنجی، د. جابر حەمزە، د. حەسەن ئەوقاتی، د. حەمەدوڵڵا ئەلبەیار، د. ناسر داود قاقۆ، هەروەها هەریەکە لە د. قوتبەدین عارف، د. قەرەنی دۆغرەمەچی، دەوریان هەبوو لە پێگەیاندنی ڤێتەرنەری لیوای موسڵ‌و کەرکوك.

*** سەرەتا دامەزراندنی پزیشکی ڤێتەرنەری لە کەرکوك:-**

بۆ یەکەم جار ڤێتەرنەری لە کەرکوك بۆ ساڵی (١٩٣٧) دەگەڕێتەوە لە گەڕەکی (ئیمام قاسم - زێویە)، بەسەرپەرشتی دکتۆری ڤێتەرنەری د. قەرەنی کە هەڵگری ڕەگەزنامەی هیندی بووە.

ئەمانەی خوارەوە پزیشکەکانی ڤێتەرنەری کەرکوکن، کە بەڕێوەبەرایەتی کەرکوکیان بەسەر بردووە:-
١-د. قەرەنی ١٩٣٧- ١٩٤٥
٢-د. نەجمەدین عارف ١٩٤٥- ١٩٥٠
٣-د. ڕەشاد قەفتان ١٩٥٠- ١٩٦٠
٤-د. عیسا فەهمی ١٩٦٠- ١٩٦٧
٥-د. جەمال ئەحمەد ١٩٦٧- ١٩٧٠
٦-د. عەلی حەیدەر ١٩٧٠- ١٩٧٢
٧-د. سامح هیدایەت ئەرسەلان ١٩٧٢- ١٩٧٥
٨-د. ڕەشاد بەکر ١٩٧٥- ١٩٧٧
٩-د. عەمانوئیل ١٩٧٧- ١٩٧٩
١٠- د. عەدنان عەبدولمەجید ١٩٧٠- ١٩٨٤
١١-د. جەلیل نیسان ١٩٨٤- ١٩٨٧
١٢- د. ئاوزار حەسەن حوسێن ١٩٨٧- ١٩٨٩
١٣- د. ئەحمەد ڕەشید ١٩٨٩- ١٩٩٢
١٤- د. ئاوزار حەسەن حوسێن ١٩٩٢- ١٩٩٤
١٥- د. ئەحمەد ڕەشید ١٩٩٤- ١٩٩٦
١٦- د. نەجمەدین کەریم ئەمین ١٩٩٦- ١٩٩٨
١٧- د. ئەکرەم کەمال عارف ١٩٩٨- ٢٠٠٢
١٨- د. تاریق بەریسیم ٢٠٠٢- ٢٠٠٣
١٩- د. ئەحمەد ڕەشید ٢٠٠٣- ٢٠٠٥
٢٠- د. ئەکرەم کەماڵ عارف ٢٠٠٥ تاکو ئێستاکە بەردەوامە.

*** هەرەمی پزیشکی ڤێتەرنەری کەرکوك.**

١-نورینگە دەرەکییەکان:-
ئەم بەشەیان پێکهاتووە لە :-
- لیژنەی نەهێشتنی سەربڕینی دەرەکی.
- لیژنەی لە ناودانی سەگی بەرەڵا.
٢-هۆبەی هونەری
- لیژنەی فرۆشتنی گۆشتی دروست بۆ کارهێنانی لەلایەن مرۆڤەوە.
- لیژنەی سووتاندی گوشتی بەسەرچوو.
٣-هۆبەی پەلەوەر
٤-هۆبەی تاقیگە
٥-هۆبەی کۆگا
٦-هۆبەی کوتان
٧-هۆبەی سەربڕین
٨-بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری
کە بەشەکانی بریتی بووە لە:-
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (تازە).
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (ئەلرەشاد)
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (داقوق)
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (قەرە حەسەن)
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (ئیمام قاسم- زێویە)
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (ئاڵتون کۆپری)
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (دووبز)
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (زاب).
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (ئەلعەباسی)
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (حەویجە)
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (ئەلریان)
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (یایچی)
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری (سەکران)
- بنکەی تەندروستی ڤێتەرنەری لە نەخۆشخانە
٩-هۆبەی بەکەڵدانی دەستکرد
١٠-حیسابات‌و ووردبینی
١١- کارگێڕی‌و خۆجێیەتی
١٢- یەکەی هەڵگرتن‌و پاراستن.

١٣- یەکەی ڕاگەیاندن و ڕێنمایی ڤێتەرنەری.
١٤- یەکەی تیشك و سۆنار.
١٥- ژووری کاروباری ئەنفلۆزای باڵندە.
- ژووری کاروباری ناوەندی
- ژووری کاروباری ناوخۆیی
١٦- لیژنەی ڤێتەرنەرییەکان.
- لیژنەی پشکنین سەربرینی دەرەکی
- لیژنەی لەناودانی سەگی بەرەڵا
- لیژنەی سووتاندن ولە ناودانی گۆشتی بۆگەن.
- لیژنەی فرۆشتنی گۆشتی لە بار بۆ خواردن

* دکتۆرە ڤێتەرنەرییەکانی کەرکوك:-
- ئومێد محەمەد سەراجەدین
- ئەیوب عەلی حوسێن
- بەیان محەمەد مەجید
- بورهان عەبدوڵڵا حوسێن
- بلند جەمال محەمەد
- جاهیدە قاسم عەباس
- جەعفەر حوسێن حەسەن
- جەلیل جومعە یاسین
- حوسێن عەلی ئەحمەد
- حەیدەر وەلی حوسێن
- خەدیجە محەمەد عەلی
- خلود عەلی خالید
- دابان عادل عومەر
- دالیا مەنسور ئیسحاق
- دالیا هاشم محەمەد ئەمین
- دەحام سالم ڕۆستەم
- دورەید هاشم محەمەد ئەمین
- دەنیز ئەنوەر عەبدوڵڵا
- دەریا عوسمان قادر
- ڕووناك ڕەشید محەمەد
- سۆزان ئیبراهیم ڕەمەزان
- سامان ئەسعەد ستار
- سامی ئیبراهیم عەبدوڵڵا
- سروشت کەریم ئەحمەد
- سەعد جەلال کەریم
- سومەیە سەمیر بەکر
- سینان عەلی حوسێن
- سوهام ئەحمەد مەحموود
- سوهەیل حەبیب یوسف
- سۆزان عەبدولرەحمان عەبدوڵڵا
- سیروان حەسەن عەبدولرەحمان
- شەهدا عەلی ئەحمەد
- شەهاب ئەحمەد عەبدوڵڵا
- شێروان ڕەحیم سەعید.
- سۆن گوڵ قادر ڕەزا
- گەرمیان عەلی
- عادل جەعفەر زەینولعابدین
- عامر حەسەن محەمەد
- عەباس حەسیب جومعە
- عەبدولجەبار ئیبراهیم فاتیح
- عەبدولخالق ڕەشید خدر.
- عەبدولکەریم ئەنوەر محەمەد
- عەبدولکەریم محەمەد عەلی کەریم
- عەبدوڵڵا عەزیز محەمەد ئەمین
- عەبود شەهاب ئەحمەد
- عیزەدین عەلی فەتحوڵڵا
- عەزیز عەبدوڵڵا ڕەفیق
- عیسام سلێمان ساڵح
- عیسام محەمەد ئەحمەد
- عەلی حەسەن محەمەد
- عیماد عەبدولغەفور عەزیز
- فوئاد ئەبوبکر محەمەد
- فازڵ ئەحمەد عەلی
- فیردەوس جەواد کەریم
- فەرهاد میدحەت عەبدوڵڵا
- فریال ئەحمەد حوسێن
- فەواز سوبحی
- قەدریە حەسەن سەعید
- کەماڵ عەبدولوەهاب عەبدوڵڵا
- کەنعان فاتیح حوسێن
- مازن عەبدوڵڵا تاهیر
- محەمەد حەبیب حوسێن
- محەمەد حوسێن جومعە
- محەمەد حەمید عەبدوڵڵا
- محەمەد عومەر عەلی
- محەمەد موحسن محەمەد
- محەمەد نەسرەدین غایب
- مەروە بەدرەدین نەجمەدین
- مەریوان کامیل فارس
- مەنال سەعید محەمەد
- مونا ئیبراهیم عەلی
- نەبیل ئەدوەر ناسر
- نەبیل بورهان کازم
- نەبیل عابدین قەنبەر
- نەجدەت فازڵ عەبدولقادر
- نەجلاو کازم عەلی
- نەجم کەریم ئەمین
- نەدا ڕەمزی کەریم
- نەزیر کازم عەلی
- نەمیر نازم ئەنتوان
- نیهاد حوسێن عەبدوڵڵا
- نورەدین محەمەد سەعید
- نورسن مەهدی شەفیق
- هەوارز عەبدوڵڵا عەبدولواحید

*** دامو دەزگا ڤێتەرنەرییەکانی کەرکوك لەنێوان ساڵانی ( ١٩٣٧ - ١٩٥١ :**

"بەپێی ئەو ئامارە پزیشکانەی دەستمان کەوتووە ئاماژە بەوە دەکەن کە یەکە بەڕێوەبەرییەکانی ڤێتەرنەری کەرکوك بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

١. نەخۆشخانەی ڤێتەرنەری کەرکوك.

٢. نۆڕینگەی ڤێتەرنەری لە کفری، بەڵام لە ساڵی (١٩٥١)ەوە بووە بە نەخۆشخانەی ڤێتەرنەری لە کفری.

٣. نۆڕینگەی ڤێتەرنەری لە چەمچەماڵ، بەڵام لە ساڵی (١٩٥١)ەوە بووە بە نەخۆشخانەی ڤێتەرنەری لە چەمچەماڵ.

٤. نۆڕینگەی ڤێتەرنەری لە ئاڵتون کۆپری (پردێ)"[١].

٥. نۆڕینگەی ڤێتەرنەری خورماتوو.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

[١]. (التقرير السنوي للسنة ١٩٣٧ - ١٩٣٨ المالية)، وەزارەتی ئابووریو گەیاندن، بەڕێوەبەرایەتی کاری ڤێتەرنەری، بەغدا، ١٩٣٨، لاپەڕە (٣).

*** کوشتارگەو پشکنینی گۆشتی ئاژەڵ لە پارێزگای کەرکوك لەنێوان ساڵانی ( ١٩٤٣ - ١٩٦٨ ):**

| ساڵ | مەر | بزن | مانگا | گامێش | حوشتر | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٤٣ - ١٩٤٤ | ٣١٧٨٧ | ٢٢٢٣٤ | ١٤١٥ | - | - | ٥٥٤٣٦ |
| ١٩٤٥ - ١٩٤٦ | ٢٨٦٧٢ | ١٨٧٠٥ | ١١١١ | ١٦ | - | ٤٨٥٠٤ |
| ١٩٤٦ - ١٩٤٧ | ٤٥٨٤٨ | ٤٢٦٣٦ | ٢١٨٥ | ١٥ | ١ | ٩٠٦٧٥ |
| ١٩٤٧ - ١٩٤٨ | ٤٥٢٧٢ | ٣٠٥٧٦ | ٣١١٤ | - | - | ٧٨٩٦٢ |
| ١٩٤٨ - ١٩٤٩ | ٤٣٢٤٨ | ٣٧٦٦٦ | ٢٧٨٦ | ٢٤ | - | ٨٣٧٢٤ |
| ١٩٥١ | ٤٥٧٢١ | ٣٣٢١٥ | ٢٤٨٣ | ٤١ | ١ | ٨١٤٦١ |
| ١٩٥٢ | ٤٥١٧١ | ٢٦٧٣٤ | ١٨١٠ | ١٣ | - | ٧٣٧٢٨ |
| ١٩٥٣ | ٥٦٣٥٨ | ٥٧٨٤٧ | ٧٢٨٧ | ٦٦ | - | ١١٧٥٥٨ |
| ١٩٥٤ | ٨١٧٧١ | ٥٠٥٦٧ | ٥٨٨٨ | ٦ | - | ١٣٨٢٣٢ |
| ١٩٥٥ | ٩٥٣٢٨ | ٥٧٨٥٦ | ٦٧٤٧ | - | - | ١٥٩٩٣١ |
| ١٩٥٦ | ١٢١٢٣٠ | ٦٩٧٦٨ | ٨٨٠٦ | - | - | ١٩٩٦٠٤ |
| ١٩٥٧ | ٩٦٣٣٤ | ٧٠٠١٩ | ١٠٩٨٢ | - | - | ١٧٧٣٣٥ |
| ١٩٥٨ | ٨٧٠٦٩ | ٩٢٩٠٧ | ١٣٦٧٠ | - | - | ١٩٣٦٤٦ |
| ١٩٥٩ | ٧٥٧١٧ | ٩٠٢٠٣ | ١٢٠٠٨ | - | - | ١٧٧٩٢٨ |
| ١٩٦٠ | ١٢١٨٥٥ | ٥٨٦٦٤ | ١٥٢٨٢ | - | - | ١٩٥٨٠١ |
| ١٩٦١ | ١٢٨٠٤٧ | ١٠٥٨٧٤ | ١٤٩٢٨ | - | - | ٢٤٨٨٥٠ |
| ١٩٦٢ | ١١٧٠٥٤ | ١٢٨٩٩٠ | ١٥٦٧٣ | ٤٧ | - | ٢٦١٧٦٤ |
| ١٩٦٣ | ١١٢٧٥٠ | ٧٠٥٩٣ | ١٣٤٤١ | ١١٧ | ١ | ١٩٦٩٠٢ |
| ١٩٦٤ | ١٠٤٣٩٤ | ٦٩٨٣٠ | ١٣٤٤٢ | ٣٥٥ | - | ١٨٨٠٢١ |
| ١٩٦٥ | ٧٨٩١٧ | ٦٣٣٩١ | ١٧٠٩٦ | ٥٥٥ | ٣٤ | ١٥٩٩٩٣ |
| ١٩٦٦ | ٨٤٥٢٦ | ٤٤٤٠٧ | ١٦٢٤٢ | ٤١٨ | ٧٦ | ١٤٥٦٦٩ |
| ١٩٦٧ | ٩٤٩٨٢ | ٣٦٨٥٠ | ٢٣٨٤٧ | ٢٦٤ | ٣٥ | ١٥٥٩٧٨ |
| ١٩٦٨ | ٨٤٥٢٥ | ٣٧٤٤٣ | ١٦٧٤٤ | ٥٢٧ | ١٦ | ١٣٩٢٥٥ |

*** خشتەی ئەو ئاژەڵ و گیاندارانەی پارێزگای کەرکوك لەنێوان ساڵانی ( ١٩٤٤ - ١٩٤٥ ):**

| ساڵ | مەڕ | بزن | مانگای گۆشت | مانگای شیردەر | ئەسپ | هێستر | گامێش | گوێدرێژ | حوشتر | ڕەشە وڵاخ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٤٤ - ١٩٤٥ | ٩٦٨٣٨٧ | ٢٥٢٥٨٥ | - | ٥٩٦١٠ | ١٣١١٦ | ١٠٧٨٢ | ٤٨٢ | ٤٦٦٧٨ | ٨٥٠٠ | ٤٨٩٧٦ |
| ١٩٤٥ - ١٩٤٦ | ٤٨٨٢٠٠ | ١٦١٧٥٠ | ٤٠٢٥٤ | - | ٦٣٧٥ | ١٥٥٧٧ | ٧٥٠ | ٣٢٤٤٥ | ١١٥٠٠ | - |

*** خشتەی ئەو نەشتەرگەرییە ئاژەڵییانەی پارێزگای کەرکوك لەنێوان ساڵانی ( ١٩٣٨ - ١٩٥٦ ):**

| ساڵ | ژمارەی نەشتەرگەری |
|---|---|
| ١٩٣٨ - ١٩٣٩ | ٣٥٦ |
| ١٩٤٤ - ١٩٤٥ | ١٨٦ |
| ١٩٤٥ - ١٩٤٦ | ٢٠١ |
| ١٩٤٧ - ١٩٤٨ | ١٥٣ |
| ١٩٥٣ | ١٧٣ |
| ١٩٥٤ | ١٣٣ |
| ١٩٥٦ | ٨١ |

* ئەو نەخۆشیانەی کە تووشی ئاژەڵ بوونە لە پارێزگای کەرکوک لەنێوان ساڵانی (١٩٣٧ - ١٩٥٢):

| | ١٩٣٨-١٩٣٧ | ١٩٣٩-١٩٣٨ | ١٩٤٤-١٩٤٣ | ١٩٤٥-١٩٤٤ | ١٩٤٦-١٩٤٥ | ١٩٤٧-١٩٤٦ | ١٩٤٨-١٩٤٧ | ١٩٤٩-١٩٤٨ | ١٩٥١ | ١٩٥٢ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| یزو[1] – السقاو | ٢٥ | ١٣ | ٢ | ١٦ | ٥ | ٣ | ٥ | ٢ | ١ | ١٢ |
| چلم[2] – الرعام | ٩ | – | ١ | ٣ | ١٣ | ٢ | ١ | ٢ | ١٦ | ٨ |
| دەردە کۆپانی[3] – الکزاز (تیتانوس) | ١ | ١ | ١ | – | ١ | | – | – | ١ | ٤ |
| هاری سەگ – داو الکلب | ١ | ٣ | ١ | ٣ | ٣ | ١ | ١ | ١ | – | ٦ |
| مەقاو[4] – السراجة | – | – | ١ | – | ١ | – | – | – | – | |
| ئاولە[5] – الجدري في الغنم والماعز | هەموو پارێزگاکە | ١٩١٦ | ١٩٢ | ٣٧٧٠ | ٣١٥ | – | ٦١٦ | ٤٨٦٣ | ١٩٣٧ | ١٠٥٣ |
| پۆیە ڕەشە[6] – طاعون الدجاج | هەموو پارێزگاکە | ٤١٧ | ٢٠٧ | – | ٣٢٠ | – | – | – | – | – |
| وەناق[7] – دفتریا الدجاج | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – |
| گەری[8] – الجرب الطفیلي في الخیل والبقر | ٨ | ١٩٤٧ | ٨٠ | – | ٢٠٢٣ | ٣٣٤٦ | ٧٦٤٢ | – | ١٥٦ | – |
| ترپیانۆسۆم[9] – البجل | – | – | ٤٣ | – | – | – | – | – | – | – |
| سەگەناز[10] – الدستمبر | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – |
| سیلی مانگا – السل البقري | – | – | – | – | – | – | – | – | – | – |
| کرمی سی[11] – دیدان الرئة في الغنم والماعز | هەموو پارێزگاکە | – | ٨٢ | – | ٥٣٧ | – | ١٦٨٠ | – | – | ٣٥٠ |
| کرمی گەدە – دودة المعدة الرابعة في الغنم | – | ١٠٦٠ | – | ١٧٥ | ٦٨٥ | – | ٥٩٥ | ٣٦٠ | ٥٠٣ | ٣٥٦ |
| مشە[12] – عفونە الدم النزفیە | – | – | – | – | – | ١٩ | – | – | | – |
| شوقاق[13] – الحمی القلاعیة | – | – | ٤٣ | – | ٣١٢١ | ٢٠ | – | – | ١٤٨١ | |
| کرمی جگەر[14] – دودة الکبد | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٥٢ |

| | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کەچەڵی[15] – القرع | هەموو پارێزگاکە | ٣٥ | - | - | - | - | - | - | - | - |
| دەرخۆنە[16] – السرا | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| لارەش[17] – سواد الساق | - | ٣٦ | - | - | - | - | - | - | - | - |
| فووت رۆت[18] – تعفن الظلف في الغنم | - | ٦٢ | - | - | - | - | - | - | ١٦٠٧ | - |
| زەردویی[19] – مرض الصفراء | - | ٨٩٠ | - | - | - | ٧٠ | - | - | - | - |
| بەراویتە[20] – الاجهاض الساري | - | - | - | ٣ | - | - | - | - | - | - |
| هەڵامەتی ئەسپ – انفلونزا الخيل | | ٣ | - | - | - | - | - | - | - | - |
| هەوکردنی گوان[21] – التهاب الضرع الساري في الغنم | - | ٣ | - | - | - | - | - | - | - | - |
| نەخۆشی دویل – دويل (مرض نيو كاسل) | - | ٣٧ | ٣٢ | - | - | - | - | - | - | - |
| نەخۆشی سپڵ[22] – الجمرة الخبيثة (انثراكس) | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| کنێج و ئەسپێ[23] – القمل والقرادة | - | ٥٨٨٢ | - | - | - | - | - | - | - | - |
| – النزلة الشعبية الديدانية | - | ١٢٩٧٩ | - | - | - | - | - | - | - | - |
| دانکە[24] – جدري الدجاج | - | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| تای سووتێنەر – الحمى المحرقة | - | - | - | - | ٢٩٦ | - | - | ٩٥ | ٤٤٦ | - |
| لاقەر ڕەشە[25] – الجمرة العرضية | - | - | - | - | - | - | - | - | ٥٧ | - |
| هەوکردنی دەم – التهاب الفم الفرحوي | - | - | - | - | - | - | - | - | ٣٠ | - |
| کرمی ئەسکارسی مریشك[26] – دودە ماری ناو سك – الاسكارس في الدجاج | - | - | - | - | - | - | - | - | ٦٠ | - |
| – حميات بسيطة | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ٢٩٠ |
| خوێن کەمی – فقر الدم الساري | - | - | - | - | - | - | - | - | - | ١٧ |

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. پرو، السقاو:
نەخۆشییەکی درمە تووشی ووڵاخ دەبێت لە نەخۆشی (رعام – چڵم) دەچێت، پەردەی ئەندامی هەناسە دەئاوسێنێت و ماوەیەکی چڵمی لێ دێتە دەرەوە پاشان ژێر ملی ووڵاخەکە دەئاوسێنێت و رەق دەبێت و لە دواییدا دەبێت بە دوومەڵ، ئەم نەخۆشییە تووشی مەڕو ماڵاتیش دەبێت، بڕوانە: (کەمالنامە، فەرهەنگی زانستی عەرەبی – ئینگلیزی – کوردی)، کەمال جەلال غەریب، چاپی یەکەم، چاپخانەی (ڕێنوێن)، ٢٠٠٣، لاپەرە (٥٤٧).
٢. رعام، مخاط: چڵم، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٣٥).
٣. گزاز، تیتانۆسی، دەردە کۆپان:
هەرشتێک، پەیوەندی بە دەردە کۆپانەوە هەبێت، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١١٥٢).
٤. السراجة، سقاوە، ذناب، مەقاو، سەقاو:
نەخۆشییەکی درمە تووشی رەشە ووڵاخ دەبێتە گرێ و برین لە بۆری لیمفیدا پەیدا دەبێت، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٣٢).
٥. جدری، ئاوڵە، خوریکە، خرۆیکە، خرویلکە، خرووکە، خریی:
نەخۆشییەکی درمە تای لەگەڵدایە بڵق لەسەر پێست پەیدا دەکات و شوێن بە جێ دەهێڵێت، ئاوڵەی مانگا، ئاوڵەی رەشە ووڵاخ، نەخۆشییەکە بلۆق لە دەم و گوان و پێستدا پەیدا دەکات، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٠٦).
٦. طاعون الدجاج، پۆپە رەشە، دەردە مریشک، دانکە، چاوە قوولیی مریشک:
نەخۆشییەکی درمی ترسناکە تووشی مریشک دەبێت پێستی سەرو مل و سنگی دەئاوسێت و پۆپنەکەی شین دەبێتەوە، شلەیەکی لینج لە لووت و چاوو دەمی دێتە دەرەوەو سکی دەچێت، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٧٣٢).
٧. دفتریا، وەناق:
نەخۆشییەکی میکرۆبی درمە لە گەروودا دەبێت، ئاوڵەی باڵندە، وەناقی باڵندە، نەخۆشییەکی پیسە، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٧٢).
٨. الجرب الطفیلي، گەریی، خارشت گرگە:
نەخۆشییەکی درمی پیسە، بە هۆی گەنەیەکی سپی مەیلەو زەردەوە دەبێت، کە دەچێتە ژێر پێستەوەو دەبێتە هۆی خرووییەکی زۆرو پەیدا بوونی زیپکەو بڵق و توێکڵی ئەستوور، گەری نانەواکان، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢١١).
٩. البجل – دروین، تریپانۆسۆم:
جۆرە نەخۆشییەکی درمی پیسە لە فەرەنگی دەچێت برینش لە لێوی نەخۆشەکە پەیدا دەبێت، نەخۆشییەکە تووشی ووڵاخ دەبێت بە هۆی کرمێکی باریکەوە، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٩٥).
١٠. دستمبر، دیستیمبر، سەگەناز:
نەخۆشییەکی درمە بە زۆری تووشی دەماری سییەکان و ریخۆڵەی سەگ دەبێت، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٧٠).
١١. دودة الرئة، کرمی سیی، مەیتوولە، مارتوولە:
کرمێکی کوشندەیە لە بۆریی سیی مەڕو ماڵات و ئاژەڵدا دەژی، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣١٨).
١٢. عفونة الدم النزفیة، مشە:
نەخۆشییەکی تیژە تووشی گاو مانگا دەبێت، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی و ئاوسانی سی و گەدەو ریخۆڵەی لەگەڵدایە، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٨٣٧).
١٣. الحمی القلاعیة، جلاخ، شوقاق:
نەخۆشییەکی درمە، تووشی ئاژەڵ دەبێت و پلەی گەرمیی بەرز دەبێتەوە، ئەگەر لە دەما پەیدا بوو، پێی دەوترێت (تەبەق) ئەگەر لە سمدا بێ پێی دەوترێت (شەلکە) لە هەردوو جۆرەکەدا بلق پەیدا دەبێت و دەتەقێت و دەبێت بە برین، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٠٤).
١٤. دودة الکبد، کرمی جگەر، پەپوولەی جگەر:
کرمێکی مشەخۆرە لە جگەری مەڕو ماڵاتدا دەژی و تووشی نەخۆشیی دەکات لەگەڵای درەخت دەچێت، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٨١).
١٥. القرع، کەچەڵی، کەچەڵی ئەسپ:
نەخۆشییەکە دەدات لە ناوشان و کەفەڵی ئەسپ و ماین، کەچەڵی گاو مانگا دەدات لەسەر ملیان، خۆی کەچەڵی نەخۆشییەکی پێستە تووشی مرۆڤ و گیاندارو ئاژەڵ و باڵندە دەبێت لە نیشانەکانی وەرینی تووک و خوری و پەرە بە هۆی کەرووەوە بڵاو دەبێتەوە، هەروەها کەچەڵی پەلەوەریش هەیە، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠٤٧).
١٦. السرا، دەرخۆنە:
نەخۆشییەکە لە ناو ووڵاخدا بڵاودەبێتەوە، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٣٢).
١٧. سواد الساق، لارەش:
نەخۆشییەکی درمی ترسناکە، تووشی ئاژەڵ دەبێت و لەشی دەئاوسێت، بە تایبەتی ران و شان و پشتی ماسولکەی ئەو شوێنە رەش دەبێتەوە، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٩١).
١٨. تعفن الظلف (فووت رۆت foot rot، تەوەق، شەلکە):
نەخۆشییەکە ئەدات لە رەشە ووڵاخ ژێر سمی بریندار ئەکات و ناتوانێ بجووڵێت، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٦١).
١٩. مرض الصفراء، زەردوویی:
نەخۆشییە، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٣٣٤).
٢٠. اجهاض، بەراویتە، بەراویتە بوون، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠).
٢١. التهاب الضرع الساري:
هەوکردنی گوان، مەمک لە ئاژەڵ، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٧٢١).

٢٢. الجمرة الخبيثة، نەخۆشی سپڵ، هەوڵە، لەرزك، ئارنگ، زڵ زڵە، ئاگرە:
نەخۆشییەکی درمو کوشندەیە تووشی وولاخو ئاژەڵو مرۆڤ دەبێتو خوێن لە لووتو کۆمیەوە دێتە دەرەوە، هەندێك جار دوومەڵ یان زیپك لەسەر پێست پەیدا دەکات، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٨).
٢٣. القمل والقرادة، ئەسپێو گەنە، قڕنوو، کڕنی، کەوڵە، کەوە مێ:
مێرووڵەیەکە لە کۆمەڵی جاڵجاڵۆکەیە، دەنووسێت بە پێستی ئاژەڵەوەو خوێنەکەی دەمژێت، هەندێکیان نەخۆشی (تیندۆس) دەگوێزنەوە، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠٤٠).
٢٤. جدري الدجاج، دانکە، خوریکەی مریشك:
نەخۆشییەکی درمە تووشی باڵندە دەبێت، وەك مریشك، زیپکەو برین لەسەر پێستی پەیدا دەبێتو پەردەیەکی زەردیش لە ناو دەمیدا پەیدا دەبێت، ئاو لە دەمو گوێچکەی دێتە دەرەوە، هەروەها لە منداڵیشدا بڵاودەبێتەوە پێی دەوترێت (مێکوتە)، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٠٦).
٢٥. الجمرة العرضية، لاقە رەشە، لارەشە، دوان خڤییك:
نەخۆشییەکە دەدات لە لاقی ئاژەڵ، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٩).
٢٦. دودة الاسكارس، ئەسکارس ماری ناوسك، درنە، کرمی ئەسکارس، کرمی ناوسك، بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٨٢).

*** مێژووی پەتاو نەخۆشی لە کۆتایی سەردەمی عوسمانی لە کەرکوك (١٨٥٠-١٩١٨)ی زایینی:-**

د. قاسم ئەلجومەیلی

لە ماوەی مێژووی عێراقدا، هەر لە سەردەمانی زوودا گەلێك پەتاو نەخۆشی جۆراوجۆر و کوشندە، بڵاوبوونەتەوە، کە بەشێکیان عێراقیان تووشی کۆرە و مردنی بە کۆمەڵ کردووە و تا ماوەیەك ئەم پەتایانە بەردەوام بوونە، بۆیە لێرەدا گەلێك هۆکار رۆڵیان بینیوە لە بڵاوبوونەوەی ئەم پەتاو نەخۆشیانە کە بەشێکیان لەم خاڵانەدا خۆیان چڕ کردووەتەوە:-

**١- هۆکاری جوگرافی لە ئاو و هەواو و پێکهاتەی زەوی:-**

هەموو پەتایەك زۆر هەستیارە بە گەشەکردنی لە پلەی گەرماو شێ و بارینی باران، بۆیە هەریەکەیان رۆڵی هەیە لە پێگەیاندن و یارمەتیدانی بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی گونجاو گەشە بکات، هەر ئەمەشە وای کردووە لە سالنامەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا ئاماژە بەو هۆکارانەی باری جوگرافی کراوە بەتایبەتی لە وەرزەکانی زستان و هاوین و پاییزدا، بەڵام ئەگەر بەراوردی پارێزگای کەرکوك بکەی لەگەڵ پارێزگاکانی تر دەبینین کە هۆکاری جوگرافی کەمتر رۆڵی بینیوە، وەکو ئەوەی لە خواروو ناوەراستی عێراقدا رۆڵی بینیوە.

**٢- هۆکاری سروشتی لە برسێتی و لافاو:-**

لە ماوەی مێژووی عێراقدا گەلێك لافاو بەرزبوونەوەی ئاستی ئاو روویداوە کە زەوییەکی زۆر و فراوانی لە عێراقدا تووشی زیان کردووە، هەر لەو شارانەی کە زیاتر کەوتوونەتە سەر زێی دیجلە و فورات، هەر لەبەر ئەمەیە لافاو و بەرزبوونی ئاو هۆکارێکە بۆ دروستبوونی گۆماو و لیتەیی کە یاریدەدەرە لە بڵاوبوونەوەی ئاوڵە و کولێرەدا، هەروەها بەهۆی لافاوەوە پەتاکە بەشێوەیەکی بەرفراوان دەگوێزرێتەوە و بەردەوام دەبێ.

هەروەها برسێتی یەکێکە لەو هۆکارانەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئەویش بەهۆی نەبوونی خواردنی پێویست و بەردەست کە دەبێتە گەشەکردنی پەتاکە بەشێوەیەکی بەرچاو.

لە هەمان کاتدا پەتاو لافاو دەبێتە هۆکاری کۆرەو و کۆچی بە کۆمەڵ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر کە دەبێتە بڵاوبوونەوەی یان گواستنەوەی پەتاکە.

**٣- دابەزینی ئاستی پاکوخاوێنی و تەندروستی:-**

زۆری شارو شارۆچکەکانی عێراق دەیانناڵاند بەهۆی نەبوونی باری تەندروستی و نەبوونی پاکوخاوێنی لەسەر چاوەی ئاوخواردنەوە بەشێکی زۆری دانیشتووان لە خانووی قوڕ و لە ئاوی بیر سەرچاوەی ژیانیان بووە، هەروەها پاشماوەکانی مرۆڤ و ئاژەڵ وەکو پێویست لە ناو نەدراوە و بووەتە جێگەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی، هەر لە هەمان کاتدا بڵاوبوونەوەی گەلێك بوونەوەری زیان بەخش وەکو کێچ رۆڵی بینیوە لە زیاتر بڵاوبوونەوەی نەخۆشی.

**٤- هەژاری و دابەزینی ئاستی بژێوی دانیشتووان:-**

هەژاری و نەبوونی و نیشتەجێی نا تەندروست و بەدخۆراکی، یەکێك بووە لەو هۆکارانەی کە نەخۆشی و پەتایان بڵاوکردووەتەوە، بۆیە زۆری ئەو گەشتیار و گەرۆکانەی سەریان لە دەڤەری کەرکوك داوە باسی ئەو هەژاری و نەهامەتی و نەخۆشیانەیان کردووە، کە بووەتە هۆی دابەزینی ئاستی بژێوی ژیانیان و بڵاوبوونەوەی جۆرەها پەتا کە خەڵکی ناوچەکەی لەناوداوە.

**٥- بێتوانایی دەزگا تەندروستییەکان و ئاستی نزمی کارمەکانیان:-**

لە هەر سێ ولایەتەکانی عێراقدا لە سەردەمی عوسمانییەکان ئاستی دەزگا تەندروستییەکان لە بارێکی پێویست نەبووە و دەزگا و نەخۆشخانەی تەندروستی پێویست بەکارنەهاتووە لەسەر ئاستی رێـژەی ژمارەی دانیشتووان، هەر بۆیە لە سەردەمی (میدحەت پاشا)دا لە ساڵی (١٨٧٢)ی زایینی کە یەکەم نەخۆشخانە دانرا، لە ئاستی نەخۆشخانە نەبوو بەڵکو وەکو شوێنێکی بەساڵاچووان سەیر دەکرا، کە تەنها کاری بۆ ئەو کەسانە دەکرد کە بەساڵاچووبوون کەسیان نەبوو سەرپەرشتیان بکات لەرووی تەندروستییەوە.

هەر لەبەر ئەمەیە لەنێوان ساڵانی (١٨٩١-١٩١٢)ی زایینی لە کەرکوك یەك نەخۆشخانە و یەك دەرمانخانەی لێ هەبووە، کە لە ساڵی (١٩١٢)ی زایینی دەرمانخانەکەشی نەمابوو.

**٦- نەبوونی ئاسوودەیی سیاسی و گەندەڵی کارگێری:-**

بەهۆی ناجێگیری لە باری سیاسی بووەتە هۆکار بۆ ئەوەی بایەخی پێویست بە تەندروستی و پێویستییەکانی نەدرێت و بوونی ژمارەیەکی زۆری والیا لە ماوەی نێوان (١٨٩١-١٩١٢) کە خۆی لە سی و یەك والی دەدا، ئەمەش بەڵگەیە لە نەبوونی ئاسوودەیی سیاسی.

هەروەها یاخیبوونی خێڵەکی لە پارچەکانی عێراق هۆکار بوو بۆ روودانی شەر و پێکدادان و نەبوونی ئاسوودەیی، لە هەمان کاتدا بێدەسەڵاتی والییەکان لەناوخۆدا هۆکار بوو بۆ بێ هێزی تەندروستی.

**٧- بیر و باوەر و سرووتە ئاینییەکان:-**

بەهۆی دواکەوتن و کەمی تێگەیشتنی تەندروستی لە دەوڵەتی عوسمانی، بوو بە هۆکاری بیروباوەری ئیسلامی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی و پەتا ئەویش لەسەر بنەمای غەیب و خێوکە و باوەربوون بە قەدەر و خۆبەستنەوە بە کۆمەڵێك سرووتی ئاینیی بۆ چارەسەرە پزیشکییەکان بۆ نموونە ئەفسەرێکی بەریتانی هەرچەند هەوڵی دا کە داود پاشا باوەر بێنێت بە چارەسەری کولێرا لە بەغدا بە کردنەوەی پێگەیەکی تەندروستی بەڵام باوەری نەدەکرد و گوێیان لێ نەدەگرت، تا بەشێوەیەکی بەربڵاو تەنەشەی کرد.

**٨- دواکەوتنی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی:-**

بەهۆی دابەزینی ئاستی رۆشنبیری و دواکەوتنی کۆمەڵایەتی لە گەلێك باردا بووەتە هۆکاری تێنەگەیشتنی لە نەخۆشی و

چارەسەرەکانی و باوەڕنەبوون بە پزیشك و تێگەیشتنی لە ڕێنماییەکانی.

*** بڵاوبوونەوەی تاعون لەنێوان ساڵانی (١٨٦٧-١٩١٥):-**

وەکو ئەوەی لە فەرهەنگی (کەماڵنامە)دا هاتووە وشەی یان بنەرەتی تاعون بەمانای: ژەقنە، ژەقنەمووت، سنگان، شننا، ئاهۆ، چاوەقووولی، قران، درۆم، قوزەڵقورت، کە نەخۆشییەکەی درمە هاتووە.

ئەم نەخۆشییە لەسەر تاپای عێراقدا بەتایبەتی لە ناوەڕاست و خوارووی عێراقدا بەشێوەیەکی بەربڵاو گەشەیان کردووە و خەڵکێکی زۆری لە ناوداوە و زیانی گەورەی بە کۆمەڵانی خەڵك گەیاندووە.

کەرکوکیش یەکێك بووە لەو شارانەی کە بەدوور نەبووە بەم نەخۆشییەو هەردەم دوور و نزیك پریشکی بەرکەوتووە بەتایبەتی لە ناوچە سنوورییەکانی ئێرانەوە ئەم نەخۆشییە دزەی کردووەتە ئەم دەڤەرە، بەڵام ئاماری پێویستمان لەبەردەستدا نییە دەربارەی ڕێژەی مردوو و قەبارەی نەخۆشییەکە، چونکە بڵاوبوونەوەی لە شارێکی وەکو سلێمانی و دەورووبەری بێ دوودڵی ئەم دەڤەرەشی گرتووەتەوە.

*** بڵاوبوونەوەی کولێرا لەنێوان ساڵانی (١٨٥١-١٩١٧):-**

نەخۆشییەکە لە گەدەو ڕیخۆڵەدا دەبێت، ڕشانەوە و ژانەسك و سکچوونی لەگەڵدایە، ناوی بەرمشە و، ڕشانەوە و چاوەقوولێ هاتووە.

بنەرەتی (کولێرا) لە وشەیەکی عیبرییەوە هاتووە بەناوی (کولی – را) بە مانای نەخۆشی (پسیس و لەناب)، یان لە وشەی یۆنانی بەناوی زەرداو هاتووە، کە نزیکەی لە هێڵنج و ڕشانەوە کە تایبەتمەندییەکانی بریتییە لە :- ڕشانەوە، زکچوون، میزەچۆڕکێ، تینوێتی، زۆری لێدانی دڵ، دەنگ نووسان، دابەزینی پلەی گەرمی، بێ هێزی.

ئەم نەخۆشییە بەشێوەیەکی بەرفراوان لە عێراق بڵاونەبووەوە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم و بەو جۆرە بەناوبانگ نەبووە، هەر بۆیە نووسەرێکی وەکو ڕەسول کەرکوکلی لە کتێبی (دوحە الوزراو)دا بە نەخۆشییەکی ترسناك باسی لێوە دەکات بێ ئەوەی ئاماژە بەناوی بکات، بەڵام لە ماوەی فەرمانڕەوایی عوسمانیدا لەنێوان ساڵانی (١٩١٥-١٩١٧)دا چەند جارێکی ترسناك ئەم پەتایە لە عێراقدا بڵاوبووەتەوە کە زیاتر لە ئێران و هیند و مەکە و شوێنانی ترەوە هاتووەتە ناو وڵاتەوە.

لە حوزەیران تا تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٥١دا لە بەغداو بەسرەدا بڵاوبووەتەوە، کە لە دواییدا لە شارەکانی کفری و کەرکوکیش بڵاوبووەتەوە و درێژەی کێشاوە بۆ ناوچەیەکی بەرفراوان لە ئێران و دەورووبەری.

لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٨٥٥-١٨٥٨)دا دووبارە لە عێراقدا لە ڕێگای ئێران و مەکەدا بڵاوبووەتەوە بەتایبەتی لە شارەکانی بەغدا و کەربەلا و نەجەف و خانەقین و بەسرەو لەدوایدا بەرەو کەرکوك و کوردستان پەلی هاویشتووە.

لە ساڵی ١٨٦٦دا لە زۆربەی ناوچەکانی بڵاوبووەتەوە بەتایبەتی لە سلێمانی و کفری و دەورووبەری کە تا تشرینی دووەمی هەمان ساڵی خایاندووە.

لە ئاداری ساڵی ١٨٧١ تا کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٧٢ لە شارەکانی بەغداو بەسرە و موسڵ و سلێمانی و کەرکوك بڵاوبووەتەوە کە لە مانگی ئابدا لە کەرکوك بوونی هەبووە کە نزیکەی (١٢٠٠)کەسی لە کۆی دانیشتووان کە ٢٥٠٠٠ هەزار کەس بووە لە ناوداوە لە ماوەی بیست ڕۆژدا.

لە تەمووزی ساڵی ١٨٨٩ تا کانوونی یەکەم پەتایەکی بەهێزی کولێرا لە ناوچەکانی بەغداو بەسرەو موسڵی دا کە لە هیندستانەوە ئەم پەتایە بڵاوبووەتەوە.

هەر بۆیە سولتان عەبدولحەمیدی دووەم بڕیاری دەرکرد بە دروستکردنی پشتێنەیەکی تەندروستی بەدەوری بەغدادا کە درێژ دەبووەوە لە کفری و خورماتوو و تکریت تا سەر ڕووباری دیجلە و لەوێوە بۆ سەر هیت و کوبیسە لەسەر ڕووباری فورات لە (٤)ی ئەیلوول تا ٢٤ی ئەیلوول (١٤٣) کەس لە کفری مرد لە ٧ی ئەیلول تا ٢٦ی ئەیلول (٣٨٥) کەس لە کەرکوك مرد لە (١٢)ی ئەیلول تا ١٩ی ئەیلول (٨) کەس لە خورماتوو مردن، لە ١٦ی ئەیلول تا (٢٥)ی ئەیلول (٢) کەس لە پردێ مردن، لە ٢٠ی ئەیلول لە چەمچەماڵ دوو کەس مردن لە ٧ی ئەیلولی ساڵی ١٨٩٣دا لە داقووق (٨)کەس بەم نەخۆشییە مردوونە لە ٩ی تشرینی یەکەمدا لەنێوان کفری و کەرکوکدا (٢٩)کەس مردوونە، لە ١٣ی تشرینی یەکەم لە کفری و گوندەکانی دەورووبەری (١٨) کەس مردوونە لە پردێ لە ٢٥ی تشرینی دووەم (١٠٨)کەس مردوونە.

لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٣ تا کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٤ دووبارە لە بەغداو موسڵ ئەم پەتایە بڵاوبووەتەوە لە ڕێگای مەکە و میسر و سوریا، لە ڕێگای ڕووباری دیجلەوە گوازراوەتەوە بۆ موسڵ و کەرکوك و لەدوایدا بەرەو ناوچەکانی کوردستان تا سەر ڕووباری فورات درێژبووەتەوە.

لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان بۆ عێراق و شکاندنی سوپای عوسمانی لە ناوەڕاست و سەرووی عێراق گەلێك نەخۆشی جۆراوجۆری وەکو تاعون و کولێرا و مەلاریا و تیفۆ و (جبە بغداد) و مێشوولەی بیابان بەرگریان کردووە و سوپای بەریتانیا خۆیان لێی پاراستووە و هەوڵی قەڵاچۆکردنیان داوە.

*** بڵاوبوونەوەی ئاوڵە لەنێوان ساڵانی (١٨٥٤-١٩١٥):-**

پەتایەکە کە بڵاو دەبێتەوە و گەرماو لەشی داهێزرانی تێدایە و بەئاسانی لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوازرێتەوە بەتایبەتی لە ڕێگای هەوا و زیبکەی سەر پشت، یا برین و قنچکە.

ئامارەکان ئەوە دەخەنە ڕوو کە ئەم پەتایە لە ناوچەیەکی زۆری عێراق بڵاوبوونەتەوە بەتایبەتی لە ناوچەکانی سەرووی ڕووباری (دیجلە)، بەڵام بەڵگەی پێویست لەبەردەستدا نییە دەربارەی ڕێژە و جۆر و پانتایی بڵاوبوونەوەی، کەرکوکیش بەدەر نەبووە لە شارەکانی عێراق و دوورو نزیك ئەم پەتایەی تێدا بڵاوبووەتەوە.

*** بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعون لە کەرکوك:-**

**د. عەلی شاکر عەلی**

**گەلێك سەرچاوە بەشێوەی جۆراوجۆر باس لە بڵاوبوونەوەی تاعون دەکەن لە کەرکوك، کە بەشێکی ئەو سەرچاوانە باس لە ناوبردنی بە کۆمەڵی خەڵك دەکەن بەهۆی ئەم نەخۆشییەوە.. لە ئاقاری کەرکوك یان بەشێکیان لە سەرچاوەکان بەشێوەیەکی خەیاڵی باسی زیان و گەورەی فەوتاندن و کێشەکان دەکەن.**

**١- ساڵی ١٤٠٨ی زایینی تاعونێکی زۆر لە موسڵ و کەرکوك بڵاوبووەتەوە کە خەڵکێکی کوشتووە کە لە حیساب نایەت.**

**٢- ساڵی (١٤١٧)ی زایینی، تاعوون لە رۆژهەڵاتی وڵاتی عەرەبی بڵاوبووەتەوە و موسڵ و جەزیرە و کەرکوکیشی گرتووەتەوە.**

**٣- ساڵی ١٤٣٠ی زایینی تاعوون لە هەموو وڵاتانی رۆژهەڵاتدا بڵاوبوونەتەوە.**

**٤- ساڵی ١٤٣١ی زایینی تاعوون لە کەرکوك و موسڵ بڵاوبووەتەوە.**

**٥- ساڵی ١٤٣٧ی زایینی تاعوون لە کەرکوك و موسڵ و دەوروبەری بڵاوبووەتەوە.**

**٦- ساڵی ١٣٥٧ی زایینی تاعوون لە کەرکوك و موسڵ و دەوروبەری بڵاوبووەتەوە.**

**٧- ساڵی ١٤٦١ی زایینی هورژمێکی تاعوون لە بەغدا و تکریتەوە بەرەو کەرکوك و هەولێر و موسڵ گەیشت و خەڵکێکی بێ شوماری کوشت.**

**٨- ساڵی ١٤٧٢ی زایینی تاعوون لە بەغدا بەرەو کەرکوك هاتووە لەگەڵ چەند نەخۆشییەکی تری وەکو مەلاریا و ئاولە.**

**٩- لە ساڵی ١٥١٨ی زایینی بەهۆی بێ بارانی و کەم بەرهەمی نەخۆشی جۆراوجۆر لەم پارێزگایەدا بڵاوبووەتەوە.**

**١٠- لە ساڵانی: ١٦٢٣، ١٦٢٥، ١٦٢٩، ١٦٣٨دا بەهۆی زۆری شەری چەندان ساڵەی نێوان (عوسمانی - سەفەوی) لەم شارەدا، بوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی جۆرەها نەخۆشی، چونکە لە زۆر کاتدا بوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی جۆرەها نەخۆشی، چونکە لە زۆر کاتدا لاشەیەکی زۆر لە شارەکەدا بڵاوبووەوە و بۆن و نەخۆشی بڵاوکردەوە، لە هەمان کاتدا نەبوونی باران بارین لەو ساڵانە، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی زیاتر پەرەی دەسەند، لە هەمان کاتدا ناوە ناوەش کوللە هێرشی دەکرد و ئەوەندەی تر کارەکەی سەختتر دەکردەوە، کە خەڵکێکی زۆر منداڵەکانیان دەفرۆشت کە گەنم رتڵێکی بەدوو درهەم بوو، بەتایبەتی لەنێوان ساڵانی (١٧٧٣-١٧٧٤)ی زایینی دۆخەکە لە موسڵ و کەرکوك و هەولێر بۆ بڵاوبوونەوەی تاعوون زۆر سەختتر دەبووەوە.**

**١١- لە ساڵی ١١٨٥ی کۆچی تاعوون لە هەولێر و کەرکوك و بەغدا و عانە و حەدیسە و حیللە و بەسرە و حەسەکە بڵاوبووەوە بەشێوەیەکی بەرفراوان، دوای دوو ساڵ خەڵکێکی زۆر لە هەولێر بۆ کەرکوك رەویان کردو لە شارەکەیش بڵاوبووەوە.**

**١٢- لە ساڵی ١٢٠٩ی کۆچی ژمارەیەکی زۆری کوللە هێرشیان هێنا لە مانگی شوبات کە زیانێکی زۆریان بە زەوی کشتوکاڵیدا لە کەرکوك، کە قەبارەی کوللە زۆر گەورە بوون لە کاتی دروێنەدا، هەر بۆیە تاعوون لە سلێمانی و کەرکوك و بەغدا بڵاوبووەوە.**

**١٣- لە ساڵی ١٨٣٠ی زایینی تاعوون بڵاوبووەوە لە عێراق لە رێگای تەبرێزەوە کە بەهۆی رێگای بازرگانی و بازرگانەکانەوە گەیشتە کەرکوك و ناوەراستی بەغدا، کە ترسێکی گەورەی لەنێو خەڵکی دروست کرد و خەڵکی ماڵەکانیان بەجێهێشت.**

**١٤- لە ساڵانی ١٨٢٤، ١٨٦٥، ١٨٧١، ١٨٧٣، ١٨٧٤، ١٨٧٦، ١٨٧٧، ١٨٨١، ١٨٨٢، ١٨٨٩، ١٨٩٩، ١٩٠١، ١٩٠٤، بەشێوەیەکی بەربڵاو نەخۆشی تاعوون لە کەرکوك و دەوروبەری بڵاوبووەتەوە کە هەندێك لە ساڵەکان زۆر بەربڵاوبووە.**

**١٥- لەنێوان ساڵانی (١٩١٤-١٩١٨) بەهۆی شەری سەفەر بەلەکەوە برسێتییەکی زۆر کەرکوکی هەڵچنی بەتایبەتی لەنێوان ساڵانی ١٩١٦، ١٩١٧ تا بەوەی خەڵکی گۆشتی پشیلە و گوێدرێژیان دەخوارد و نزیکی ٥ هەزار کەس مردن، هەندێك لە خەڵکی منداڵەکانیان فرۆشت، دز و جەردە ماڵە دەوڵەمەندەکانیان دەرووتاندەوە، لەپای ئەمانە جۆرەها نەخۆشی وەکو تاعوون و کولێرا و نەخۆشی تر بڵاوبوونەوە کە دەسەڵاتدارانی عوسمانی و بەریتانیش بۆیان چارەسەر نەدەکرا.**

*** سەرچاوە:-**

**- الأوبئة والأمراض في كركوك (١٤١١-١٩٢١) دراسة تأريخية، د. عەلی شاکر عەلی، گۆڤاری توركمن ايلى (الأدب والفن)، ژمارە ١٣٢، ٢٠١٩، لاپەرەکانی (٧٠٢٩).**

## بەشی دووەم

# وەرزش و یانە وەرزشییەكانی كەركوك

*** وەرزش لە كەركوك لەنێوان ساڵانی سەردەمی پاشایەتی تا ١٩٥٨**

**د. دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان**

وەرزش لە شاری كەركوك بە بەراورد بە شارەكانی دیكەی ناوچەكە هەر لە كۆنەوە گرنگی زۆری پێدراوە، هەر لە یارییەكانی سوارچاكیو زۆرانبازیو هەتا یارییە نوێیەكانی وەك تۆپی پێو گۆلف. لە سەردەمی پاشایەتی گۆڕانێكی چۆنیەتی بەسەر باری وەرزشی شاری كەركوكدا هات، بە حوكمی پێشكەوتنە كۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسییەكانی ناوچەكە زۆرێك لە وەرزشە كۆنەكان بەرەو نەمان چوون، لە سەرووشیانەوە سوارچاكی. دەبێت ئەوەش بوترێت، زۆرێك لەو وەرزشانەی ئەو ڕۆژگارە بریتیبوون لە وەرزشی وەرزی، لە وەرزی بەهارو هاویندا چالاك و بەهێز دەبوونو لە وەرزەكانی دیكە تەواو لاواز. چونكە بوارەكانی وەرزشی پێشكەوتنێكی ئەوتۆی بەخۆوە نەدی بوو. لە وەرزی زستاندا زۆربەی كارە وەرزشییەكان دەكەوتنە چوارچێوەی چالاكییەكانی قوتابخانەكان[1]. هەرچی یارییەكانی (زار)و (شەترەنج) بوو، ئەوا بە زۆری لە چوارچێوەی قاوەخانەو چایخانەكاندا بوو[2].

لە گەلێك شوێنی شاری كەركوك لە ڕۆژگاری پاشایەتی (زۆرخانە) هەبوو، كە یاری پاڵەوانێتی تێدا ئەنجام دەدرا. لە پاڵەوانە بەناوبانگەكانی ئەو سەردەمە: (شوكر پاڵەوان، فەخری نوسرەت، جەعاو قەساب، قەرە عوسمان، فاتح پاڵەوان، هادی پاڵەوان، مەمەد پاڵەوانو هی دیكە) هەبوون. هەروەها لە پەنجاكانی سەدەی بیستەم هەندێك وەرزشی نوێی دیكە پەیدا بوون، وەك: لەشجوانی. ئەم وەرزشە لە لایەن كەركوكییەكانەوە گرنگی تایبەتی وەرگرتووەو خەڵكێكی چاك بە دەورییەوە بوون. لە یاریزانەكانی لەشجوانیی ئەو ڕۆژگارەی كەركوك: (فارووق نامیق، عەلی محەمەد، عەلی سەعید، نەجات محەمەد، فاتح حاجی عەبدوڵڵا، ناسیح حاجی عەبدوڵڵاو هی دیكە بوون). لە تیپە بەناوبانگەكانی شاری كەركوكیش: تیپی چوارباغ، تیپی ئیمام قاسم، تیپی قەڵا بوون[3].

یاری تۆپی پێ لەو وەرزشە نوێیانە بوو، كە لە سەردەمی پاشایەتی لە شاری كەركوك پەیدابوو. ئەم یارییە بە بەراورد بە یارییەكانی دیكە جەماوەرو خەڵكێكی زۆرتری هەبوو. یاری تۆپی پێ بە تایبەت لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە لە شاری كەركوك هاتە ئارا، لە ساڵانی پەنجاكانی سەدەی بیستەمیشدا گەشەكردنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی. لەو سەردەمەدا، شاری كەركوك خاوەنی چەند تیپێكی تۆپی پێ بوو، چەند یاریگەیەكی چاكیشیان هەبوو، بەڵام لە هەموویان باشترو ڕێكتر یاریگەی كۆمپانیای نەوت بوو[4]. چونكە دەسەڵاتدارانی كۆمپانیا، نەوتی ڕەش (جەفت) ڕێژیان كردبوو تاوەكو لەبارتر بێت بۆ یاریكردنو تەپ وتۆزی نەمێنێ[5].

یەكەم تیپی وەرزشیی تۆپی پێی كۆمپانیای نەوتیش لە كۆتاییەكانی چلەكان دروست بوو، بۆ كارمەندانی كۆمپانیاكە بە سەرۆكایەتی (میستەر ڕائول). لە دواتراو لە ساڵی (١٩٥٢)، یەكێتیی تۆپی پێی كەركوك بە سەرۆكایەتی (كەمال عەبدولقادر) هاتە ئارا[6]. ناوی تیپە گرنگەكانی تۆپی پێی كەركوك: (زێری ڕەش)، (تیپی سوپا)، كەتایبەت بوو بە فیرقەی دووی كەركوك. لە یاریزانە ناسراوەكانی ئەو ڕۆژگارەش: عەمۆ بابا (كلدانی)، كەریم ئەفەندی (كورد)، عادل عەبدوڵڵا (توركمان)، قاسم دیو (توركمان)، كازم (عەرەب)[7].

لەنێوان ساڵانی (١٩٣٢-١٩٣٣) وەرزش یەكێك بوو لەو بوارە دیارانەی قوتابخانەكانو بایەخێكی زۆر درا بە تۆپێنو باسكەو باڵە، زیاتر ئەم یاریانە لە پارێزگاكانی بەغداو كەركوكو سلێمانیو هەولێرو موسڵ بڵاوبووە، ئەویش بە هۆی كردنەوەی ئەو خولە وەرزشییانەی كە لە قوتابخانە سەرەتاییەكان دەكرایەوە بۆ فێربوونی منداڵان بە شێوەی مەشقو ڕاهێنان لەگەڵ خوێندنی وەرزشی، هەر ئەمەش وایكرد لە هەموو قوتابخانەكانی ئەم پارێزگایانە بایەخ بدرێت بە پرۆگرامی وەرزش.

لەنێوان ساڵانی (١٩٣٣-١٩٣٤) پەروەردە لە سەرتاپای عێراقدا بایەخێكی گەورەی دەدا بە پەروەردەی لەشو وەرزش، لە هەمان كاتدا پرۆگرامێكی بەرزی دانابوو لە بوارەكانی خوێندنداو گەلێك یاری جۆربەجۆری وەكو (مەلەوانیو لەشجوانیو گۆڕەپانو مەیدانو دیدەوانیو باسكە)و گەلێك یاری تر.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

**(١) بروانە: "صدى الشباب" (مجلة)، العدد (٢)، كركوك، شباط ١٩٥٠، ص٤٢؛"صدى الشباب" (مجلة)، العدد (٤)، كركوك، كانون الثاني ١٩٥٢، ص٤٢.**

**(٢) آيدن كركوك، مقاهي كركوك القديمة، ص١٩٢.**

**(٣) چاوپێکەوتنێکی مێژوویی لەگەڵ ناوداری شاری کەرکوک نوری فەقێ، "کەرکوک" (گۆڤار)، ژمارە (٢٧)، کەرکوک، زستانی ٢٠٠٦، ل١٥٣-١٥٥.**

**(٤) فاضل العزاوي، المصدر السابق، ص٢٨٧.**

**(٥) وجدي أنور مردان، من دفاتر ايام زمان.. زيارة جديدة لمدينة كركوك القديمة، المصدر السابق.**

**(٦) نجاة كوثر اوغلو، من حوادث كركوك، ص١١٦.**

**(٧) وجدي أنور مردان، من دفاتر ايام زمان.. زيارة جديدة لمدينة كركوك القديمة، المصدر السابق.**

## * بیرەوەرییەکانی وەرزش:-

زاهیر شکور

زۆربەی بۆچوونەکان، زۆربەی چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ یاریزانە کۆن و دێرینەکانی عێراق و کەرکوک باس لەوە دەکەن کە یاریی تۆپی پێ ئینگلیز هێنایە عێراق، هیچ سەرچاوەیەك نییە باس لە تۆپی پێ بکات لە سەردەمی عوسمانییەکان زۆربەی ئاماژەکان بۆلای ئینگلیز دەچێت.

ساڵی (١٩٢٥) ئینگلیز یەکەم تیپی تۆپی پێیان لە کەرکوك دامەزراند، لەو رۆژەوە یاری تۆپی پێ رۆژ لە دوای رۆژ فراوان بووەو تا بووە یارییەکی میللی فراوان لە هەموو گەڕەکەکان. عەیامێك بە تایبەتی لە گوندەکان و گەڕەکە میللییەکان تۆپیان لە پەرۆ دروست دەکرد، لە شەستەکانی سەدەی رابردوو، لە گەڕەکدا (١٥ - ٢٠) مێرد منداڵ لەنێو خۆیاندا پارەیان کۆ دەکردەوەو دەچوون تۆپێکی لاستیکیان بە سێ پەنجایی (١٥٠) فلس دەکری و لە گەڕەك یاریان پێدەکرد، جۆرەها تۆپ پەیدا بوو، تۆپی لاستێك، تۆپی چەرم، باشترین تۆپ لە شەستەکان لە کەرکوك جۆرە تۆپێکی چەرم بوو پێیان دەگوت (گرێگەر) ئەم تۆپە بەرگریی زۆری دەکردو درەنگ دەدرا.

لە کەرکوك یاریزانی بە توانا و شارەزا پەیدا بوو، نموونەی (عادل عەبدوڵڵا، کەریم ئەفەندی، فازیل عەبدولمەجید، کازم یاسین، عەدنان عەبدولجەبار) کە چەند یاریزانێك بوون لە کەرکوکەوە گەیشتنە تیپی هەڵبژاردەی عێراق، جگە لەمانە یاریزانی تر نموونەی (سامان محەمەد شۆراوی، حەسەن نوری، عەونی، ستار کوردی، حەسەن تەقلە، سەلاح مەلا قاوون، سەلاح حەسەن، سوهێل سابیر عەلی) و دەیانی تر کە ئەستێرەی ئاسمانی تۆپی پێبوون لە کەرکوك، ئێستاش سەدان یاریزان لە کەرکوك نەوەی دوای ئەوانن و وەرزش لەکەرکوك بەتایبەتی تۆپی پێ لەسەردەستی ئەوان پێشکەوتنی زۆری بەخۆیەوە بینیوە، لە تیپێکەوە ئێستا کەرکوك خاوەن دەیان یانەوتیپی جۆراوجۆرە، جاران یانەی سەورەو سۆلاف و ئیمام قاسم، ئێستا دەیان یانە لە کەرکوك هەیەو هەزارەها گەنج و لاو لە دەوری یانەکان کۆبونەتەوە، ئێستا چەندین یانەو تیپی کچانیش هەیە کە بواری وەرزشییان لە کەرکوك ئەوەندەی تر جوان کردووە.

لە کەرکوك لە بواری وەرزشیدا ئینگلیز رۆڵی ئێجگار زۆرو گەورەیان هەبوو چ لە پشتیوان کردن و دامەزراندنی تیپی وەرزشی لە ناو کرێکارو کارمەندانی کۆمپانیای نەوت، چ لە دروستکردنی یاریگاو مەلەوانگەو گۆڕەپانی وەرزشی، هەر لەدروستکردنی یاریگای کۆمپانیایی نەوت کە گۆڕەپانی هەموو یارییەکانی تێدا بوو بە مەلەوانگەی تێکەڵیشەوە تا دەگاتە گۆڕەپانی گۆڵف و تێنس وچەندین جۆری تری یاری. پێش دروستکردنی یاریگای (ئیدارە محلی) هەموو چالاکیە وەرزشیەکان لە یاریگای کۆمپانیای نەوت دەکرا، گۆڕەپانی گۆڵف کەوتبووە ناو کۆمپانیایی نەوت لە (بابە وەیس)، کەزیاتر ئینگلیزەکان خۆیان و ئەندازیارەکانی کۆمپانیای نەوت یاریان تێدا دەکرد، لە گوندەکانی سێکانیان و گورگەچاڵ منداڵانی ئەو گوندانە دەچوون تۆپەکانیان لەگۆڕپانی گوڵفەکە کۆدەکردەوە بۆ ئینگلیزەکان بەرامبەر پارەیان تۆپی یاری گۆڵفیان وەردەگرت، تۆپی گۆڵفی ئەو عەیامە لە جۆرە لاستیکێك دروست دەکرا هاو شێوەی لاستیکی پارە بوو، لە ناوەوە میزەڵانێکی تێدا بوو پڕ بوو لەشلەیەکی سپی خەست، هەموو ئەمانە لەمادەیەکی رەقی سپیدا کرابووە تۆپێکی سپی لەیاریکردندا دەخرایە سەر شتێك پێیان دەوت (تی).

هەر لەم گۆڵفەوە خەڵکی گوندەکان فێری یاری (شەقێن) بوون، شەقێن جۆرە یارییەك بوو لەنێوان دووتیپدا، قوتویەکی دۆشاو تەماتەیان پەنیری گرافت کە ئەو عەیامە بە (٢٠) فلس بوو دەکرایە تۆپ و یاریزانەکان بە دارشەق یارین پێدەکرد هەندێك جار بەم یارییەیان دەگوت (دایك) دایك تۆپەکە دەبووە دایك و یاریزانەکان بەیەکتریان دەگوت دایکتمان برد، لەمەوە کێبرکێ و ململانێ یارییەکە گەرم دەبوو، یارییەکی دیکەی میللی کە ئینگلیز هێنایان بۆ کەرکوك (جوغزێن بوو) جوغزێن لەناو بازنەیەکی گەورەدا بەرێوە دەچوو، یاریزانەکان دەبوون بە دوو تیپ تیپێك لەناو بازنەکە، تیپێك لەسەر هێڵی بازنەکە، ئەوانی دەرەوە بەتۆپ تێگرتن کە لە پەرۆ دروستکرابوو تۆپیان لە وانەی ناوەوە دەگرت هەرکەسێك بەری کەوتایە لەیارییەکە دەردەکرا ئەوانەی تۆپیان بەردەکەوت لە کەرکوك پێیا دەگوت (خرچان) ئەم یاریانە لە گوندەکانی دەوروبەری کۆمپانیای نەوت (شۆراو، سێکانیان، گورگەچاڵ، قەرەدەرەو) زۆربەی گوندەکانی تر زۆر باو بوو، زۆربەی رۆژانی زستان کەباران نەبوایە ئەو یاریانە لە گوندا دەکراو زۆر جاریش وەك پێشبرکێ لەنێوان گوندەکاندا دەکرا.

ئەو عەیامە پارە کەم بوو تیپەکان جلوبەرگی وەرزشییان نەبوو، هەر بە جلەکانی بەریانەوە یاریان دەکرد، دەیان جار بینیومە لە گوندەکان بە دەرپێی سەر خەرمانەوە یاری تۆپی پێ و (جوغزێن) و شەقێن دەکرا، ئینگلیز زۆر شتی هێنایە کەرکوك زۆرو بەردەوام هەوڵیدەدا زۆربەی یارییەکان لە گوندەکانی دەوروبەری کۆمپانیای نەوت بڵاوبکاتەوە ئەویش لە رێگەی ئەو کرێکارانەوە کە لە کۆمپانیای نەوت کاریان دەکرد. وەرزشیش بەو جۆرە لە کەرکوك دەستی پێکرد ئێستاش کەرکوك لە شارە یەکەمەکانی عێراقە بۆ تەماشاکردنی یاری تۆپی پێی وەرزشکردن بە تایبەتی کەرکوکییەکان زۆر تامەزرۆی یارییەکانی تیپەکانی ریال مەدریدو بەرشەلۆنەن. هەموو ئەو شارانەی نەوتی هەبوو و ئینگلیزیشی لێبوو وەرزش تیایدا بەهێز بوو بەتایبەتی یاری تۆپی پێ، بۆیە تا ئێستاش کەرکوك وبەسرەو موسل زۆرترین جەماوەری وەرزشوانی تێدایە.

*** (وەرزش و يارييە وەرزشييەكان لە كەركوك):-**
**سمكۆ بەهرۆز**

ئەگەر سەيرى مێژوو و دەستنووس و كۆتەڵ و هونەرەكانى سەر ديوارو ئەو بەردانەى دۆزراوەتەوە ئەوە دەخاتە روو كە مێژووى وەرزش و يارييەكانى مێژوويیەكى دووروودرێژى هەيە لە رووداوەكانى نێوان دوو رووباردا.
ئەو كۆچەرەوييەى كە لە سەرەتاى چاخە بەردينەكاندا بەرچاو دەكەوێت، واى لە مرۆڤى ئەوكاتە كردووە كە هەردەم بە دواى خۆراك و راوكردندا بەردەوام لە وەرزش و جوولەدا بووە كە هێزو بازووى خۆى بەكار هێناوە بۆ بە دەست هێنانى راوەكەى بە شێوەيەكى سەركەوتوو.
بەڵام لە سەردەمە مێژوويیەكانى دواى چاخە بەردينەكان گەلێك بەڵگە لێرەو لەوێ باس لە بوونى وەرزش و يارييەكانى دەكرێت، ئەمە بەڵگەيە كە هەر لە سەردەمە جۆر بە جۆرەكان مێژووەوە بوونى وەرزش هاتووە:-
"... بەپێى ئەو پشكنينەى كە لە ساڵى (١٩٧٧) دۆزراوەتەوە لە شارى (نوفەر) لە خوارووى عێراق، ئەوە دەخاتە روو لە پارچەيەكى شوێنەواريدا كە مێژوويیەكەى دەگەرێتەوە بۆ سەدەى نۆزدەهەمى پێش زايينى، تێدا ئەوە بە ديارەكە كە پێى پياوێك كە نيوەى لە خوارەوە بە ديارە، بەڵام لە بەرامبەريدا شتێك ديارە وەكو (تۆپ) وايە كە لە هەوڵى لێدانى ئەو تۆپەيە كە پێى بەرەودوا دەگەرێنێتەوە" [١]
بۆيە بمانەوێ و نەمانەوێ لەگەڵ فراوانبوونى زاخاوەزرى ژيانى مرۆڤ، لەگەڵ خۆيدا گۆرانكارى و جوانكارى دەورى هەبووە لە بايەخ دان و بە بيركردنەوەى دەورووبەرى بۆ سەرنج دان لەگەڵ گەلێك يارى و هەڵسووكەوت كە بەڵگەى ئەوەن مرۆڤ لە سەردەمە زووەكان هەردەم يارى كردووەو زاخاوى خۆى تاوودادە بۆ جوانكارى.
*** يارييە كوردەوارييەكان:-**
لەوەتەى كۆمەڵگەى كوردەوارى هەيە، مرۆڤى ئەم ناوچەيەش لە هەوڵداندا بووە بۆ ئەوەى ژيانى خۆى رێكبخات "... فۆلكلۆرى يارييەكانى كوردەوارى ئەوەمان بۆ روون دەكاتەوە لە ژيانى كوردەوارى دێرين كە لە كاتى حەسانەوەو بێ كاريدا خۆيان پێوە خەريك كردووە" [٢]
لە كۆمەڵگەى كورديدا گەلێك يارى جۆر بە جۆر هەبووە كە هەر هەمووى چووەتە چوار چێوەى وەرزشەوەو مرۆڤ بازووى خۆى بەكارهێناوەو راكردن و هەڵبەزو دابەزى تێدا بووە بەشێك لەو يارييانە تايبەت بوو بە پياو، ئافرەت، منداڵ، يان بە شێوەى كۆمەڵ يارى و وەرزشييان كردووە. " هەندێك يارى وەكو:- تاوڵە، شەترەنج، بليارد، تۆپ تۆپێنى، دامە، غارغارين، (كەللايانى - هەڵماتێنى) مزراحين، جۆڵانە، زۆرانێ، كەوشك، تايبەت نين بە ميللەتێكەوەو لە هەموو شوێنێك مرۆڤ يارى دەكات و هاوبەشە لەنێوانياندا.." [٣]
يارييەكانى كوردوارى جۆراوجۆر بوونە كە ئەمانە بەشێكيانە:-
" ئەستێرە پەنگەستێرە، ئەستى لە باخەڵ، پشيلە سوورە، پەليكانى، پيسكە، تاژ تووڵە، تەقڵەلێدان، تيروكەوان، جگانى، چاڵەوانى، چاوبەستنەوە، چاوشاركێى، چرە باپيرە، چوزەكە، چەرمەسەرانى، چەق چەقۆكەى بنى گوونان، حەلاليشك، حەمبەلەتفانى، خيتى ژنان، خيتى بيردان، راك راكانى، دەمانچۆكە، زيچانى، ساپ ساپينى، سنجوقين، سوونە سوونانى، سەرى بەبن كڵاوكەوتيە، سى ريزكانى، شەپلە قونانى، شەرە بەرد، شەرەبەفر، شەوتا، شەوى شەو بەراتى، قوورت قوورتانى، قومت قومەتالى، كڵاوپشت قونانى، كڵاو قشپلانى، كەرى بە قالان، كەرى پشت درێژ، كشيمانە كێش، گلۆلەمو، گوريس كێشكانى، كێ فرركانى، مێش گرە، ويلى ويلى، هوپ هوپ قەرە تۆق، بوو كوكە، بەنتك، پێنجوكانى، تيتلى سماق، چولى چوليانى، حووحايى، حيللانى، خانى چولكە، دوونگە مەرانى، سابوونە رەقێ، سووتام برژام، مورى خولكانى، مەگرى.. مەگرى، هەڵووربەلوور، هەليسكۆ بابى بابى، بووكە بە بارانە، حندر حۆب، ماڵ ماڵانێ، مەيل مەيلانى، ئەزە لەزە، بارە خييانى، بەللورى و دەياروك، تەركى بن بەرى، تەلەو رێويانى، تەندۆرە سووركە، جغزى، خەجەروو، دارکێشانى، درۆينەى بە كرەيى، دەستار، دەمەتەقى، ديزەو گوزە، راوە بەراز، راوە ژيشك، ساوار كووتان، شەرە قوور، شەرە كوفتە، قاشويانى، قاوقاوانى، قسەى نەستەق، كڵاوودرکانى كەرو ئاشەوان، كەرى كەر هاژۆ، كەللامستانى، گەلەك دابرينى، كێلە بەردانى، گوورگوورزانى، گوريسى بن سينگى، گەنم گەنمانى، مەتەڵ، ميرى گزيرانى، نان نانانى، هەولەملانى، هەوار هەدارانى، هەڵگرتنى شاهى ئەجندان، (هەياران - كۆسەبەبا) هەى كەر هەى كەر، [٤]
*** كەرەستە دۆزراوەكانى نوزى و كوروخانى:-**
لە ماوەى ئەو كنەو پشكنينانەى كە لە نوزى و كوروخانى دۆزراونەتەوە گەلێك كەرەستەى راو تيروكەوانى جۆربەجۆرى وەكو رم، شير، داس، سەرە رم، زرێپۆشى مسى، هەر يەكە لە مانە بەڵگەيەكى لەبەر چاوە كە ئەم جۆرە كەرەستانە لە پاڵ كەرەستە سەربازييەكانى لە هەمان كاتدا كەرەستەى وەرزشى جۆربەجۆرن كە لەوكاتاندا بەكار هاتووە لە خزمەت مرۆڤدا.
*** زۆرخانەكانى كەركوك:-**
زۆر خانە بريتييە لەو يانە وەرزشييە كۆنانەى كەركوك كە دەورێكى گەورەى بينووە لە بەشدارى خەڵكێكى بەرچاو يارييان تێدا كردووە.
لەگەڵێك شوێنى جۆراوجۆر لە كەركوك لە سييەكانى سەدەى رابردوودا بوونى هەبووە بە تايبەتى لە (شوێر حەمام)، لە چۆڵەوانى لاى شەقامى ئەوقاف، بەرتەكييە.
ئەم جۆرە يارييە گەلێك ياساو رێساى خۆى هەبوو كە تێدا پاڵەوان و تەپڵ و سرووتە ئايينييەكان دەوريان دەبينى لەم جۆرە يارييانەدا.
لە كەركوك گەلێك پاڵەوانى بە ناوبانگيان هەبوو وەكو: فەخرەدين ئيسماعيل، شكور پاڵەوان، تورك محەمەد، جعاو قەساب، ئەسعەد شەوكەت، فاتح قەساب، محەمەد گاج، عيزەدين پاڵەوان، ئەحمەد ئاغا، ساير عەلى، نورى فەقێ،



مەلا حەبیب زۆرخانچی.

" لە سەرەتادا کە باسی وەرزش بکەین لە شاری کەرکوك دا دەبێت باسی یاری وەرزشی (زۆرخانە) بکەین هەر لە زەمانی عوسمانێکاندا ناوی (مەلا عبدالله)ی پاڵەوان بهێنینە ناوەوە کە جێگایەکی تایبەتی هەبوو لە سەر ڕێگای کەرکوك هەولێر لەسەر گردەکەی (کۆشکلی) لەسەر ئاسیاوەکە تا ساڵانی چلەکان مابوو ئەم پاڵەوانە بازرگانی (کوتاڵی) دەکرد لەنێوان عێراق و ئێران لە هەردوو وڵاتەکەدا بە ناو بانگ بوو، باپیری عوسمان محەمەد پیرۆزخان بوو. باوکی



پاڵەوانی زۆرخانە: فەخرەددین نەسرەت پاڵەوان

دایکی بوو شەرواڵێکی پێستی تەنکی لەبەر دەکردو تاخوار ئەژنۆی بوو بە تەلی ئاورێشم چنراو بوو بە نەخش و نیگاری جوانەوە، هەروەها ناوی حوسێن بەگ سیامەنسووری کە مامی حەسیب محەمەد بەگی شەهید بووە ئەویش لە گەرەکی ئیمام قاسم لە تەك مزگەوتەکەی شێخ جواد لە عاشور جێگای زۆرخانەی هەبوو لەگەڵ عوسمان ڕەئوف و بەندە غەفووردا یاریان دەکرد، لە گەرەکی (ئاخور حوسێن) لە جووت حەمام کە ئێستا گازینۆی (تراث)ە لە بەردەم قەڵا ناوی شکور وەلی پاڵەوان و حاجی عومەرو حاجی عومەر سلێمان پاسەوان و فەخری نوسرەت و جەعاو قەساب و فاتح قەساب لەبیر نەکەین، شەکۆی (شکور) تەپڵ لێدەر بە دەنگە خۆشەکەی یاریزانەکانی ئەخستە هاندانەوە بێتەوەیادو (عیزەددین) کارگەچی و عەباس حەسەن مەترقەش پاڵەوانی ئەم یاری بوون.

وەلی پاڵەوان کە باوکی شکور پاڵەوان بوو خەڵکی دێی کەڵوور بوو لە ناحییەی شوان کە زۆر بەهێز بووە وەك دەڵێن هێزی چوار زەلامی هەبووە، گۆزەی بەپەنجە شکاندووە لە بەرامبەر سینەما علەمێنی ئێستا جێگایەکی زۆرخانە هەبوو (سایر عەلی هەمەوەندی) و مەهدی پاڵەوانی ئەو جێگایە بوون ناوی حەبیبە سووری تەپڵ لێدەر بە ناوبانگ بووە، هەروەها لە جێگاکەی ئێستای مزگەوتی (الیاس) حاجی (سکران) بە ناوبانگ بووە لە یاری زۆرخانەدا لە پێش ساڵەکانی پەنجادا (نوری محەمەد عەبدوڵڵا) کە بە نوری فەقێ بەناو بانگە جێگایەکی یاری زۆرخانەی لەسەر شاخەکەی سەر ڕێگای کەرکوك سلێمانی دروستکرد لە چوارباغ. دوایی یاری ئاسن پەرەی سەند نوری فەقێ و محەمەد سەعید ئاسنیان کۆکردەوە (ئیبراهیم)ە ڕەش ئیسماعیل و مەلا مەهدی تۆپاڵ و بەکر مەلا عەبدوڵڵا و سەید حەسەن عەبدولکەریم شێخانی بە باشترین یاریزانی بەرزکردنەوەی قورسایی ئاسن و جوانی لەش دەژمێردران. چەندەها پاڵەوانێتیان بردووەتەوە لە هەولێرو مووسڵ. هەروەها نوری محەمەد عەلی (نوری حەمدیە حەنە) ڕەشید مەلا مەهدی و عەلی باوك و عوسمان محمد پیرۆزخان وەستا نادر محەمەد عەلی محەمەد عەبدولقادر بە باشترین یاریزانانی ساڵەکانی پەنجاکان دەژمێردرێن.

لە ساڵی (١٩٥٦) لەتەك قوتابخانەی (ئیمام قاسم)ی سەرەتایی دووهەم (محەمەد ئەبو شوارب) چایخانەیەکی گرت و دوو دوکان بۆ یاری بەرزکردنەوەی ئاسنیان تێدا دەکرد کۆمەڵێك گەنج لەوێ یاریان دەکرد.

ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە پێشبڕکێی سوارچاکی لە دەشتی چوارباغ دەکراو عەلی بەستی و ماینە جوانەکەی ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو.

یاری تاك بازو چورباز لەنێوان فەقێی مزگەوتەکان بە تایبەتی لە ڕۆژی هەینییەکانداو لە بەهاردا لە ڕاستی چوار باغ پێش برکێ دەکرا.

یاری تۆپی پێ لە چلەکاندا دەستی پێکردبوو لە گەڕەکەکاندا ولە ناو خاسەدا یاریگایەکیان دروستکردبوو حاجی ئەڵڵا وێردی لە سەرەتای پەنجاکاندا لەگەڵ سەید مەعروف سەید گل سەرپەرشتی تیپی ئیمام قاسمیان دەکردو مەحموود

قەلایی لە گەڕەکی قەلا ئەویش تیپی هەبوو، زۆر جار یاری تۆپێنیان دەکرد.
دووای ئەوان دوو تیپی بەهێز هەبوو لە ئیمام قاسم و بەرتەکییە.
تیپی (نور) بریتی بوون لەم ئەندامانە (خورشید عوسمان رابی، خەلیل رەشید، قادر محەمەد خدر، عەزیز تاهیر، ستار عەبدوڵلا، عیزەدین نوری، لەتیف عەبدولرەحمان، فازڵ نوری (ئەسوەد)، رەفیق مەولوود، ئەنوەر عەبدولقادر.
تیپی چوارباغ فاروق نامیق، عەلی محەمەد ئەمین (عەلی ئیحسان) محەمەد سەعید، نەجات محەمەد حوسێن جەلاو (ئامۆزا) سەعید حاجی عەبدوڵلا، فاتیح حاجی عەبدوڵلا، ئەحمەد حاجی فەخرەدین و کەسانێکی تر[٥]."

*** سەرەتاکانی سەرهەڵدانی وەرزش لە کەرکووك:-**

لەسەردەمانێکی زووی پێش شەڕی جیهانی یەکەم، وەرزش بەشێوەیەکی جۆراوجۆر ئەنجام دراوە، بەڵام بەشێوەیەکی ئەوتۆ نەبووە کە پرۆگرام‌و بەرنامەی بۆ دانرابێت‌و بە شێوەیەکی بەرچاو گرنگی‌و بایەخی خۆی هەبووبێت بە تایبەتی لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییەکاندا، لە ماوەی پرۆگرامی خوێندن‌و قوتابخانەکانی ئەو کاتەی کەرکوکدا.
بەڵام ئەگەر سەیری پرۆگرامەکانی تری قوتابخانەکان بکەین هەست دەکەین بایەخیان پێی داوە لە چاو بەرنامەو پرۆگرامی وەرزشدا.
بۆیە سەرچاوەکانی وەرزش لە لایەن خەڵکەوە بەکار هاتووە بەبێ ئەوەی بایەخێکی ئەوتۆی پێ درابێت کە لە سەر ئاستێکی بەر چاو ناوبانگی دەرکردبێت.
ئەم بارەش تاکۆتایی دەوڵەتی عوسمانی‌و هاتنی ئینگلیزەکان درێژەی کێشاوە، بەڵام لەوەو دوای دەرکردنی



عوسمانییەکان گۆڕانکاری لە پرۆگرامی خوێندن‌و وەرزش کراو هەموو ناوچەکانی عێراقی گرتەوە.
".. گەنجانی بەغدا یاری کردنیان بە تۆپ لە پێش شەڕی جیهانی یەکەم بە شێوەیەکی بەرچاوو ڕێکوپێك نەبووە، یەکەم یاری کردن بە شێوەیەکی فەرمی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩١٨) لەنێوان تیپی (دار المعلمین)ی سەرەتایی‌و تیپی هەڵبژێردراوی قوتابخانە سەرەتاییەکانی (الفضل، الحیدریة، البارِوودیة)[٦]
بەڵام هەندێك سەرچاوەی تر ئاماژە بەوە دەکەن کە هەر لە ساڵی (١٩٠٠)ی زایینییەوە عێراقییەکان یاری تۆپی پێیان کردووە، بە تایبەتی لە ڕێگای موسڵەوە گەشتۆتە عێراق ئەویش لە لایەن ئەو کەسانە کە لە خوێندن لە ئەستەمبوڵەوە گەڕاونەتەوە عێراق هەندێکی تریش لەو باوەڕەدان کە لەگەڵ هاتنی سوپای ئینگلیزەکان وەرچەرخانی گەورە لە بواری وەرزشدا ڕووی دا کە لە سەرەتاوە لە بەسرەو بەغداوە ڕووی داوە[٧]
یەکێك لە وانەی یاداشتی هەبووە لە بواری وەرزشدا ئاوا بەو جۆرە باسی دەکات:-
"... دەکەوێتەوە بیرم کاتێك کە من قوتابی بووم لە ساڵی (١٩١٥)دا لە بەغدا، تۆپمان بەکاردەهێنا، بەڵام بەشێوەیەکی سروشتی‌و دوور لە پەیڕەو و یاسادا، ئێمە کە منداڵ بووین تەنها بۆ کات بردنەسەرو ڕابواردن بەکارمان دەهێنا، بەڵام لەبەر نەزانی کۆمەڵگە، ئەو بایەخەی پێ نەدەدرا کە چەندێك گرنگ و بە بایەخە.
بەڵام کاتێك شەڕی جیهانی یەکەم دەستی پێکردو تیپێکی ئینگلیزەکان لە عێراق جێگیربوون، بینمان کە تۆپی پێ ئەرکێکی گرنگە بۆ سەربازەکانی سووپاو لێیان جیانەدەکرایەوە، لە کاتی دیتنمان بۆ ئەم یارییانە خۆشیمان دەبینی‌و سەیری جوولەی جیاوازو نامۆی ئەم یارییەمان دەکرد."[٨] شێخ ستار لە یاداشتەکانیدا لەو سەردەمانەدا بەم جۆرە باسی وەرزش دەکات:-
"... وەکو بە بیرم بێت دەربارەی تۆپی پێ، لەگەڕەکەکەی خۆمان کوڕێك هەبوو بە ناوی عادل مەلا سابیر کە بە عادلە سوور بە ناوبانگ بوو، کوڕێکی جوانکیلە بوو ئێستا نەماوە.
باوکی لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ شەریکە بۆ لای ئینگلیزەکان، باوکی بەرگ درووبوو لە کۆمپانیا. جارێکیان لە جاران ئینگلیزەکان تۆپێکیان دابوو پێی تۆپە کە زۆر سەیر بوو، ئێمە تۆپمان نەبینیووە، ئێمە کە یاریمان دەکرتۆپی پەڕۆمان کۆنەکردەوەو دارێکمان تێدا دەکردو دەمانبەست.
عادل کە تۆپەکەی هێنایەوە بۆ گەڕەك، هەموو منداڵانی گەڕەك چووینە بەردەم ماڵی عادل، عادل تۆپەکەی بۆ

دەرکردین کە شتێکی زۆر جوان بوو ووتی ئێوارە ئەیهێنم بۆ پشت قوتابخانەکە ئێمە لەو کاتەدا شتێکی زۆر سەیر بوو، هەر کەسێك پای لە تۆپەکە بکەوتایە زۆر کەیف خۆش دەبووین، عادل دوایی ماوەیەك تۆپەکەی بوو بە خۆڵەوە، تۆپەکەی بردەوە بۆ ماڵەوە ئێمەش کەوتینە دوایی، سەیر دەکەین لە ماڵەوە تۆپەکەی بە وەزەنی چەورکردو کردیە ناو تۆڕێك بە دیوارەکەوە هەڵیواسی..."[9]

" بەڵام کاتێك ئینگلیزەکان کاروباری کارگێڕی عێراقیان کەوتەوەست، هەستان بە دامەزراندنی (مێجر بۆمان) وەکو بەڕێوەبەری گشتی (معارف) وە یەکێك لە کارەکانی چاودرێری وەرزش بوو لە وولاتدا، لە هەمان کاتدا هەستا بە دامەزراندنی عەریف (هیوستن) بۆ ئەوەی سەرپەرشتی یاریی تۆپی پێ بکات لە قوتابخانە سەرەتاییەکان. ئەم هەنگاوەی ئینگلیزەکان وەرچەرخانێکی گەورە بوو بۆ بایەخ دان بە وەرزش لە عێراقدا"[10]

بە حوکمی ئەوەی کە کۆمپانیای نەوتی عێراق لە کەرکوك بوو، زۆربەی چالاکییە نەوتی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابوورییەکانیان لەم شارەدا بە شێوەیەکی زۆر بەرچاو بوو، لە هەمان کاتدا بایەخدانە کۆمەڵایەتیەکانیان دەوری هەبوو لە بایەخ دان بە وەرزش‌و هەردەم چالاکییە وەرزشییەکانیان کاریگەری بەجێهێشت لەسەر چالاکی و بزاڤی وەرزشی لەم شارەدا.

گرنگی کۆمپانیای نەوتی عێراق لەوە دابوو لەم بوارەدا بەردەوام لە چالاکیدا بوو لە هەموو بوارەکانی وەرزش، ئەویش لە چوار چێوەی کارە وەرزشییە جۆر بە جۆرەکان وەکو تۆپی پێ، ڕاکردن، باڵە، گوریس ڕاکێشان، مەلەوانی، پاسکیل سوواری، هەموو ئەم بوارانە گەلێك یاریزانی بەرچاو ناوبانگیان دەرکردووەو لە دوارۆژدا. بە شێوەیەکی گرنگ خزمەتی وەرزشییان کردووە.

هەر لەو ماوەیەی ئینگلیزەکان بوو کە پاسکیل هێنرایە ئەم شارەو خەڵکێکی زۆر بەکاریان دەهێنا بۆ چوونە سەرکار هەموو یەکە کارگێڕییەکانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك، تیپی وەرزشی جۆراوجۆریان هەبوو لە کاتی دیاری کراوو لە هەموو ساڵێکدا لە ڤیستڤاڵییە وەرزشییەکاندا بەشداری وەرزش‌و پێشبڕکێیان دەکردو خەڵاتی جۆراوجۆریان دانابوو بە وانەی کە لەو بوارەدا پێشرەو بوون.

* یاریزان کەماڵ عەبدولقادر دەڵێت:-

" مێژووی تۆپی پێ لە کەرکوك هەر لەگەڵ داگیرکردنی ئینگلیزەکان لە کەرکوك لە ساڵی (١٩١٨)دا دەست پێ دەکات، کە ئەم یارییەیان لە سەربازە ئینگلیزەکان وەرگرتووە[11].

لە دوای هاتنی ئینگلیزەکان بۆ کەرکوك هەر لە ساڵی (١٩١٨) ەوە بایەخ دان بە وەرزش دەوری خۆی بینووەو دوورو نزیك لێرەو لەوێ جۆرەکانی وەرزش سەری هەڵداوە بۆیە بە پێی ئەو سەرچاوانەی کەلە بەرچاوە هەر لە بیستەکانی سەدەی ڕابردووە یاری تۆپی پێ لە شارەکانی کەرکوك‌و موسڵ‌و هەولێر بوونی هەبووەو یاری تۆپی پێ لەنێوان شارەکان برەوی هەبووە. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە لە بیستەکان‌و سییەکانی سەدەی ڕابردوودا، وەرزش بە شێوەیەکی ڕێکوپێك‌و بەرنامە داڕێژراو نەبووە، لە چوار چێوەی



هەنگاوو چالاکی تاکەکەسیدا بووە، بەڵام توانیوویەتی ببێتە بناغەیەکی گرنگ لە پێشکەوتنی وەرزش لەو شارەدا.

لە چلەکانی سەدەی ڕابردوودا لە عێراق هەنگاوێکی بەرچاو بوو لە پێشکەوتنی وەرزش‌و بایەخ دان بەکردنەوەی تیپی وەرزشی لەنێوان قوتابخانەکان‌و بایەخی وەزارەتی (مەعاریف) بەکردنەوەی تیپە وەرزشییەکان نەك تەنها لە پەروەردە بەڵکو لە هەموو وەزارەتەکاندا.

لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٤٣)دا وەزارەتی مەعاریف یاداشت نامەیەکی بڵاوکردۆتەوە بەم شێوەیە:-

"... هەروەکو هەموو وولاتە دراوسێکانی دەوروبەریان، کە ئاستی بزاڤی وەرزشی گەیشتۆتە ئاستێکی بەرچاو، وەزارەتی مەعاریف بڕیاری داوە بە کردنەوەی تیپی وەرزشی میللی نەك تەنها لەسەر وەرزشوانانی وەزارەتی مەعاریف‌و وەزارەتی بەگری، بەڵکو لەسەر هەموو وەرزشوانانی وەزارەتەکانی تر وەکو وەزارەتی بەرگری‌و ناوخۆو کاروباری کۆمەڵایەتی.

هەروەها ڕەزامەندی وەرگیراوە بۆ ڕاهێنانی وەرزشوانانی تۆپی پێ لەلایەن کەسانی سوپای بەریتانیاوە، ڕێکەوتنی کراوە لەسەر ئەوەی کە ئێوارەی هەموو ڕۆژانی سێ شەمە لە هەفتەیەکدا لە بەرواری (١٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٤٣) ئەم کارە بکرێت لە دوای ئەوەی کە کارڕایی پێویست کراوە بۆ ڕاهێنانی وەرزشی لە لایەن (جۆرج ڕێنر) بۆیە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی لەش‌ولار بە دانانی تیپێك لە قوتابیانی ناوەندی‌و سەرەتایی‌و (دار المعلمین) لەژێر ناوی (تیپی معاریف)، وە (مەجید سامەڕائی) هەڵبژێردراوە بۆ کارکردن لە بواری وەرزشداو گەشت کردنی بۆ کەرکوك‌و موسڵ تا وەرزشوانی خۆیان هەڵبژێرین لە بەشداریکردن لە ڕاهێنانی وەرزشی"[12].

لە چلەکانەوە (کەرکوك) یەکێك بووە لەو شارانەی کە بایەخی وەرزشی پێ دراوەو لە هەڵبژاردە وەرزشییەکاندا ناوی هاتووە.

بۆیە لەو دوا پێشکەوتنی گەورە لە بواری وەرزش لە قوتابخانەکانی کەرکوك گەشەی کردوو هەموو قوتابخانەکان بایەخیان بە وەرزش‌و یاریزان داوە، هەروەها دیدەوانی یەکێك بوو لەو ڕووانەی وەرزش کە هەموو ساڵێك بایەخیان پێداوەو لە ناوچەکانی دەوروبەرییەوە قوتابییەکانیان



ڕاهێناوەو گەشتی جۆراوجۆریان کردووە. لەم بوارەشدا گەلێك کەسایەتی بە توانانیان تێدا هەڵکەوتووە کە خزمەتی دیدەوانیان کردووە لەوانە عیزەدین مەجید، سابیر عەلی ئەحمەد هەمەوەندی.

ئەو یارییانەی کە لە قوتابخانەکان دەکرا بریتی بووە لە جمناستیك، تۆپی پێ، تۆپی باڵە، تۆپی باسکە، مەلەوانی، زۆرانبازی، ڕاکردن، هاویشتن، بازدان، گۆرەپانو مەیدان.

لە (٨)ی تشرینی یەکەم لە ساڵی (١٩٤٨)دا وەرچەرخانێکی گەورە ڕووی دا ئەویش بە هەڵبژاردنی (١٠) تیپی وەرزشی بە هەڵبژاردنی ئەندامەکان بۆ دروست بوونی یەکێتی تۆپی پێی عێراقی.

١- عوبێد عەبدوڵڵا سەرۆك
٢- سەعدی جاسم سکرتێر
٣- زیا حەبیب ئەلخەیالی ئەندام
٤- سەعید واسف ئەندام
٥- مستەفا ئەلقەڵەمچی ئەندام

هەروەها یەکێتی تۆپی بڕیاری یاریکردنی دەرکرد لە پێنجی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٤٨) لەنێوان ئەم تیپو یانەوانە

١- نادي الرياضي الملكي
٢- فريق القوة الجوية الملكية العراقية
٣- فريق كلية الشرطة
٤- فريق القوة السيارة
٥- فريق الحرس الملكي
٦- فريق وزارة المعارف
٧- فريق نادي الكانمواز
٨- فريق الكلية العسكرية الملكية
٩- فريق دار المعلمين العالية
١٠- فريق كلية الحقوق

هەروەها یەکێتی تۆپی پێ بڕیاری دا بە دابەشکردنەوە لقەکانی لە کەرکوك و بەسرەو موسڵ[١٣].

لەچلەکانی سەدەی ڕابردوودا یاری لەنێوان هەڵبژاردەی کەرکوك و هەڵبژاردەی نەینەوا کراوە لە یانەی (الجزيرة) لە موسڵ هەروەها لەنێوان ساڵانی (١٩٤١- ١٩٤٥) وەرزش بە شێوەیەکی بەرچاو گەشەی کردوو گەلێك تیپی وەرزشی بڵاوبووەتەوە وەکو:- الفرقة الثانية، النسور الثوري، الفريق الارمني، فريق المعهد الثقافي البريطاني"[١٤].

لە ساڵی (١٩٥٣)دا بۆیەکەم جار یەکێتی تۆپی پێی کەرکوك پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینی، وەبردنەوەی بەدەستهێنا لەگەڵ هەموو ئەو پارێزگا یانەی کە یاریکرد، تیپی لیوای دوانزە دەوری سەرەکی هەبوو لە پێگەیاندنی وەرزشوانی بە توانا وەکو:- عادل عەبدوڵڵا، کەریم ئەفەندی، فرێش خۆرین، کەمال ئەحمەد، هەروەها کۆمپانیای نەوتی کەرکوك



دەستێکی درێژی هەبوو لە هێنانی وەرزشوان لە (حەبانیە) وەکو ئارام کارم، سەرکس سولتان، بنیامینی، یوئارش ئیسحاق، فەزیل ئلیاس"[١٥]

لەکاتی گۆڕینی رژێمی پاشایەتی بۆ رژێمی کۆماری لە ماوەی نێوان سالانی (١٩٥٨- ١٩٥٩) تیپی هەلبژاردەی کەرکوك گەلێك یاری تۆپی پێ لەگەل جەزائیر، بولغاریا، رووسیا کردووە بە تایبەتی ئەو تیپی ناوخۆییەی وولاتەکان کە سەردانی عێراق و کەرکوکیان کردووە کە ئەو کەشە



موتەسەریف بەشیر حەدید
لە یەکێك لە ڤیستیفالە وەرزشییەکاندا

تازەییەی وولات دەوری بینی لە بەرەو پێشچوونی وەرزشدا.

١- هەلبژاردەی کەرکوك لەگەل تیپی (سیارتك ترنا ڤتی تشکی) (١) بە (٥) لە سالی (١٩٥٩)

٢- هەلبژاردەی کەرکوك لەگەل هەلبژاردەی (جەزائیر) (٠) بە (٥) لە سالی (١٩٥٩)

٣- هەلبژاردەی کەرکوك لەگەل (تیپی نەوتی جانیك باکو) (٢) بە (٤) لە سالی (١٩٥٩)

٤- هەلبژاردەی کەرکوك لەگەل (تیپی بولغاری سەربازی) (٠) بە (٤) لە سالی (١٩٥٩)[١٦].

٥- هەلبژاردەی کەرکوك لەگەل تیپی (رۆستونی رووسی) (١) بە (٥) لە سالی (١٩٦٥)

٦- هەلبژاردەی کەرکوك لەگەل تیپی (شەنغەهای) (١) بە (٥) لە سالی (١٩٦٥) [١٧]

لەو ماوەیەدا بەرێوەبەرایەتی پەروەردەو خوێندن لە کەرکوك دەوری گەورەی بینیووە لە پێگەیاندنی یاریزانی بە توانا بە تایبەتی لە بەشداری ڤیستڤالە وەرزشییەکان کە سالانە رێك دەخرا هەر ئەمەش وایکرد کە گەلێك یاریزانی بە توانای پێکهێنا کە دەوریان بینی لە گەورەکردنی هەلبژاردەی کەرکوکدا بەلام لە دوای سالانی (١٩٦٤)ەوە هەلبژاردەی کەرکوك بەرەو دواوە چوو یان ئەو پێشکەوتنەی لەوەو پێشەوەی نەما ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ هۆکاری ئەو بارە سیاسییەی کە هات بەسەر عێراق و کەرکوکدا.

*** کۆمەلێك لە چالاکی وەرزشی لەنێوان سالانی (١٩٥٣- ١٩٥٦) لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك:-**

١- لە رۆژی (١٨)ی نیسان لە سالی (١٩٥٣)دا ڤیستڤالی وەرزشی رێکخراوە بە سەرپەرشتی موتەسەرفی کەرکوك رەشید نەجیب و سەرکردەی تیپی دووی سوپا و بەرێوەبەری گشتی کۆمپانیا (مستر مینلاند).

ئەمەش ناوی براوەکانی ئەم ڤیستڤالەیە بەم جۆرە:-

١- لە راکردنی (١٠٠) مەتر، هنری شمرو (لەبەشی ئەندازیاری)

٢- لە راکردنی (٢٠٠) مەتر، خورشید نامیق.

٣- لە راکردنی (٤٠٠) مەتر، سەلمان یوسف

٤- لە راکردنی (٨٠٠) مەتر، عیسا ئەحمەد.

٥- لە راکردنی (١٥٠٠) مەتر، فازل سالح

٦- لە راکردنی (٣٠٠٠) مەتر، شەریف کەریم

٧- لە راکردنی (١١٠) مەتر، ئارام کەرەم

٨- فرێدانی قورسایی، ئەوادس هەمیز سونیا

٩- فرێدانی قورسایی، سەرکیس ئیبراهیم





خێزانی میستەر میلاند لە کاتی پێشکەشکردنی خەڵات بۆ تیپی وەرزشی تەرکیز

١٠ فڕێدانی قورسایی، عەلی ئەحمەد
١١- خۆهەڵدانی بەرز، ئەوادیس خەمبر ستونیا
١٢- خۆهەڵدانی درێژ، هەرمز دەریاویش
١٣- سێ خۆهەڵدان، هورمز وریاویس (١٨)

٢- لە (٢٣)ی نیسانی ساڵی (١٩٥٣) قوتابخانەکانی ناوەندی پارێزگای کەرکوك هەستان بە ڤیستڤاڵی ساڵانەی خۆیان لە گۆڕەپانی عەرەفە بەسەرپەرشتی وەزیر مەعاریف و موتەسەڕیفی کەرکوك (١٩)



لە یەکێ لە فیستیڤاڵە وەرزشیەکاندا خانم میلاند چەپکێ گوڵ وەردەگرێ لە فادیە فەخری

٣- لە (١٣)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٤)دا لە گۆڕەپانی تەرابلس لەنێوان هەڵبژاردەی کەرکوك یاری دۆستانەی وەرزشی رووی دا بە بردنەوەی کەرکوك بە چوار خاڵ بەرامبەر بەیەك خاڵ (٢٠)

٤- لە مانگی ئاياری ساڵی (١٩٥٤)دا لە کەرکوك ڤیستڤاڵی وەرزشی ساڵانە جێ بە جێ کرا کە لە هەموو بەشەکانی وەرزش لەلایەن تیپە وەرزشییەکانەوە هاتە ئەنجام بەسەرپەرشتی بەڕێوەبەری کێلگەی نەوتی (منیلاند) (٢١)

٥- لە سەعات سێی رۆژی شەمە لە (١)ی مایس لە ساڵی (١٩٥٤) ڤیستڤاڵی ساڵانی وەرزشی کۆمپانیای نەوتی عێراق لە کەرکوك بەم شێوەیە بە ئەنجام گەیەنرا:-

١- راکردنی (١٠٠) مەتر، جوزیف فلیب
٢- خۆهەڵدانی بەرز، ستراك ئوهانیس
٣- راکردنی (٨٠٠) مەتر، مرمشی دانیال
٤- فڕێدانی قورسایی، ئەلفرێد ئایزل
٥- راکردنی (٣٠٠٠) مەتر، مەحموود ئەسوەد
٦- راکێشانی گوریس
٧- راکردنی (١١٠) مەتر دووجا، لێون دانیال
٨- فڕێدانی خەپڵە، سەرکیس ئیبراهیم
٩- راکردنی (٢٠٠) مەتر، یواب ئایزل
١٠ سێ خۆهەڵدان، ئیسماعیل هورمز
١١ راکردنی (١٥٠٠) مەتر، مەحموود ئەسوەد
١٢- راکردنی (٤٠٠) مەتر، زەکی عەلی موسا
١٣- خۆهەڵدانی درێژ، یواب ئایزل (٢٢)



دوو ئافرەت لە یاری سوارچاکیدا لە کەرکوك





سوارچاك کەمال ئەمین پلەی یەکەمی بەدەستهێنا





میستەر تیسۆ لە کاتی پێشکەشکردنی وتەکەیدا دوای تەواوبوونی فیستیڤاڵە وەرزشییەکان لە گۆڕەپانی نەوتی کەرکوك



**عەبدولەتیف محەمەد خەڵاتی یەکەمی وەرگرت لەلایەن خاتوو هیندرسۆن**



**تۆما کبرۆ لە کاتی یاریکردندا لە گۆڕەپانی شەریکەی نەوت**



حەسەن ساڵح خەڵاتی جوانترین سوارچاكی عەرەبی وەرگرتووە



یاری گوریس ڕاكێشان لە كەركوك

(٦) کردنەوەی ناوەندی وەرزشی کۆمەڵایەتی لە کەرکوك:-
ئەم ناوەندە لە کۆمپانیای نەوت لەلایەن جۆن کنغهام کرایەوە



بۆ ئەو کارمەندە خانەنشینانەی کۆمپانیا تا بۆ ئەوەی بە هەستێکی وەرزشییەوە رایانبهێنن ئەم ناوەندە لە ساڵی (١٩٥٥) کرایەوە[٢٣]

(٧) هەڵبژاردەی کەرکوك لە هەڵبژاردەی نەوتی سووری دەباتەوە:- ئەم یارییە وەرزشییە لە (٢٠)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٥) روویداوەو کەرکوك بەسێ خاڵ بەرامبەر هیچ یارییەکەی بردووەتەوە.

(٨) هەر لە هەمان ساڵدا یاری لەنێوان تیپی سوپاو تیپی کۆمپانیا روو بداتو تیپی کۆمپانیا سێ خاڵی بردووەتەوە



بەرامبەر یەك خاڵ.

(٩) لە (٢٨)ی ئاداری ساڵ (١٩٥٥) یاری تۆپی پێ لەنێوان هەڵبژاردەی عەین زالەو هەڵبژاردەی کۆمپانیا روویدا بە بردنەوەی دوو خاڵ بەرامبەر بە یەك خاڵ[٢٤].

(١٠) لە (١٤)ی نیسان ساڵی (١٩٥٥) ڤیستڤاڵی ساڵانەی وەرزشی کۆمپانیای نەوتی عێراق بەسترا لە کەرکوك بە سەرپەرشتی موتەسەریفی کەرکوك یوسف زیاو مستەر منیلاند بەرێوەبەری گشتی کۆمپانیای نەوتی عێراق.

کە براوەکانی بەم شێوەیە بوو:-

١- لە راکردنی (١٠٠) مەتر، زوبێد حەمید
٢- لە راکردنی (٢٠٠) مەتر، سەلمان یوسف
٣- لە راکردنی (٤٠٠) مەتر، سەلمان یوسف
٤- لە راکردنی (٨٠٠) مەتر، عەلی مەنسوور
٥- لە راکردنی (١٥٠٠) مەتر، دبلیوجی بولر
٦- لە راکردنی (٣٠٠٠) مەتر، محەمەد ئەسوەد
٧- لە راکردنی (١١٠) مەتر، بەربەست، بنو یوخنا
٨- ٤ × ١٠٠ مەتر، فريق مركز التدريب
٩- ٤ × ١٠٠ مەتر، بريد فريق مركز التدريب
١٠- ٢٠٠× ٤٠٠ × ٨٠٠ × ٢٠٠ بريد فريق مركز التدريب
١١- خۆهەڵدانی بەرز، بنو یۆخنا، لە بەرزی ١/٦٠ مەتر
١٢- خۆهەڵدانی بەلاوە، ئیسماعیل هورمز
١٣- خۆهەڵدانی سێ لایی، فازڵ مەجید
١٤- خۆهەڵدانی (زانە)، بنو یۆخنا
١٥- فرێدانی قوورسایی، یوسف ئۆدیسو
١٦- فرێدانی خەپکە (قرص)، ئەدیشۆ دنخا.
١٧- فرێدانی (رم)، عەلی حەمەد

(١١) پێشبرکێی مەلەوانی لەنێوان هەڵبژاردەی سوپای عێراق لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی عێراق لە مەلەوانگەی یانەی

کۆمپانیای نەوتی عێراق لە (١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٥٥)[٢٥]
بردنەوەی تیپی کۆمپانیا بە (٨٧) خاڵ بەرامبەر (٣٨) خاڵ
(١٢) لە (٢٩)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٥٥) تیپی سوپای عێراق بردنەوەی بە دەست هێنا بە سەر تیپی کۆمپانیای عێراق بە بردنەوەی یەك خاڵ[٢٦]

(١٣) ڤیستڤاڵی گشتی پاسکیل سواری لە کەرکوك:-

لە رۆژی پێنج شەمە لە (١٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٥٦) بۆ یەکەم جار پێشبڕکێی پاسکیل سواری لە کێڵگەی نەوت روویدا بە بەشداری (٥٠) کارمەندی بە شەکانی کێڵگەی نەوت بە بڕینی (٢٣) کیلۆ مەتر لە دەشت و چیا و دۆڵ و گردی جۆراوجۆر، کە براوەکانی ئەم یارییە بەم شێوەیە بوو:-

١- خەڵاتی یەکەم بۆ (ولیَم دانیال) کە بە (٤١) دەقیقەو (١٩) چرکە ماوەکەی بڕی

٢- خەڵاتی دووەم بۆ (حیسامەدینی حوسێنی)

٣- خەڵاتی سێیەم بۆ (قاسم محەمەد یونس)[٢٧]

(١٤) بردنەوەی تیپی (القوة الجوية الملكية العراقية) بەسەر تیپی (قيادة الفرقة الثانية) لە گۆرەپانی کۆمپانیای نەوتی عێراق بە (٤) چوار خاڵ بەرامبەر (١) خاڵ لە رۆژی (١٦)ی شوباتی ساڵی (١٩٥٦)[٢٨]

*** دامەزراندنی یەکێتی تۆپی پێی کەرکوك:-**

بەپێی ئەو سەرچاوانەی کە باس لە وەرزش دەکات لە عێراقدا لە (٨)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٤٨) بۆ یەکەم جار یەکێتی تۆپی پێی عێراق دامەزراوە بە هەر سێ لقەکانییەوە لە بەسرەو موسڵ و کەرکوك و لەپاڵ بەغدا، بەڵام هەندێك سەرچاوە ئەوە دەخەنە روو کە لە ساڵی (١٩٥٢) یەکێتی تۆپی پێی کەرکوك دامەزراوە، بەڵام هەر لە ساڵی (١٩٤٨) ەوە زۆربەی سەرچاوەکان لە تۆمارەکانیاندا باس لە بوونی یەکێتی تۆپی پێی کەرکوك دەکەن.

بەڵام هەر لە ساڵی (١٩٥٢)دا یەکێتی تۆپی پێی کەرکوك گەلێك چالاکی هەبووەو لەوماوەیەدا پێشکەوتنی بەسەر پارێزگاکانی تردا هەبووە ولە هەموو یارییەکاندا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە لەو ماوەیەدا گەلێك یاریزانی وەکو: عادل عەبدوڵڵا، کەریم ئەفەندی، فرێش خۆرین، کەمال ئەحمەد و چەندینی تری هەبووە. لە هەمان کاتدا کۆمپانیای نەوتی کەرکوك یاریزانی وەکو:- ئارام کارم، سەرکیس سوڵتان، بنیامین، یوراش ئیسحاق، فەزیل ئلیاس هێنا بوو لە یاریکردن لە یەکێتی تۆپی پێی کەرکوك.

*** هۆکارەکانی پاشەکشێی بزاڤی وەرزشی لە شەستەکانی سەدەی رابردوو دا:-**

دەبینین لەم ماوەیەدا بزووتنەوەی وەرزشی تووشی نووچدان هات یان بەرەوکزی رۆشیت کە گەلێك هۆکاری جۆراو جۆر دەوریان بینی لە بێ هێزی وەرزشی لەم شارەدا:-

لەو ماوەیەدا بەشێکی زۆری یاریزانەکان پەیوەندیان کردووە بە تیپە وەرزشییەکانی ترەوە بە هۆکاری خزمەتکردنی سەربازی یان بە هۆکاری کاروباری رۆژانەو گواستنەوە بۆ پارێزگاکانی تر.

سەرقاڵبوونی بەشێکی وەرزشوانەکان بە کاروباری رۆژانەو راکردن بە دوای کارەوە تا بەوەی بژێوی ژیانیان بەدەست بهێنن بەشێکی تریان بە سەرقاڵی خوێندن لە پارێزگاکانی ترو کارکردن لە پێناوی خوێندن لە کۆلیژەکانی دوور لە پارێزگای کەرکوك.

ئەو بارە تایبەتی کە بە سەر وڵاتدا هات، بەتایبەتی بارە سیاسییەکە دەوری گەورەی بینی لە بێ هێزکردنی باری وەرزشی و سەرقاڵی خەڵکی بە کاروباری رۆژانە بە تایبەتی شارێکی وەکو کەرکوك زیاتر لە هەموو شارەکانی تر کەوتە ژێر ئەم کاریگەرییە.

دژایەتیکردنی وەرزشوانەکان لەلایەن خەڵکی و کەس و کارییانەوە بەوەی کە وەرزش هیچ پێویستییەکی ژیانیان جێبەجێ ناکات، هەروەها دەزگاکانی دەوڵەت و دامو دەستەی رابردوو لەو ئاستەدا نەبوونە تاکو بتوانێ بایەخ بە وەرزش بدەن.

لە کاتی برینیدار بوونی وەرزشوان لە گۆرەپانی یاریکردن هیچ دەزگایەکی فەرمی ئەرکی چارەسەر یان ئامادە نەبووە کاری پێویست یا چارەسەری بۆ بکات، ئەویش کاریگەری گەورەی بەجێدەهێشت لەوەی کە یاریزان واز لە پیشەکەی بهێنێت و بۆ هەتا هەتایە کەمئەندام بێت.

نەبوونی راگەیاندنی وەرزشی و هۆکارەکانی میدیایی، رۆڵی گەورەی بینیووە لەبەرەو دوابوونی وەرزشی، پەیوەندی بە جیهانی وەرزشی دەرەوە، بۆ نموونە لەو ساڵانەدا تەنها رۆژنامە یان گۆڤارێکی وەرزشی لەو شارە بەرچاو نەدەکەوت بۆ نموونە تەنها بڵاوکراوەی (صدى كركوك الرياضي) بوو، بەڵام لەو ئاستەدا نەبوو کە خزمەت بە رۆشنبیری وەرزشی بکات.

بەرنەکەوتنی تیپەکانی پارێزگا یان پەیوەندی نەکردنیان بە جیهانی دەرەوەی وەرزشی تا بۆ ئەوەی سوود لە هەنگاو و چارەسەرو پێویستییەکانیان وەربگرن، لەپاڵ نەبوونی کەلوپەلی وەرزشی پێویست بۆ یاریزانەکان.

نەبوونی گۆرەپانی رێکوپێك و لەسەر بنەمای وەرزشی دامەزرابێت بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە خزمەت بە وەرزش بکات، ئەوەش لەبەر نەبوونی چایەر و خۆڵ و فراوانی شوێنی یاریکردن، هەندێك جار دەبووە هۆکاری سەرەکی برینداربوونی یاریزان.

نەبوونی هەستی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی خەڵکی بەرامبەر وەرزش دەوری سەرەکی دەبینی لە داڕووخانی هەست و توانای تاکە کەسی یاریزان، چونکە پشتگیری کردنی جەماوەر دەوری هەیە لە بەرزکردنەوەی ئاستی یاریزان، بایەخ نەدانی یارییەکان بە کەرەستەو کامیرای وێنەگرتنی، دەوری سەرەکی هەیە لەبەرزکردنەوەی ئاستی وەرزش، چونکە گواستنەوەی یاری و دەرخستنی باری کەس وەرزشوان دەبێتە پاڵپشتێکی گەورە لە ژیانی وەرزشی[٢٩].

*** یاریزانەکانی کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٩٣٥- ١٩٤٥)ی تۆپی پێ:-**

حەمید عومەر، نوری مەردان، حەسەن عەبدولمەجید،

عەبدوڵڵا، واجد عوسمان، جەلیل کوردی، سابیرە لاڵ، شەوکەت عەنەر، محەممەد گاج، محەممەد عەنتەر، سەلیم ئەمین، سابیر عەلی، عەبدوڵڵاچەنەباز، عیزەدین عەبدی بەیاتی، کەمال عەبدولقادر، رەمزی عومەر، عەبدین چۆبان، جەمال وەلی، ئیلهام مەردان، حوسێنی تکریتی، دیران خاچیك، لەتیف عەزیز شێخلەر.

* یاریزانەکانی کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٩٤٦- ١٩٥٤):-
ئەحمەد نیعمەت، محەممەد عیزەت خەتاب، حیسامەدین مستەفا، عەونی بیلال، نەجات شێخ قودرەت، شەفیق رەزا، جەمال بەگ تکریتی، حەمود سابیر تکریتی، ئەحمەد جەلال، سوبحی عەبدوڵڵا، ئارام کارم، داڤید، سەرکیس سوڵتان، ویداد عەباس حیلمی کاکەیی، سوداد عەباس حیلمی کاکەیی، هالوب، فەخری ئاوچی، فەخری تکریتی.

* یاریزانەکانی کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٩٥٣- ١٩٦٦):-
عادل عەبدوڵڵا، فازڵ عەبدولمجید، خورشید نامق، کەریم ئەفەندی، فەزیل ئیلیاس، ئیسحاق یەعقوب، سەباح عوسمان کەتانی، عەلی موسا، بابەکین، ناپلیۆن لازار، فرێش خوری، تاهیر ئیسماعیل، تەحسین عەبدوڵڵا موختار، ماهیر بەیاتی، محەممەد عەبدولمەجید، غالیب ئاغا، ئیبراهیم قەدری ئەرزەرومی، وەهاب شەفیق، عەدنان عەبدولقادر، کازم یاسین، مستەفا سۆلاقای، کاکۆ موسلاوی، یوئاریش ئیشایا.

* یاریزانەکانی کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٩٦٧- ١٩٥٨):-
ئەشئەت محەممەد خەلیل، ئەنوەر سالح خدر، جەلال عوسمان عومەر، خەلیفە ئەسوەد، سەلاح نوری، رەفعەت داود، هاشم حەمودی، سەلاح حەسەن فەرەج، رەمزی حەیدەر، عادل عەلی، موئەیەد سەلاحەدین، عەونی غەنی، یاسین عەبدوڵڵا، عادل شوکر، سالم محەممەد قادر، کامل عەلی مەعروف، موفید خورشید، فوئاد محەممەد، محەممەد نوری، محەممەد مستەفا، عەونی حەسەن، موزەفەر نوری، عەدنان عومەر، عیماد قادر، قەیس بورهان، نیزام حەمید، سەباح غەفور، نزام محەممەد یاوەر، سەلاح سالح، وەلید رەزوان، سایغن شەوکەت، قاسم عەبدی، محەممەد حیکمەت، فەلاح سەلاحەدین، عادل مستەفا، کەریم خورشید، سوهێل سابیر، ساقی محەممەد، ئەیاد قادر عەلۆ[٣٠].

* یاریزانەکانی کەرکوك:-

*کەمال عەبدولقادر:-
- ماوەیەك پشکێنەری پەروەردە بووە لە بواری چالاکییە وەرزشییەکاندا.

*ئەحمەد جەلال:-
- ساڵی (١٩٢٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- قوتابخانەی سەرەتایی لە داقوق تەواوکردووە، ناوەندی لە کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٩٤٣-١٩٤٤) تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٤٧- ١٩٤٨) لە (دار المعلمین) دەرچووە لە بەغدا ولە ساڵی (١٩٤٨- ١٩٤٩) لە قوتابخانەی قەڵا بووە بە مامۆستای وەرزش بۆ ماوەی دە ساڵ.
- ساڵی (١٩٧٠)ەوە بووەتە سەرپەرشتیاری وەرزشی لە کەرکوك[٣١].



کەریم ئەفەندی

*کەریم ئەفەندی:-
- ساڵی (١٩٣٢) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ساڵی (١٩٤٨)ەوە دەستی بە وەرزش کردووە لەگەڵ تیپەکانی (الذهب)، (الاخوة)، (الهلال الأحمر)، (المعارف)، (شركة النفط العراق)، (الفرقة الثانية)، هەڵبژاردەی کەرکوك.



کەریم ئەفەندی و ئەحمەد جەلال

- بەشداری لە یاری وەرزشی کردووە لە رووسیا، چین، کۆریا، ڤیتنام، تورکیا، یۆنان، تونس، میسر، لوبنان، سوریا، لیبیا، ئێران.



عەبدولوەهاب شەفیق

***عەبدولوەهاب شەفیق:-**
- ساڵی (١٩٤١) لە كەركوك لەدایكبووە
ژیانی وەرزشی لە قوتابخانەكەیدا دەستی پێكردووە، لە دوایدا لە (الفرقة الثانية)، لە ساڵی (١٩٥٨) بووەتە كابتنی تیپی (فوج التدریب).

***هینری ئیسماعیل:-**
- ساڵی (١٩٣٤) لە كەركوك دایك بووە.



هینری ئیسماعیل

- هەر لە ساڵی (١٩٥٧)ەوە لە بواری وەرزش كاری كردووە لە (شركة النفط العراق)، نادي الاثوري.

***شلیمۆن شمۆئیل حەداد:-**
- ساڵی (١٩٤٤) لە كەركوك لەدایكبووە.



شلیمۆن شمۆئیل حەداد

- ساڵی (١٩٥٦)ەوە لە بواری وەرزش‌و مشتە كۆڵیدا یاری كردووە لە تیپی (الطیور الزرقاء)، هەڵبژاردەی (شباب كركوك)، هەڵبژاردەی شرطة البصرة، تیپی النادی الاثوري لە بەغدا
- هەروەها لە یاری (هۆكی) بە شداری كردووە

***كەمال تۆفیق:-**
- ساڵی (١٩٤١) لە كەركوك لەدایكبووە.
- سەرەتای یاریكردنی لە قوتابخانەكەی خۆیدا بووە، یاری كردووە لە تیپی (النهرین) لە ساڵی (١٩٥٨) لە دوایدا پەیوەندی بە تیپی (شركة النفط العراق)ەوە كردووە، هەروەها بەشداری ئەم تیپانەی كردووە:- (مصلحة نقل الركاب، نادی الثورة).

***ئەنوەر عومەر:-**
- سەرەتای كاركردنی لە قوتابخانەی (النجاح) دەستی پێكرد ولە زۆربەی یاری قوتابخانەكان دەوری هەبووە.
- ساڵی (١٩٥٧) بەشداری سوپای كردووە وەكو یاریزان هەروەها بەشداری تیپەكانی:- مصلحة نقل الركاب، نادی الثورة، هەڵبژاردەی كەركوك، تیپی (بەكتاش).

*ئایدن زەینەل گدك:-
- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە
- لە قوتابخانەی (موسەڵلا) بەشداری یاری تۆپی پێی کردووە
- ساڵی (١٩٦٠) بەشداری هەڵبژاردەی کەرکوکی کردووە لەگەڵ تیپەکانی:- تیپی ینی گون، قەرە ئاڵتون، تیپی الفرقة الثانیة، شرطة النفط.

*سوبحی مەحموود داغستانی:-
- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ساڵی (١٩٥٧ - ١٩٥٨) یاری کردووە لە تیپی (إعاشة کرکوك) مصلحة الکهرباء الوطنیة، هەڵبژاردەی کەرکوك، تیپی بشیکتاش

*تەحسینی ئیسماعیل:-
- هەر لە ساڵی (١٩٥٤)ەوە بەشداری وەرزشی کردووە لەگەڵ تیپی (المنصور الابتدائیة)، الفرقة الثانیة بشیکتاش.

*بەهجەت عەبدولرەزاق:-
- لەساڵ (١٩٤٧) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ساڵی (١٩٥٨) بەشداری وەرزشی کردووە لە ناوەندی (الشرقیة)و هەڵبژاردی (المعارف)، یانەی (الثورة) هەڵبژاردەی کەرکوك و بشیکتاش

*کیورك ئارتین کیفورکیان
- ساڵی (١٩٤٨) لە کەرکوك لەدایکبووە
- بەشداری یاریی باڵەو باسکەی کردووە لە ساڵی (١٩٦١)و لە یاریزانی پلەیەك بووەو بەشداری یانەکانی کەرکوك بووەو لە ساڵی (١٩٦٣)دا پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە
لە ساڵی (١٩٦٤) هەڵبژێردراوە بە یاریکردن لەنێوان هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك

*عادل شوکر:-
- ساڵی (١٩٤٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە ساڵی (١٩٦٠)ەوە لە وەرزش بە شداری کردووە لە تیپی ناوەندی (الشرقیة)ء (مصلحة نقل الرکاب)و (الشرطة)

*عابدین زینل:-
- ساڵی (١٩٤٦) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ساڵی (١٩٥٨)ەوە لەنێو تیپی قوتابخانەی (المنصور)ی سەرەتایی وەرزشی کردووە
- لە دوایدا بەشداری لە قوتابخانەی (الوثبة)و (الشرطة)و (الفرقة الثانیة)و (بشیکتاش).

*قادر عارف:-
- ساڵی (١٩٤٨) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ساڵی (١٩٦٠)ەوە بەشداری وەرزشی کردووە لە موسەڵای سەرەتایی (یانەی باڵەی الثورة)و تا ماوەیەکی چاك لە یانەی (الثورة) بەشداری کردووە

*سەباح عەتا:-
- ساڵی (١٩٥١) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ماوەیەك لەنێو تیپە میللییەکانی کەرکوك بە شداری کردووە،
- ماوەیەك لە تیپی قوتابخانەی الشرقیە بەشداری کردووە
- ساڵی (١٩٦٤) لەگەڵ تیپی (ئوغل) بەشداری کردووە

*حەقی حوسێن ئاڵتوون:-
- ساڵی (١٩٤٦) لە کەرکوك لەدایکبوو
- هەر لە ساڵ (١٩٦٤)ەوە لە بواری وەرزشی بەشداری کردووە
- لە ساڵی (١٩٦٥)ەوە لە بواری لەشجوانی بە شداری کردووە

*ستراڵ ئاکۆب ماداشلیان:-
- ساڵی (١٩٤٧) لە کەرکوك لەدایکبووە
- هەر لە ساڵی (١٩٦٤)ەوە بەشداری یارییە وەرزشییەکانی کردووە
- ماوەیەك ئەندامی تیپی وەرزشی (هوفتمن) بووە

*سالوك کولتیك ئۆهانیان:-
- ساڵی (١٩٤٧) لە کەرکوك لەدایکبووە
- هەر لە ساڵی (١٩٦١)ەوە بەشداری لە یاری باسکە کردووە
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٣- ١٩٦٤) لە یانە وەرزشییەکانی کەرکوك بە شداری کردووە
- ساڵی (١٩٦٦) بەشداری هەڵبژاردەی کەرکوك و پەروەردەی کردووە

*سەباح عەبدوڵڵا:-
- ساڵی (١٩٤٧) لە کەرکوك لەدایکبووە
- هەر لە ساڵی (١٩٥٧)ەوە لە تیپی قوتابخانەی ناوەندی الشرقیەو هەڵبژاردەی پەروەردە بە شداری کردووە لە دواید لە یانەی (الثورة) بە شداری کردووە لە دوایدا لە تیپی (بشیکتاش)

*سەلاح حوسێن ئاڵتون:-
- ساڵی (١٩٤٣) لەدایکبووە
- سەرەتای ژیانی وەرزشی لە تیپی موسەلا بەشداری کردووە ماوەیەکی تر لە ناوەندی موسەلا بە شداربووە[٣٢].

*ئامیق بیرقدار:-
- ساڵی (١٩٣١) لە کەرکوك لەدایکبوو
- هەر لە سەرەتادە لەگەڵ تیپە میللی و تیپی قوتابخانەکان بە شداری وەرزشی کردووە.
- لەنێو تیپی (الکلیة العسکریة) بەشداری کردووەو لە ساڵی (١٩٥٥) کۆلیژی سەربازی تەواو کردووە، لەدوایدا دامەزراوە



کیورك ئارتین



نامیق بەیرەقدار



عادل شوکور

بە ئەفسەر لەبەشی یارییە وەرزشییەكان لەنێوان سالانی (١٩٥٩، ١٩٦٠، ١٩٦١، ١٩٦٢.
– بەشداری یاری تۆپی پێی عێراقی كردووە لە سالی (١٩٥٩) لەكاتی یاریكردنی لە دەولەتە ئیشتراكییەكان.
– بەشداری خولی وەرزشی لەش ولای كردووەو راهێنانی كردووە لە راهێنانی تووندو تیژی بەریتانیا وپلەی سێ یەمی بەدەستهێناوە لە ناوبژیوانیدا.
– لە سالی (١٩٦٢) بروانامەی بەدەستهێناوە لە بواری ناوبژیوانیدا لەلایەن یەكێتی تۆپی پێی نێودەولەتی.

***هەلمەت یوسف:-**
– سالی (١٩٤٦) لە كەركوك لەدایكبووە
– سالی (١٩٦٤)ەوە لە بواری مستەكۆلی یاری كردووە لەژێر دەستی ئەنوەر یوسف.
– بەشدار سێ میهرەجانی كردووە لە ناوەراستو كەركوكو عێراق.
– ئەندامی وەرزشی مستەكۆلە بووە لە فیرقەی (٢)ی سەربازی.

***ئیبراهیم مەجید:-**
– سالی (١٩٤٠) لە كەركوك لەدایكبووە
– هەر لە سالی (١٩٦٠)ەوە لە ژێر سەرپەرشتی مەهدی وەحید راهێنانی پێكراوە، لە سالی (١٩٦٠)ەوە بەشداری یارییەكانی سوپای كردووە لە كێشی ناوەند.
– هەروەها لە سالی (١٩٦٣) بەشداری یارییەكانی عێراقی كردووە.



ئیبراهیم مەجید

– لە سالی (١٩٦٤) خەلاتی مەدالیەی زێری بەدەستهێناوە
– پلەی سێیەمی بەدەستهێناوە لە كاتی بەشداری لە خولی (كانیفو) لە دەولەتە تازە پێگەیشتووەكان كە لە ئاسیا رێكخرا بوو[٣٣].

*** عیزەدین مەجید خدر:-**
– سالی (١٩٢٠) لە كەركوك لەدایكبووە.
– سالی (١٩٤٤) لە پەیمانگای (إعداد المعلمین) دەرچووە بووە بە مامۆستای (وەرزش).
– بۆ ماوەی سالێك لە سالی (١٩٥٩) دوور خراوەتەوە بۆ (عەمارە).



عیزەدین مەجید خدر

– سالی (١٩٥٢) سەرپەرشتیاری پەروەردەی دیدەوانی پارێزگای كەركوك بووە.
– بەشداری چالاكییە دیدەوانییەكانی كردووە لە ئینگلیترا، میسر، ئێران.
– چالاكی زۆری هەبووە لە یانەی (الپورە).
– سالی (٢٠٠٢) كۆچی دوایی كردووە.

*** سابیر عەلی ئەحمەد هەمەوەندی:-**
– سالی (١٩٢١) لە گەرەكی بەگەكان لەدایكبووە لەسەر قەلا.
– سالی (١٩٤٠) لە پەیمانگای (دار المعلمین) دەرچووە.
– سالی (١٩٤١) بووە بە مامۆستا لەسەر میلاكی وەزارەتی (مەعاریف)، لە دواییدا كارەكانی گواستووەتەوە بۆ كۆمپانیای نەوتی عێراق.
– خەلات وریزلێنانی بەدەستهێناوە لە بەرگری نیشتمانی، تۆپی پێ، تۆپی بالەو باسكە، مەلەوانی، هەلگرتنی قورسایی، هەروەها لە یاریزانەكانی زۆرخانە بووە.
– بەشداری هەبووە لە یانەی وەرزشی (الثورة)

- ماوەیەك بەڕێوەبەری یانەی کۆمپانیای نەوتی عێراق بووە
- دەستی هەبووە لە دیدەوانی کۆمپانیای نەوت لە ساڵی (١٩٥٦)
- ساڵی (١٩٩٥) کۆچی دوایی کردووە.

*** هیجران ئەحمەد بەیاتی:-**
- ساڵی (١٩٥٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٦) تیپی میللی (ماوی یلدز)ی دامەزراندووە.
- ساڵی (١٩٧١) بەشداری ماوەی پێگەیاندنی (ناوبژیوانان)ی وەرزشی کردووە کە لە یەکێتی تۆپی پێی عێراقی لە کەرکوك کراوەتەوە.

*** عادل عەبدوڵڵا:-**
- یەکێك بووە لە یاریزانە بە تواناکانی کەرکوك کە زۆر بە هێمنی کاری کردووە لە بواری وەرزشی و کەسێکی دڵسۆزی بووە لە بوارەکەی خۆیدا، ماوەیەك لە هەڵبژاردەی کەرکوك بەشداری کردووە، یەکێك بووە لە هێماکانی وەرزشی کەرکوك کە هەر باسی دەکرێت.
- ساڵی (١٩٣٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.

*** ویداد عەبباس حیلمی:-**
- یاریزانی چلەکان و پەنجاکان بووە لە کەرکوك.
- یاریزانێکی بە توانا بووە لە جووڵە و هێرش کردندا لە گۆرەپانی وەرزش، هیچ یارییەکی نەبووە کە خاڵ و سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا بێت.

*** عەبدولغەفور مستەفا:-**
- ساڵی (١٩٣٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك تەواوکردووە.
- ساڵی (١٩٦٢)دا (دار المعلمین)ی لە بەغدا تەواو کردووە
- بەشداری کردووە لە تیپی (شرگە نفگ)، تیپی (الپورە)، مصلحە نقل الرکاب، لەگەڵ تیپی وەرزشی میللی
- ساڵی (٢٠٠٣) ڕێزی لێ گیراوە لە یانەی (الپورە) لەبەر ئەوەی یەکێك بووە لە یاریزانەکانی بزاڤی وەرزشی لە کەرکوك
- ساڵی (١٩٦١)دا لە ڕاکردنی (١٥٠٠) مەتر پلەی یەکەمی لە قوتابخانەکانی کەرکوك بەدەستهێناوە
- ساڵی (١٩٦١) پلەی دووەمی بەدەستهێناوە لە ڕاکردنی (ماراپون) لە چیای (سەفین)
- هەروەها یەکەم بووە لەگەڵ (عادل شیت) لە پێشبڕکێی سەرکەوتن بەسەر چیای سەفین
- چالاکی گواستنەوەی هەواڵە وەرزشییەکانی هەبوو لە ڕۆژنامەکانی وەکو (البغدادیة، الاخاء) لەنێوان ساڵانی (١٩٥٦- ٢٠٠٤)
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٨- ١٩٧٠) هەستاوە بەکاری بەڕێوەبەری نووسین لە بەشی وەرزشی لە ڕۆژنامەی شارەوانی.

*** فازل عەبدولمەجید:-**
- ساڵی (١٩٣٥) لە کەرکوك لەدایکبووە
- هەر لە منداڵییەوە ئاشنای یاری تۆپی پێ و زۆرانبازی بووە کە لەسەر دەستی براکەی (حەسەن عەبدولمەجید) ڕاهێنراوە.
- ساڵی (١٩٥٠- ١٩٥٣) لە هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك یاری کردووە.
- یاری کردووە لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی عێراق و (الفرقة الثانیة) لە ساڵی (١٩٥٦) چووەتە بەغداو لە گەڵ تیپی (مصلحة نقل الرکاب) یاری کردووە.
- ساڵی (١٩٥٥) بەشداری هەڵبژاردەی عێراقی کردووە لە خولی ئاسیا.
- ساڵی (١٩٥٧) بەشداری هەڵبژاردەی عێراقی کردووە لە خولی عەرەبی.
- ساڵی (١٩٥٩) شارەی کاپتنی لە هەڵبژاردەی عێراق بەدەستهێناوە.

*** محەمەد عەبدولمەجید:-**
- ساڵی (١٩٤١) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ساڵی (١٩٥٥)ەوە یاری کردووە لەگەڵ تیپی قوتابخانەی ئامادەیی کەرکوك
- ساڵی (١٩٥٦) بەشداری یانەی (الپورە)ی کردووە
- ساڵی (١٩٥٩) بەشداری تیپی (مصلحة نقل الرکاب العامة) کردووە
- بەشداری گەلێك لە یارییە نێودەوڵەتیەکانی کردووە.

*** عادل عەلی:-**
- ساڵی (١٩٥١) لە کەرکوك لەدایکبووە لە گەڕەکی (پیریادی)
- یاری کردووە لە تیپی قوتابخانەی (الشرقیة) و موسەڵڵا و هەڵبژاردەی پەروەردە، هەڵبژاردەی کەرکوك، یانەی (الثورة)، یانەی (الترکمان).

*** مستەفا عەبدولمەجید محەمەد حەمزە:-**
- ساڵی (١٩٣٨) لە کەرکوك لەدایکبووە
- هەر لە ساڵی (١٩٦٠)ەوە بەشداری یارییە وەرزشییەکانی کردووە لە (مصلحة نقل الرکاب)، تیپی (الفرسان)، الحوسێنیە، زمالك، النهرین، یانەی (الثورة)، هەڵبژاردەی تورکمان، هەڵبژاردەی کەرکوك.

*** حیلمی شەوکەت ئەحمەد:-**
- ساڵی (١٩٥٤) لە کەرکوك لەدایکبووە
- هەر لە سەرەتاوە لە تیپی (میشیل ئەرماق) یاری کردووە
- یاریکردووە لە تیپی (تسعینی)ی سەرەتایی، تیپی پەروەردە.
- ساڵی (١٩٧٣) هەڵبژێردراوە لە هەڵبژاردەی سوپای عێراق
- ساڵی (١٩٧٤) هەڵبژێردراوە لە هەڵبژاردەی کەرکوك
- هەر لە ساڵی (١٩٧٧)ەوە بەشداری لە یانەی (صلاح الدین)، یانەی کەرکوك، یانەی (الجیش)، هەڵبژاردەی (العسکری) و (الوطني) کردووە

- ماوەیەك لە یانەی (الثورة) یاری وەرزشی کردووە
- ماوەیەك لە تیپی (شباب العراق) یاری تۆپی سەرمێزی کردووە.

***سەلاحەدین سەعید مەجید:-**
- ساڵی (١٩٥٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە منداڵییەوە ئارەزووی یاری زۆرانبازی کردووە بەشداری یارییەکانی یانەی (الثورة)ی کردووە بۆ زۆرانبازی بەشداری زۆرانبازی کردووە لەگەڵ تیپی (الجیش) بۆ ماوەی شانزە ساڵ، بۆ ماوەی یانزە ساڵ لەگەڵ تیپی (القوة الجویة) بەشداری زۆرانبازی کردووە.
- گەلێك خەڵاتی جۆربەجۆری وەرگرتووە لەنێوان ساڵانی (١٩٧٧- ٢٠١١).

*** سەعدوڵلا ئەحمەد مەلا قاوون:-**
- ساڵی (١٩٤٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە ساڵی (١٩٦١ - ١٩٦٩) بەشداری گەلێك یاری وەرزشی کردووە لە بواری زۆرانبازیدا.

*** ئیحسان محەمەد نوری خەفاف:-**
- ساڵی (١٩٤٣) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە ساڵی (١٩٦٠ - ١٩٦٦) بەشداری گەلێك لە یاری وەرزشی زۆرانبازی کردووە[٣٤].

*** عەبدولرەحمان عەبدوڵلا حەمید (عەبدولرەحمان شەشە):-**
- ساڵی (١٩٤٠) لە گەرەکی شاترلو لەدایکبووە
- ناوەندی (الغربیة)ی لە کەرکوك تەواو کردووە
- یەکێك بووە لە یاریزانەکانی پەروەردەی کەرکوك
- ساڵی (١٩٧٧) بڕوانامەی لە بواری ناوبژیوانی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٧٦) هەستاوە بە ڕاهێنان لە یانەی سۆلاڤ.
- سەرپەرشتیاری وەرزشی بووە لە قەزای خورماتوو تا کاتی کۆچکردنی لە ساڵی (٢٠٠٦).

*** بەکر ساڵح حەمە:-**
- ساڵی (١٩٤٨) لە شۆراو لەدایکبووە
- هەر لە سەرەتای سەرەتاییەوە، وەرزشی پاسکیل سواری کردووە، لە ناوەندیو ئامادەیی لە ساڵی (١٩٦٤) پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٦- ١٩٦٧) بەشداری هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوکی کردووە.
- دووجار هەڵبژێردراوە لە فیستیڤاڵی ئاسیا لە ساڵی (١٩٦٦) لە تورکیا و لە ساڵی (١٩٦٨) لە لوبنان بەڵام لەبەر ئەوەی لە کەرکوك بووە نەیانهێشتووە بەشداری بکات.
- ساڵی (١٩٧٥- ١٩٨١) هەڵبژێردراوە لە یەکێتی پاسکیل سواری
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧٥- ١٩٨١) بەشداری یانەی سۆلاڤو وەزارەتی لاوانو ناوبژیوانی پاسکیل سواری کردووە.



هیجران ئەحمەد بەیاتی

*** عەونی غەنی ئیسماعیل:-**
- ساڵی (١٩٤٥) لە گوندی یەنگیجە لەدایکبووە.
- بەشداری وەرزشی کردووە لەگەڵ تیپی (النجوم)، تیپی (غلطة السراي)، تیپی (فنر بقچە)، تیپی (الزمالك)، تیپی (بشیکتاش)، تیپی (ناشئة کرکوك)، تیپی (شباب کرکوك).
- بەشداری یارییە وەرزشییەکانی کردووە لە هەڵبژاردەی کەرکوك، یانەی (الثورة)، تیپی کۆمپانیای نەوتی عێراق،

***یونس مەحموود خەلەف:-**
- ساڵی (١٩٨٣) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ماوەیەك یاری کردووە لەگەڵ یانەی کەرکوك، یانەی (الطلبة) یانەی (الشرطة)، هەڵبژاردەی (الوطني)، یانەی (الغرفة القطري)
- گەلێك خەڵاتی وەرزشی بەدەستهێناوە.

***حەقی وێردی مستەفا بەیاتی:-**
- ساڵی (١٩٣٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- تیپی وەرزشی (فلسطین)ی دامەزراندووە لە (جرید مەیدان)
- یاری کردووە لە نێو تیپە وەرزشییەکانی قوتابخانەکانی الشرقیە، المصلی، هەڵبژاردەی کەرکوك، هەڵبژاردەی (الشرطة).

***لوئەی سەلاحەدین عەلی:-**
- ساڵی (١٩٥٧) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ساڵی (١٩٧٨) ئامادەیی کەرکوکی تەواو کردووە.

*** قادر مەلا خالید:-**
- ساڵی (١٩٥٨) لە گەڕەكی ئیمام قاسم لەدایكبووە
- هەر لە منداڵییەوە ئارەزووی هەڵگرتنی قورسایی و لەشجوانی كردووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٨٤- ١٩٨٨) بەشداریی زۆربەی یارییەكانی لەشجوانی كردووە.

*** نیزاڵ عەبدوڵڵا مستەفا:-**
- ساڵی (١٩٥٩) لە گەڕەكی ئیمام قاسم لەدایكبووە
- هەر لە قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی، ئارەزووی وەرزشی هەبوو.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٨٦ - ١٩٨٨) ڕاهێنەری یانەی وەرزشی سۆلاف بووە
- لەنێوان ساڵانی (١٩٩٥- ١٩٩٨) ڕاهێنەری هەڵبژاردەی كەركوك بووە.

*** نوری رەفیق:-**
- هەر لە منداڵییەوە بەشداری یارییە وەرزشییەكانی كردووە لە تیپە میللییەكانی كەركوك و ئەندامی یانەی سۆلاف بووە
- هەر لە ساڵی (١٩٧١)ەوە بەشداری یارییە وەرزشییەكانی كردووە لە موسڵ، دیوانیە، بەغدا.

*** ئەبوبەكر كەریم نەریمان:-**
- ساڵی (١٩٥٥) لە كەركوك لەدایكبووە
- هەر لە ساڵی (١٩٧١)ەوە بەشداری یارییە وەرزشییەكانی لە یانەی وەرزشی سۆلاف كردووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧١- ١٩٧٦) بەشداری ڕاكردنی (١٠٠) مەتر (٢٠٠) مەتری كردووە پلەی یەكەمی بەدەستهێناوە لەسەر ئاستی پارێزگاو بەشداری دەرەوەی پارێزگاشی كردووە لە موسڵ و نەجەف.

*** نەجمەدین ئەنوەر مەحموود:-**
- لە ساڵی (١٩٦٦) لە كەركوك لەدایكبووە
- لە سەرەتادا لە تیپی وەرزشی قوتابخانەكان بەشداری كردووە لە قوتابخانەی بێ كەس، سەلاحەدین
- ساڵی (١٩٧٦) لەیانەی وەرزشی سۆلاف یاری كردووە لە تیپی (منی بۆل)
- ساڵی (١٩٧٦) بەشداری هەڵبژاردەی پەروەردەی كەركوكی كردووە لە یاری (منی بۆل)
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧٧- ١٩٩٢) لە یانەی سۆلاف بەشداری كردووەو نوێنەری بووە.
- ساڵی (١٩٨٠) ڕاهێنانی هونەری یارییە شەڕەكانی كردووە
- ساڵی (١٩٨٧- ٢٠٠٣) ڕاهێنەری هەڵبژاردەی پارێزگا بووە بۆ لاوان و پێشكەوتووان بۆ (تایكواندۆ)
- ڕاهێنەری یانەی وەرزشی سۆلاف بووە لەنێوان ساڵانی (١٩٩٢- ٢٠٠٣) لە یاری (تایكواندۆ)
- لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٦- ٢٠٠٨) ڕاهێنەری یاری تۆپی باڵە بووە بۆ ئافرەتان.

*** عەدنان عومەر سالح:-**
- ساڵی (١٩٦٧) لە كەركوك لەدایكبووە
- هەر لە ساڵی (١٩٧٧)ەوە بەشداری تیپە وەرزشییەكانی:- میدیا، ئیسكان، الانیق، مەنسور، موسەڵڵا، عواتف، صمود، مەولەوی، ئاوارەكان، یەكێتی، ڕاپەڕین، شەهید عەبدولوەهاب بووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٨٣- ١٩٨٧) یاری كردووە لە تیپی لاوانی یانەی وەرزشی یەكی حوزەیران
- ساڵی (١٩٩١)دا لەگەڵ كۆمەڵێك لە وەرزشوانەكانی وەكو:- شەهید تاریق، شەهید ئەبوبەكر، جەلیل جەمیل، بەدرەدین نورەدین، یانەی (باباگور گوڕ) یان دروستكردووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٩١ - ١٩٩٢) ڕاهێنەرو یاریكەری یانەی وەرزشی چەمچەماڵ بووە
- ساڵی (١٩٩٨) ڕاهێنەری یانەی وەرزشی چەمچەماڵ بووە
- لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە ئەندامی یانەی وەرزشی سۆلاف بووە.

*** شێرزاد سالح عەبدوڵڵا:-**
- ساڵی (١٩٧١) لە گەڕەكی ئازادی لەدایكبووە
- لەنێوان ساڵانی (١٩٩١- ١٩٩٢) دبلۆمی لە بەشی پەروەردەی وەرزشی بەدەستهێناوەو بووەتە مامۆستای وەرزشی
- ساڵی (١٩٨٤) لەگەڵ تیپی (ئاگرین) یاری كردووە
- بەشداری یارییەكانی كردووە لە تیپی وەرزشی پەیمانگا لەنێوان ساڵانی (١٩٨٩- ١٩٩١)
- یاری كردووە لە یانەی وەرزشی (الثورة) لە ساڵی (١٩٩٨)
- ماوەیەكی زۆر وەكو یاریزان و ناوبژیوان و ڕاهێنەر كاری كردووە.

*** ئامینە كەریم حەسەن:-**
- ساڵی (١٩٧٠) لە كەركوك لەدایكبووە
- ساڵی (١٩٨٢)ەوە لە قوتابخانەی (مەیسەلوونی) كچان بەشداری یاریە وەرزشییەكانی كردووە.
- ساڵی (١٩٨٤) بەشداری یاری (باڵە) كردووە لە هەمان قوتابخانە
- ساڵی (١٩٨٦) لە ئامادەیی (جمهوری)ی كچان بەشداری كردووە لە یاری بازی درێژو دووەمی بەدەستهێناوە
- ساڵی (١٩٨٨) لە كۆلێژی پەروەردەی وەرزش لە زانكۆی كۆیە وەردەگیرێت و بەشداری یارییە وەرزشییەكانی زانكۆ دەكات بە تایبەتی لە یاری (بازی درێژ و پلەی دووەمی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠٦) بڕوانامەی ماستەری لە زانكۆی سلێمانی لە بواری وەرزش بەدەستهێناوە

*** نیهاد خەلیل رەشید:-**
- ساڵی (١٩٧٨) لەكەركوك لەدایكبووە
- دەرچووی بەكالۆریۆسە لە پەروەردەی وەرزشی، ئێستا مامۆستایە لە زانكۆی كەركوك لە بواری وەرزش.

- ساڵی (٢٠١٠) بڕوانامەی ڕاهێنانی بەدەستهێناوە ولە تۆپی باڵە لە یەکێتی نێودەوڵەتی
- یاری کردووە لە هەڵبژاردەی کەرکوک لە یاری تۆپی باڵە دا لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٢- ٢٠٠١)

* عەدنان عەبدوڵڵا مستەفا:-
- ساڵی (١٩٦٢) لە کەرکوک لەدایکبووە
- دەرچووی زانکۆی موسڵە لە کۆلیژی پەروەردەی وەرزشی
- سەرەتای یارییە وەرزشییەکانی لە تیپەکانی: وەحدە، دەرسیم، سۆلاف، بووە.
- ساڵی (١٩٩٥) بڕوانامەی پلەیەکی ناوبژیوانی وەرگرت و لە هەمان کاتدا ئەندامی دەستەی کارگێڕی یانەی وەرزشی سۆلاف بوو.

* عەونی حەسەن کوردی:-
- لە سەرەتادا بەشداری وەرزشی کردووە لە تیپەکانی:- مدرسة النضال، خەبات، هەڵبژاردەی (ناشئین)و (الشباب) کەرکوک
- لە یانەی (الثورة)و یانەی (سۆلاف)و (الفرقة الثانیة) کاری کردووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧١ - ١٩٧٩) لە هەڵبژاردەی کەرکوک یاری کردووە
- هەروەها یاری کردووە لە: (الفیلق الاول)، (الفیلق الخامس)، یانەی کوردستان، یانەی العربی)، یانەی (اتحاد نقابات العمال)

* فەخرەدین ئیسماعیل ئەلسەراج:-
- هەر لە ساڵی (١٩٦٢)ەوە یاری تۆپی پێی کردووە وەکو گۆڵچی لە تیپەکانی: النور، الملاعب، امام قاسم، اتحاد مجید
- لەنێوان ساڵانی (١٩٦٥- ١٩٦٩) ئەندامی هەڵبژاردەی کەرکوک بووە.
- ساڵی (١٩٦٧) ئەندامی هەڵبژاردەی (ناشئی کرکوك) بووە
- ساڵی (١٩٦٨- ١٩٧٥) لە هەڵبژاردەی کەرکوک یاری کردووە
- ساڵی (١٩٧٠- ١٩٧٢) لە تیپی (الفرقة الثانیة) یاری کردووە
- ساڵی (١٩٦٩- ١٩٧٨) یاری کردووە لە یانەی سۆلاف
- ساڵی (١٩٧٣- ١٩٧٤) یاری کردووە لە (یانەی نەوتی سەروو)
- ساڵی (١٩٧٥- ١٩٧٧) یاری کردووە لە یانەی (التآخي)
- یەکێکە لە دامەزرێنەرەکانی (وەرزشوانەکۆنەکانی کەرکوک)
- بەشداری گەلێک خولی وەرزشی کردووە لە کەرکوک و دەرەوەی کەرکوک.

* مەریوان فازڵ ئەمین:-
- دەرچووی کۆلیچی ئادابە لەنێوان ساڵانی (١٩٨١- ١٩٨٢)
- ئەندامی یانەی وەرزشی سۆلافە هەر لە ساڵی (١٩٧٢)
- (١٩٧٧- ١٩٧٨) هەڵبژاردەی زانکۆ بووە بۆ تۆپی پێ
- ساڵی (١٩٨١- ١٩٨٢) بە شداری یارییەکانی سوپای کردووە لە یاری تیرهاویشتن.

* عەبدوڵڵای حەمەدەمینی قەڵەو:-
- ساڵی (١٩٦٢) لە کەرکوک لەدایکبووە
- ئامادەیی پیشەسازی کەرکوکی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٤) لە بێچووە شێرانی یانەی سۆلاف وەرگیرا وەك گۆڵچی بۆ تازە پێگەیشتووان
- ساڵی (١٩٧٨) لە تازە پێگەیشتووانی کەرکوک وەرگیرا و پلەی یەکەمی باکوورو دووەمی هەڵبژاردەکان و تازە پێگەشیتووانی عێراقیان بە دەست هێنا.
- ساڵی (١٩٧٩) لەلایەن (عەموو بابا) وەرگیرا بۆ هەڵبژاردەی کەرکوک
- لەسەر داوای ڕاهێنەری تۆپی دەست (عەونی ئاشووری) بۆ لاوانی کەرکوك وەرگیرا.
- ساڵی (١٩٩٣) لەگەڵ یانەیەکی شاری مەراغەی ئێران یاری کردووە
- ساڵی (١٩٨٠- ١٩٨٣) لە یانەی وەرزشی سۆلاف یاری کردووە.

* سابیر عەلی محەمەد:-
- لە ساڵی (١٩٦٢) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ساڵی (١٩٧٦)ەوە لە یانەی سۆلاف یاری کردووە
- پاڵەوانی وەرزش بووە لە ساڵی (١٩٨٦)
- پاڵەوانی ناوچەی کوردستان بووە لەنێوان ساڵانی (١٩٨٧- ١٩٨٩)

* دێرین سابیر عەلی:-
- ساڵی (١٩٩٣) لە کەرکوک لەدایکبوو.
- یەکەم ئافرەتە کە یاری هەڵگرتنی قورسایی دەکات لە یانەی سۆلاف و پارێزگاکانی کوردستان
- پاڵەوانی پارێزگا بووە لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٣- ٢٠٠٦)
- پاڵەوانی باشترین یاریزانی کوردستان بووە لە ساڵی (٢٠٠٧)

* نەوزاد شەفیق خەڵەف:-
- ساڵی (١٩٨٩- ١٩٩٠) کۆلیژی پەروەردەی وەرزشی تەواو کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٣) بووەتە ناوبژیوانی نێودەوڵەتی (فیفا)و لە (٢٠٠٩) کۆتایی ئەم کارە بووە.
- مامۆستای کۆلیژی پەروەردەی کەرکوکە لە زانکۆی کەرکوک.

* ناسیح عوسمان حەسەن:-
- ساڵی (١٩٦٧) لە گەڕەکی (شۆریجە) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٨٧- ١٩٩٠) یاری کردووە وەکو (بەرگر) لە یانەی سۆلاف.

* مەجید نەعیم حەسەن:-
- ساڵی (١٩٩٧- ١٩٩٨) لە یانەی وەرزشی سوڵاڤ یاری کردووە
- ساڵی (١٩٩٨- ١٩٩٩) لە یانەی وەرزشی (الثورة) یاری کردووە.

* جەنگیز ئەحمەد رەشید:-
- ساڵی (١٩٨٧- ١٩٩٥) یاریزانی هەڵبژاردەی پارێزگا بووە
- ساڵی (١٩٨٨- ١٩٩٤) پاڵەوانی ناوچەی کوردستان بووە لە گەڵ یانەی وەرزشی سوڵاڤ
- پاڵەوانی عێراق بووە بۆ کێشی (٨٠) کیلۆ گرام لە ساڵی (١٩٩٢) لە بەغدا
- ناوبژیوانی پاڵەوانێکانی کەرکوك، ناوچەی کوردستان و عێراق بووە هەر لە ساڵی (١٩٩٨)ەوە

* عیزەدین عەسکەر جەلال:-
- ساڵی (١٩٨٨- ١٩٨٩) دەرچووی کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی بووە لە زانکۆی موسڵ
- هەر لە ساڵی (١٩٧٣)ەوە لەگەڵ تیپە میللییەکانی وەکو:- المیثاق، القادسیة، المصلي، ١٤ رمضان) یاری کردووە
- ساڵی (١٩٨٠- ١٩٨٥) یاری کردووە لە یانەی (الثورة)
- ساڵی (١٩٨٦- ١٩٨٨) یاری کردووە لە یانەی (الکرامة)
- ساڵی (١٩٨٨- ١٩٩٠) لە یانەی کەرکوك یاری کردووە
- ساڵی (١٩٩١- ١٩٩٥) لە یانەی زاخۆ یاری کردووە
- ساڵی (١٩٩٦) لە یانەی (سیمێل) یاری کردووە
- ساڵی (١٩٩٧- ١٩٩٨) لە یانەی زاخۆ یاری کردووە
- ساڵی (١٩٩٩- ٢٠٠٠) لە یانەی دهۆك یاری کردووە
- ساڵی (٢٠٠٥- ٢٠٠٦) راهێنەر بووە لە یانەی سوڵاڤ هەروەها لە یانەی کەرکوك و کەیوان بەشداری کردووە وەکو راهێنەر.

* (خالید حاجی ئەحمەد- خالیدی حاجی ئەحەکە ):-
- ساڵی (١٩٤٨) لە گەرەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
- هەر لە سەرەتای یانەی وەرزشی سوڵاڤ بەشداری وەرزشی کردووە
- ساڵی (١٩٨٦) کۆچی دوایی کردووە.

* سلێمان رەمەزان وەهاب:-
- ساڵی (١٩٧١) لە کەرکوك لەدایکبووە
- هەر لە سەرەتای ژیانییەوە یاری کردووە لە بواری قورسایی هەڵگرتن.
- یەکەم بووە لە سەر پارێزگا لە قورسایی (٧٥) کیلۆ گرام لەنێوان ساڵانی (١٩٩١- ١٩٩٨)
- یەکەم بووە لە پاڵەوانی (المنطقة الشمالیة) لەنێوان ساڵانی (١٩٩٥- ١٩٩٦- ١٩٩٧)
- سێ یەم بووە لە پاڵەوانی عێراق لە قورسایی (٨٠) کیلۆ گرام لە پارێزگای بابل لە ساڵی (١٩٩٢)
-لە ساڵی(١٩٩٩)ەوە هەتا ئێستا راهێنەری یانەی سوڵاڤە.

* عەدنان عەبدولقادر:-
- ساڵی (١٩٤٣) لە کەرکوك لەدایکبووە
- هەر لە پەنجاکانی سەدەی رابردووە لە تیپە میللییەکان بەشداری کردووە
- بەشداری یاری کردووە لە هەڵبژاردەی کەرکوك، هەڵبژاردەی (الفرقة الثالثة)، یانەی وەرزشی سوڵاڤ، هەڵبژاردەی (الوطني)، هەڵبژاردەی (العراق)
- ساڵی (١٩٧٢)ەوە راهێنەرە لەبواری وەرزش لە هەشتاکانەوە راهێنەرە لە یانەی کارەبای (دووبز)

* نورەدین حوسێن جاف:-
- هەر لە ساڵی (١٩٧٥) ەوە بەشداری خولێکی بەرزکردنەوەی قورسایی کردووە کە یانەی وەرزشی سوڵاڤ سەرپەرشتی کردووە.

* فەرمان رەحمان رەحیم:-
- ساڵی (١٩٧٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٣)ەوە لە ناوەندی (الرسالة)و ئامادەیی موسەڵڵا یاری کردووە
- بەشداری یاری وەرزشی پاسکیل سواری کردووە
- ساڵی (٢٠٠٤)ەوە بەشداری کردووە لە خولی راهێنان و ناوبژیوانی لە بواری پاسکیل سواری لە کەرکوك
- ساڵی (٢٠٠٦) بەشداری لە خولی ناوبژیوانی لە بواری پاسکیل کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٧) بووە بە راهێنەری یانەی وەرزشی سوڵاڤ لە بواری پاسکیل سواری.

*عیزەدین مەجید خدر:-
- ساڵی (١٩٢٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٤٤) لە پەیمانگای (اعداد المعلمین) دەرچووە
- بووە بە مامۆستای (وەرزش)
- بۆ ماوەی ساڵێك لە ساڵی (١٩٥٩) دوور خراوەتەوە بۆ (عەمارە)
- ساڵی (١٩٥٢) سەرپەرشتیاری پەروەردەیی دیدەوانی پارێزگای کەرکوك بووە
- بەشداری چالاکییە دیدەوانییەکانی کردووە لە ئینگلیترا، میسر، ئێران)
- چالاکی زۆری هەبووە لە یانەی (الثورة)
- ساڵی (٢٠٠٢) کۆچی دوایی کردووە.

* سابیر عەلی ئەحمەد هەمەوەندی:-
- ساڵی (١٩٢١) لە گەرەکی بەگەکان لە دایکبووە لەسەر قەڵا.
- ساڵی (١٩٤٠) لە پەیمانگای (دار المعلمین) دەرچووە
- ساڵی (١٩٤١) بووە بە مامۆستا لەسەر میلاکی وەزارەتی (مەعاریف)، لە دوایدا کارەکانی گواستووەتەوە بۆ کۆمپانیای نەوتی عێراق.
- خەڵات و رێزلێنانی بەدەستهێناوە لە بەرگری نیشتمانی، تۆپی پێ، تۆپی باڵەو باسکە، مەلەوانی، هەڵگرتنی قورسایی، هەروەها لە یاریزانەکانی زۆرخانە بووە.

– بەشداری هەبووە لە یانەی وەرزشی (الثورة)
– ماوەیەك بەڕێوەبەری یانەی کۆمپانیای نەوتی عێراق بووە
– دەستی هەبووە لە دیەوانی کۆمپانیای نەوت لە سالی (١٩٥٦)
– سالی (١٩٩٥) کۆچی دوایی کردووە.

* **سامی ئەمین سالح:-**
– لەدایکبووی (١٩٥٧)ی شاری کەرکوکە لە گەڕەکی ئیمام قاسم،
– سالی (١٩٦٨) لە قوتابخانەی نەجاحی سەرەتایی دەستی بە یاری تۆپی بالە کردووەو لەو سالەدا پلەی دووەمیان هێناوە. لە قوتابخانەی کاوەی ناوەندی دەستی بە یاری تۆپی پێکردووەو لە یانەی سۆلاف یەکەم جار بەشداری کردووە.
– دوای ئەوە لە قوتابخانەی شۆڕش. دەستی کردووە بە یاری کردنی تۆپی بالە یەکەم سال پلەی یەکەمیان هێناوەو دوای ئەوەش دوو سال لەسەر یەکتری دووەمیان هێناوە لە کەرکوك دواجار لە ئامادەیی پیشەسازی سێ سال یەکەمیان هێنا لەسەر شاری کەرکوك تا کۆتایی سالی (١٩٧٩) لە یانەی سۆلاف مایەوە دوای ئەوە بوو بە سەرباز (٤) سال یاری بالەی کردو لە کەتیبەی موخابەرە لە بەغدا هەروەها لە یانەی ئەعزەمیەو یانەی شەعب بەشداری کردووە.
– یەکەم هاندەری لە سەرەتایی مامۆستا عەبدولخالق دوای ئەوە مامۆستا جەلال محەمەد قادر کە گەورەترین کاری هەبووە لە پێشکەوتنیو شانازی پێوە ئەکات، هەروەها مامۆستا کەمال سویحی بیلالو چەند ڕاهێنەرێکی تر.
– سەرەتای یاریکردنی لە قوتابخانەی نەجاح، یانەی سۆلاف، ناوەندی شۆڕش تا ئامادەیی پیشەسازی، هەلبژاردەی کەرکوك (منتخب كركوك)، پەروەردەی کەرکوك.
– سامی ئەمین کە یاریزانێکی دێرینی شاری کەرکوکە زۆر شانازی بە یانەکەی خۆیەوە دەکرد، ئێستاش زۆر سوپاسو شانازی بە مامۆستا جەلال محەمەد قادرو مامۆستا سەلاح دەکات کە زۆر ماندوبوونە لەو یانەیە، کاك سامی ئێستاش دەلێت:– (من زۆر سەربەرزمو شانازی دەکەم بەم وێنەیە کە هەلبژاردەی پەروەردەی شاری کەرکوك (منتخب تربية) بۆ سالی (١٩٧٨) چونکە لەو هەلبژاردەیە پێنج یاریزانی کوردبوو لە کۆی (١٠) یاریزاندا ئەو یاریزانانەش ئەمانەن: ئازاد جەرجیز، سامی ئەمین، شێخ باهر عەبدوللا، محەمەد عەبدوللا (بەحەمە قەلەو ناسراوە)، عەبدوللا حەسەن (عەبەی حەسەن کەشاف) ناسراوە.

* **ئازاد فاتح محەمەد:-**
ناوی (ئازاد فاتح محەمەد)ە، لەدایکبوی سالی (١٩٥٦) لە گەڕەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکوك، هەر لە منالییەوە حەزو ئارەزووی لە تۆپی پێ بووە و لەم شوێنانە یاری تۆپی پێی ئەنجامداوە وەك:–
– سەرەتای یاری کردنی لە قوتابخانەی (ئیمان)ی سەرەتایی کوڕان بوو کە ئێستا ناسراوە بە ناوەندی ڕزگاری کوڕان بۆ هەلبژاردەی قوتابخانەکان لە گەڕەکی زێوییە.
– لە دواناوەندی ئیمام قاسم یاریی کردووە تا پۆلی چوارەمی گشتی بۆ هەلبژاردەی قوتابخانەکان.
– لە ئامادەیی کوردستانی کوڕان یاریی کردووە بۆ هەلبژاردەی قوتابخانەکان.
– بۆ تیپی لاوانی سۆران یاریی کردووە پاشان ناوی کرا بە "تیپی دەرسیم"
– سالی (١٩٧١وە تا ١٩٧٥) بۆ یەکێتی قوتابیانی کوردستان یاریی کردووە.
– بۆ یانەی سۆلاف یاریی کردووە بۆ هەر سێ پلەی یەکەمو دووەمو سێیەم کە مامۆستا جەلال محەمەد قادر ڕاهێنەر بوو پاشان مامۆستا فاتیح نەقشبەندی کرا بە ڕاهێنەری هەموو پلەکان.
– لە هەلبژاردەی پەروەردەی کەرکووك یاریی کردووە کە مامۆستا عەدنان شکور ڕاهێنەر بوو لە سالی (١٩٧٢).
– سالی (١٩٨١) یاریی کردووە بۆ تیپی دووی سوپای عێراقی ئەو کاتە کە ڕاهێنەرەکەیان عادل بچووك بوو.
– سالی (١٩٨١و ١٩٨٢) هەلبژێردراوە بۆ تیپی " فەیلەقی یەکی" سوپای عێراق کە شوێنی دیار بوو لەوێ لەگەل یاریزانێکی تر بەناوی عەلی سەلام بوو دانیشتووی گەڕەکی زێوییە بوو کە تەنها ئەوان کورد بوون.
– یاریی کردووە بەرامبەر دەیان یاریزانی ناوداری عێراق وەك (نزار ئەشرەف، واسق ئەسوەد، حەسەن سەداوی، یەحیا عەلوان، ڕەعەد حەموودی)و چەندین یاریزانی دیکە.
– کارێکی سەرسووڕهێنەری ئەنجامدا لە سالی (١٩٨٧) لە قوتابخانەی (کانی ماران)ی سەر بە قەزای ڕانیە مامۆستای وەرزش بووە لەوێ پالەوانێتییەکی پەروەردەیی کرایەوە بەناوی (گۆڕەپان و مەیدان) کە قوتابخانەکەی لە دێیەکی بچووك وەك کانی مارانی بە پلەی یەکەمی ئەو پالەوانێتییەیان وەرگرت لەسەر هەموو قەزای ڕانیە تێیدا چەندین دیاریی وەرگرت لە بەڕێوبەرایەتی قەزای ڕانیە.
– سالی (١٩٩٤) تاکوو ئێستا ئەندامی دەستەی کارگێڕی یانەی سۆلافە لە کەرکووكو ئەندامی دارایی لە یەکێتی سیانی لقی کەرکووكو ناوبژیوانی پلەی یەکەمە لە پاسکیل سواریو سەرپەرشتیاری پەروەردەی وەرزشییە لە پەروەردەی کەرکووك لە سالی (٢٠٠٣) تاکو ئێستا.
– ئەمەی خوارەوەش چەند دێڕێکە سەبارەت بە ژیاننامەکەی:–
– خوێندنی سەرەتاییو ناوەندیو ئامادەیی لە شاری کەرکووك تەواو کردووە ولە سالی (١٩٧٦– ١٩٧٧) لە پەیمانگەی مامۆستایانی هەولێر وەرگیراوە.
لە سەرەتای سالی (١٩٧٧) بووم بە مامۆستاو یەکەم دامەزراندنی لە گوندی "هەلەدن" بوو دواجار لە گوندی "شێخ وەیس"ی ئاغجەلەر ولە دوایی بۆ گوندی "قۆرەتوو"، دواجار بۆ گوندی "کانی مارانی" سەر بە قەزای ڕانیە پێنج سال لەو گوندە مایەوە، نزیکەی (١٤) سال لە ئۆردوگاکانی زۆرەملێی شۆڕش لە قوتابخانەی داستان. – سالی (١٩٩١) سەدان مامۆستا لە قوتابخانەکانی چەمچەمالو شۆڕشو تەکییە کە

گەرانەوە بۆ کەرکووك وەك "تەنسیب" تەنها (١٣) مامۆستا بوون مانەوە لە چەمچەماڵ و شۆڕش و بەردەوام بوون لە خزمەتکردنی منالانی کوردی ئەنفال و شەهیدو دەربەدەری رژێمی بەعس، چونکە ئەم کارەیان بە پیرۆزتر دەزانی،

* جەلال محەمەد قادر:-
- لە شاری کەرکوك لە ساڵی (١٩٤٣) لەدایکبووە.
- سەرەتای خوێندنی لە خوێندنگای شەرقییە دەستی پێکرد دواجار گواستراوەتەوە بۆ قوتابخانەی موسەڵلای سەرەتایی لە هەمان خوێندنگا تەواوکرد و ناوەندی لە خوێندنگای ئیمام قاسمی کوران تەواو کردووە مامۆستای وەرزشی ئەوکاتە ناوی تۆما جومعە بوو لە ناوەندییەوە دەستی کردووە بە یاریکردن لە تۆپی پێ.
- ئامادەیی لە خوێندنگای کەرکوك تەواو کرد کە مامۆستای وەرزشی ئەوکاتە ناوی لوتفی مزهر تکریتی بووە لەگەڵ ماهیر بەیاتی.
- لەگەڵ تۆپی پێدا دواجار دەستی کرد بەیاری باسکەو بالە و بۆ خۆی یاری لەشجوانیی دەکرد و هەر لە ئامادەیی بوو هەڵبژێردرا بۆ هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك.
- لە شاری بەغدا لە بەشی وەرزش یاری بالەی دەکرد وەبەشداریمان کردوە لە هەڵبژاردەی کۆلێجەکان و پەیمانگاکاندا و پلەی باشی بەدەستهێناوە لەیاری بالەدا.
- ساڵی (١٩٦٩) کە یانەی سۆلاف دامەزرا وەلە هەمان ساڵدا لە دەستەی گشتی یانەی سۆلاف بووە دواجار لە دەستەی کارگێریی هەڵبژێردراوە و بووە بە بەڕێوەبەری یانە لە هەمان ساڵدا و لە ناو یانەکە بووە ڕاهێنەری تۆپی ئەوە بوو بۆ ماوەی سێ ساڵ بەپلەی یەکەم دەرچوون لەسەر ئاستی پارێزگاکە.
- دواجار بووە ڕاهێنەری بالە لە یانەی سۆلاف وە لە هەمان ساڵدا بووە بە ڕاهێنەری پارێزگا لە ساڵی (١٩٧٧ تا وەکو (١٩٨٣).
- لە سەرئاستی عێراقدا، یەك ساڵ ڕاهێنەری هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك بووە ئەوش ساڵی (١٩٨٣) بوو ئەو یاریزانانەی کە سوودمەند بوون لەلای پێگەیشتن وەکو یاریزان سامی ئەمین تاکو گەیشتە یانەکانی شاری بەغدا لە پلە یەکەمەکان یاری کردووە
- دواجار بووەتەوە ڕاهێنەری تۆپی سەرمێز لە یانەی سۆلاف و توانیویەتی چەندەها یاریزان پێبگەیەنێت کە پلەی باشیان هێناوە بەسەر عێراق و پارێزگادا ئەو یاریزانانەش وەك ئازاد کاکل، محەمەد عەبدوڵلا، ئەکرەم تەنانەت لە دەرەوەی عێراقیش بەشداری یاریان کردووە دواجار (ئەکرەم)لە سێدارەدرا بە دەستی رژێمی لە ناوچوو.

* سامی عەبدوڵڵا محەمەد - سامی موختار:-
- ساڵی (١٩٥٦) هاتووەتە دونیاوە لە گەرەکی ئیمام قاسم لە کەرکوك قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی پیشەسازی لە کەرکوك تەواو کردووە لە قوتابخانەکانی پیرەمێرد و کاوە و پیشەسازی کەرکوك.
هەر لە منداڵییەوە خولیای تۆپی پێی هەبووەو تاوەکو گەیشتووەتە ئاستی پاڵەوانێتی عێراق کە لە هەڵبژاردەی پەروەردەیی بووە لە وڵاتی لیبیا ئەنجام درا.
- لەگەڵێك چالاکییەکانی وەرزشی کەرکوك و عێراق بەشداری کردووە لە تیپی دەرسیم، تیپی ئەستێرەکانی زێوێ، تیپی ئیسکان، تیپی ئەستێرەکانی ئازادی، تیپی ئەڵماس، وەکو ڕاهێنەر لە گەلێك لەم تیپانە بەشداری کردووە.
- ساڵی (١٩٧٠- ١٩٧٩) بۆ هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك یاری کردووەو باشترین یاریزانی پەروەردەی کەرکوك بووە لەسەر ئاستی عێراق، وەکو یاریزان لە تیپی یانەی سۆلاف و یانەی کرێکاران بەشداری کردووە، ماوەی چوار ساڵ لە هەڵبژاردەی کەرکوك یاری کردووە.
- خزمەتی تۆپی پێی کردووە لە کاتی شاخدا لە ناوچەی بالیسان و گەلێك ناوچەی تری کوردستان وەکو یاریزان و ڕاهێنەر.
- لە خێزانەکەشی گەلێك وەرزشکاری تیا هەڵکەوتووە وەکو برای و کچەکانی، ئێستا موختاری گەرەکی ئیمام قاسمە.

* یاسین عەبدوڵڵا رەزا:-
- ساڵی (١٩٥١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی ئیمام قاسم تەواو کردووەو هەر لەوێشەوە بەشداری وەرزشی قوتابخانەکانی کردووەو پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە لە وەرزشی پەروەردەی کەرکوك هەتا وەکو سەرەتایی تەواو کردووە بەردەوام بووە لە کاری وەرزشی.
بووەتە سەرباز لە تیپی دووی عێراق و بۆ ماوەی بیست ساڵ بەشداری وەرزشی کردووە لەو تیپەدا بۆ هەڵبژاردنی عێراق.
- هەروەها بەشداری یارییە وەرزشییەکانی کەرکوکی کردووە لەو ماوەیەدا.
- یاریزانی یانەی سۆلاف بووە بە پلەی یەکەم لەنێوان ساڵانی (١٩٧٢- ١٩٧٧)، هەروەها بۆ یانەی سەوزەش یاری کردووە.
- ئێستا خانەنشینە و لە هیچ لایەك خانەنشینی وەرزشی وەرناگرێت.

* بەهادین عەبدولقادر:-
- ساڵی (١٩٦٦) لە گەرەکی ئیسکانی کەرکوك لەدایکبووە،
- سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨٥ خانەی مامۆستایانی لە کەرکوك تەواو کردووە.
- هەر لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە ئارەزووی یاریی کیکۆشینگا و شۆتۆکان و تایکواندۆ هەبووە و لەسەر ئاستی پارێزگا بەشداری کردووە.
- لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لە ساڵی ٢٠٠٩ بەشداری تایکواندۆی کردووە.
- لەسەر ئاستی ناوخۆیی لە ساڵی ٢٠١٠-٢٠١١ لە هاوینەهەواری مەسیف لەنێوان (٨٣) ڕاهێنەر بە پلەی A دەرچوو کە ڕاهێنەرێکی ئێرانی بەناوی حوسێن زادە بەشداری کردووە.



- دەستێکی باڵای هەیە لە هونەری شێوەکاری و چەندین تابلۆی جۆراوجۆری نەخشاندووە.

*** عەدنان محەمەد سابیر:-**
- ساڵی (١٩٥٧) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- لە ساڵی (١٩٧٠) بووەتە ئەندام لە یانەی سوڵاف کەرکوك.
- بووەتە یاریزانی پلە دوو لە یاری باڵە، بەڵام لەدوای ماوەیەك بە توانای خۆیو بە بازووی کارەکانی بووەتە پلە یەكو لە چەند شارێکی عێراق بەشداری یارییەکانی کردووە. لە قوتابخانەی ناوەندی دووجار پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە، لە قوتابخانەی ئامادەییش سێ جار پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە.
- بۆ سێ ساڵ هەڵبژێردراوی پەروەردەی کەرکوك بووە بۆ یاری لە شارەکانی عێراق.
- ماوەیەك لە کاری وەرزشی دوور کەوتووەتەوەو ئێستا فەرمانبەرە لە نەخۆشخانەی کەرکوك.

*** بەکرە گۆج:-**
- ناوی ئەبو بەکر کەریم نەریمانە ناسراوە بە (بەکرە گۆج)، ساڵی (١٩٥٥) لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
- سەرەتایی لە قوتابخانەی ئیمام قاسم تەواو کردووەو لە پۆلی پێنجەوە دەستی کردووە بەیاری کردن لە تۆپی پێ.
- لەیاری گۆڕەپانو مەیداندا لە ساڵی (١٩٦٩) بە پلەی دووەم دەرچووە لە ڕاکردنی (١٠٠ مەترو ٢٠٠ مەتر لەسەر ئاستی قوتابخانە سەرەتاییەکانی کەرکوك.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧٢- ١٩٧٧)، بەشداری لەم تیپە میللییانە کردووە وەکو سۆران، ملاعب، دەرسیم، ئاسۆ، هەندرێن، سوڵاف.
- لە خوێندنی ناوەندیو ئامادەیی بە پلەی یەکەم دەرچووە لە ڕاکردنی (١٠٠مەترو ٢٠٠ مەتر لەسەر ئاستی قوتابخانەکانی کەرکوك کە لە ساڵی (١٩٧٤)دا ڕاکردنی سەدمەتری بە ٨، ١٠ خولەك بڕیوەو تاوەکو ئێستاکەش بە ناوی خۆیەوە تۆمار کراوە.
- ساڵی (١٩٧٤- ١٩٧٧) هەڵبژێردراوە لە شاری کەرکوك وەکو یاریکەر لە گۆڕەپانو مەیدان.
- لەکاتی خوێندنی لە پەیمانگای مامۆستایانی هەولێر توانیویەتی دوو ساڵ لەسەر یەك بە پلەی یەکەم دەرچێت لەسەر ڕاکردنی سەد مەترو دوو سەد مەتر، هەروەها نوێنەرایەتی هەولێری کردووەو دوو ساڵ لەسەر یەك بەپلەی دووەم دەرچووە.
- لە ساڵی (١٩٧٤- ١٩٧٧) بەشداری هەموو پاڵەوانێتیەکانی کۆماری کردووە لە ساڵی (١٩٧٧)دا بە پلەی یەکەم دەرچووە لەسەر ناوچەی حوکمی زاتی.
- یەکێك بووە لە یاریزانەکانی یانە سوڵاف لە تۆپی پێو گۆڕەپانو مەیدان.
- ئێستا مامۆستای وەرزشە لە قوتابخانەی سەرەتایی کوران.

*** فەخری هاوار ئیبراهیم:-**
- ساڵی (١٩٦٢) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی پەیمانگای مامۆستایانە، بەشی وەرزش لە شاری موسڵ لەنێوان ساڵانی (١٩٨٢- ١٩٨٣).
- ساڵی (١٩٦٨) چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی خەبات لە کەرکوكو لە ساڵی (١٩٧٥) سەرەتایی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٧٤) بۆ یەکەمجار بەشداری تیپی قوتابخانەکانی کردووە لەبەشی تۆپی پێو باڵە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧٦- ١٩٧٧) لە ناوەندی باوەگوڕگوڕ یاری باڵەی کردووەو بەشداری هەڵبژاردنی نەوجەوانانی کەرکوکی کردووە.
- یاریزانی یانەی (عاشورو سەورە)بووە لە کەرکوك.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧٨- ١٩٧٩) لە ئامادەیی عەبدولمەلیك بەشداری خولە وەرزشییەکانی کردووەو پلەی یەکەمی بەدەستهێناوەو هەڵبژێردراوە بۆ یاری تیپەکانی پەروەردەی کەرکوك.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٧٩-١٩٨١) بەشداری ڕاهێنەری هەڵبژاردەی عێراقی کردووەو پلەی یەکەمو دووەمی بەدەستهێناوە لە یاری باڵەدا.
- هەریەکە لە مامۆستا عامر عوبەیدیو مامۆستا سەعدوڵڵا ئەحمەد ڕاهێنەری بوونە لە ماوەی خوێندندا بۆ کاری وەرزشی.
- بەشداری هەڵبژاردەی پەیمانگای مامۆستایانی شاری موسڵی کردووە لەنێوان ساڵانی (١٩٨٥- ١٩٨٦)و لە تیپی (٢٣)ی سەربازی بەشداری تیپە سەربازییە وەرزشییەکانی کردووە.
- بڕوانامەی ناوبژیوانی پلە دووی بەدەستهێناوە لە شاری کەرکوك.
- ساڵی (٢٠٠٣)وە بەشداری ڕاهێنەرایەتی کردووە لە یانەی حەمرینو یانەی ئەرمەنو باڵەی کچانی یانەی سوڵاف.
- ئێستا سەرپەشتیاری وەرزشییە لە خوێندنی کوردی لە کەرکوك.

*** فازڵ ئەسوەد:-**

- ناوی (فازڵ محەمەد نوری) یە
- ساڵی (١٩٤٠) لە کەرکوك لە گەڕەکی ئیمام قاسم لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٤٧) خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی ئیمام قاسم دەست پێکردووە.
- ناوەندیی و ئامادەیی تا پۆلی پێنج لە قوتابخانەی (شەرقیە) تەواو کردووەو پاشان وازی لە خوێندن هێناوە.
- هەر لە سەرەتای ژیانیەوە خولیای وەرزش بووەو ناوبانگی پێی دەرکردووەو لە زۆر کاتدا یاری بۆ قوتابخانەی سەرەتایی ئیمام قاسم کردووەو لەو سەردەمەدا خولیای یاریزانەکانی وەکو (سابیر بچکۆل و نەجات محەمەد)بووە.
- سوودی لە مامۆستای وەرزش (فوئاد دیکران) بینیوە لە وەرزشکردن کە مامۆستایەکی مەسیحی بووە.
- بۆ ماوەی دە ساڵ هەڵبژاردەی تۆپی پێ بووە لە پەروەردەی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٥٦) قوتابخانەکەیان دووەم بووە دوای قوتابخانەی نەجاح.
- ئەو ڕاهێنەرانەی ئەوکاتەی پەروەردەی کەرکوك بریتی بوونە لە مامۆستا کەمال عەبدولقادر و تۆما جومعە.

ئەو تیپانەی یاریزان فازڵ ئەسوەد دایمەزراندووە بریتی بوو لە:

- شەباب ئیمام قاسم ساڵی (١٩٥٤).
- سەقەر ئیمام قاسم ساڵی (١٩٦٠).
- وەحدە ئیمام قاسم ساڵی (١٩٧١).
- ساڵی (١٩٧٠ تا ١٩٧٩) ڕاهێنەر بووەو لە دەستەی کارگێڕی تیپی یانەی سۆلاف بووە بۆ ماوەی (٨) ساڵ.

یاریزانی یانەی سەورە بووە لە ساڵی (١٩٦٥- ١٩٦٧).

*** عەلی ساڵح عەلی محەمەد:-**

- لەدایکبووی ساڵی (١٩٤٧) لە گوندی گۆگجە هاتوومەتە دنیاوە.
- پاشان هاتوونەتە گەڕەکی شۆریجە دانیشتووە و لە سەرەتادا قوتابخانەی لە کڵاوقوتەوە دەسپێکردووە.
- دواتر هاتمە قوتابخانەی شۆریجە کە ئەو کاتیش هەر ناوی شۆریجە بوو.
- ناوەندیی لە قوتابخانەی ئەییوبییە تەواو کردووە کە لەناو بازاڕی حەلواچییەکان بووە.
- قوتابخانەی ئامادەیی لە قوتابخانەی موسەڵلا تەواو کردووە مامۆستای وەرزشییان کە ناوی قاسم دێو بوو، سەرەتای وەرزشی لە قوتابخانەی شۆریجەوە دەستی پێکرد کە تۆپی پێبوو، کە لەگەڵ ڕاهێنەر قالە شەریکە بوو، دواجار لەگەڵ ڕاهێنەر ڕەزا شوانی بۆ هەڵبژاردەی قوتابخانە یاریی کردووە و لە چەندین یاری بەشداری کردووە هەتاکو ئامادەیی تەواو کردووە هەر بەردەوامبووە لە یاریکردن لە تۆپی پێ و پلەی دووەمی بەدەستهێناوە بەسەر قوتابخانەکانی شاری کەرکوك لە ساڵانی (١٩٦٤- ١٩٦٥)و ئامادەیی تەواو کرد لە پەیمانگای مامۆستایانی ئەو کاتە وەرگیرا لە شاری دیالە لە ساڵی (١٩٦٦- ١٩٦٧)و پاشان یاری جومبازی دەستپێکرد لە ناوپەیمانگاکەدا وپلە باشی بەدەستهێنا لەسەر شاری دیالەو قوتابخانەکان بە پلەی باش وەتاکو وەرگیرا بۆ هەڵبژاردەی پەروەردەی دیالە کە بە تیپ بەشدارییان کردووە لە پاڵەوانێتی هەرێمی ناوەندی عێراق بە پلەی یەکەم.
- لەبەشی دارایی لە یانەی سۆلاف کارم کردووە لە ساڵانی (١٩٧٥- ١٩٧٨) کە لە بەشی کارگێڕی یانەکە کاری دەکرد و دەستی بەیاری سەرمێز کردووە توانیی سەرکەوتووبێت لەگەڵ یاریزان ئەنوەر توانیان پلەی دووەم بەدەستبهێنن بەسەر سەندیکای مامۆستایانی ئەوکاتە.
- بەهامانشێوە دەستیکرد بەیاری بەرزکردنەوەی قورسایی ئاسن و توانیی لەوەش پلەی یەکەم بێنێت بەسەر شاری کەرکوك لە کێشی (٦٠)کیلۆ لە ساڵی (١٩٧٦- ١٩٧٧)و دوو جار بووە بەراهێنەر لەناو یانەی سۆلاف و چەند یاریزانی پێگەیاندووە وەك پاڵاوان فەیزوڵڵا و وەلید عوسمان.

*** فەیزوڵڵا فە تحوڵڵا کەریم:-**

- ئەم وەرزشکارە لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٠) لەشاری کەرکوك گەڕەکی ئازادی لە خێزانێکی هەژار چاوی بەدنیا هەڵهێناوە.
- پلەی خوێندەواری شەشی سەرەتایی تەواو کردووە، بە بۆنەی هەژاریی و دەستکورتی خێزانەکەیەوە خەریکی کاسبی بووە، کە دەگەڕایەوە بۆماڵەوە یاری ئاسنی دەکردو تاوکو ماوەیەك هەر بۆخۆی، ئینجا برادەرێك بەناوی (سابیر چیمەنی)، هانی داوە کە بەردەوام بێت و یەکێ هەبێ کۆرسی بۆ بنووسێ بەشێوەیەکی جوانی و دواجار لە ڕێگای (حەسەن سەید غەریب) هاوردی بۆ یانەی سۆلاف کە دەست بە یاری بکات.
- ساڵی (١٩٧٣)و لە یانەی سۆلاف ڕاهێنەر بوو لەگەڵ مامۆستا عەلی ساڵح و چەند برادەرێکی تر وەکو عیماد محەمەد شەریف و نورەدین عەبدوڵڵا وەلید عوسمان، تا ماوەیەکی چاك لە کاری پاڵەوانێتی ئاسندا یاری کردووە.
- یەکەم جار لە بەرزکردنەوەی (١٠٠کغ) لە شاری کەرکوك بەشداری کردووە، هەروەها پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە لە پاڵەوانێتی لە شاری کەرکوك و موسڵ، لەنێوان ساڵانی (١٩٧٣- ١٩٨٠). لە پارێزگاکانی کوردستاندا پلەی یەکەمی بەناو خۆیەوە تۆمار کردووەو خەڵاتی گەورەی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٧٩) لە شاری سەماوە بەشداری پاڵەوانێتی عێراقی کردووەو بە پلەی دووەم دەرچووە.
- ساڵی (١٩٧٠) بووەتە سەربازو لە (٥)ی مایسی ساڵی ١٩٧٩) بەشداری ئاسنی کردووە لە سوپادا.
- هەروەها لەو ماوەیەی سەربازیەدا پلەی سێیەمی بەدەستهێناوە لەسەر ئاستی عێراق.
- بەشداری دوو پاڵەوانێتی نێودەوڵەتی کردووە لە ئوردن و میسرو لوبنان و نیپاڵ و پلەی سێیەمی بەدەستهێناوە کە لە ژێر ناوی "سید النصیر المصری"دا بووە هەروەها پاڵەوانێتی

دووەمی بەدەستهێناوە بە ناوی عەبدولواحید عەزیز کە چەند دەوڵەتی عەرەبی بەشداریان تێدا کردووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٨٩- ٢٠٠٣) چ لە کەرکوک و دەرەوەی کەرکوک بەشداری گەلێک چالاکی و ڕاهێنانی هونەری کردووە و تاکو ئێستاکە بەردەوامە.

* (تالب غالب حمە شێن ناسراو بە (مام دەریا)):-
- ساڵی (١٩٦٦) لە شاری کەرکوک لەدایکبووە، لە ساڵی (١٩٧٤) ئاوارەی وڵاتی ئێران بوونە.
- بەهۆی شۆڕشی کوردستانەوە لەو کاتەوە هەستی بەخۆشەویستی کوردستان و زمان و کەلتووری نەتەوەکەی کردووە و لەناخی دڵیدا چەسپابوو هەر لە هەمان ساڵداو لە تەمەنی منداڵیدا دەستی بەوەرزشکردووە لە بواری تۆپی پێدا لە ئۆردوگای ئاوارەکان لە نزیک شاری کرماشان لە خوێندنگەیەکی سەرەتایی یاری کردووە، پاش دەرکەوتنی بۆ تیپی ئاوارەکان یاری کردووە، دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول گەڕوانەتەوە شاری کەرکوک لە وەرزش بەردەوام بووە، هەمیشە لە یاریکەرە سەرەکییەکانی ئەو تیپە بووە، کە یاری تێدا کردووە، قوتابخانەکان (گۆران، زێوەر، عەبدولرەحمان بن عوف)، لێرەوە بۆ هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوک یاریکردووە.
- ئەو تیپە میللییەیانەی کە یاری تێدا کردوون زۆرن، بەڵام یاریزانی سەرەکی (شەباب ئومە)ی ڕەحیم ئاوا بووە، ئەو یانانەی کە یاری تێدا کردووە یانەی (سوڵاف، سەورە، پۆلیسی کەرکووک).
- ئەو هەڵبژاردانەی کە یاری تێدا کردووە هەڵبژاردەی (فیدائی کەرکووک، لاوانی کەرکووک، پێشکەوتووانی کەرکووک، پەروەردەی کەرکووک) لە ساڵی (١٩٨٢) بووە بەپێشمەرگە لە گوندەکان لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا زۆرجار لەگەڵ خەڵکی گوندنشینەکان وەرزشی دەکرد زۆرجاریش لەناو هێزی پێشمەرگە لەگەڵ هاوڕێکانی سەرقاڵی وەرزش دەبوو، بەڵام لە گوندی تۆمارو گورگان تیپێکی نەوجەوانانی دامەزراندبوو ببووە جێی سەرسووڕمانی گوندەکان بە تەمەن منداڵ بوون و فێری هەموو جۆرە شێوازێکی یاریکردنیانی کردبوو بۆیە بەهێزبوون و جێگای سەرسووڕمانبوون لەو کات و سەردەمەدا.
- دەستپێکردنەوەی وەرزشی بەتەواوەتی لەدوای ڕاپەڕین لە ساڵی (١٩٩١) دەستی پێکردووە لە ساڵی (١٩٩٢) لە شاری هەولێر لە بنەسڵاوە بیرۆکەی یانەی وەرزشی کەرکوک بۆ ئاوارەکانی کەرکوک وەرزشکاری هەمیشە نەمرو مامۆستای گەورەی هەموومان (حەمزە یاسین) داڕێژراو کۆمەڵێک هاوڕێ و وەرزشکاری بە توانای شاری کەرکوک بوون بە دەستەی دامەزراندن و ئامادەکارییان بۆ هەڵبژاردنێکی پاک و بێگەرد کردوو یانەی وەرزشی کەرکوک دامەزرا (مام دەریا) یەکێکە لەو کەسانە لەم یانەیە شەرەفی ڕاهێنەری پێبەخشرا، بوو بەڕاهێنەری تیپی لاوانی یانەی وەرزشی کەرکوک، هەر لەم یانەیەدا جارێکی تر لە شاری سلێمانی بوو بە ڕاهێنەری لاوان و تیپی پێشکەوتووانی یانەی وەرزشی کەرکوک کە ئەوکات کەرکوک لە پلەی نایاب بوو پاشان بوو بە ڕاهێنەری یانەی (سەید سادق) کە ئەوکات ئەم یانەیە لە پلەیەکەکانی کوردستان بوو لەدوای ئەم یانەیە بوو بەڕاهێنەری یانەی بەکرەجۆ لە شاری سلێمانی پاشان لەم یانەیەوە بەرەو یانەی شۆڕیجەی شاری کەرکوک دەگەڕێتەوە کە ئەوکات یانەی شۆڕیجە پلە یەک بوو لەسەر دەستی مام دەریا دەچێتە پلەی نایاب لەدوای ئەم یانەیە دەبێتە ڕاهێنەری یانەی خاک، جگە لە ڕاهێنەرایەتی ئەم یانانە ڕاهێنەری خوێندنگایەکی تەمەنە جیاجیاکانیش بووە بۆ پێگەیاندنی یاریزانانی کەرکووک.
- ئەو خولانەی کە بەشداری تێدا کردووە وەک ڕاهێنەر ئەمانەی لای خوارەوەن:-
١-خولێک بۆ لەش و لاری لە شاری سلێمانی لەسەر دەستی دکتۆر (تێرس عۆدیشو).
٢-خولێک لە شاری هەولێر لەسەر دەستی مامۆستا (کەنعان میدحەت) تەکنیک تەکتیک سویدی.
٣-خولێک لە شاری سلێمانی بۆ تەکتیک، تەکنیک لەسەر دەستی (مەهدی عەبولساحیب)سوید.
٤-خولێک لە شاری چەمچەماڵ لەسەر دەستی (مەهدی عەبولساحیب) سوید.
٥-خولێک لەشاری هەولێر لەسەر دەستی شارەزایەکی وڵاتی شیلی.
٦-خولێک لەشاری هەولێر لەسەر دەستی شارەزایانی ئەرجەنتین.
٧-خولێک لە شاری هەولێر لەسەر دەستی چەند شارەزایەکی ئەڵمانی.
٨-خولێک لە وڵاتی ئێران لە شاری تاران لەسەر دەستی شارەزایانی وڵاتی ئاسیا.
٩-بۆ خزمەتی ڕۆژنامەنووسیی وەرزشی وەک ڕۆژنامەنووس کاری کردووە.
- ئێستاش جێگری سەرۆکی لیژنەی سەرپەرشتی تیپە میللییەکانی کەرکووکە و لە خزمەتی وەرزشدا بەردەوامە.

* فەخرەدین پاڵەوان:-
- لە ساڵی (١٩٢٠) لە گەڕەکی پیریادی لە کەرکوک لەدایکبووە.
- هەر لە تەمەنی پانزە ساڵییەوە یاری پاڵەوانی زۆرخانی کردووە.
- زمانەکانی عەرەبی و تورکمانی و کوردی و هیندی و فارسی و ئینگلیزی بە باشی زانیووە.
- بۆ ماوەی ساڵێک چووەتە (بەسرە)و لە لەوێ فێری زۆررانبازی بووە.
- ساڵی (١٩٧٥) لەگەڵ هەریەکە لە (سادق ئەلسەندق) و (عەباس ئەلدیک) بەشداری پاڵەوانی زۆرخانەی کردووە لەگەڵ پاڵەوانەکانی ئێران و سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە. ماوەیەک لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە گیراوەو گەلێک ئەشکەنجە دراوە تا ماوەیەک ماوەتەوە و لەدوای دەرچوونی تووشی گەلێک نەخۆشی بووە تا کۆچی دوایی کردووە.

*** عادل عەلی (کوچوك عادل):-**

- ساڵی (١٩٥١) لە گەڕەکی پیریادی لەدایکبووە.
- لە سەرەتادا لە قوتابخانەی (الشرقية) دەستی بە یاری کردووە.
- لە ئامادەیی (المصلی) و هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك و هەڵبژاردەی کەرکوك یاری کردووە.
- دوای ماوەیەك لە تیپی (الفرقة الثانية) لە کەرکوك یاری کردووە.



جەلال محەمەد قادر



*** عیسی پاڵەوان و وورچەکە:-**

- ناوی تەواوی (ئیسماعیل عەزیز عەلی)یە
- ساڵی (١٩٣٦) لە گەڕەکی ئیمام قاسم لە شاری کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە سەرەتای ژیانییەوە دەستی کردووە بە ئاسن یاریکردن و فێلبازی"سحر" چەندەها ئاهەنگی گێڕاوە لە ژیانیدا وەك خۆی دەڵێت:

(ساڵەکانی پەنجا و لە سەرەتای ژیانمدا دەچووم بۆ چایخانەکەی "نوری فەقێ" لەبەر تەکێی شاری کەرکوك: ئاسن بازیم دەکرد گەلێك لە پاڵەوانی ئەو سەردەمە یاریان دەکرد لەوێدا دەچووین بۆ چایخانەی مەحموود قەڵایی و محەمەد ئەبو شوارب لە قەراخ خاسەو لەگەڵ بەکر مەلا عەبدوڵڵا و عوسمان پاڵەوان.
لە ساڵەکانی شەستەکاندا ئاهەنگی ئاسن و زۆرانی ورچ بازیم دەکرد گەلێك ئاهەنگمان لە کوێسنجاق و بەسرەو عەمارە ڕەواندوزو سلێمانی ساز دەکرد لەگەڵ عەبدوڵڵا زێڕەنگەرو



بەکرە گۆج



جەلال ئیبراهیم عەبدولکەریم



سامی عەبدوڵڵا موختار



سامی ئەمین ساڵح



عەدنان محەمەد سابیر



عەلی ساڵح عەلی



فەیزوڵڵا فەتحوڵڵا



مام دەریا



یاسین عەبدوڵڵا

یوسف فەتاح.
بەڵام لە جەژنەکاندا لە حەمامەکەی قالە حەمامچی نمایشی زۆران بازیم دەکرد لەگەڵ وورچدا، ورچێکی زلم هەبوو فێرم کردبوو باوەشمان لەیەك دەدا یەکتریمان ئەهاوردو ئەبردو خەڵکێکی زۆر کۆ دەبوونەوەو پارەیان دەدا سەیری ئێمەیان دەکرد. ئەو ورچە ببوو بە دۆستو برادەرم زۆر زیرەك بوو بەڵام خۆم نائەدایە دەستییەوە ئەگەر بێتو پا بخاتە سەر پاتو پاڵت پێوەبنێ ئەوا پشتت دەشکێنێ لەبەر ئەوە زۆر بەهێزە.
لە شاری "عیمارە" فرۆشتم سەرۆکی شارەوانی لێمی کری کە بەجێم هێشت تورە بوو بەستبویانەوە بە دارێك بە هەردوو دەستی دارەکەی ڕاوەشاند لە بنەوە هەڵیکەندو ڕای کرد بۆلام ئەوان ووتیان بیبەرەوە بۆخۆتو پارەکەیان لێ نەسەندم.
چووم بۆ ئێران بۆ فێربوونی فێڵ خەڵك پێی دەڵێت "سەمەربازی" بەڵام هەمووی یاری بەکارهێنانی دەستە بە گورجیو تیژی.
خەلیل عەقاب هەبوو لە ئێران پاڵەوانێکی بەهێز بوو کەرێکی سپی بەددان بە گوریسێك هەڵدەگرت.
هەشت فەردەیان دەخستە سەر سنگی ئینجا لەگەڵ کەریم حەریریو باتاسیدا لەگەڵ فەخری پاڵەوان یارییان دەکرد.
لەگەڵ موکەڕەم قالە حەمامچی (۳۷۰)کیلۆ گرام ئاسنم ڕادەکێشا" بە سەحب"
ئەو یاریزانانەی لە بیرم ماون یوسف محێدین کۆیی، محەمەد ڕەشید "گونە" لە جوانی لەشدا زۆر باش بوون).
عیسا پاڵەوان تا ئێستا ژنی نەهێناوەو هەر تەنیایەو حەز بە وەرزشو دەکاتو خەیاڵێکی فراوانی هەیە لە سەیرکردنی ژیانی ئەمڕۆدا.



ئەبوبەکر کەریم



عالیە محەمەد ئەمین



ئامینە کەریم



دێرین سابیر



نەجمەدین ئەنوەر مەحموود



مەریوان فازڵ



شەمسەدین عەبدوڵڵا وەلی

*** ( محەمەد سلێمان سالح - محەمەد بلە )**
- ساڵی (١٩٣٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە سەرەتای دامەزراندنی یانەی (الثورة)وە لە ساڵی ١٩٦٣ ڕاهێنەر بووە لەو یانەیە.
- ساڵی (١٩٦٩) لەگەڵ (قاسم دێو) بەشداری خولی تۆپی پێی تورکی کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٨) کۆچی دوایی کردووە.

*** ماهیر ئەحمەد حەسەن:-**
- ساڵی (١٩٣٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٧- ١٩٦٠) کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٦١- ١٩٦٧) مامۆستا پەروەردەی وەرزش بووە لە ئامادەیی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٦٧- ١٩٦٨) سەرپەرشتیاری پەروەردەی وەرزش بووە لە کەرکوك.
- ساڵی (١٩٦٩- ١٩٧٢) نێردراوە بۆ ئەڵمانیا بۆ تەواوکردنی ماستەر.
- ساڵی (١٩٧٤- ١٩٧٧) بەڕێوەبەری گشتی بنکە وەرزشییەکان بووە.
- ساڵی (١٩٧٨) بووەتە بەڕێوەبەری یانەو یەکێتییە وەرزشییەکانی عێراق.
- ساڵی (١٩٧٨- ١٩٩٠) مامۆستای کۆلێژی پەروەردەی وەرزش بووە لە زانکۆی بەغدا.
- ساڵی (١٩٩٠- ١٩٩١) سەرۆکی لیژنەی بڕوانامەی ماستەر بووە.
- ساڵی (١٩٩٩- ٢٠٠٢) لە زانکۆی سلێمانی دامەزراوە.
- ساڵی (٢٠٠٣- ٢٠١٠) لە زانکۆی بەغدا دامەزراوە.

*** سەلاح محەمەد ئەورەس:-**
- ساڵی (١٩٤١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٠) بەشی وەرزشی لە (دار المعلمین) تەواو کردووە.
- ماوەیەك مامۆستای وەرزش بووە لە ناوەندی خورماتوو، ناوەندی (الغربیة)
- ماوەیەك ڕاهێنەر بووە لە پەروەردەی کەرکوك
- ماوەیەك لە یانەی (الثورة) بووە.
- ڕۆڵی هەبووە لە شەستەکان لە دامەزراندنی یانەو تیپە ئەدەبیو تورکمانییەکانو بەشێك لە سەرچاوەو نووسراوی هەبوو.
- ساڵی (١٩٩٩) عێراقی بەجێهێشتووە و لە ئوستڕالیا جێگیر بوو.

*** قادر مەجید زەینەڵ:-**
- ساڵی (١٩٥٧- ١٩٥٨) (دار المعلمین) بەشی پەروەردەی وەرزشی تەواو کردووە.
- ماوەیەك سکرتێری یانەی (الثورة) بووە.
- بەشداری زۆربەی یارییەکانی یانەی (الثورة)ی کردووە.

*** عەبدولسەلام ئەحمەد حەسەن:-**
- ساڵی (١٩٤١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦١- ١٩٦٢) بەشی پەروەردەی وەرزشی لە (دار المعلمین) تەواو کردووە.
- ماوەیەك لە هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك بەشداری کردووە لە تۆپی پێیو باسکەو باڵەدا.
- بەشداری گەلێك لە تیپە میللییەکانی کەرکوکی کردووە وەکو (الجزائر)و (فلسطین).
- یەکێك بووە لە یاریزانەکانی گۆڕەپانو مەیدان لە ڕاکردنی (٦/٤٠)م
- سەرپەرشتیاری وەرزشی بووە لە چالاکی قوتابخانەکانی ناوەندیو ئامادەیی.
- سەرۆکی یەکێتی تۆپی سەر مێز بووە لەنێوان ساڵانی (١٩٧٣- ١٩٩٦).
- ماوەیەك سەرۆکی یەکێتی (بلیارد) بووە لە پارێزگاکە.

*** عەدنان شکور عوسمان:-**
- ساڵی (١٩٤٢) لە کەرکوك لەدایکبووە
- ساڵی (١٩٦٤- ١٩٦٨) کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی تەواو کردووە.
- ماوەیەك مامۆستا بووە لە پێگەیاندنی مامۆستایانی کەرکوك
- بۆ ماوەی دە ساڵ ڕاهێنەر بووە لە یانەی (الثورة)
- ماوەیەك ڕاهێنەری تیپی (الشرقیة)و هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك بووە.
- هەر لە ساڵی (١٩٨٧)ەوە لە دانیمارك نیشتەجێبووە.

*** قاسم سلێمان - قاسم دێو:-**
- ساڵی (١٩٤١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە ساڵی (١٩٥٤)ەوە لە بواری وەرزشیدا کاری کردووە.
- لەگەڵ ئەم تیپو یانەی کەرکوك بەشداری کردووە:-
- هەڵبژاردەی پەروەردە، یانەی (الثورة)، یانەی (الآخاء التركماني).
- بەشداری خوولی ڕاهێنەری کردووە.
- ساڵی (٢٠٠٧) کۆچی دوای کردووە.

*** ناجی عەبدولقادر زەینەڵ:-**
- ساڵی (١٩٤٢) لە کەرکوک لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٩- ١٩٦٠) بەشی وەرزشی لە (دار المعلمین) تەواو کردووە
- ماوەیەك مامۆستای وەرزشی بووە لە بڵاوە، تۆپزاوە، داقوق.
- بەشداری خوولەکانی دیدەوانی کردووە.
- بۆ ماوەی حەوت ساڵ بەرپرسی پێشانگای کشتوکاڵییەکان بووە لە کەرکوك.

*** سوهەیل سابیر عەلی هەمەوەندی:-**
- ساڵی (١٩٦٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە تیپە میللییەکان بەشداری کردووە لەنێوان ساڵانی (١٩٧٤- ١٩٧٨)
- یاری کردووە لە (مرکز شباب کرکوك)، یانەی (الثورة الریاضي).

*** وەهبی نورەدین:-**
- هەر لە تەمەنی منداڵییەوە خولیای وەرزشی هەبووە و لە قۆناغی ناوەندی چووەتە هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك، کە لە ساڵی (١٩٥٢) لە تیپی تۆپی پێ و باسکە ئەندام بووە.
- ساڵی (١٩٥٤) چووەتە (مدرسة التدریب الصناعي) لە کۆمپانیای نەوتی عێراق و بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە خوێندن بەردەوام بووە، لەسەر دەستی (مستر هۆجکیس) ڕاهێنراوە لە تۆپی پێ و بۆ ماوەی سی و هەشت ساڵ ئەندام بووە لە هەڵبژاردەی کۆمپانیا.
- ماوەیەك وەکو مامۆستای وەرزشی کاری کردووە لە ناوەندی (الشرقیة).

*** قاسم محەمەد - (قاسم قورت):-**
- ساڵی (١٩٥٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی پەروەردەی وەرزشی زانکۆی موسڵە.
- ساڵی (١٩٨٥) بووەتە مامۆستای وەرزش
- ماوەیەك مامۆستای یانەی وەرزشی تورکمانی بووە

*** ئەنوەر عەلی هورمزی:-**
- ساڵی (١٩٤٢) لە کەرکوك لە گوندی (ترکەڵان) لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٦٧) پەروەردەی وەرزشی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٦٨) وەکو مامۆستای وەرزشی دامەزراوە.
- خەڵاتی دادوەری بەدەستهێناوە لە یاری باسکە و گۆرەپان و مەیدان.
- ساڵی (١٩٧٩) دامەزراوە وەکو بەڕێوەبەری چالاکییەکانی دیدەوانی لە پەروەردەی کەرکوك.
- ساڵی (٢٠١٠) کۆچی دوای کردووە.

*** میدحەت مستەفا سەعدوڵڵا:-**
- ساڵی (١٩٣٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لەنێوان ساڵانی (١٩٤٩- ١٩٥٢) پەیوەندی کردووە بە دار المعلمین لە بەغدا و تەواوی کردووە.
- ساڵی (١٩٥٣) لە یانەی (الثورة) دامەزراوە.
- ساڵی (٢٠٠١) کۆچی دوای کردووە.
- بەشداری گەلێك لە چالاکییە دیدەوانی و فیستیڤاڵەکان کردووە.

*** غالیب ئیبراهیم وەهاب:-**
- ساڵی (١٩٣٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- بەشداری گەلێك تیپی وەرزشی کردووە لە کەرکوك وەکو هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك.
- ساڵی (١٩٩٦) کۆچی دوای کردووە.

*** محەمەد عیزەت خەتاب:-**
- کەسایەتییەکی ئەدەبی، زانستی، پەروەردەیی، سیاسی، هونەرمەند و وەرزشەوان بووە.
- لەسەردەمانێکدا یەکێك بووە لە وەرزشەوانەکانی تۆپی پێ

*** ئەحمەد نیعمەت لوتفوڵڵا:-**
- ساڵی (١٩٣٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یەکێك بووە لە هەڵبژاردەکانی کۆمپانیای نەوتی عێراق، تاوەکو ساڵی (١٩٥٨) بۆ ماوەی سی و هەشت ساڵ لە بواری وەرزشی خزمەتی کردووە.

*** حیسامەدین مستەفا عەبدوڵڵا:-**
- ساڵی (١٩٢٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لە سەرەتاوە لە تیپی (چای) یاری کردووە لەگەڵ یاریزانەکانی وەکو:- عەونی جەلال، سوبحی جەلال، سامی دەدە، محەمەد جەمیل، حەسەن دەدە.

*** عەبدولخالق محەمەد عەبدی:-**
- ساڵی (١٩٣٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥٨) کۆلیژی کشتوکاڵی لە ئەنقەرە تەواو کردووە.
- ساڵی (١٩٦٩) دکتۆرای لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- ماوەیەکی زۆر لەگەڵ تیپی (جرید میدان) و (الجناح الطائر) و (داغ پار چاسي). وەرزشی کردووە.

*** مستەفا عەلی کەریم:-**
- ساڵی (١٩٣٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٥١) ڕۆڵی بینی لە دامەزراندنی تیپی (پیریادی).
- ساڵی (١٩٥٤) لەگەڵ تیپی (الأخوة) یاری کردووە.
- ساڵی (١٩٥٩) لە هەڵبژاردەی (مەعاریف) کاری کردووە.

*** مێژووی چالاکی وەرزش لە کەرکوک:-**

بەپێی ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستدایە، ساڵی (١٩٣٣) ساڵێکی بەرچاوە لە مێژووی بزووتنەوەی وەرزش لە کەرکوک، ئەویش پاش ئەوەی بەشێکی بەرچاو لە تیپی قوتابخانەکان دامەزرا لە پارێزگاکە، بەشێکی بەرچاو لە کەسانی بە توانا لەم بوارانەدا یاریزانی بە توانایان پێگەیاند. هەروەها تیپی (سوپای عێراق) بە هەردوو بەشەکانی المخابرة والمدفعية، گەلێك یاریزانی بەرچاوی لە خۆگرت وەکو:-

قەدوری کافر عوسمان، جەلیل کوردی، محەمەد تاج، جاسم حەسون، نوری ئەحمەد.

لەپاڵ گرنگی دامەزراندی تیپی کۆمپانیای نەوتی عێراق بە هەموو بەشەکانییەوە دەوری بینی لە پێشکەوتنی وەرزش لە پارێزگاکە کە هەریەکە لە یاریزانەکانی: (مایکل لازار، بابازیان، بنیامین)، بەڵام لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٠ - ١٩٤٥) گەلێك یاریزانی بەرچاو لەو ماوەیەدا سەری هەڵدا وەکو:- سەباح عەبدوڵڵا، محەمەد رەشاد، هەروەها گەلێك تیپی میللی لەو ماوەیەدا لە کەرکوك چالاکیان هەبووە، لەهەمان ماوەدا یەکێتە وەرزشییەکانی سەریهەڵدا وەکو یەکێتی تۆپی پێی کۆمپانیای نەوتی عێراق، بەسەرپەرشتی مستر ئوول و فەخری عومەر، بوونی ئەم یەکێتییەی کۆمپانیا دەوری بەرچاوی هەبوو ئەویش لە بوونی گۆڕەپانی چاك و شوێنی بەرچاو بۆ مەشق کردن هەر لەو ماوەیەدا یەکێتییەکانی تۆپی پێ دابەش بووە دوو بەشەوە وەکو تیپی پلە یەك کە (٧) تیپ بوون، هەروەها تیپی پلە دوو کە لە (٨) تیپ پێکهاتبوو، وەئەو تیپانەی کە لە پلە یەك بوون وەکو تیپی (المعارف)، تیپی ناوەندییەکان، تیپی (المعهد الثقافي البريطاني)، کە یاریزانی بەرچاوی معارف عەبدوڵڵا چەنەباز بوو، ئەحمەد تکریتی یاریزانی (المعهد الثقافي)بوو. لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٥ - ١٩٥٨) ئەم یاریزانانە ناوبانگیان هەبوو:- عادل ئەفەندی، ویداد، سوداد، میناس، ئەلفرید[٣٥]

*** تیپە وەرزشییەکانی کەرکوك:-**

**١- تیپی وەرزشی (بشکتاش):-**

ئەم تیپە وەرزشییە لە ساڵی (١٩٦٥) لە کەرکوك دامەزراوە لەلایەن سەلمان تەیفورو رەشید کازم، باشترین یاریزانەکانی بریتییە لە:- عادل شوکور، سەلاح حیلە، سەلاحەدین، بەهجەت عەبدولرزاق، عابدین زەینەل، فەریدون مستەفا، سەلاح نوری، عومەر مستەفا، حەقی ئیسماعیل، ئەنوەر ساڵح، [٣٦].

**٢-تیپی وەرزشی (قارداشلق)**

ئەم تیپە وەرزشییە لە ساڵی (١٩٦٣) لە گەڕەکی موسەڵا دروست بووە بە سەرپەرشتی کوردە قەساب، یاریزانەکانی ئەم تیپە بریتیبووە لە:- غازی محەمەد، جەودەت شەوکەت، عادل عەلی، سەلیم محەمەد، جەلال عوسمان، قاسم سلێمان، کەماڵ عوسمان، شاکیرە سوورە، خالید بەهجەت، عەبدولرەحمان، ئیسماعیل، سامی هەروەها تیپێکی تری هەبوو بە ناوی تیپی (قارداشلق گنجلر طاقمي) [٣٧].

**٣- تیپی (یلدرم کفری)**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٥) لە کفری دامەزراوە بەسەرپەرشتی (یوکسەل محەمەد ئیبراهیم)، کە باشترین یاریزانەکانی کفری یارییان تێدا کردووە لە (٢٢) یاریزان و بەڕێوەبەری کارگێڕیی، یاری کردووە لە گەڵ تیپی (اسکان بغداد) کە (٢) بە (١) سەرکەوتنی بەدەستهێناوە. یاریزانەکانی بریتی بووە لە : شاهین محەمەد، نەوزاد حەمید، جەودەت دەدە، نەجدەت محەمەد[٣٨].

**٤- تیپی وەرزشی (شنلر):-**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٥) لە گەڕەکی (تسعین) دامەزراوە یاریزانەکانی بریتی بووە لە:- سەفا جەمال، عەلی محەمەد، سەباح عەلی، خەلیل عەبدولقادر، ئیحسان عەبدولقادر، فەتاح حەمید، سەباح وەلی، نەجمەدین شوکر، عیماد محەمەد، عیرفان خەلیل، رەعد عومەر[٣٩].

**٥- تیپی وەرزشی (قزل ئارمق):-**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٦) لە گەڕەکی (تسعین) دامەزراوە یاریزانەکانی پێکهاتبوو لە:- جەلال عوسمان، سامی عارف، غازی محەمەد، ئەنوەر ریاشین، عەزیز مورشید، عادل مەردان، جەودەت نەجمەدین، هاشم حەمودی، فەخرەدین قەلایی، سامی سناعە، حەسەن رەفعەت، [٤٠].

**٦- تیپی قوتابخانەی عەرەفەی سەرەتایی:-**

ئەم تیپە لە شەستەکانی سەدەی رابردوو لە گەڕەکی عەرەفە دامەزراوە[٤١]

**٧- تیپی وەرزشی (مصلحة الكهرباء):-**

یەکێك بووە لە تیپە بەهێزەکانی کەرکوك، کە بەشداری گەلێك تۆپێنی کردووە لە کەرکوك و دەرەوەی کەرکوك کە یاریزانەکانی بریتی بووە لە:- عەدنان عەبدولقادر، سەلاح حەسەن، جیهاد خورشید، سامی عارف، غازی غەریب، دانیال شاوول[٤٢].

**٨- تیپی (أتحاد خليل كركوك):-**

ئەم تیپە بە سەرپەرشتی خەلیل حەسەن دامەزراوە بەشێك لە یاریزانەکانی بریتی بووە لە:- یەڵماز عادل، نەشئەت ئاوچی، فەخرەدین رەفیق[٤٣].

**٩- تیپی وەرزشی (کوچك بازار):-**

ئەم تیپە وەرزشییە لە خوورماتوو دامەزراوە بەشێك لە یاریزانەکانی بریتی بووە لە:- قاسم شوکر، ماهیر ئەحمەد، حەسەن حەقی، حەمید قەساب، سوبحی داغستانی، کەماڵ قەنبر، زینەل عابدین، خەلیل توراب، نەجم شاهباز، ئەسغەر حەمید، فازڵ حوسێن، حوسێن عەلی، ئایدن محەمەد[٤٤].

**١٠- تیپی وەرزشی (اتحاد مەجید کەریم):-**

ئەم تیپە لە شەستەکانی سەدەی رابردوو لە کەرکوك دامەزراوە

**١١- تیپی وەرزشی (العاصفة كركوك)**

ئەم تیپە لە شەستەکانی سەدەی رابردوو لە کەرکوك دامەزراوە.

**١٢- تیپی وەرزشی ناوەندی (الغربية):-**

ئەم تیپە گەلێك چالاکی لەنێو قوتابخانەو لە دەرەوەی قوتابخانەکە هەبوو، کە گەلێك یاریزانی بە توانای

پێگەیاندبوو.

**١٣- تیپی وەرزشی (شركة نفط العراق):-**

ئەم تیپە وەرزشییانەی کە لەنێو کۆمپانیادا هەبوو، گەلێك لقی وەرزشی هەبووە وەکو:-

١- لیژنەی تۆپی پێ
٢- لیژنەی یاری باڵە
٣- لیژنەی یاری باسکە
٤- لیژنەی یاری هۆکی
٥- لیژنەی یاری گۆلف
٦- لیژنەی سوار چاکی
٧- لیژنەی تۆپی سەر مێز
٨- لیژنەی قورسایی هەڵگرتن.

ئەم لیژنانە دەوری سەرەکیان هەبووە لە پێگەیاندنی تازە پێگەیشتووان لەنێو کۆمپانیادا کە ژمارەیان نزیکەی شەست یاریزان بووە بەسەرپەرشتی مستەر (هوجکس) ئەم لیژنانە دەوریان بینووە لە یاریکردن لە عێراق و دەرەوەی عێراق. هەروەها بوونی یاریگایەکی فراوانی کۆمپانیا دەوری سەرەکی بینووە لە پێشکەوتنی یاری لە کۆمپانیا[٤٥].

**١٤- تیپی وەرزشی (موسەلا):-**

ئەم تیپە لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا لە قوتابخانەی سەرەتایی موسەلا بوونی هەبووە.

**١٥- تیپی وەرزشی (خالدیة)**

ئەم تیپە لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا لە قوتابخانەی خالدییەی سەرەتایی بوونی هەبووە.

**١٦- تیپی وەرزشی (النهرین)**

ئەم تیپە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردووە بوونی هەبووە لە پارێزگای کەرکوك.

**١٧- تیپی وەرزشی (ماوی یەڵدز)**

ئەم تیپە لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووە، کە بەسەرپەرشتی هیجران بەیاتی، هەریەکە لە نەجاح خورشید، نەجات جەمال، یەشار سەعدەدین، خالید سلێمان، عەدنان عەلی، وەکو یاریزانی لە تیپەکەدا یارییان کردووە.

**١٨- تیپی هەڵبژاردەی کەرکوك (منتخب کرکوك)**

ئەم تیپە لە ماوەیەکی دوورو درێژ وەلە کەرکوك بوونی هەبووە ولە گەلێك یاری بۆ پارێزگاکە ولە دەرەوەی پارێزگاکە یارییان کردووە.

لە یاریزانەکانی هەڵبژاردەی کەرکوك بریتییە لە خورشید نامق، سەرکیس یۆنان، فەزیل ئلیاس، خەتاب یاسین، قاسم سلێمان، عەدنان عەبدولقادر، عادل عەبدوڵلا.

**١٩- تیپی هەڵبژاردەی پەروەردەی کرکوك (منتخب التربیة):-**

لە ماوەیەکی زۆر لە زووە بوونی هەبووەو دەوری هەبووە لە بەرزکردنەوەی ئاستی یاری وەرزش لە پارێزگاکەو کۆکردنەوەی یاریزانەکانی قوتابخانەکان لەنێو هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك دەوری بینووە لە بەرزبوونەوەی ئاستی وەرزش لە هەمان کاتدا گەلێك یاریزانی گەنجی بەدەستهێناوە کە لە سەر ئاستی دەرەوەی پارێزگاکە یارییان کردووە

**٢٠- تیپی (شرطة کرکوك):-**

ئەم تیپەش لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا بوونی هەبووە لە کەرکوك[٤٦].

**٢١- تیپی (الفرقة الثانیة)**

کە لە دوایدا ناوەکەی بوو بە تیپی (قوات خالد).

**٢٢- تیپی (النسور الاثوري).**

**٢٣- تیپی وەرزشی (الارمني).**

**٢٤- تیپی (المعهد الثقافي البریطاني).**

**٢٥- یانەی (الثورة)**

ئەم یانە وەرزشییە لە ساڵی (١٩٥٤) لە کەرکوك دامەزراوە کە دەورێکی بەرچاوی هەبوو لە بەرزکردنەوەی ئاستی وەرزش لە پارێزگاکە بە کردنەوەی چوار تیپی وەرزشی لە یەك کاتدا

**٢٦- تیپی وەرزشی (الاخاء):-**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٣٣) لە کەرکوك دامەزراوە، کە یاریزانەکانی بریتی بوو لە مەسعود عەبدولقادر ئاغا، ئیسماعیل عومەر، فاتیح سەعاتچی، مستەفا گوك قایا، شاکر زابت، مەلا ئیبراهیم، سدیق تۆفیق، کەریم حوسێنی، حەسیب ساڵح، جیهاد عەلی.

**٢٧- تیپی (الشعبي الاول)**

ئەم تیپە لە گەرەکی (جرید مەیدان) دامەزراوە لە لایەن یاریزانەکانی وەکو:- عیزەدین عەبدی، غازی نوری، حەسەن قزا، وەستا مەکی.

**٢٨- تیپی (نادي کرکوك الاتحادي):-**

ئەم تیپە بەسەرپەرشتی (قەدری ئەرزۆملی) دامەزراوە.

**٢٩- تیپی (منتخب شرطة النفط)**

**٣٠- تیپی (منتخب المعلب)**

**٣١- تیپی یانەی (السکك الریاضي).**

**٣٢- منتخب (نادي الثورة الریاضي)**

ئەم هەڵبژاردەیە لە ساڵی (١٩٥٤) دامەزراوە لەسەر ناونیشانی (نادي فیصل الریاضي) لە تەنیشت گۆرستانی (سەید عەلاوی) بەڵام لە دوای ڕاگەیاندنی کۆماری لە ساڵی (١٩٥٨) ناوەکەی گۆڕاوە بۆ (نادي الثورة الریاضي).

شوێنەکەی لە سەرەتادا گواسترایەوە بۆ پشت سینەما ئەتلەس بەڵام لە دوایدا بینایەکی تازەی بۆ دروستکرا لە سەرشەقامی کۆرنیش لە پشت بەڕێوەبەرایەتی کارەبای کۆنی کەرکوك، بەڵام لە دوایدا گواسترایەوە بۆ سەر ڕێگای بەغدا.

**٣٣- تیپی (الفرسان):-**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٥٥) دامەزراوە.

**٣٤- تیپی (النهب الاسود)**

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٥١) دامەزراوە یاریزانە بە ناوبانگەکانی بریتی بوو لە:- نورەدین عەبدولڕەحمان، فاتیح عەبدولڕەحمان، سوداد عەباس، محەمەد سدیق عەبدوڵلا، فەخری خەلیل ئاوچی، عەبدوڵلا چەنەباز، حوسێن عەلی تکریتی، ئەحمەد جەلال شەریف، ئەلفرید داود)

لە ساڵی (١٩٥٦) ئەم یاریزانانە هاتنە نێو تیپەکەوە:- محەمەد عیزەت خەتاب، نەجات شێخ قودرەت، ئەحمەد عیزەدین.



تیپی وەرزشی نوور ١٩٥٧



یاری یەکێتی مامۆستایانی کەرکوك لە سلێمانی ١٩٥٧



تیپی وەرزشی نوور بە سەرۆکایەتی خورشید لە ساڵی ١٩٥٩



تیپی وەرزشی ناوەندی شەرقییە لە ١٩٥٨



تیپی وەرزشی نوور ١٩٥٩



تیپی وەرزشی نوور لە سلێمانی ١٩٥٩



هەڵبژاردەی کەرکوك لە ١٩٥٨-١٩٥٩





تیپی وەرزشی دار المعلمین لە ١٩٦١

٣٥- تیپی (الهلال الأحمر):-
ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٥٦) دامەزراوە، یاریزانەكانی بریتی بوونە لە:- عادل ئەمین، ئەحمەد ئەبو شەهاب، جەمال عوسمان، ئیحسان حوسێن پاڵەوان، قاسم دێو، سوبحی عەونی، عەبدوڵڵاحاجی محەمەد، ئەنوەر (یاشین)، سەباح نوری، محەمەد سێوە، مولازم تاریق، مستەفا سولاقای، محەمەد حەمید، عەباس عاشوور.
٣٦- تیپی (تسعین):-
لە ساڵی (١٩٥٧) لە كەركوك دامەزراوە.
٣٧- تیپی (الحوسێنیة):-
ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٠) لە كەركوك دامەزراوە.
٣٨- تیپی (ئەحمەد ئاغا):-
ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٠) دامەزراوە، یاریزانەكانی بریتی بووە لە:- غازی غەریب، تاریق رەدام، سەلاح حەسەن(حیلە)، سەلاح بەهادین، تەحسین تەبرە، بەهجەت، حەجی عابدین.
٣٩- تیپی (فلسطین):-
ئەم تیپە بەسەرپەرشتی (كەماڵ عەبدولقادر) دامەزراوە یاریزانەكانی بریتبوو لە:- حەقی وێردی مستەفا، قاسم دێو، نورەدین دیوانی، عەدنان شوكر، قەرە عەلی ئەسود، نەجات شێخۆ، عەبدولغەفوور مستەفا.
ئەم تیپە ناوی لە شەستەكاندا تیپی (بشیكتاش)بووە.
٤٠- تیپی (الزمالك):-
ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٣) دامەزراوە بە سەرپەرشتی (محەمەد حەقی).
٤١- تیپی (النور):-
ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٣) دامەزراوە.
٤٢- تیپی (نادي الاخاء التركماني):-
ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٧) لە كەركوك لە بنكەی یانەی (الثورة) دامەزراوە بەسەرپەرشتی یاریزان ئەحمەد جەلال بە یارمەتی عەبدوڵڵا چەنەباز، قاسم سلێمان دێو، ئەندامانی تیپەكە بریتییە لە:- كازم یاسین، غازی محەمەد، عادل عەبدوڵڵا، فازڵ مەجید، محەمەد مەجید، قاسم سلێمان، بەهجەت عەبدولرەزاق، عەدنان عەبدولقادر، ئەنوەر عارف، سەلیم محەمەد، سوبحی مەحموود، جەودەت شەوكەت،


تیپی وەرزشی ناوەندی غەربییە ١٩٥٦


تیپی قوتابخانەی ئیمام قاسم

محەمەد حیکمەت، جەلال عوسمان، عادل عەلی، سەعید یونس، عادل شوکور، نیهاد عیزەت.

٤٣- تیپی (الجزائر):-

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٧) دامەزراوە.

٤٤- تیپی (صونای):-

دووبارە دروست بوونی لە ساڵی (١٩٦٨) لە گەڕەکی (بولاق).

٤٥- تیپی (رەعد):-

بنکەکەی لە نزیك قەڵا بوو، لە دوایدا ناوەکەی گۆڕا بۆ تیپی وەرزشی (یلدرم).

٤٦- تیپی وەرزشی (یوزلر):-

بنکەی سەرەکی ئەم تیپە لە گازینۆ ئاڵتون کۆپری بوو لە شەقامی ئەتڵەس، لە ساڵی (١٩٦٨) پێك هاتبوو لە یاریزان:- محەمەد عەبدوڵڵا، سەلاح عەزە، سینان ئەحمەد، عەبدولرەحمان مەجید، محەمەد، حەمید، ئەکرەم، موفەق.

٤٧- تیپی وەرزشی (قزیل ئیرمق):-

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٦) دامەزراوە لە ناوچەی تسعین بە سەرپەرشتی (محەمەد نەقیب دەمیرچی)، ئەنوەر عومەریش، یاریزانەکانی ڕاهێناوە.

ئەنوەرو گەلێکی تر.

٤٩- تیپی وەرزشی (مصلحة نقل الرکاب):-

٥٠- تیپی وەرزشی (أنصار قارداشلق):-

٥١- تیپی وەرزشی (ئای یلدز):-

٥٢- تیپی وەرزشی (نجوم الشرق)

٥٣- تیپی وەرزشی (غلطة سراي)

٥٤- تیپی وەرزشی (النهرین - أیرمق سبور طاقیمي):-

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٨) لە گەڕەکی شوان دامەزراوە یاریزانەکانی بریتی بووە لە:-

عەدنان عەبدولقادر، تارق، ئەنوەر عارف، شکور ئەحمەد، عادل شکور، محەمەد حەکی، فەیزوڵڵا سەلمان، کەریم عەباس، تاریق عەبدولقادر، عەدنان عەبدولقادر، کەمال تۆفیق، جەمال تۆفیق، وەهاب شەفیق، سامی عارف، بەکر حاجی ئەحمەد، محەمەد حەکی، نەجات شێخۆ، مستەفا مەجید، بەکر شوکر، هەلال جەلال، شوکر مەحموود.

٥٥- تیپی وەرزشی (صقاریا)

٥٦- تیپی وەرزشی (جان)

٥٧- تیپی وەرزشی (مصلی یلدزلاری)



ئەحمەد ئاغا دیاری پێشکەش تیپی ئیمام قاسم دەکات لە ساڵی ١٩٦٨

یاریزانەکانی پێك هاتبوو لە:- عادل مەردان، ئیحسان قادر، حەسەن رەفعەت، عەبدولرەحمان محەمەد، عەدنان محەمەد شوکور، عەزیز مورشید، محەمەد حیسامەدین، عەباس کازم، یالچینی سامی، مەحموود ڕەزوان، نەوزاد.

لە ساڵی (١٩٧٤) ئەم یاریزانانە بەشداری ئەم تیپە وەرزشییان کردووە:- مەحموود ڕەزوان، غازی سابیر، تالیب عەسکەر، سەباح نوری (بەریەر)، فەخرەدین، نورەدین سەعید، فەلاح قەساب، عیسام سەعاتچی، سامی سەعاتچی، مونیب مەحموود، یوسف ئیسماعیل.

٤٨- تیپی وەرزشی (یلدرم قلعة):-

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٦٨) دامەزراوە لە نزیك گەرماوی کەرکوك لە تەنیشت گازینۆ نوری قاسم، یاریزانەکانی پێکهاتبوو لە:- ئەحمەد قاسم، ئومێد، کەنعان، عەدنان، مقداد، ئیسماعیل خالد، زوهێر، سەباح، حوسێنی، هاشم،

٥٨- تیپی وەرزشی (فنر بقچە)

٥٩- تیپی وەرزشی (ئەرەنلر)

٦٠- تیپی وەرزشی (ئاڵتون داش)

٦١- تیپی وەرزشی (قاعدة الجویة الریاضي)

٦٢- تیپی وەرزشی (شرطة نفط کرکوك الریاضي)

٦٣- تیپی وەرزشی (الانتصار)

٦٤- تیپی وەرزشی (عرفة)

٦٥- تیپی وەرزشی (باباگورگور)

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٧١) لە قەڵا دروستکراوە.

٦٦- تیپی وەرزشی (صواش)

ئەم تیپە لە قەڵا لە ساڵی (١٩٧١) دامەزراوە

٦٧- تیپی وەرزشی (قەرە ئاڵتون)

ئەم تیپە لە موسەڵڵا لە ساڵی (١٩٧١) دامەزراوە

٦٨- تیپی وەرزشی (تورکیش)

ئەم تیپە لە (ساری کەهبیە) لە ساڵی (١٩٧١) دامەزراوە

٦٩ تیپی وەرزشی ( أصلان یوردی )

ئەم تیپە لە ساڵی (١٩٧١) لە تسعین دامەزراوە

٧٠- تیپی وەرزشی ( مصلی گنچلری )

٧١- تیپی وەرزشی ( العمال )

٧٢- تیپی وەرزشی ( بوزقورت )

٧٣- تیپی وەرزشی ( العروبة )

٧٤- تیپی وەرزشی ( مرکز شباب کرکوك - پیریادی )

٧٥- تیپی وەرزشی ( العاصفة )

٧٦- تیپی وەرزشی ( گوك بلوط )

٧٧- تیپی وەرزشی ( باسل مەهدی )

٧٨- تیپی وەرزشی ( سبارتك المحطة )

٧٩- تیپی وەرزشی ( ئازادی )

٨٠- تیپی وەرزشی ( ییلدزلر )

٨١- تیپی وەرزشی ( نجوم قلعة )

٨٢- تیپی وەرزشی ( امام قاسم )

٨٣- تیپی وەرزشی ( خلود )

٨٤- تیپی وەرزشی ( أنتصار )

٨٥- تیپی وەرزشی ( یشل أیرمق )

٨٦- تیپی وەرزشی ( الحکمة )

٨٧- تیپی وەرزشی ( الاغوز )

٨٨- تیپی وەرزشی ( الیات الشرطة )

٩٠- تیپی وەرزشی ( نسور بشیکتاش )

٩١- تیپی وەرزشی ( النسور الترکمان )

٩٢- تیپی وەرزشی ( نقابة المعلمین في کرکوك )

٩٣- تیپی وەرزشی ( صقر امام قاسم )

٩٤- تیپی وەرزشی ( المنصور )

٩٥- تیپی وەرزشی ( أغالق )

٩٦- تیپی وەرزشی ( یلدرم القوریة )

٩٧- تیپی وەرزشی ( تسعین )

٩٨- تیپی وەرزشی ( قره بلوط )

٩٩- تیپی وەرزشی ( الزهور )

١٠٠- تیپی وەرزشی ( النمر )

١٠١- تیپی وەرزشی ( نجوم أسکان )

١٠٢- تیپی وەرزشی ( قزل ئای )

١٠٣- تیپی وەرزشی ( شعلة کرکوك )

١٠٤- تیپی وەرزشی ( الشورجة الاهلي )

١٠٥- تیپی وەرزشی ( البریدو البرق )

١٠٦- تیپی وەرزشی ( زمالك الشورجة )

١٠٧- تیپی وەرزشی ( الملا قاوون )

١٠٨- تیپی وەرزشی ( الوفاء )

١٠٩- تیپی وەرزشی ( دمیر باش )

١١٠- تیپی وەرزشی ( أسکي شهر )

١١١- تیپی وەرزشی ( طوق جان )

١١٢- تیپی وەرزشی ( کوکبة الزرقاء )

١١٣- تیپی وەرزشی ( ناشئة الاخاء )

١١٤- تیپی وەرزشی ( ناشئة قلعة )

١١٥- تیپی وەرزشی ( ناشئة النهرین )

١١٦- تیپی وەرزشی ( ناشئة تسعین )

١١٧- تیپی وەرزشی ( ناشئة الترکمان )

١١٨- تیپی وەرزشی ( ناشئة کرکوك )

١١٩- تیپی وەرزشی ( ناشئة العاصمة )

١٢٠- تیپی وەرزشی ( ناشئة نادي الثورة الریاضي )

١٢١- تیپی وەرزشی ( ناشئة نادي سولاف الریاضي )

١٢٢- تیپی وەرزشی ( ناشئة ألماس )

١٢٣- تیپی وەرزشی ( اتحاد أحمد عبدالله )

١٢٤- تیپی وەرزشی ( أتحاد عادل عبد الله )

١٢٥- تیپی وەرزشی ( اتحاد أدیب اوچی )

١٢٦- تیپی وەرزشی ( اتحاد عز الدین عبد الله )

١٢٧- تیپی وەرزشی ( اتحاد الملا قاوون )

١٢٨- تیپی وەرزشی ( اتحاد مجید کریم )

١٢٩- تیپی وەرزشی ( اتحاد خلیل کرکوك )

١٣٠- تیپی وەرزشی ( اتحاد أخوان )

١٣١- تیپی وەرزشی ( اتحاد فاضل )

١٣٢- تیپی وەرزشی ( اتحاد قاسم زوینة )

١٣٣- تیپی وەرزشی ( اتحاد قلعة )

١٣٤- تیپی وەرزشی ( اتحاد قمر )

١٣٥- تیپی وەرزشی ( اتحاد الماس )

١٣٦- تیپی وەرزشی ( اتحاد رعد )

١٣٧- تیپی وەرزشی ( اتحاد ایدن )

١٣٨- تیپی وەرزشی ( شباب الترکمان )

١٣٩- تیپی وەرزشی ( شباب القلعة )

١٤٠- تیپی وەرزشی ( شباب الچای )

١٤١- تیپی وەرزشی ( شباب امام قاسم )

١٤٢- تیپی وەرزشی ( شباب الاسکان )

١٤٣- تیپی وەرزشی ( شباب الحوسێنیة )

١٤٤- تیپی وەرزشی ( شباب عرفة )

١٤٥- تیپی وەرزشی ( شباب کرکوك )

١٤٦- تیپی وەرزشی ( شباب المجزرة )

١٤٧- تیپی وەرزشی ( شباب پیریادی )( ٤٧ )

١٤٨- تیپی شێروانە

یەکێك لە جوانکاریەکانی خەڵکی ئەم شارە کە هێشتا تەنها گوندێك بووە، ساڵی (١٩٥٦) تیپێکی تۆپێی وەرزشی جوانی لەو سەردەمەدا رۆڵی یاریکردنی باشی نواندووە لە سنووری گەرمیاندا، وەکو وتمان پاییزی ساڵی (١٩٥٦) ئەم تیپە دروستکراوە بە ناوی تیپی (تۆپی پێی شێروانە) بەسەرپەرشتی (حەسەن کەریم بەگی جاف) دروستکراوە

لەو سەرو بەندەدا ئەم تیپە یەکەم یاری خۆی لەگەڵ تیپی تۆپی پێی (ئاقسوی شاری کفری) کە پاشتر ناوە کەی گۆراوە بە تیپی تۆپی پێی (یولدرم) لە کەلار یارییەکی دۆستانەیاندا لە گوندی کەلاری ئەو سەردەمە ئەنجامدا و جەماوەری گوندی کەلار هەموو هاتبوون بۆ تەماشاکردنی یارییەکەو ئەنجامی یارییەکەیش بە دوو گۆڵ بۆ تیپی (ئاقسو کفری) یەك گوڵ بۆ تیپی شێروانە کۆتای پێ هات.

پاش شەش رۆژ دیسان لەنێوان هەردوو تیپەکە لە شاری کفری یارییەکی تریش ئەنجامدرا، تیپی شێروانە چەند

یاریزانێکی باشی شاری خانەقی بانگهێشتی تیپەکەی خۆیانکردوە، کە بریتی بوون لەم بەڕێزانە.
کەمال شاکر (ئێستا سکرتێری حیزبی شیوعی کوردستانە)، عەلی حەربی، نەجمەدین فەقێ، عەباس ڕەوف.
ئەنجامی یارییەکە بە شەش گوڵ بە قازانجی تیپی شێروانە، بەرانبەر بە هیچ بۆ تیپی (ئاقسو کفری) کۆتایی هات، ئەم یارییە بووە هۆی خۆشحاڵی لایەنگرانی تیپی شێروانەو شێوە خۆپیشاندانێکی کوردانەی خەڵکی شاری کفری لێکەوتەوە.
هەڵبەتە دوای (٣٦) ساڵ، ساڵی (١٩٩٢) لە شاری کەلار یانەیەك بە ناوی (یانەی وەرزشی شێروانە) دروستکراو ئەو یانە تیپێکی تۆپی پێی نایابی لە سەر ئاستی پلە یەکەکانی کوردستانی هەیە کە جێی خۆشحاڵی جەماوەری وەرزش دۆستی گەرمیانییەکانە.[٤٨]
١٤٩- تیپی وەرزشی سۆران.
١٥٠- تیپی وەرزشی دەرسیم.
١٥١- تیپی وەرزشی نەورۆز.
١٥٢- تیپی وەرزشی عواگف.
١٥٣- تیپی وەرزشی صمود.
١٥٤- تیپی وەرزشی مەولەوی.
١٥٥- تیپی وەرزشی ئاگرین.
١٥٦- تیپی وەرزشی چوارباخ.
١٥٧- تیپی وەرزشی هەندرێن.
١٥٨- تیپی وەرزشی لاوانی ئاسۆ.



ڕاوەستاوەکان لە چەپەوە بۆ ڕاست:- خەسرەو جاف، حەمەی حەمە موراد، عومەر ئەحمەد، ئەکرەم عەلی بەکر، مەحموود قادر ناسراو بە خولە شووتە، عەلی کەریم بەگی جاف، جەمیل ئەحمەد بەگی جاف.
دانیشتووانەکان لە ڕاستەوە:- سەلاح عەبدولڕحمان بەگی جاف، حەسەن کەریم بەگی جاف، ئەحمەد مەحموود عەتار، فەقێ عەلی ڕەشید.



پێشبرکێیەکی پاسکیل سواری لە کەرکوك



تیپی وەرزشی قوتابخانەی پیرەمێرد



یارییەکی تینس لەنێوان شامیل عەزیز و فیلیب یۆنان لە کۆمپانیای نەوت کەرکوك



یانەی وەرزشی گۆلف لە کەرکوک



تیپی کۆماری ١٩٧٥

*** عەدنان قەیسی و دەوری بەعس لە جێبەجێکردنی مەرامە سیاسییەکانی:-**

هاتنی بەعس، هاتنە سەر حوکمی، ڕێککەوت نەبووە، بەڵکو دەرهاوشیتەی ئەو گۆڕانکارییانە بوو کە لە ناوچەکە ڕوویداوەو دەوری دەوڵەتە زلهێزەکان لە هاتنە سەر حوکمی بۆ عێراق لەگەڵ خواستو مەرامی ئەواندا بووە.
لە ماوەی حوکمڕانی بەعس لە عێراق، بەهەموو شێوەیەك هەوڵی داوە بە هەموو هێزیەوە سیاسەتی خۆی بسەپێنێت بە شێوازێکی ئەوتۆ کە ببێتە جێ بەجێ کردنی مەرامە



سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیریەکانی خۆی.
وەرزشیش یەکێکە لەو بوارە کۆمەڵایەتیانەی کە بەعس زۆر بە ژیرانە کاری لەسەر کردووەو توانیوویەتی کار بکات کە چۆن خەڵك و کۆمەڵگەی پێوە سەرقاڵ بکات، تا بۆ ئەوەی بیر لە سیاسەتو مەرامەکانی نەکەنەوە.
ماوەیەکی دوورودرێژ خەڵکی عێراقی سەرقاڵکرد بە دیاردەی عەدنان قەیسی و پاڵەوانێتییەکانی بەسەر پاڵەوانەکانی تر لە زۆرانبازیدا بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە هەستو نەستی خەڵکی بەلای بەعس و ئیسلامو عەرەب ڕابکێشێت کە لەو چوار چێوەوە بیر لە سیاسەت بکەنەوە.
عەدنان قەیسی ماوەیەکی چاك خەڵکی سەرقاڵ کردوو بەشێکی گەورەی خەڵکی لە خەیاڵی ئاواتەکانی ژیان کە لە دوایدا بزر بوو بێ ئەوەی کەس شتێك لە مێژووی هاتو بزربوونی بزانێت. کەرکوکیش وەکو بەشێك لە شارەکانی عێراق زیاتر چاوی چووە سەر وبەحوکمی بارە سیاسیەکەی بەرچاوتر عەدنان قەیسی لە شارەکە زەق کرایەوە.
عەدنان قەیسی لە گەڕەکی (المهدیە) لە (فەزل) لە بەغدا لەدایکبووە، هەر لە ساڵی (١٩٥٥)ەوە لە بواری زۆرانبازیدا لە عێراق سەرکەوتنی گەورەی بەدەستهێناوە.
لەدوایدا چووەتە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ تەواوکردنی خوێندنی و لەو ماوەیەی لەوێدا بووە ئاشنایەتی لەگەڵ گەلێك پاڵەوانەوانی جیهاندا کردووە کە لە ڕابردوودا پاڵەوانی زۆرانبازی بوونە بۆ نموونە وەکو (جاك دەمبس)، هەر لە هەمان کاتدا داوای یارمەتی لێکردووە بۆ بەدەستبوونی کار تا بۆ ئەوەی یارمەتی زۆرانبازییەکەی بدات ولە هەمان کاتدا خوێندنەکەی تەواو بکات، ئەوەی جێگای سەرنجە کە (دەمبسی) زۆر پشتگیری کردووە بۆ یاری زۆرانبازی، لە زانکۆی (هیوستن) لە ولایەتی (تکساس) وەرگیراو لەو زانکۆیە ئاشنایەتی لەگەڵ گەلێك یاریزاندا



تیپی تازە پێگەیشتووانی ئیمام قاسم لە ساڵی ١٩٦٨



تیپی وەرزشی کۆنی کەرکوك



كردووە. لە دوایدا گواستراوەتەوە بۆ زانكۆی (ئوكلاهۆما) وپەیوەندی كردووە بە تێپكی زۆرانبازی كە لەوێدا ئەستێرەی بەختی بەدەركەوتووەو بەدەیان سەركەوتنی بە دەست هێناوە.

عەدنان قەیسی وەكو ئەوەی لە شارەكانی عێراقدا یاری كردووە، هەوڵی داوە، كە هەستی عێراقییەكان بەلای خۆیدا رابكێشێت، هەر لەبەر ئەوە سەردانی گەلێك شاری كردووە لەنێوان كوردو بەعس هەر لە هەمان كات هەوڵی عەدنان قەیسی بۆ سەردانی كوردستان یەكێك بووە لەو هەنگاوانەی كە بەعس بەرنامەی بۆ دانابوو تا بۆ ئەوەی بتوانێت كورد بخاتە سەر گەلێك باری نا سیاسی نەگونجاو.

ئەوەی جێگەی سەرنجە دوای ماوەیەكی كەم عەدنان قەیسیو پاڵەوانێتییەكانی بووە بڵقی سەر ئاوو هیچ ناو و ناوبانگێكی نەماو، وەكو ئەوەی كە زەوی قووتی دابێت[٤٩]



تا بۆ ئەوەی جەماوەر پشتیگری بكات، بۆ یەكەم جار لە گۆڕەپانی (الشعب) بە ئامادە بوونی هەشت هەزار كەس، زۆرانبازی لە گەڵ (جۆرج كۆریانكۆ) كردووە، هەر لەو ماوەیەدا گەلێك سەركەوتنی بەدەستهێناوە.

پێش یاریكردنی لەگەڵ پاڵەوانی زۆرانبازی (جۆن) سەردانی شاری كەركوكی كردووەو چووەتە یانەی (سۆلاف) لە گەڕەكی ئیمام قاسم، هەر لەوێدا ئەوەی ووتوە كە ڕەچەڵەكی لە نەتەوەی كوردە، نەزانراوە كە تا چەندێك ئەمە راست بووە، كە گوایە نازناوی (القیسی) لە ناوی عەشیرەتی كورد (قەرەلوسی)یەوە هاتووە لە ناوچەی (جەلەولا- گولاڵە).

هەر لەوماوەیەدا ڕێكەوتنی لەگەڵ كۆمەڵێك وەرزشواندا كردووە لە گەڕەكی ئیمام قاسم بۆ سەفەركردنی بۆ كوردستان بۆ چاوپێكەوتنی سەركرایەتی ئەو كاتەی شۆڕشی كورد، بەڵام ئەو سەركردەیە ڕازی نەبوو كە پشتگیریو چاوپێكەوتنی لەگەڵدا بكات.

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوە بە كە زۆرانبازییەكانی عەدنان قەیسی لە عێراقدا، تەنها بۆ كات بردنە سەرو خافڵاندنی كۆمەڵگای عێراق بووتا بۆ ئەوەی ڕژێمی بەعس مەرامەكانی جێ بەجێ بكاتو خەڵكی لێر بێ ئاگابێت بەتایبەتی لەو شوێنانەی كە كێشەكانی قووڵ بووە یان تا ئەو ماوەیە چارەسەر نەكراوە وەكو ئەوەی كەركوك لە ڕێككەوتندا بوو

*** گەشەكردنی تیپە وەرزشییەكانی كەركوك لە حەفتاكانی سەدەی ڕابردوودا :-**

بەهۆی گەشەكردنی ئەو بارە سیاسییەی كوردستان، كە كەركوكیشی گرتەوە، هەنگاوێكی بەرچاو بوو لە پێكەیاندنی كەشێكی لەبار بۆ گەشەكردنی هەموو بوارەكانی ژیانو لایەنە كۆمەڵایەتیو ئابوورییەكانی ئەو ماوەیە.

یەكێك لەو بوارە كۆمەڵایەتییانەی كەركوك، چالاكییە وەرزشیو یانە وەرزشییەكان بوو كە بە شێوەیەكی بەرچاو بوو ژاندنەوەی بە خۆیەوە بینی.

" جموجوڵێكی وەرزشی لە شاری كەركوك پەرەی سەندبوو بە تایبەتی لە تۆپی پێداو لە گەڕەكەكانی ئیمام قاسمو ئازادیو شۆڕیجەو تەپەی مەلا عەبدوڵڵاو موسەڵڵاو شاترلوو"[٥٠].

ئەم جموجوڵە هەموو تیپە وەرزشییەكانی كوردو توركمانو ئاسووری بەشێوەیەكی بەرچاو دەگرتەوە كە لە ئاستێكی بەرچاو بزاڤو چالاكییەكان هەنگاویان دەنا.

هەر ئەمە وای كرد كە تیپە میللییەكانو تیپی قوتابخانەكان دەوری بینی لە جووڵانەوەی لە هەموو كووچەو گەڕەكو شوێنە بەرچاوەكان.

" هەر لەو ماوەیەدا تۆپی پێ پێشكەوتنی گەورەی بەخۆوە بینی كە بوو بە سەرهەڵدانی یاریزانی بەر چاوو بەهێز لە بواری وەرزشدا كە بەشێكیان جێگای ڕێزە هەڵبژاردەی تۆپی



ڕوویەکی یاری وەرزش لە گۆڕەپانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوک




تیپی وەرزشی تەرکیز لە گۆڕەپانی نەوتی کەرکوک

پیێ عێراقی بوونە وەکو:-
عادل عەبدوڵلا، ئارام کەرەم، کەریم ئەفەندی، کازم یاسین، عەدنان عەبدولقادر، فازل عەبدولمەجید، ستار کوردی، سوداد، ویداد، عەبدوڵلا چەنەباز، ئەحمەد جەلال.
هەروەها گەلێك یاریزان لە بوارەکانی باسکەو بالەو، زۆرانبازیو مەلەوانیو گۆڕەپانو مەیدان ناوبانگیان دەرکرد"[٥١].

* نسکۆکانی وەرزش لە پارێزگاکە:-

ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لە ناوەڕاستی هەشتاکانو حەفتاکانی سەدەی رابردوودا، وەرزش بەرەو دوادا گەڕایەوەو بەعس بە هەموو جۆرێك کەوتە چوارچێوەی سیاسەکانی بۆ خستنە باری وەرزش لە ڕاستە ڕێی بیروباوەڕە شۆڤێنەکانی بەعسدا ئەویش بەجێ بەجێ کردنی.
یاساو ڕێساکانی کە بەسەر وەرزشدا سەپاندی کە توانی یاریزانو وەرزش لەو خزمەتەدا چڕ بکاتەوە بوونی دوو شەڕی عێراق - ئێرانو عێراق - کوەیت بوو بە بارگرانیەکی گەورە بەسەر کۆمەڵگەی عێراقو لە هەموو بوارەکاندا سیاسەتی بەعسو داڕوخانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی عێراق کە ئەمیش کاریگەری بەسەر وەرزشدا بەشێوەیەکی بەرچاو ڕەنگی دایەو گەلێك وەرزشوان لە دەستی ڕژێمی بەعس هەڵهاتن یان چوونە دەرەوەی وڵات.
ڕژێمی بەعس لە شارێکی وەکو کەرکوك گەلێك تیپو یانەی وەرزشی داخست یان هەستا بە گۆڕینی یانەو تیپەکان بۆ ناوی عەرەبی وەکو ئەوەی یانەی سوڵاڤیان گۆڕی بۆ (الكرامة). یان بڕینی باربووی دارایی یانەکان خۆی لە خۆیدا بووە پووکانەوەی هەموو تواناکانی یاریزان بۆ ئاستی پێویست.
لەو ماوەیەدا زۆربەی تیپو یانە وەرزشییە کوردیو تورکمانو ئاسوورییەکان پووکانەوەو وەستانو هیچ چالاکییەکی بەرچاویان نەما وەکو ئاستی پێویست.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:-
١- التأريخ المصور لكرة القدم العراقية (١٩١٤ - ١٩٤٥) ئیسماعیل محەمەد، سەمیر ئەلشەکرچی، بەرگی یەکەم، بەغدا، لاپەرە (١١)
٢- فۆلکلۆری یارییەکانی کوردەواری، محەمەد کەریم شەریف، ١٩٧١ چاپخانەی (شیمال)، لاپەرە (٥)
٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١١)
(٤) گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٢ لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی( وەرزش لە شاری کەرکوك) نووسینی ستار عەبدوڵڵا بەرزنجی، لاپەرە (٥٦).
٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە جۆربەجۆرەکان.
٦- التأريخ المصور لكرة القدم العراقية، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥).
٧- موسوعة كرة القدم العراقية المصورة، (١٩١٨- ١٩٨٦)، علي فاضل البدراوي، هيثم فتح الله عزيزة، بەرگی یەکەم، منشورات الاديب، ٢٠١١ لاپەرە (١٠).
٨- التأريخ المصور لكرة العراقية، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٧)
٩- یاداشتی (شێخ ستار) لەبەرنامەی (گەشتی ژیانم)ی کەناڵی ئاسمانی کەرکوك.
١٠- موسوعة كرة القدم المصورة، بەرگی یەکەم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١١).
١١- اضواء كرة القدم في مدينة الذهب الاسود، رامز سديق، ساڵی (١٩٧١)، لاپەرە (١١).
١٢- موسوعة كرة القدم العراقية المصورة، بەرگی یەکەم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٨٥).
١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٩٦).
١٤- اضواء كرة القدم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦ -٧)
١٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٧)
١٦- موسوعة كرة القدم العراقية المصورة، بەرگی یەکەم لاپەرە (١١٤- ١١٦)
١٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٣٤)
١٨ گۆڤاری (اهل النفط)، لاپەرە (٥٦)
١٩ گۆڤاری (اهل النفط)، لاپەرە (٥٦)
٢٠- گۆڤاری (اهل النفط)، ژمارە (٣٣)، ساڵی (١٩٥٤)، لاپەرە (٧٢)
٢١- گۆڤاری (اهل النفط)، ژمارە (٣٦)، تەموزی ساڵی (١٩٥٤) لاپەرە (٤٨- ٤٩).
٢٢- گۆڤاری (اهل النفط)، ژمارە (٣٦)، تەموزی ساڵی (١٩٥٤) لاپەرە (٦٣).
٢٣- گۆڤاری (اهل النفط)، ژمارە (٤٦)، ساڵی (١٩٥٥)، لاپەرە (٦٣)
٢٤- گۆڤاری (اهل النفط) ژمارە (٤٦)، ساڵی (١٩٥٥)، لاپەرە (٦٩)
٢٥- کۆڤاری (اهل النفط) ژمارە (٤٧)، ساڵی (١٩٥٥)، لاپەرە (٦٣)
٢٦- گۆڤاری (اهل النفط) ژمارە (٥١)، ساڵی (١٩٥٥)، لاپەرە (٦٣)
٢٧- گۆڤاری (اهل النفط)، ژمارە (٥٢)، ساڵی (١٩٥٥)
٢٨ - گۆڤاری (اهل النفط)، ژمارە (٥٦)، ساڵی (١٩٥٦)، لاپەرە (٦٩)
٢٩- گۆڤاری (اهل النفط)، ژمارە، ژمارە (٥٦)، ساڵی (١٩٥٦)، لاپەرە (٦٨)
٣٠- صدى كركوك الرياضي، بەشی سێ یەم، لاپەرە (٢٦ - ٢٧)
٣١- كركوك بانوراما التأريخ والإنسان، د. ابراهيم خليل سعيد، لاپەرە (٤٧٧- ٤٧٨)
٣٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٧٧)
٣٣- صدى كركوك الرياضي، بەشی یەکەم، لاپەرەی جۆراوجۆر
٣٤- صدى كركوك الرياضي، بەشی سێ یەم، لاپەرەی جۆراوجۆر
٣٥- كركوك بانوراما، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
هەروەها بڕوانە:-
- صدى كركوك الرياضي، هەرسێ بەرگەکەی.
٣٦- بڕوانە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٦٣، لاپەرە ٣٨-٣٩.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٧١، لاپەرە ٤٨.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٦٢، لاپەرە ٥٠-٥١.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٧٦، لاپەرە ٣٥-٣٦.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٦٩، لاپەرە ٤٧.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٦٧، لاپەرە ٤٣-٤٤.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٦٦، لاپەرە ٣٩-٤٠.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٧٥، لاپەرە ٤٠.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٧٣، لاپەرە ٥٦.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٧١، لاپەرە ٤٨.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٧٤، لاپەرە ٤٠.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٦٤، لاپەرە ٣٤-٣٦.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٦٨، لاپەرە ٥١-٥٣.
- گۆڤاری بانەڕۆژ، ژمارە ٦٥، لاپەرە ٣٤.
٣٧- صدى كركوك الرياضي، بەرگی یەکەم، لاپەرە (١٠)
٣٨- اضواء كرة القدم في مدينة الذهب الاسود، رامز سديق، ساڵی (١٩٧١)، لاپەرە (٣٧)
٣٩- هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٣٩)
٤٠- هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٤١)
٤١- هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٤٣)
٤٢- هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٤٥)
٤٣- هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٤٧)
٤٤- هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٤٨)
٤٥- هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٤٩)
٤٦- صدى كركوك الرياضي، ئیسماعیل سرت تورکمان، محەمەد حوسێنی داغستانی، بەشی سێ یەم، ١٩٦٧، لاپەرە (٨٣)
٤٧- گۆڤاری (اهل النفط)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:-

" صور من الحركة الرياضية في كركوك" لاپەرە (٤٢- ٤٣)
٤٨- گۆڤاری بانەرۆژ، ژمارە ٦٤، لاپەرە ٣٧-٣٨.
٤٩- بين التراث والمعاصرة، موعتەسەم ساڵەیی، ساڵی ٢٠١٣ لاپەرە ٣٩-٤٦.
٥٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ (شێخ ستار)
٥١- چاوپێکەوتن لەگەڵ (شێخ ستار)

*** یانە وەرزشییەکانی کەرکوك:-**

**١- یانەی وەرزشی ئاشووری:**

**زاهیر شکور**

کەرکوك یەکێك بوو لەو شارانەی گرنگیی زۆر بەوەرزش دەدا، لەوانەیە یەکێك لەهۆکارەکانی گرنگیدانی کەرکوك بەوەرزش، بوونی ئینگلیز بوو بێت لەشارەکە، چوونکە وەرزش لەکەرکوکدا لەسەر دەستی ئەوان سەریهەڵدا، تەنانەت یەکەم تیپی تۆپی پێ لە ساڵی (١٩٢٥) ئینگلیزەکان دایانمەزراند، جگە لەوەش گۆرەپانی یاریی گۆڵفو مەلەوانگەو دامەزراندنی تیپە وەرزشییەکانی سەر بەکۆمپانیای نەوت، ئینگلیز لەپشتییەوە بوو.

رۆڵی ئینگلیزو گەشەکردنی بواری وەرزش لە کەرکوك، بووە هۆکاری درووستبوونی دەیان تیپی جۆراوجۆرو یانەی جۆراوجۆرو گەشەکردنی وەرزش بووە مایەی سەرکەوتنی چەندین یاریزانی گەورە بۆ تیپی هەڵبژاردەی عێراق.

لەپاڵ یانەو تیپە وەرزشییەکان، یانەو تیپی تایبەت بە نەتەوەکانیش دروست بوو، (چەندین تیپو یانەی تورکمانی و ئاشووریو ئەرمەنی)، یەکێك لەیانە بەناوبانگەکانی کەرکوك یانەی وەرزشیی ئاشووری بوو.

یانەی ئاشووری یەکێك بوو لەو یانە وەرزشییە چالاكو دیارەکانی کەرکوكو عێراق، ساڵی (١٩٦٤) ئەم یانەیە لە سەرەتاوە وەك لقێکی یانەی ئاشووریی شاری بەغدا دامەزراو لە ساڵی (١٩٧٢) لەیانەی ئاشووریی شاری بەغدا جیابووەوەو بووە یانەیەکی سەربەخۆ.

دواتر رژێمی بەعس ناوی یانەکەی گۆری بۆ (یانەی وەرزشیی تەئمیم)، دوای پرۆسەی ئازادیی عێراق لە ساڵی (٢٠٠٣)، جارێکیتر ناوە کۆنەکەی بۆ گێردرایەوە.

یەکێك لەسیما دیارو شارستانییەکەی کەرکوك بوونی مەسیحییە لە شارەکە، مەسیحییەکان لایەنە جوانو پێشکەوتوو شارستانییەکەی کەرکوك بوون، لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتییان، لەمامەڵەی بازارو بازرگانی، لە پەیوەندییان بەپێکهاتەکانی ترەوە، لەخوێندن، لەپێشکەوتن، لەوەرزش، مەسیحییەکان نموونەی جوانو شارستانییەت بوون.

ناوی ئاشووریش یەکێك بوو لەو وێستگە گرنگانەی کەرکوك کەبەشداریی گرنگو بەرچاوی هەبوو لە پێشخستنی شاری کەرکوك لەهەموو بوارەکان بەوەرزشیشەوە.

یانەی وەرزشی ئاشووری لە سەرەتای دامەزراندنییەوە زۆربەی یارییەکانی تێدا دەکرا، لەوانە (تۆپی پێ، باسکە، باڵە، گۆرەپانو مەیدان، تێنس، پاسکیل سواری، کیکۆشینگای، جومناستیك، شەترەنج)و چەندین یاری تر.

رۆژگارێك تیپەکانی تۆپی پێو باسکەو جومناستیکی یانەی وەرزشی ئاشووری تیپی بەهێزبوونو لەکاتی خۆیدا بەبەراوورد بەیانە وەرزشییەکانی کەرکوكو شارەکانی عێراق لە تیپە پێشکەوتووەکان بوو.

لە یاریی پاسکیل سواریدا ناوی (تاوەر، یۆلیۆس، خنۆ، دانیال نوونوو) لەو ناوانەبوون کە لەکەرکوكو کوردستانیش ناسراوبوون، ئەم یاریزانانە چەندین سەرکەوتنیان بۆ یانەی ئاشووری تۆمارکردبوو، چەندین میدالیاشیان بۆ یانەکەیان بەدەسهێنابوو، ئێستاش تیپەکانی جومناستیكو لەشجوانی و کیکۆشینگای پلەی ئایابیان هەیە لەسەر ئاستی پارێزگای کەرکوكو عێراق.

یانەی وەرزشیی ئاشووری تا ئێستاش بەردەوامی هەیەو دەرگای کراوەیە بۆ وەرزشکارانو ئەوانەی باوەریان بەوەرزش هەیەو هەوڵی پێشکەوتنی وەرزش دەدەن، بارەگای سەرەکیی یانەکە لە ساڵی (١٩٦٤)ەوە لەگەرەکی ئەڵماس بوو لەتەنیشت یانەی (زەهەب ئەسوەد) کە پێشتر لەسەردەمی پاشایەتیدا کونسوڵگەریی بەریتانیا بوو، ئەو رۆژگارەی ئینگلیزەکان لەم وڵاتەدا فەرمانرەوا بوون.

دوای فراوانبوونی بووارەکانی وەرزشو زیادبوونی تیپی جۆراوجۆر لەیانەکە، بارەگای یانەکە رووخێندراو ئێستا بەپشتیوانیی بەرپرسانی پەیوەنداری شاری کەرکوك، یانەکە بەشێوازێکی تازە درووستدەکرێتەوە، بە جۆرێك لەتوانایدابێت بەباشی یارییە وەرزشییەکانو پەیامە وەرزشییەکەی بەجێبگەیەنێت.

تا ساڵی (٢٠١٠) (کۆریاڵ خۆشابا) سەرۆکی یانەکەبوو، بەڵام دوای کۆچکردنی لە (١٧)ی ئەیلولی ساڵی (٢٠١٠)ەوە (مازن پوترۆس) کراوەتە سەرۆکی یانەکە بەوەکالەتو دەستەیەکی لەگەڵدایە کەبریتین لە (ئاشوور سوولاقە هورمز، ریجینە میخائیل ئیلیا، گۆرگیس عەمانوئێل جۆرج).

وەزارەتــی وەرزشو لاوانــی عــێراق یـارمـەتـیـی مـاددیـی یانەکە دەکـاتو بوودجەشی بۆ نۆژەنکـردنـەوەی یانەکە تـەرخـانـکـردووە، چـاوەروان دەکـرێـت دوای تـەواوبـوونـی بارەگای یانەکە، سەرلەنوێ یانەی وەرزشیی ئاشووری بەگروتینێکی نوێوە بێتەوە گۆرەپانی وەرزشـەوەو ببێتە پێشەنگ لە پێشخستنی رەوتی وەرزش لەشاری کەرکوك.

یانەکانی وەرزشیی ئاشووریو ئەرمەنی، دوو ناوەندی گرنگی بوواری وەرزشن لەشاری کەرکوك، ئەم یانانەو یانەکانی دیکەی کەرکوك، رۆژگارێك کەرکوکیان کردبووە سەنتەرێکی گرنگی وەرزش لە کوردستانو عێراقیشدا.

کاتێك سەردانی دەستەی بەرێوەبردنی یانەکەمان کرد، پێیان راگەیاندین کەدوای تەواوبوونی بارەگای یانەکە، بەنیازن هەڵبژاردن بکەن بۆ دەستەیەکی نوێی بەرێوەبردنو بەتەوژمێکی نوێوە بێنەوە گۆرەپانی وەرزشەوەو داواکاری ئەوەبوون گرنگی زیاتربدرێت بەوەرزش، چوونکە وەرزش ئەو بووارەیە کەهەموو پێکهاتەکان کۆدەکاتەوە.

**٢- یانەی وەرزشی ئەرمەن:-**

ئەمە یەکێکە لە یانە کۆنەو بەناوبانگەکانی کەرکوك کە هەر لە ماوەیەکی دوورودرێژی خزمەتی وەرزشی شارەکەی کردووە. مێژووی دامەزراندنی بۆ ساڵی (١٩٦٠) دەگەرێتەوە.

ئەم یانەیە لە مێژوویدا بەشداری گەلێك یاری کردووە لە کەرکوكو دەرەوەی کەرکوك ولە گەلێك لەو چالاکییانە سەرکەوتنی وەرزشی بەدەستهێناوە.

ئەم یانەیە گەلێك تیپی وەرزشی جۆراو جۆری تێدایە لەسەر ئاستی یاریزانی پلە یەكو تازە پێگەیشتووان بۆ نموونە گەلێك یاریزانی بە توانای تێدایە لە بواری، یاری باڵەدا



وەکو:- تامارا وارسی، ئەڤین فەخیری، ڤالین شاهین، ویڤا موراد، ریتا ئاکۆب، مریەم میلکۆن، لوسین باغاسات، تمارا گرابیت، سارین راڤی، ئانی ئازاد.

هەروەها تیپی تایکواندیش گەلێك سەرکەوتنی لە کوردستان و ناوەراستی عێراق بەدەستهێناوە کە گەلێك یاریزانی وەکو:- محەمەد سوبحی، عومەر عەلی، محەمەد جەبار، محەمەد کەریم، حەسەن رەفیقە لە یاریزانە بە تواناکانێتی.

تیپی بالەی کچانی یانەی وەرزشی ئەرمەن، یەکەمی تیپەکانی بالەی کچان و ئاستێکی بەرچاوی هەیە لە دەرەوەی کەرکوکیش لە یاریزانە بەناوبانگەکانی بریتییە لە:-

مریەم گرابێت، ئایدا، زیبور، نایری، کە نزیکەی (٣٠) یاریزانی سەرەکی هەیە.

بەڵام ئەم یانەیە لە ئێستادا نەماوە لەبەر ئەوەی زۆری ئەندامەکانی چوونەتە دەرەوە.

**٣- یانەی وەرزشی یەکی حوزەیران**

ئەم یانەیە لە ئێستادا نەماوە و هەموویان چوونەتە نێو یانەی وەرزشی کەرکوکەوە.

**٤- یانەی وەرزشی (الثورة - الفیصل)**

**٥- یانەی وەرزشی کەرکوك:-**

ئەم یانەیە لە ساڵی (١٩٧٢) لە کەرکوك دامەزراوە. دوایی ماوەیەکی کورت توانی بوونی خۆی بسەلمێنێ لەناو یانە بەناوبانگەکانی عێراق و ببێتە سەنتەری وەرزشوانەکانی کەرکوك و چەندەها جۆر وەرزشی تێدا یاری بکرێت چالاکی و تیپەکانی یانەکە بریتییە لە:-

١- تیپی تۆپی پێ:-

لە پلەکانی عێراق یاری دەکات و تیپی دووەمیان لە خوولی کوردستان یاری دەکات.

٢- تیپی تۆپی سەرمێز:-

ئەم تیپە چوار ساڵ رێك یەکەمی سەر عێراقە ولە ساڵی (٢٠٠٢)، (٢٠٠٣) بەناو عێراقەوە بەشداری کردووە لە پاڵەوانەکانی وڵاتە عەرەبییەکان لە لوبنان.

٣- تیپی تێنسی سەر زەوی:-

بەردەوام یاری لە پاڵەوانێتییەکانی عێراقدا کردووە

٤- تیپی تایکواندۆی کەرکوك:-

ئەم تیپە چەند جارێك یەکەمی عێراقی بەدەستهێناوە.

٥- تیپی لەشجوانی:-

هەردەم لە پاڵەوانێتی عێراق بەشداری کردووە.

ئەم یانەیە لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە تووشی تاڵان کاری و لە ناوچوون بووە، بەڵام لە پاش هەڵبژاردنی دەستەی باڵای ئەندامانی یانەکە و کارکردنی چالاکییەکانی توانیان لەسەر پێی خۆی بووەستێت.

**٦- یانەی وەرزشی (الأخاء الترکماني)**



ئەحمەد کەرکوکلی لە یانەی یلدزلار




یانەی وەرزشی کەرکوك



یانەی وەرزشی سەورە



یانەی وەرزشی سەورە



یانەی وەرزشی یەکی حوزەیران



یانەی وەرزشی سەورە

### ٧- یانەی وەرزشی سۆلاف

کورد لە ساڵانی (١٩٥٨- ١٩٥٩) عەودالی ئەوە بوو یانەیەکی کوردیی دابمەزرێنێت لە دوای شۆڕشەکەی (١٤) تەممووزی ساڵی (١٩٥٨) لە کەرکوك پارتی دیموکراتی کوردستان - لقی (٣)، کە مامۆستا جەلال عەبدولرەحمان لێپرسراوی بوو، هەروەها عەبدولجەبار تاهیر شەریف‌و سەلمان قادری وەك بەرپرس، دیاری کرد بۆ کردنەوەی یانەیەکی وەرزش لە کەرکوك، ئەوانیش هەڵسان بە پەیوەندی بە وەرزشوان‌و لاوانی کەرکوکەوەو توانیان تیپی باڵەو باسکەو تۆپی پێ دروست بکەن، دەستیان کرد بە چالاکی‌و ناویان نا یانەی وەرزشی خەبات‌و دەستیان کرد بە پێشبڕکێ، لەگەڵ سلێمانی‌و هەولێرو ناو شاری کەرکوك، بەڵام عەبدولکەریم قاسم مۆڵەت (ڕوخسەت)ی نەدا بە ئاشکرا یانەکە دروست بکەن‌و قەدەغەی کرد، لەبەر فیکری شۆڤێنی دژ بە کوردی ئەم شارە. بە کۆڕپەیی ئەو یانەیە زیندەچاڵ کرا.

هەر لەبەر ئەمە لە ساڵی (١٩٦٩) جموجۆڵی دامەزراندنی یانەیەکی تر دەستی پێکرد، لە دوای ئەوەی جموجۆڵی وەرزشی لە شاری کەرکوك پەرەی سەندبوو، بەتایبەتی لە تۆپی پێداو لە گەڕەکەکانی ئیمام قاسم‌و ئازادیی‌و شۆریجەو تەپەی ملا عەبدوڵڵاو موسەڵڵاو شاترلوو، لەناو وەرزشوانەکانی کورددا گفتوگۆ دەکراو لە چاپخانەکەی (خورشید عوسمان ڕابی) کۆدەبوونەوە، ئەوانیش: (پیرۆت تاڵەبانی، ئەنوەر عەبدولقادر سلێمانی، عەبدولمەوجود نورەددین، عەبدولستار محەمەد ڕەسوڵ، ستار کوردی، شێخ ستار بەرزنجی‌و زۆریتر. دوای لێکدانەوەیەکی زۆر گەیشتنە ئەوەی کە دەتوانن یانەیەکی وەرزشی دابمەزرێ‌و دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی دەستەی دامەزرێنەری. یانە بە مەرجێك مامۆستای وەرزشی تێدا بێت‌و (١٠) ناو ئامادەکراو لەگەڵ لیستی (٣٠) ئەندامی پاڵپشتی بۆ دامەزراندنی یانە.

یەکەم دانیشتن کرا لە ماڵی خوالێخۆشبوو شەهید (ئەجیب ساڵح). دووەم دانیشتن لە ماڵی ئەنوەر سلێمانی ئەنجام درا، کە لە ماڵی عومەری حاجی ئەحمەد بوو. ئەو مەرجانە نووسران بۆ دامەزراندنی یانەکەو بوونی یانەکە. دەستنیشانی چەند ناوێك کرا، بۆ ئەم مەبەستە (سیروان، سۆلاف، ئیمام قاسم، هەندرێن، هەڵگورد) دوایی بە دەنگدان ناوی سۆلاف هەڵبژێردرا. شێخ پیرۆت تاڵەبانی بۆ وەزارەتی ناوخۆ لە بەغدا نێردراو پەیوەندیەکانی شێخ پیرۆت وەك پارێزەرێك توانی ئەو کەموکوڕیانەی، کە تیایدا هەبوو تەواوی بکات‌و چەند جارێك بگەڕێتەوە بۆ کەرکوك‌و لە (٣٠)ی تەموزی ساڵی (١٩٦٩) مۆڵەتی ئاشکرای یانەکە لە وەزارەتی ناوخۆی عێراقەوە هات لە ژێر ژمارە (١٧٤٧)، پاشان کۆبوونەوەی یەکەممان لە ماڵی شێخ پیرۆت تاڵەبانی ئەنجامداو دوای ئەوە لە ماڵی مەجید کەریم لە تەنیشت حەمامەکەی عومەر عەلی لە گەڕەکی ئیمام قاسم کۆبوونەوەیەکی دیکەیان سازکرد بۆ ئەو مەبەستە. پاشان کەوتنە ئەوەی، کە جێگەیەك بۆ بارەگای یانەکە دابین بکەن‌و چوون لە سەرووی پردی خەبات لە تەنیشت سینەما خەیام لە نزیك حەمامەکەی قادر حەمامچی دوو دوکانیان بەکرێ گرت‌و چوار کورسی نایلون‌و دوو دۆڵابی داریان کری‌و تاقمێکی جلی تۆپی پێ لەلایەن خوالێخۆشبوو خورشید عوسمان ڕابی خەڵاتی یانەکەی کرد. ئێواران دەچوونە بارەگای یانەو هێدی هێدی پەیوەندییان بە مامۆستایانی وەرزش‌و وەرزشکاران کردو دەرگای بەشدارییان کرد بە (١٠٠ فلس)و بەناوی عەبدولستار محەمەد ڕەسوڵ حیسابیان لە بانکی ڕافدین کردەوەو عەبدولستار بوو بە



یانەی وەرزشی سۆلاف لە ١٩٦٩ بەرامبەر هەڵبژاردەی هەولێر



یانەی وەرزشی سۆلاف بەرامبەر هەڵبژاردەی هەولێر لە ٥-١٢-١٩٦٩



نەجات شێخۆ – جەبار کوردی لە گۆڕەپانی خلود لە کەرکوك لە ١٩٦٩



عەونی – حەبیب تائی – شێخ ستار ١٩٦٩



پارێزگاری کەرکوك عەبدولجەبار سەعدی دەستخۆشی لە تیپی سۆلاف دەکات ١٧-١٠-١٩٦٩



ڕێپێوانی یانەی وەرزشی سۆلاف لە ١٩٧١



پاڵەوانانی یانەی وەرزشی سۆلاف بەدیع کوردی – تۆفیق عەبدوڵڵا ١٩٧٠



یاری نێوان لاوانی ئیسکان و یانەی وەرزشی سۆلاف ١٦-٢-١٩٧٥



ڕێپێوانی یانەی وەرزشی سۆلاف



کۆکردنی پارە بۆ جەژنەکان لەلایەن یانەی سۆلافەوە – ئەحمەد داودە



سالی ١٩٧٤ تیپی هەلبژێردراوی جومباز، ئیبراهیم عەبد، شەهید محەمەد جاسم، فازڵ ئەسوەد، خالید حوسێن، تاریق عەواد، ئیسماعیل سەمین، خالید حەمەد، موعەمەر عەدنان، هاشم کەریم، ڕاهێنەر مومتاز یوسف



تیپی یانەی سۆلاف بۆ لەشجوانی



تیپی یانەی سۆلاف سالی ١٩٧١

یەکەم سکرتێری یانەی سۆلاف. دوای ماوەیەك خانوویەکیان بە کرێ گرت و دەستیان کرد بە دانانی تیپی تۆپی پێ و بالەو باسکە.. هتد.

*** یەکەم هەلبژاردن و یەکەم سەرۆکی یانە:**

دوای هەلبژاردنی یەکەم دەستەی بەڕێوەبردنی یانە دەستنیشانکراو دەستەی تازە هاتەکایەوە، شێخ پیرۆت تالەبانی بوو بە یەکەم سەرۆکی یانە یەکەم دەستەی یانە بەم شێوەیە بوو (شێخ پیرۆت فازل تالەبانی سەرۆك و شێخ ستار عەبدوللا بەرزنجی جێگری سەرۆك و سەلاح سالح سکرتێرو عەبدولستار محەمەد رەسول ژمێریارو ئەندامانی وەکو عەزیز تاهیرو خورشید عوسمان و عەبدولخالق عەبدولرەحمان و مەجید کەریم و فاتح ئەحمەد نەقشبەندی).

بریاری بەکرێ گرتنی خانووەکانی شەهید عیزەددین قەرە محەمەد درا بۆ کردنی بە بارەگای یانە. شێخ ستارو جەلال محەمەد هەر ئەو شەوە چوون بۆ مالی نورەددین قەرە محەمەد بۆ بەکرێ گرتنی خانووەکە. ئەو داوای (٢٥) دیناری دەکردو ئەوانیش (٢٠) دیناریان بۆ دانابوو دوای هەفتەیەك نورەددین ووتی: عیزەددین برام دەلێ: مادام بۆ یانەی وەرزشە بە (٢٠) دینار بیاندەرێ، ئەوە بوو چوونە ناو خانووەکەوەو یاری بەرزکردنەوەی ئاسن و لەشجوانی و یاری زۆرانبازییان تیادا دامەزران.

فاخیر ئەحمەد نەقشبندی راهێنەرێکی باش بوو لە زۆرانبازی هاتە یانەکە. بۆ ئەوەی دۆشەکی زۆرانبازی دابین بکەن، شێخ ستار چوو بۆ بەغدا، لۆرییەکی لە پاشماوەی تووکی خوری لە (کارگەی بەتانی) هێناو بە سەرپەرشتی راهێنەر فاخیر دۆشەکیان دروستکردو ژوورێکیان تەرخان کرد بۆ هۆلی زۆرانبازی. لە یاری ئاسن، رەشید راهێنەر بوو، مەحموود عەبدولباقی کوردی و تۆفیق عەبدوللا سێتی ئاسنیان بە یانەکە بەخشی، یانەکە پارەی نەبوو، خۆیان ئامادەکرد بوو بۆ جەژن، تا ئاهەنگ بگێرن و شاری یاری دومبەلە بکرێت. بەراستی ئەندامانی یانە خۆبەخش بوون، جەژنیان لە خۆیان تال کرد بوو، بۆ هاوردنی نەختێ خەرجی بۆ پێشخستنی یانەکەو لە پێش جەژنەوە چەرخوفەلەك و دومبەلەو دەهۆل و زورناو لێدانی پەنەلتی لە قوتابخانەی (١١ ئاداری کچان) سازدەکرا. یانەی سۆلاف لە هەموو بوارێکدا سەرکەوتوو بوو، تەنها لە یاری تۆپی پێ (٩) یاریزانی یانەکەیان لە هەلبژاردەی کەرکوك بوون. راهێنەرە باشەکانی شاری کەرکوك وەك (نوری کوردی کە یەکەم راهێنەری تۆپی پێی سۆلاف بووو کەریم ئەفەندی سەرپەرشتیاری تیپەکانی یانەیان دەکرد). لەناو خاسە جاری وا هەبووە، کە (٥٥) یاریزان مەشقیان دەکردو هەموو یاریزانەکانی کەرکوك لە هەموو نەتەوەکان روویان دەکردە یانەی سۆلاف، لە ئاشووری و عەرەب و تورکمان. تیپە میللییەکانی ئیمام قاسم و ئازادی و شۆریجەو تەپەو رەحیماوە لە یانەی سۆلاف کۆدەبوونەوە.

*** یەکەم یاری یانەی سۆلاف لە تۆپی پێ:**

یەکەم یاری تۆپی پێ لە (٢٧)ی تشرینی یەکەمی سالی (١٩٦٩) لەگەل یانەی هەولێر بوو، لە یاریگەی شەریکە لەژێر چاودێری پارێزگاری ئەو سەردەمە (عەبدولجەبار ئەلسەعدی)، کە بە ئەنجامی (٤ – ٢) بۆ سۆلاف کۆتایی هات. لە دوای بەیانی ئاداری سالی (١٩٧٠) کۆمەلێك برادەرانیان ناردە ناو دەستەی بەڕێوەبەری یانەی سۆلافدا لە ژێر ژمارەی (٢٠١٨) لەگەل چەند برادەرێکی تردا وەك

عادل نیعمەت هەواس‌و خەیروڵلا پیرداوودو محەمەد ڕەزا، ماوەیەك گۆڕانكاری كرا لە بوارەکانداو کۆمەڵێکی زۆر هاتنە ناو یانەکەوەو دوای ماوەیەکی کەم خۆیان کێشایەوە بۆیە دەستەی بەڕێوبەر ناچار بوو بڕیاری دوورخستنەوەیان بدات، ئەمە کۆمەڵێکە لەو ناوانەی کەوتە بەر ئەو بڕیارە، کە لە ڕۆژنامەی (کەرکوك)، کە شارەوانی دەریدەکرد لەژێر ژمارەی (٢٠١٨) بڵاوکرایەوە.

(محەمەد پیرۆت، ئیحسان مەجید، ئەنوەر مەولود، ئەحمەد شەریف، ئیبراهیم خەلیل، ئیبراهیم میرزا، ئەحمەد ئەمین، ئیبراهیم عەلی، ئیبراهیم حەسەن، ئەنوەر میرزا، ئیحسان محەمەد، ئەحمەد شاهین، ئەحمەد فەتحوڵلا، بەکر حەسەن قارەمان، جومعە عەزیز، جەبار محەمەد عەلی، جەمال ڕەشید، جەلیل ئەحمەد عەبدولواحید، جەمیل خەلیل، چولی محەمەد باپیر، عومەر شێخ محەمەد، خواکەرەم حوسێن، عومەر سالح، حەمەخان حەمید، عادل کەریم، حەسەن حوسێن، عەبدولرەحمان عومەر، حەمە شەریف، عەبدوڵلا عەزیز، حوسێن عەبدوڵلا حەسەن غەریب، حەمە خان غەریب، حاجی شەریف محەمەد، حوسامەددین نورەددین، حەمە عارف محەمەد، حوسێن میرزا عەباس، حەمە سالح قادر، ڕەزا شوان، ڕەشید سەعید، ڕەمەزان ڕەشید محەمەد، ڕەئوف حەمە شەریف، ڕەحمان عەلی پارە، سیروان فەخری، عەبدوڵلا محەمەد، عومەر سەعید، سلێمان فایق فەقێ، عەلی ئەمین، سامی محەمەد، سلێمان مەحموود، عەبدولکەریم هوشیار، سەعید فەرەج، سەعید حوسێن سەید یونس، عەسکەر محەمەد، سەعید محەمەد ئەمین، سەلاحەددین فەتاح محەمەد، سەلاحەددین عەبدولقادر، سەفوەت عەلی ڕەفیق، سەبری محەمەد، تالب ڕەشید یادگار، تەها سەید ئەحمەد، تاهیر قادر ڕەشید، عەبدولرەحمان مستەفا، عوسمان وەلی، عەلی تاهیر، عەلی کەریم، عەبدولحەمید ئەحمەد شەریف، عومەر عەبدولرەحمان عەبدولحەمید وەندی، عەلی تەقی، عەبدولکەریم قادر، عەبدولوەهاب محێددین، عەبدولرەحمان عوسمان، عوسمان تەها حوسێن، عەزیز ئەحمەد، عەبدوڵلا یاسین، فازڵ سالح، فەخرەددین سابیر، فەتحوڵلا عەلی، فەخرەددین نوری ئەحمەد، فەرەج شاهین، فەیزوڵلا میرزا، فەتاح ڕەشید، فارس کەریم، فەرحان حەمەد خان، قادر عەبدوڵلا محەمەد، گلی محەمەد حەسەن، قادر حەوێز، کەریم ڕەحیم، کەریم عەباس، کەریم سلێمان، کەریم محەمەد عەلی، مەحموود ئەحمەد مەحموود، محەمەد ئەمین فەتاح، محەمەد حەمە خان، موراد عەلی، موراد ئەحمەد، محەمەد عەلی مەحموود، قادر تۆفیق، مەجید مەحموود، محەمەد شەفیق، محەمەد شێخ عیزەددین، محەمەد موراد، موراد کەریم، محەمەد سالح تۆفیق، مەحموود عەلی بەگ، عەبدوڵلا قادر دەروێش، عەبدوڵلا محەمەد، عەزیز موراد، عەباس عەلی، عومەر حوسێن، عەبدوڵلا جەعفەر، عەبدولمەجید محەمەد تاهیر، عەلی شەریف، عەبدولستار داوود، عەبدوڵلا میرزا عەباس، عەسکەر جەمشیر، عومەر شکور فەرەج، عەبدوڵلا سەعید ڕەمەزان، عەبدولرەحمان حەسەن، غەریب قارەمان، غیدان محەمەد، غەفور ئاغجەلەری، قادر ئەحمەد، نیعمەت ئەحمەد، نورەددین شێخ لەتیف، نەجمەددین محەمەد ئیحسان، نیعمەت حەمە خان، نەجم ناسح، وەجدی ئەمین، یونس مەجید، یەحیا جاسم، یونس قادر وەهاب، یوسف ئەحمەد، هاشم ئەمین محەمەد، ئەحمەد خواکەرەم، ڕەشید محەمەد شەریف، ئەنوەر فەتاح، ئەحمەد عەباس، ئیسماعیل عەزیز، تالب محەمەد، حوسێن خواکەرەم، حوسێن محەمەد شەریف، خەیروڵلا سالح، سەعدی سەید ئەحمەد، ستار ئەمین، سەیید عەلی سەیید حوسێن، سەیید مەحمەد سەیید عەلی، شکور محەمەد، غەریب سۆلاف، شەفیق ڕەشید، فازڵ ئەحمەد، غازی ئەمین، فەرحان سالح، لەتیف نەسرەددین، نەجمەدین کەریم، نەزیف حەسەن، محەمەد عەلی ئەحمەد، محەمەد فایق، محێددین عەزیز، عیزەددین مستەفا، عەلی ئەحمەد، غازی خورشید، ئەسعەد عەلی، ئەحمەد عەبدولکەریم، ئەبرەم عەماش، ئەحمەد مەحموود، بابا کەریم، بەهجەت عەبدولکەریم، سەعدون، شێخ تاهیر، سەعید سەکران، غالب ڕەشید کاکەیی، سەیید مەجید سەیید سالح، شکور عەزیز، شکور عەزیز، شکور مەردان، شکور جاسم، شکور محەمەد، سالح بەرغەش، فازڵ جەبار، فەخرەددین محێددین، فەخری سلێمان، قاسم عەلی، قادر شەریف، کەریم محێددین، کازم حەسەن، ڕەشید سەیید حوسێن، محەمەد سەعید فەتحوڵلا، مەجید محەمەد شەریف، محەمەد عەلی، محێددین ئەمین، محەمەد سالح تۆفیق، محێددین عەزیز، محەمەد وەلی ئەحمەد، محەمەد محێددین، محەمەد فەتاح، مەجید سەعید، محەمەد حوسێن فلامەرز، محەمەد ئەحمەد، محەمەد میرزا ئەحمەد، مەولود ئەحمەد، محەمەد تەها، نورەددین محەمەد، عەباس مەجید، عەبدولرەحمان کەریم، عەبدولحوسێن جەبر، عەبدولحوسێن فاتیح، سادق کەریم، سەباح غیدان، سەلاح محەمەد ڕەزا، سەلاح محەمەد ئەمین، سوبحی سابیر، قادر حەوێز، قادر عەبدوڵلا خالد مەولود محێددین، خزییەر حەسەن عەبدی، خدر شەفیق، خەلیل ئەحمەد عەباس، ئیسماعیل محەمەد ئەمین، ئەحمەد محەمەد ئەحمەد، محێددین نوری، جەبار مستەفا، جەلال عەبدولواحد زەنون، عەزیز سادق، زەکی مەلا محەمەد، حەسەن حەسون، حەسەن سلێمان، حەسەن محەمەد حوسێن، حەسەن محەمەد ئەمین، کەمال شکور محەمەد، کەمال عەلی ڕەزا، کەمال سالح، کەمال حوسێن، ماجد کازم، محەمەد حەمید عومەر، ئەحمەد حەمید مەجید، زەنون عەزیز سادق، زەکی مەلا محەمەد، حەسەن حەسون، حەسەن سلێمان، حەسەن محەمەد حوسێن، حەسەن محەمەد ئەمین، کەمال شەکور محەمەد، کەمال عەلی ڕەزا، کەمال سالح، کەمال حوسێن، ماجد کازم، محەمەد حەمید عومەر، ئەحمەد حەمید مەجید، محەمەد حەمە خان، محەمەد وەلی ئەحمەد، مستەفا عەلی، محەمەد موحسن تاهیر، مەحموود عەبدولباقی کەریم، محەمەد فارس عەزیز، نیعمە ئەحمەد، نەجمەددین عەبدوڵلا، ستار حەسەن عەزیز، عەبدوڵلا سالح، عەبد لیلو حوسێن).



قادری مەلا خالید سالی ١٩٨٤ لە یەکێك لە پالەوانییەتییەکانی هەلگرتنی قورسایی لە کەرکوك



سالی ١٩٧٦، یاریگای (بابا) تیپی هەلبژێردراوی پەروەردەی کەرکوك، نەجات عیزەت، فوئاد فەتحوللا، شێرزاد، محەمەد، حەمزە یاسین، ئەکرەم مودەڕیسی، کەنعان زەینولعابدین، سەلاح مستەفا، تەلال، عەونی حەسەن، سەعد عەبدولڕەزاق، قاسم محەمەد عەبدی، فوئاد سادق، سەمەد یاسین، جوی، سەرگون، نورەددین سەعید



سالی ١٩٧٩ یاری نێوان تیپی هەلبژێردراوی کەرکوك‌و تیپی هەلبژێردراوی سلێمانی، نەشئەت محەمەد، خەلیفە ئەسوەد، محەمەد نوری، سەلاح نوری، ساقی محەمەد، حیلمی شەوکەت،
دانیشتووەکان لە ڕاستەوە عەونی غەنی، فوئاد محەمەد، موئەیەد سەلاحەددین، شوان، ڕەمزی حەیدەر.



یاریزانی مستەکۆلە فەلاح ئەحمەد نادر

*** چالاکییەکانی تیپی کچان:**

جارێکی تر دەستەی بەڕێوەبەرایەتی بە سەرۆکایەتی پیرۆت تاڵەبانی دەستی کرد بە ئیشکردن لە هەموو چالاکییەکان، تیپی کوڕان و کچانی یانەکە لەسەر ئاستی کەرکوک و عێراق پلەی باشیان بەدەستهێنا، بەتایبەت کچان لە یاری گۆڕەپان و تۆپی دەست و سەبەتە.

لە پاڵەوانییەکی کەرکوک دا لە تەکییەی دەربەندەوە بۆ کەرکوک، کە ٦٥ کم بوو، عەبدولوەهاب حەمە عەزیز یەکەم بوو لە تاکەکاندا لە پاسکیلی سادە، یانەی ئاشووری بە یەکەم لە کۆداو یانەی سۆلاف دووهەم بوو لە (١٦)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٢). لە ساڵی (١٩٧١) ڕێپێوانێك کرا بەبۆنەی خۆماڵی کردنی نەوتەوە، ئەندامانی یانەی سۆلاف و لایەنگرانی دابەزینە سەرشەقامەکانی شاری کەرکوک و ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان پیشاندا لەسەر بڕیاری لقی (٣)ی پارتی ئەو سەردەمە لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٣) لە هەمان بۆنە بەشدارییان کردو لەگەڵ جەماوەری شاری کەرکوک تیپی سۆلاف دروشمی تایبەتی کوردییان بەرزکردەوە. لە ئۆتۆمبێلێکی لاندرۆڤەری عوسمان پاڵەوان دروشمی حوکمی زاتی و مافەکانی شاری کەرکوکیان دەخوێندەوە بە میکرۆفۆن. لەلایەن محەمەد عایش سەرۆکی کرێکارانی عێراق و ئامر ئینزبات وەستانیان و ووتی: بۆ ئەم دروشمانە دەخوێندرێتەوە؟ ئێمەش ووتمان کە دەستەی بەڕێوەبەرایەتی یانە بڕیاری ئەمەی داوە. (تطبيق الحكم الذاتي لكوردستان العراق) و سەرۆکی یانە (شێخ پیرۆت تاڵەبانی) یان بانگ کرد بۆ لێپرسینەوە لەگەڵی بۆ ئەو ڕووداوە. ئەوە بوو جەنابی مەلا مستەفا بارزانی و مەکتەبی سیاسی کاسێکی گەورەیان بە دیاری نارد بۆ یانەی سۆلاف لەلایەن بەڕێز عوسمان ساڵح کارگێڕی لقی (٣) پارتی دیموکراتی کوردستان پێشکەش کرا.

*** یارییەکانی لەشجوانی:**

یانەی سۆلاف لە چالاکییەکانی خۆی نەوەستاو لە هەموو بوارەکانی وەرزشدا دەستکەوتی گرنگی بەدەستدەهێنا چ لە ناو شاری کەرکوک و چ لە ئاستی عێراق بە دەیەها یاریزانی پێگەیاندو بوونە نوێنەری شارەکەیان و عێراق، ئەمەش بەشێکە لەو یاریزانانە کە لە بواری لەشجوانی کارییان کردووە:

(تۆفیق عەبدوڵڵا خدر، بەدیع کوردی، ئیبراهیم خەلەف، عومەر ئیبراهیم، فازڵ حەمە حوسێن، حەمید مەجید، لەفتە کازم، عەبدولئیلا، محەمەد وەهاب، سەعید میسری، شەهاب غەفور، یوسف مەحموود، محەمەدی مەلا خالید).

*** گۆڕینی ناوی یانەی سۆلاف بۆ کەرامە لەلایەن ڕژێمی بەعس:**

بە فەرمانی ڕژێمی بەعس لە ساڵی (١٩٧٩) یانەکە ئاگادار کرایەوە، کە چۆڵی بکەن و ئەوان بارەگای (بەعس)ی لێ دروست بکەن، بۆیە جارێکی تر یانەکەیان گواستەوە بۆ ماڵی شەهید عومەر شەریف لە گەڕەکی ئیسکان.

بە فەرمانی ڕژێم، تیپەکە هەر لە چالاکی خۆی نەکەوت و تیپی تۆپی پێیان سپاردە بەرزان ئەحمەد و یاسین عەبدوڵڵا، هەروەها تیپی بالەیان بە جەلال محەمەد قادر سپاردو یوسف فەتاح بۆ بەرزکردنەوەی ئاسن، زۆری نەخایاند بڕیاری وەزارەتی لاوان فەرمانی نەهێشتنی یانەی داو لەگەڵ یانەی سەورە بیانکەن بە یەك و هەر چییان هەیە لە پارە بیدەن بە ئەوان، کە (٤,٧٢١,١٦١) چوار هەزارو حەوت سەدو بیست و یەك دینارو سەدو شەست و یەك فلس بوو، کە جەلال محەمەد قادر نوێنەری سۆلاف بوو و خوالێخۆشبوو قاسم سلێمان نوێنەری سەورە بوو، لە بارەگای وەزارەتی لاوان لە بەغدا تەواویان کرد بەم شێوەیە ناوی یانەی (سۆلاف)یان سرییەوە.

لە ساڵی (١٩٨٣) یانەیەکی لەسەر شێوەی تازە دامەزراو لە پێشتر یانە هەوڵی زەویەکەیانی دابوو لە گەڕەکی ئازادی، بەڵام ڕژێمی بەعس کۆمەڵێك لە دەستەی خۆی هێنا و بە فەرمانی لیژنەی ئۆلۆمپی دەستەی کاتی دروستکردو لە سۆلافەوە ناوەکەیان گۆڕی بۆ (کەرامە).

بە هەمان شێوە ڕژێمی بەعس یانەی (ئاشووری) کرد بە یانەی (تامیم) و یانەی (ئەرمەنی) کرد بە (شەهید ماسیس)، لەم قۆناغەدا لە ناو دەستەی کارگێڕی دووبەرەکی دەستی پێکرد، ئەندامانی کۆنی سۆلاف و ئەندامانی تازە هاتووان لەبەر چەند گۆڕانێکی تر بۆیان نەچووە سەرو یانەیان بەجێهێشت.

*** ناوی وەرزشوانەکانی تۆپی پێ:**

(ئازاد فاتیح محەمەد، سەباح فەخری، ستار مەجید، عابدین ئیبراهیم، سەلام محەمەد یاور، هاشم ڕەئوف، کاکەمەند کاکەڕەش، ناسر حەکیم، چالاك عەلی ئەحمەد، ئەحمەد حەسەن، محەمەد جەبار، ناتق عەبدولقادر، میران کەریم، ئەحمەد محەمەد دەمانچە، بەکر شکور، عەدنان عەبدولقادر، حیلم شەوکەت، یاسین عەبدوڵڵا، تارق عەبدولقادر، جەبار کوردی، عەونی کوردی، ستار کوردی، غەنی کوردی، سامی عەبدولکەریم لەیلانی، عەلی مولود حەسەن، دارا جەمیل، مومتاز یوسف جەجۆ، قەیس یوسف جەجۆ، عەلی فەتاح، بەرزان ئەحمەد، شیروان ئەحمەد، شوان ئەحمەد، عەبدوڵڵا کاکە حەمە، عەزیز سابیر، سەنا مستەفا عەزیز، سامی عەبدوڵڵا موختار، سامی عەبدوڵڵا، محەمەد یوسف، فوئاد جیهاد، مەحموود فەخری، لەتیف، لەتیف ڕەشید، عادل کەریم، حەسەن محەمەد ئەمین (حەسەن سوور)، سەلام کاکە حەمە، محەمەد قادر، یەحیا قادر، محەمەد عەلی تەپە، نەوزاد تەپە، خالید تۆفیق (ڕێبوار)، خەلیل تۆفیق، شکور مەحموود، عەدنان (عەدلە)، جەلال شوان، سابیر ئەحمەد محەمەد، موکەرەم ئەمین لەیلانی، نوری ڕەفیق (بسکت)، محەمەد ئەسعەد، سوعاد عەزیز، ئەحمەد عەبدولڕەحمان، ئەحمەد عەبدوڵڵا، عەبدوڵڵا (فیرقەی دوو)، ڕێسان (فیرقەی دوو)، فاروق محەمەد (دەمانچە)، تۆفیق دابی، نەوزاد (نوکە)، ئەوبەکر کەریم ڕەمەزان، مالك میرزا، فەخرەددین ئیسماعیل، سەلام ساڵح، شەعلان، سەمەد (شۆڕیجە)، یوسف عیسام، فازڵ کەریم، ئەنوەر عارف، میکائیل سەباح، محەمەد ساجد، تورکی عەبدولجەبار، عومەر خەتاب، سەلاح حوسێن بەمە، حەسەن عەلی فەرەج، کیفاح کوردی، ڕەفعەت عەبدولقادر، موعتەسەم ئەمین لەیلانی، موستەعین ئەمین



یاریزان حەسەن کەشاف ١٩٦٥

لەیلانی، نەجمەددین، شێخۆ، نازم عومەر، فەلاح حەسیب، سەباح محەمەد یاور، سالح قەدوری، سالح عەسکەر، محەمەد عەباس، عومەر خونچە، مەریوان فازل ئەمین، جەبار مستەفا، ئیحسان سابیر، فەخرەددین (ئیسکان)، تەحسین (تەپە)، سابیر کاکەیی، ئەنوەر عەبدولقادر سلێمانی، نەجمەددین حەسەن، غازی ئەحمەد).

*** ناوی وەرزشوانەکانی تۆپی باڵە:**
(شێخ ستار عەبدوڵڵا ئەحمەد، جەلال محەمەد قادر، عەلی محەمەد سەعید، بورهان محەمەد، ئەسوەد جەبار، عادل عەلی، سامی ئەمین سالح، محەمەد عەبدوڵڵا، شێروان حەسەن کەڵەمێرد، بەرزان حەسەن کەڵەمێرد، بەکر محەمەد، کەریم کاکە حەمە، دڵشاد محەمەد، عەبدوڵڵا حەسەن کەشاف، سامال ئەمین نوری، جەلیل نەجمەددین، محەمەد سالح، هیوا تۆفیق، عەدنان محەمەد (شۆڕیجە)، سەباح فاتیح، یونس (شۆڕیجە)، عەدالەت (شۆڕیجە)، عەزیز محەمەد، فائیز (فیرقەی دوو)، عادل ئەحمەد، یادگار شاکر حەکیم، یوسف (فیرقەی دوو)، یونس حەمید، باهر عەبدوڵڵا، ئازاد جەرجیس، جیهاد عەبدولکەریم، نیهاد عەبدولکەریم، سیروان فازل، هیوا سابیر، هەورامان عەبدولکەریم، شەماڵ حەبیب عەدنان سابیر محەمەد، ئەمیر محێددین، دڵشاد شەریف، سالح محەمەد سالح، عەلی کاکە حەمە، سەمیم عەبدولڕەحمان لەیلانی، جەلال عەبدولڕەحمان).

*** ناوی وەرزشوانەکانی بەرزکردنەوەی قورسایی:**
(بەدیع کوردی، تۆفیق عەبدوڵڵا، عاسی قەسا، حوسێن ماوی، سلێمان قەساب، جەوهەر عوبێد، لەفتە کازم، حوسێن عەلی محەمەد، یوسف فەتاح، سەعد حەمید فینجان، عەبدولکەریم عەبدوڵڵا سەعید، وەحید قادر، جەودەت غەریب، خالید غالب (کەبابچی)، حوسێن (کورد)، شەمسەددین عەبدوڵڵا وەلی، عیماد محەمەد شەریف، ئیبراهیم محەمەد، فەیزوڵڵا فەتحوڵڵا، قادر مەلا خالید، محەمەد عەبدولوەهاب، سەید حەسەن شێخانی، محەمەد حەمزە قەساب، کەماڵ ئیسماعیل، عەباس عەلی محەمەد، عەبدوڵڵا محەمەد، کازم فینجان).

*** ناوی یاریزانەکانی تۆپی سەر مێز:**
ئازاد کاکل، عارف فەتاح، ئەکرەم عەبدولواحید، نیهاد (ئاخور حوسێن)، هونەر عەبدوڵڵا سدیق، محەمەد ڕەئوف، پۆڵا ئازاد خانەقا، فوئاد عەبدولڕەحمان، سەلاح عەبدولڕەحمان، سەلاح عەبدولڕەحمان، محەمەد عەبدوڵڵا).

*** ناوی یاریزانەکانی یاری هێز:**
(ئازاد عەبدولکەریم، فەرەیدون عەبدولقادر، عەدنان عومەر مەحموود، نەسر ڕەحیم، عەبدولوەهاب عەزیز، سەباح محەمەد خالید، عەبدوڵڵا ئەحمەد، حەیدەر سادق، فەرحان عەجە، ئەبوبەکر کەریم ڕەمەزان).

*** ناوی یاریزانە ئافرەتەکان:**
(عالیە محەمەد ئەمین، عالیە قادر، ئینتسار قادر، خەدیجە محەمەد خالید، نیشتیمان محەمەد، شیرین عەبدولقادر، شلێر عوبێد، حەسیبە عەزیز، شوکریە غێدان، لەیلا محەمەد نوری).

*** ناوی یاریزانەکانی پاسکیل سواری:**
عەبدولوەهاب حەمە عەزیز، سەباح محەمەد تاهیر، ئازاد عەبدولکەریم، نوری شێخۆ).

**٨- یانەی وەرزشی شۆڕیجە:-**
ئەم یانەیە لە (٢١)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٣) لە کەرکوك دامەزراوە، کە دەستەی دامەزرێنەری بریتی بووە لە :- عەبدولکەریم حاجی، حاکم عومەر جەباری، عیماد عومەر، ئەحمەد عەبدولڕەحمان، ستار محەمەد ڕەشید، سابیر کاکی ئەحمەد، مەحموود حەسەن وەسمی، سامان ڕەحمان ڕەحیم، پەروین ڕەشاد مەلاویس، ڕەحیم شەفیق، محەمەد خەڵەف.
لە (٢١) ئاداری ساڵی (٢٠٠٧) هەڵبژاردنی دووەمی بۆ کراوە، لە (٢٠)ی تشرینی یەکەم لە ساڵی (٢٠١٢) هەڵبژاردنی سێیەمی بۆ کراوە.
ئەم یانەیە لە ئێستادا خاوەنی بارەگاو یاریگاو جێگای هۆڵ و مەلەوانگەو یاریگای تارتان و یاریگای خوماسی هەیە.
ئێستا لە خولی پلە نایابی کوردستان و عێراقە.
١- ساڵی (٢٠٠٤) پلەی دووەمی لە خولی یانە پلە نایابەکانی کوردستان بووە لە تۆپی پێی باڵە.
٢- ساڵی (٢٠٠٥) پلەی یەکەم لە خولی یانە پلە نایابەکانی کوردستان بووە لە تۆپی پێی باڵە.
٣- ساڵی (٢٠٠٥) پاڵەوانی جامی کوردستان بووە لەگەڵ پێشمەرگەی سلێمانی لە تۆپی پێی باڵە.
٤- لە ساڵی (٢٠٠٥) خاوەنی پلەی چوارەم لەسەر ئاستی خولی یانە پلە نایابی عێراق بووە لە تۆپی پێی باڵە.
٥- پلەی چوارە لە تۆپی باڵە لە ساڵی (٢٠٠٩) لە سەر ئاستی کوردستان
٦- لە ساڵانی (٢٠١١، ٢٠١٢، ٢٠١٣) پلەی چوارەم لەسەر ئاستی کوردستان لە تۆپی پێی باڵە.
٧- ساڵی (٢٠٠٥، ٢٠١٣) پاڵەوانی یانەکانی کەرکوك بووە لە تیپی تۆپی پێی باڵە.
٨- پاڵەوانی یانەکانی عێراق بووە لە ساڵی (٢٠٠٥) تیپی یاری سیانی کە لە دووکان بەڕێوەچوو.
٩- پلەی دووەمی لەسەر ئاستی کوردستان لە تیپی زۆرانبازی لە ساڵانی (٢٠١٢، ٢٠١٣) لە جۆری ڕوومانی
١٠ پلەی چوارەم لەسەر ئاستی کوردستان لە ساڵی (٢٠١٣) بۆکچان بۆ بەرزکردنەوەی قورسایی.
١١ لە تۆپی پێدا پاڵەوانی پلەیەکی کوردستان لە ساڵی (٢٠٠٥)
١٢- بە شداری یاری کردووە لە تایکواندۆ، گۆڕەپان و مەیدان، لەشجوانی، لە دەرەوەی وڵات لە بەرلین و بەیروت و هەنگاریا لەنێوان ساڵانی (٢٠١١- ٢٠١٤).

**٩- یانەی وەرزشی خاك:-**
یانەی وەرزشی خاك یەکێکە لەو یانە وەرزشییانەی شاری کەرکوك کە لە سەرەتای ساڵی (١٩٩٣)ەوە لە ئۆردوگای (بنەسڵاوە) لە سەر دەستی چەند وەرزشوانێکی دێرینی شارەکە دامەزراوە وەکو:- شەهید (هەمزە یاسین) کە دەورێکی بەرچاوی هەبووە لە دامەزراندنی، هەروەها دەورێکی گەورەی بینووە لە پێگەیاندنی یاریی و چالاکییانەکانی یانەکە.
تیپەکانی ئەم یانەیە بریتیە:-
١- تۆپی پێی بۆ هەریەکە لە پێشکەوتووان و لاوان و تازە پێگەیشتووان
٢- تۆپی باڵە بۆ کوڕان و کچان
٣- تۆپی باسکە بۆ کوڕان و کچان
٤- تۆپی سەرمێز بۆ کوڕان و کچان
٥- زۆرانبازی و کاراتێ و نیشانشکاندن و مەلەوانی لە دەستکەوت و چالاکییە بەرچاوەکانی بەریتییە لە:-
١- لەیاری باڵە لە ساڵی (٢٠٠٧- ٢٠٠٨) پلەی یەکەمی بەدەستهێنا، هەروەها لە تیپی لاوان و تازەپێگەیشتووان پلەی یەکەم دووەمی شاری کەرکوکیان بەدەستهێنا.
٢- یەکەمی خولی تۆپی پێی یانە پلە دووەکان بووەو سەرکەوتنی بۆ پلە یەکەمەکانی هەرێمی کوردستان.
٣- ساڵی (٢٠٠٨) تیپی لاوانیان پلەی یەکەمی لەسەر یانەکانی شاری کەرکوك بەدەستهێناوە لە سەر ئاستی کوردستانیش گەیشتە چوار گۆشەی زێڕین.
٤- لە تۆپی باسکە دا لە ساڵانی (٢٠٠٦، ٢٠٠٧، ٢٠٠٨) لە لاوان و تازە پێگەیشتووان پلەی یەکەم و دووەمی کەرکوکیان بەدەستهێنا.
٥- ساڵی (٢٠٠٨) لە یاری زۆرانبازیدا یەکەمی یانەکانی کوردستان بووە.
٦- لە یاری کاراتێ دوو یاریزانیان لە ڕیزی هەڵبژاردەی عێراقن، لەسەر ئاستی کوردستانیش لە ساڵانی (٢٠٠٦، ٢٠٠٧، ٢٠٠٨) پلەی دووەم و سێیەمیان بەدەستهێناوە.
٧- لە تیپی مەلەوانیش لە (٢٠٠٧) لەسەر ئاستی کوردستان پلەی یەکەمیان بەدەستهێناوە لە ساڵی (٢٠٠٨)یش پلەی دووەمیان بە دەست هێناوە.

**٩- یانەی وەرزشی کەیوان**
ئەم یانەیە لە سەرەتادا لە هەولێر دامەزراوە، بەڵام لەدوای پرۆسەی ئازادییەوە هاتووەتە نێو شاری کەرکوك.

**١٠- یانەی سۆلافی نوێ**
ئەم یانەیە لەنێوان ساڵانی ١٩٩٦ - ١٩٩٧ لە چەمچەماڵ دامەزراوە بەڵام لەدوای پرۆسەی ئازادییەوە هاتووەتە نێو شاری کەرکوك.

**١١- یانەی وەرزشی باباگوڕگوڕ**
ئەم یانەیە لە یەکگرتنەوەی هەرسێ یانەی قەرەهەنجیر و قەرەحەسەن و شوان دروستبووە.

١٢- یانەی وەرزشی قەرەهەنجیر
١٣- یانەی وەرزشی فەتات کەرکوك
١٤- یانەی وەرزشی دووبز
١٥- یانەی وەرزشی کۆیری
١٦- یانەوەی وەرزشی داقووق
١٧- یانەوەی وەرزشی التآخی
١٨- یانەوەی وەرزشی خورماتوو
١٩- یانەوەی وەرزشی غاز الشمال
٢٠- یانەوەی وەرزشی موسەڵلا




یانەی کەرکوک بۆ تایکواندۆ




تیپی لاوانی یانەی کەرکوک بۆ تۆپی پێ



تیپی یانەی کەرکوك لە لوبنان



تیپی یانەی کەرکوك بۆ تۆپی سەرمێز ساڵی ٢٠٠٩

## *یاداشت و بیرەوەریی وەرزشوانە دێرینەكان

**بیرەوەری شێخ ستار دەربارەی وەرزش لە كەركوك:-**
من ناوم (ستار عەبدوڵڵا بەرزنجییە) لە ساڵی (١٩٤١) لە كەركوك لەدایكبوومە. باوكم ناوی سەید عەبدوڵڵاولە نەوەی شێخ محێدینەو باوكم هاتووەتە كەركوك و لە ئیمام قاسم



شێخ ستار

نیشتەجێ بووینە.
خولیای من هەر لە منداڵییەوە وەرزش‌و وەرزشكاری بوو، ئەو سەردەمە لە گەڕەكی ئێمە قوتابخانەیەك هەبوو ئەویش ناوی قوتابخانەی (ئیمام قاسم)ی سەرەتایی بوو.
ئەم قوتابخانەیە لە ساڵەكانی بیستەكانەوە دروستكرابوو، زۆربەی پیاوانی ناوداری كەركوك كە ئێستا ماون، لەو قوتابخانەیە خوێندنیان تەواوكردووەو دەرچوونە، ئێمەش لەبەر ئەوەی ماڵمان نزیك ئەم قوتابخانەیە بووین لەوێ وەرگیرام، ئەویش لە ساڵی (١٩٤٧)دا بوو.
وەكو بە بیرم بێت دەربارەی تۆپی پێ لە گەڕەكەكەی خۆمان، كوڕێك هەبوو ناوی (عادل مەلا سابیر)بوو كە بە (عادیلە سوور) بە ناوبانگ بوو، كوڕێكی جوانكیلە بوو ئێستا نەماوە، باوكی لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ كۆمپانیای نەوت بۆ لای ئینگلیزەكان كە باوكی بەرگدروو بوو لە كۆمپانیاكە.
جارێك لە جاران تۆپێكیان دابوو پێی تۆپە كە زۆر سەیر بوو، ئێمە تۆپمان نەبینیبوو، ئێمە كە یاریمان دەكرد تۆپی پەڕۆمان كۆدەكردەوەو دارێكمان تێدا دەكردو دەمانبەست.
عادل كە تۆپەكەی هێنایەوە بۆ گەڕەك، هەموو منداڵانی گەڕەك چووینە بەردەم ماڵی عادل، عادل تۆپەكەی بۆ دەركردین و شتێكی زۆر جوانەو ووتی ئێوارە ئەیهێنم بۆ پشت قوتابخانەكە.
ئێمە لەو كاتەدا شتێكی زۆر سەیر بوو، هەر كەسێك پێی لە تۆپەكە بكەوتایە زۆر كەیف خۆش دەبووین، دوای ماوەیەك یاری كردن تۆپەكە بوو بە خۆڵەوە، عادیل تۆپەكەی بردەوەو چووە بۆ ماڵەوە، ئێمەش كەوتینە دوای، سەیر دەكەین عادیل لە ماڵەوە تۆپەكەی بە وەزەنی چەوركردو كردیەناو تۆڕێكەوەو بە دیوارەكەوە هەڵیواسی.
شەو لە گەڕەكدا، نورەدین قەرەمحەمەدو عەزەدین خەتاب‌و ڕەمزی ئەمین‌و منداڵانی گەڕەك، چووین بولای (عادیلە سوور) بینیمان كە تۆپەكەی كردۆتە تۆڕەوەو بە دیوارەكە دا هەڵیواسیووە لە هۆڵە درێژەكەی خۆیاندا. ئەمە سەرەتای خۆشەویستی من بوو بۆ وەرزش‌ویاری.
گەڕەكی ئێمە لە باڵەدا زۆر باش بووین، من یەكێك بووم لە یاریكەران، لە ساڵی (١٩٥٤) حەمید خەیات، لە قوتابخانە مامۆستای وەرزش بوو، دوای ئەوە (ئستیڤان ئەفەندی) و (فوئاد دیكران) مامۆستای وەرزش بوون، لەبەر ئەوە ئێمە هەموو ساڵێك كە یاری قوتابخانەكان دەكرا خەڵاتمان دەبردەوە.
دوای ئەوەی كە قوتابخانەی (نەجاح) كرایەوە، بەربەرەكانی گەورەمان لەگەڵ بەرتەكییە دا بوو. یاریزانەكانی ئێمە لەو كاتەدا كە بیرم بێت عیزەدین نوری بەقاڵ، ڕەمزی ئەمین، حەمە ڕەزایەك هەبوو خەڵكی سلێمانی بوو ماڵیان لە یادگاربوو، فازڵ ئەسوەد، عەبدوڵڵا عەزیز (عابدی). لە بەرامبەریان حەمە سێوە (محەمەد عەبان)، یاریزانێكی باش بوو لە تۆپی پێ‌و تۆپی باڵەدا.
هەروەها فارووق تۆفیق ئەفەندی، عەموش كە لە زۆرانبازیدا بوو بە پاڵەوانی عێراق كە (عومەری) ناویبوو.
هەروەها لەوبەر قوتابخانەی مەركەزی هەبوو، دوایش قوتابخانەی قەڵا كرایەوە، لە دوایش قوتابخانەی موسەڵلا، ئەمانە قوتابخانە كۆنەكانی كەركوك بوون، كە یاری وەرزشی تێدا دەكرا.
ئێمە یاریگامان نەبوو، یاریگایەكمان هەبوو لە ناو گۆڕستانەكە لەم دیو گۆڕستانی (شێخ محێدین)، نزیكەی (٣٠) مەترێك بوو، تۆپێكمان لە گەڕەك كری بوو پێیان دەوت (كێچە)، كە هی تۆپی پێی تێنسی ئێستایە، بەوتۆپە یاریمان دەكرد، بەرتەكییەش گۆڕەپانی وەرزشی خۆڵاوی هەبوو، بەڵام شاخەكەی دەوری ئەگەر تۆپ برۆشیتایەتە ئەوێ بە فاوڵ حیساب نەدەكرا، جارێكیان چووم بۆ تۆپەكە پام وەرچەرخاو پێیەكانم دەرچوو، لەبەر ئەوە ترسام بچمەوە بۆ ماڵ لە ترسی باوكم هەر چۆنێك بوو هاتمەوە بۆ ماڵ.
لە دوایدا باوكم زانی بۆیە لەگەڵ خزمێكیدا ناوی (سەیگوڵ) بردمی بۆ لای مام سالحێك لە بەردەم مزگەوتی مەلا ڕەفیق ئەوكات باران دەباری، پێیەكەمی هێنایەوە جێگای خۆی.
تیپی میللی ئیمام قاسم لەو كاتەی ئێمەو پێش ئێمەش، تیپێكی زۆر بە هێزبوو، حاجی ئەڵڵاوێردی لەگەڵ سەید مارفدا، ئەمانە سەرپەرشتی ئەم تیپەیان كردووە، سەلاح قاوەچی یاریزانێكی ئەو كاتە بووە.
بەرامبەر ئەمان تیپێك هەبوو كە تیپی وەرزشی قەڵایان پێدەوت، مەحموود قەڵایی تیپێكی هەبوو بۆ ئیمام قاسمیش یاری دەكرد.

ئەو یاریزانانەی کە لە ئیمام قاسم دەوریان هەبوو:-
خورشیدی عوسمان چایەچی، سابیر بچکۆل، فازل ئەسوەد، حەمە سێوە، عەزیز تاهیر، خەلیل رەشید، عەزەدین نوری، قادر حاجی محەمەد، حەسەن کەشاف، لە بیرمان نەچێت یاریزانێکی زۆر بەرچاو بوو بە تایبەتی لەگۆڵکەرە بەهێزەکان بوو.
ئەم تیپانە هەر هەموویان، لە گۆرەپانی خاسە یارییان دەکر سەرەرای ئەوەی زەوییەکەی هەمووی بەرد بوو. لەوبەریش دووسێ تیپ دروستکرا لەسەر تۆپ یاریمان دەکرد.
دوای ئەوەی کە تیپی وەرزشی ئیمام قاسم پێشکەوت، تیپی وەرزشی (نوری)دانا قەڵاش ناوەکەی بوو بە (تاج) ئەوانیش سەباح پاڵاس، مەحموود قەڵایی و ئەحمەد پاڵاس و عەزەدین قەرە محەمەدو کەریم ئەفەندیش تیپی هەبوو، عادل عەبدوللا لە قەڵا یاری دەکرد، ئەمانە یاریزانە کۆنەکانی کەرکوك بوون.
من کاتێك لە قوتابخانەی سەرەتایی ئیمام قاسم بووم، شتێکی سەیر رووی دا، ئەوەی بە بیرم بێت لەساڵی (١٩٥٦) تەمسیلی دەکرا، عەلیە ئەفەندی لەم قوتابخانەیە لەگەڵ ئێمە دابووە، تەمسیلمان کردووە، کە لە ئاستی کەرکوك بە یەکەم دەرچووینە، من خۆم بەشداریم لەو تەمسیللییە کردووە.
مامۆستا شەهید (حەسیب ئەمین)، دوای ئەوەی لە قوتابخانەی ناوەندی (الغربیە) دوور خرایەوە، بە مامۆستایی هاتە ئەم قوتابخانەیەو تیپی باڵەی بۆمان دروستکرد کە لە جێگای یاریگای ئێستای قوتابخانەکەدا بوو، بەڵام شتی سەیر سەیرمان هەبوو، تەنها تەڵاشە دارێك هەبوو بە دیواری ئیدارەوە کە بە دەوریدا دەسووراینەوە، ئێمە منداڵ بووین قووتابییەك دەچووە بان ئەو تەڵاشە دارەو یەکێکیش دەچووە ژێر باڵی و ئەوی تریش دەستی دەگرت، ئەوەی لەم سەرەوە تا ئەو سەر بسوورایەتەوە ئەوە حەجی دەکرد، هەموومان چەپڵەمان بۆی لێ دەدا.
دوای ئەوەی قوتابخانەی سەرەتایم تەواوکرد، چووم بۆ قوتابخانەی ناوەندی (الشرقیة) لەوبەر بوو، لە نزیك بازاری (ئەحمەد ئاغا)وە، مامۆستای وەرزشمان ناوی مامۆستا (کەمال عەبدولقادر)بوو، زۆر بایەخی بەمن دا، کەزانی من یاریزانی باڵەم مێنی خستە نێو تیپی باڵەوە، بۆیە من هەڵبژێردرام بۆ هەڵبژاردەی مەعاریف و هەڵبژێردرام بۆ هەڵبژاردەی وەرزشی کەرکوك.
لە هەڵبژاردەی مەعاریف ئێمە رۆڵێکی گەورەمان هەبوو، من لە قوتابخانەی (الشرقیة) باشترین یاریزان بووم، یاریزانەکانی کە لەگەڵ مندابوون لەو قوتابخانەیە:- جاسم محەمەد، فازل ئەسوەد، قاسم دێو، یوسف ئۆشانا، نورەدین محەمەد، سوبحی بۆرن، فاتیح نەقشبەندی.
لەبەرئەوەی بەباشی یاریمان دەکرد بەردەوام پێشبرکێ لەنێوان ئێمەو (الغربیة) یان (الموصلي) بووە بۆ یاری کردن لە بەر ئەوەی مامۆستا کەمال عەبدولقادر هەوڵێکی زۆری بۆ ئێمە دەدا.
هەر لەوێ منیان هەڵبژارد بۆ یانەی وەرزشی (الثورة) کە جاران پێیان دەوت یانەی وەرزشی (الفیصلیة). کە مامۆستا (کەمال عەبدولقادر) لەوێ لە دەستەی دامەزرێنەری بوو، منیان کرد بە دیدەوانی، سابیر عەلی هەمەوەندی، یەکەمین دیدەوانی بوو لە کەرکوکدا، بەرپرسی دیدەوانی بووە، شارەی نێودەوڵەتی هەبوو.
لەنێو یاریگای کۆمپانیای نەوتی عێراق چادرگەیەکی گەورەیان کردەوە، کە هەریەکە لە شارەکانی موسڵ، سلێمانی، هەولێر، کەرکوك بۆ چەند رۆژێك لەو چادرگەیە مانەوە، خواردن و خەوتنمان لەو چادرگەیە بوو، چادرگەیەکی تریان لە خورماتوو لە (قووڵە) کردەوە، لە پشووی بەهاردا ئێمە سێ رۆژ ماینەوە، باران وای لێکردین نەتوانین خولەکە بە سەرکەوتوویی ببەینەسەر.
وورده... ووردە تیپەکانی شاری کەرکوك بەرەو پێشەوە دەرۆیشتن و دیدەوانیش پێش دەکەوت.
پێش رۆیشتنم بۆ (دار المعلمین) خولێکی دیدەوانیان بۆمان کردەوە لە شەقڵاوە لە هاوینی مانگی هەشتی ساڵی (١٩٥٩) لەگەڵ دیدەوانی هەموو شارەکانی عێراق بەشداریمان کرد.
ئەوەی گرنگ بوو لە ساڵی (١٩٥٨) هەڵبژێردراوی کەرکوك کە ئەو کاتە مەعاریفی کەرکوك بوو، ئێمە لە یاری باسکە و باڵەدا ماینەوە بۆ یاری لەسەر گۆرەپانی عێراق کە لە بەعقوبە سازکرا. مەلیك فەیسەڵی دووەم جامی سەرکەوتنەکانی دابەشکرد بەسەر تیپەکاندا، باشترین یاریزان لەوێ لە هەڵبژاردەی کەرکوك (عەبدولرەحمان شەشە)بوو، کە تەنها خۆی (٢٣) خاڵی تۆمارکرد بۆ کەرکوك بەرامبەر مەعاریفی بەغدا. باشترین یاریزانی ئێمە لە باڵەی ئەو کاتەدا (لوتفی موزهر تکریتی)بوو.
لەلایەن هەڵبژاردەی کەرکوکەوە بانگهێشتی هەڵبژاردەی عێراقمان کرد بۆ یاریگای (مخابرە) لە گۆرەپانی سوپادا، کە (سوبحی بیلال) راهێنەرمان بوو، گۆرەپانەکە خۆڵ بوو، لە یاریزانەکان من بووم، عیزەدین محەمەد نوری، نیهاد عیزەت، حوسێنی ئیبراهیم دەلۆ، نیزار قوتبەدین، لەو کاتەدا عەبدولزەهرە شنیانی راهێنەری هەڵبژاردەی عێراق بوو.
لەدوای ساڵی (١٩٥٨) لە یانەی وەرزشی (الثورة)وە چووین بۆ بەغدا منیان برد چووینە یانەی وەرزشی (قورەیش) لە (کازمیە) یاریمان کرد، زۆر بەهێز بوون، بەڵام بۆ ئێمە زۆر بەسوود بوو هەر چەندە دۆراین پێویستە لە بیری نەکەین، لە دوای ساڵی (١٩٥٨- ١٩٥٩)، پارتی دیموکراتی کوردستان یانەیەکی وەرزشییان دروستکرد بە ناوی یانەی وەرزشی (خەبات) کە یەکەم یانەی وەرزشی کوردی بوو کە عەبدولکەریم قاسم مۆڵەتی پێ نەدان بۆ کارکردن.
چەند یارییەکمان کرد لە گۆرەپانی (منتوجات النفط) کە زەوییەکەی چایەر بوو، یاریمان کرد لەگەڵ تیپی وەرزشی (ئاکۆ)، تیپی وەرزشی کرێکاران، کە تێپکی زۆر بەهێزبوون، لە دوایدا چووین بۆ سلێمانی لەگەڵ یانەی وەرزشی سلێمانی یاریمان کرد.
بۆ مێژووەش مامۆستا (سەلمان قادر)و (جەبار قادر) ئەو دووانە سەرپەرشتی تیپەکانیان دەکرد، یاریزانی کورد لەو سەردەمەدا هەمووی کۆبۆوە لە یانەی وەرزشی خەبات.
دوای ئەوەی کە خانەی مامۆستایانمان تەواوکرد من بووم بە مامۆستا لە قوتابخانەی ناوەندی (ئاڵتون کۆپری)، دامەزرام

بە مامۆستای وەرزش، توانیم قووتابیانی هەموو شارەکە، مامۆستایان، فەرمانبەران کۆبکەم کە دەبووە جۆرە یانەیەکی وەرزشی.

دوای ماوەیەك منیان دوور خستەوە بۆ پارێزگای ناسریە لە دوای ماوەیەك مانەوە گواسترامەوە بۆ کەرکوك، دامەزرام لە گوندی (تەرجیل) لەوێ تیپێکی بالەم پێکهێنا، تیپەکەمان زۆر بە هێز بوو یاریزانی باشمان دروستکرد لە گوندەکانی ترکەشکان، قازان بلاخ، تەرجیل، دەرچووین بۆ یاری لە شارۆچکەی (لەیلان)، چەندین جار لە ناوەندی لەیلانمان دەبردەوە.

جارێکیان بەزۆر تیپەکەم بەشداری وەرزشی پێکرد لە خولێکی کۆتایی تۆپی پێی کەرکوك بەسەرپەرشتی ئەحمەد جەلال، یاریمان کرد لەگەڵ قوتابخانەی (ئەیوبیە)، ئێمە زۆر بەهێزبووین، زانیان کە ئێمە لە لادێ وە هاتووین بەهێزین، فێڵیان لێمان کرد بە دوو قووتابی کە دووبە یەك لە ئێمەیان بردەوە، چوونکە لایان شوورەیی بوو کە لادێی لە شارستانی بباتەوە لە شار.

بۆیە لە مامۆستا جەلالم پرسی من باشترین تیپم هێناوە بۆ واتان کرد. لەوەڵامدا ووتی: " من لە شارم چۆن دەبێت ئەم تیپە لە لادێوە سەرکەوێت بە سەرماندا".

قوتابخانەی پیرەمێرد، یەکێك بوو لە قوتابخانە کوردییەکان، ئەم قوتابخانەیە لە باسکەو بالەو گۆرەپانو مەیدان چوار ساڵ یەکەمی شاری کەرکوك بوو، باشترین یاریزانی ئەوکاتە کە لەلای ئێمە بوو لەو قوتابخانەیە لە یاری گۆرەپانو مەیدان (عەبدولوەهاب حەمە عەزیز)بوو، کە لە یەکێك لەکاتەکاندا موتەسەریفی کەرکوك خەڵاتی (٢٠) دنیاری پێدا کەلەوکاتەدا پارەیەکی زۆر بوو، لە دوایدا (عەبدولوەهاب) سەرەتایی تەواو کردو رۆیی بۆ ناوەندی (کاوە) و منیش محازر بووم لەو قوتابخانەیە.

لە دوای ئەوەی ئەو رۆیی لەو قوتابخانەیە (جەلیل نەجمەدین) مان هەبوو، کە ئەو ساڵەش قوتابخانەکە یەکەمی کەرکوك بوو، ئەویش رۆیی ووتیان ئێستا چی دەکەی، ووتم یەکێکی ترم هەیە ئەویش (نایف عەبدولواحید) بوو کە لە رووداوی ساڵی (١٩٩١)دا لە کەرکوك بە سکچوون کۆچی دوای کرد، ئەو ساڵەش یەکەمی شاری کەرکوك بوو لە سەر ئاستی قوتابخانەکان.

لە رێورەسمی رۆیشتنیدا قوتابخانەی (پیرەمێرد)و(کاوە) یەکەمی شاری کەرکوك بوون، هەموو ساڵێك ئازادو عەبدولکەریمو ئەبوکەریم ئەریمان یەکەم دەردەچوون لە گۆرەپانو مەیدان لەسەر ئاستی ناوەندییەکان.

ئێمە لەگەڵ گەلێك گەنجی یاریزانی گەرەکی ئیمام قاسمو دەرەوەی ئیمام قاسم بیرمان لەوە کردەوە کە یانەیەك دروست بکەین لە وانەی کە لە یادمەو هەردەم باسمان دەکر:- عەبدولموجود نوری، ستار کوردی کە لە تەپەی مەلا عەبدوڵڵا بوو، پیرۆت تاڵەبانی، خورشید، ئەنوەر سلێمانی، بیرمان کردەوە یانەیەك دابنێن ناوی یانەیەکی کوردی بێت، دوای ماوەیەکی زۆر لە بیرکردنەوە بۆ هەڵبژاردنی ناوێك، ناومان نا یانەی سۆلاف دەستەی بەرێوەبەری بریتی بوون لە منو سەلاح ساڵح، عەزیز، ستار محەمەد رەسول، فەوزی محەمەد نوری، عەدنان سابیر، پیرۆت تاڵەبانی، مەجید کەریم، عەلی حاجی ئەحمەد، ئیسماعیل تاها، داواکاریمان پێشکەش بە وەزارەتی ناوخۆ کرد بۆ مۆڵەتی یانەکە، بە حوکمی ئەوەی پیرۆت تاڵەبانی لە بەغدا لەبەشی یاسا دەیخوێند، هەروەها پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دەست رۆیشتوو هەبوو، توانیان کە مۆڵەتی فەرمیمان بۆ بە دەست بهێنن لە (٣١)ی تەمووزی ساڵی (١٩٦٩) بە ژمارە (١٧٤٧)ی سەر بە وەزارەتی ناوخۆ. ئێمە جێگامان نەبوو، هەستاین لە تەك پردەکەی خەباتەوە لە تەنیشت گەرماوەکەی (حاجی قادر)ەوە دووکانو ژوورێکمان بە کرێ گرتو بە دوو دۆلابو هەشت کورسیەوە یانەی سۆلاڤمان کردەوە.

یەکەم دۆست بۆ ئێمە کە دۆستایەتی کوردو تورکمانە، ئەویش لەوەدا سەر چاوەی گرت کە سەرۆکی یانەی (الثورة) عەزەدین قۆجە بوو کەزانی یانەی سۆلاڤمان دامەزراند، ئێوارانێك کۆمەڵێك کورسی وشتی تری بۆمان هێنا.



یاری نێوان لاوانی ئیسکان و یانەی وەرزشی سۆلاف ١٦-٢-١٩٧٥



تیپی فیرقەی سێو یانەی وەرزشی سەورە لە ٢٢-٩-١٩٦٨

یانەی سۆلاڤ پەرەی سەند، چووینە خانووەکەی (عەزەدین رەحمە تووڵا)، چووینە جێگاکەی ئێستای، کە ئەو کاتە (مرکز الشرطة) بوو، دوای گواستیانەوە بۆ خانووی (عەزەدین قەرەمحەمەد)، تا ساڵی (١٩٨٠)، لەدوایدا بۆ ئەوەی ناوە کوردییەکەی نەمێنێتو کردومانیانە چەند دەستەیەکەوە.

ئەم یانەیە تەنها وەرزشی نەبوو، بەڵکو شوێنێکی هونەریو کۆمەڵایەتی هەبوو. لەو هونەرمەندانەی کەلە ساڵەکانی حەفتاکان بەشداربوون لە پێشکەوتنی هونەر لەم شارە بریتی بوون لە:- رەمەزان زامدار، سەلاح عەباسی، قادر مەردان، شەوکەت رەشید، عەلی عەزیز، ئەنوەر تاهیر، محەمەد رەزا، سابیر کوردستانی ئەمان پرۆڤەیان لە ژوورەکانی سەرەوەی یانەکە دەکرد.

گەلێك ئاهەنگمان پێشکەش کرد لەوانە ئاهەنگی ئامادەیی کەرکوك، گەرەکی شۆریجە، یانزەی ئادار لەسەر رێگای شوان.

لە ساڵانی حەفتاکان خولێکیان بۆ کردینەوە، خوولی راهێنان بۆ بالە لە سلێمانی، ئێمە وشاری موسڵو هەولێرو سلێمانی لەو خولە بەشداریمان کرد، راهێنەرێکیان هێنا بوو، بەناوی مستەر (شندۆ) بوو کەلە بنەرەتدا یابانی بوو، ئێمە لە کەرکوك منو عەلی محەمەد سەعید، جەلال محەمەد قادر.

لەدوای ئەوە چەند خولێکی تریان بۆ کردینەوە بۆ ناوبژیوانی لەشاری کەرکوك، سەرکەوتنمان بەدەستهێنا، لەدوایدا خوولی دیدەوانیان بۆمان کردەوە لەسەرچنار کە هەموو عێراق بەشداری تێداکرد، بۆ ماوەی (١٠) رۆژ، چووین بۆ شاخی ئەزمرو ئەو دیوی چیای ئەزمر، گەلێك تاقیکردنەوەی جۆراو جۆریان پێمان کرد، کەمن شارەم بەدەستهێنا، کە گەورەترین شارەی دیدەوانی بوو.

دوای ئەوەی بەبەرێوەبەری گواسترامەوە بۆ قوتابخانەی سەلاحەدین، بەهەمان شێوە قوتابییەکانم پەروەردەکرد، مامۆستای وەرزشییان عەبدولخالق ئەمین بوو.

دوای ئەوە بووم بە لێپسراوی دیدەوانی شارۆچکەی (تازە) کە ئۆردووگایەکی هەمیشەیی هەبوو، عێراق هەموویان دەهاتن بۆ ئەو شوێنە، بۆ قوتابیانی کوڕان و کچان خولمان دەکردەوە، سابیر عەلی، مامۆستا هاشم، هورمزی، سەرپەرشتی ئەو خولانەی قوتابخانەکانی کەرکوکیان دەکرد.

یانەی سۆلاڤ لەو کاتەدا باشترین یاریزانو راهێنەری لە خۆگرتبوو، لەو راهێنەرە بەرێزانە کە لە یاد ناکرێت:- کەریم ئەفەندی، نوری کوردی، فاتیح نەقشبەندی، فازڵ عەبدولمجید، یانزە یاریزانی هەڵبژاردەی کەرکوك نۆ یاریزانی لە یانەی سۆلاڤ بوو.

یەکەم یاری یانەی سۆلاڤ کە کردی، لەگەڵ یانەی هەولێر بوو لە (١٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٦٩)بوو، کە هێشتا بە تەواوەتی مۆڵەتەکەمان وەرنەگرتبوو، جێگاورێگامان نەبووکە تیپەکانمان جێگای خۆی گرتبوو.

ئەوەمان لەبیرنەچێت منوتەلەفیزۆنی کەرکوك ئاشنایەتیەکی زۆرمان هەیە، عادل عەبدوڵلا نعێمی، ئاگاداری کردمەوەکە برۆم بۆ تەلەفیزۆن، پرۆڤەیان پێکردم، بەدڵیان بوو کە پێش من برادەرێك هاتبوو، بەلام بەوە دەچوو بە دڵیان نەبووبێت، بۆ ماوەی (٢٢) ساڵ بەرنامەی وەرزشم پێشکەش کرد.

ئەوەی کە بیرم ناچێت کە گواستنەوەی یارییە وەرزشیو چالاکییەکان بوو لە شارەکانی کوردستانو موسڵو دهۆك، ستافێکی زۆر باشم لە گەڵدا بوو وەکو:- ئەحمەد عیزەدین، عەواد کەنۆ.

بۆ یەکەم جار بوو کە یارییەکانم بەزمانی کوردی دەگواستەوە، رەخنەورەخنەکاری زۆرم لەسەرکرا دەربارەی ئەوناو کوردییانەی کە لە وەرزشدا بە کارم دەهێنا وەکو زۆرانبازیو مستەکۆڵە.



دیدەوانی کەرکوک لە کۆرەك ١٩٥٠





فەخرەدین ئیسماعیل و ستار عەبدوللا لە ٣٠-٧-١٩٦٨



دیدەوانی کەرکوک لە شەقلاوە لە سالی ١٩٥٩



قاسم دێو- داوود ئەدانیس- شێخ ستار- هادی ١٩٦٦



سەرۆکی تیپی ئیتحاد و ئەهرێن لە سالی ١٩٦٧



فازڵ ئەسوەد و شێخ ستار ١٩٦٨





خوالێخۆش بوو قادر شەریکە لە ١٩٦٨



یاری یانەی خەبات لە سەندیکای کرێکارانی کەرکوک لە ساڵی ١٩٥٩



یانەی وەرزشی باسکەی خەباتی کەرکوك ١٩٥٩



گۆڕەپانی شەریکە هەلبژاردەی کەرکوك و فیرقەی سێ لە ٢٢-٩-١٩٦٨



تیپی وەرزشی نوور و بەگتاش لە گۆڕەپانی ئیمام قاسم لە ٤-٦-١٩٦٨



تیپی وەرزشی کەرکوك و بلغاریا لە سالی ١٩٧٠



یاری گوریس ڕاکێشان لە سالی ١٩٧٠



یاری کۆتایی نێوان موسڵ و کەرکوك لە ٦-٣-١٩٧٢

*** یانەی سۆلاف لە یادەوەرییەکانی شێخ پیرۆت تاڵەبانیدا:**



شێخ پیرۆت تاڵەبانی

شێخ پیرۆت تاڵەبانی دوور لە سیاسەتو قوتابخانەو خوێندنو ئیشو کاری بەڕێوەبەرایەتی ناحییەو تەنگو چەڵەمەی ڕۆژانە، بەشێکی زۆری ژیانی ڕۆژانەی تەرخانکرد بوو بۆ وەرزشو دونیای وەرزش، لە سەردەمی قۆناغی ناوەندیو دواتر ئامادەیی بیرۆکەی دامەزراندنی تیپی وەرزشیو یانەی وەرزشی خولیای شێخ پیرۆت بوون، کاتێك لە ئامادەی موسەڵلا خوێندکار بوو، خۆیو محێدین مەحموود جەباری هاوڕێی، دوو خوێندکاری کورد بوون لە تیپی تۆپی پێ قوتابخانەی موسەڵلا یاریان دەکرد، ئەو ڕۆژگارە کاپتنی تیپی ئامادەیی موسەڵلا (قاسم دێو) بوو، شێخ پیرۆت لە درێژەی گێرانەوەی بیرەوەرییەکانی باسی ئەوە دەکات، کە قاسم دێو، زۆر هاندەریان بوو بۆ دامەزراندنی یانەیەکی وەرزشی، هاندانی قاسم دێوو تیپە میللییەکانی گەڕەکەکانی بەرتەکییەو ئیمام قاسمو زێوییەو ئاخوڕ حوسێنو بڵاخو شۆڕیجە، شێخ پیرۆتی خستوەتە سەر بیرۆکەی دامەزراندنی یانەیەکی وەرزشیو لەو چوارچێوەداو لە دەورووبەری ساڵی (١٩٦٥)، کە شێخ پیرۆت لە قۆناغی کۆتایی خوێندنی کۆلێژی یاسابوو، بە ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاو دانیشتن لەگەڵ چەندین کەسایەتیو وەرزشوانو دۆستانی بواری وەرزش، تیپی تۆپی پێی چوارباخیان دامەزراند، ئەوانەی بەشداریان دەکرد لە موناقشەکانی دامەزراندنی تیپەکە بریتی بوون لە: لە قۆڵی شۆڕیجەوە (مامۆستا محێدین، مامۆستا ئەحمەد، کاك کەریم ڕەحیم، فاتیح خەیات)، لە قۆڵی ئیمام قاسم (فازڵ ئەسوەد، نەجیب ساڵح، شێخ پیرۆت، خورشید حاجی عەبدوڵڵا، حەمە زەکی، عەبدولڕەحمان دنیی، ستار کوردی)، ستار کوردی دواتر بووە یەکێك لە یاریزانە دیارەکانی کەرکوكو لەبەر لێهاتووی گەیشتە تیپی هەڵبژاردەی عێراق، یەکێك بوو لە یاریزانە هەرە بە تواناکی تیپی هەڵبژاردەی عێراق، جگە لە ستار کوردی لەسەردەمی جیاجیادا یاریزانانی لێهاتووی کەرکوك گەیشتوونەتە تیپی هەڵبژاردەی عێراق، نموونەی کەریم ئەفەنیو عادل عەبدوڵڵا.

دانیشتنەکان لە چایخانەکەی نوری فەقێ بوو، کە لەهاندەرانی وەرزش بوو، تەنانەت بەشێك لە چایخانەکەی تەرخانکرد بوو بۆ یاری ئاسنو لەشجوانی، جگە لە چایخانەکەی نوری فەقێ، چایخانەی خورشید عوسمان ڕابی لە ئیمام قاسم شوێنی دانیشتنو کۆبوونەوەو قسەو باسی دامەزراندنی تیپو یانەی وەرزشی بوو.

ئەنوەر سلێمان، فازڵ ئەسوەد، ستار محەمەد ڕەسوڵ، عەزیز تایر، عەلی ئەفەنی بەلەدیە، عەدنان سابیر، سابە بچووك، ئیسماعیل تەها، نەجیب ساڵح، شێخ ستار سەید عەبدوڵڵا، ئەنیس شاکر، مامۆستا فاتیح نەقشەبەندی، مەجید کەریم، شێخ پیرۆت، ئەمانە ئەو نوخبەیە بوون، کە بەردەوام باسی دامەزراندنی یانەیەکی وەرزشی کوردیان دەکرد، شێخ پیرۆت لە درێژەی باسەکانیو هەڵدانەوەی لاپەڕەی بیرەوەرییەکانی ئەو ڕۆژگارەی، بەتامو چێژو پرجۆشو خرۆشەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: دامەزراندنی یانەیەکی کوردی نەك لە بیرکردنەوەماندا ڕۆژ بە ڕۆژ گەورە دەبوو، بەڵکو بووە خەمێکی قووڵو لە بچووکترین هەڵو دەرفەت دەگەڕاین تاوەکو یانەیەکی کوردی دامەزرێنینو تەنانەت ناوێکی کوردیش بۆ یانەکە قسەو باسی زۆری لەسەر کراو هەموو دانیشتنێك کۆمەڵێك ناو پێشنیار دەکرا.

شێخ پیرۆت دەڵێ: دوای تەواو کردنی کۆلێژی یاسا، لە ساڵی (١٩٦٦)و ئەندابوونم لە سەندیکای پارێزەرانو دواخستنمان لە کۆلێژی سەربازی (ئیحتیات)، خولێك بۆ ئامادەکردنی بەڕێوەبەرەکانی ناحییەکان لە بەغدا کرایەوە، لەو خولە بە شداریم کرد، یەکێك لەوانەی وانەی دەوتەوە، بەڕێوەبەری ڕێکخراوەکانی وەزارەتی ناوخۆ بوو، لەماوەی خولەکەدا ئاشنایەتیو نزیکبوونە لەنێوانماندا درووستبووو بووینە هاوڕێی یەکتری، ڕۆژێك پێموت حەز دەکەین یانەیەك دامەزرێنین، ئەویش مەردانە هاتە پێشەوەو پێیو وتم ئێوە دەستکەن بە دانانی دەستەی یانەکەو داوایەك بۆ وەزارەتی ناوخۆ بەرزبکەنەوە منیش لە بەغدا تەواوی دەکەم، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دامەزراندنی یانەیەکی وەرزشی لە کەرکوك نزیکدەبووەوەو دوای ئەوەی شێخ پیرۆت لە ساڵی (١٩٦٨)، دەبێتە بەڕێوەبەری ناحییەی سەنگاو، بۆ ڕاپەراندنی ئیشو کارەکانی ناحییەکەی، ناو بە ناو هاتووچۆی وەزارەتی ناوخۆ دەکات، لەسەردانەکانیدا لەناو وەزارەتی ناوخۆ دۆستو برادەر پەیدا دەکات، کە بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی یانەکەیان ڕۆڵی گەورەی هەبوو.

لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٦٨)، دوای چەند کۆبوونەوەیەك بڕیار دەدەن یانەیەکی وەرزشی کوردی دامەزرێنن، بەشداربووانی کۆبوونەوەکان ئەمانە بوون (شێخ پیرۆت، ستار محەمەد ڕەسوڵ، عەزیز تایر، نەجیب ساڵح، مامۆستا

فاتیح نەقشەبەندی، مامۆستا سەلاح سالح، عەلی ئەفەندی بەلەدیە، ئیسماعیل تەها، مەجید کەریم، خورشید عوسمان، شێخ ستار سەید عەبدوللا، ئەنوەر سلێمان، عەدنان سابیر، خێروللا پیرداود، ئەنوەر عارف، ستار حەسەن کوردی) ئەمانە بڕیاریاندا دەستەی دامەزرێنەر دابنێن‌و بە ئیمزای دەستەی دامەزرێنەر نووسراوێك کرا بۆ وەزارەتی ناوخۆ بۆ داوا کردنی مۆڵەت، ئەوانەی ئیمزایان لە سەر نووسراوەکە کرد ئەمانە بوون (شێخ پیرۆت، ستار محەمەد رەسوڵ، شێخ ستار سەید عەبدوللا، مەجید کەریم، عەلی ئەفەندی، ئیسماعیل تەها، مامۆستا فاتیح، سەلاح سالم، خورشید عوسمان، عەزیز تایر، نەجیب سالح، خەلیل عەبدوللا، ئەو کاتە عەبدولجەبار سەعدی موتەسەریفی کەرکوك بوو، موتەسەریفی کەرکوکیش لای خۆیەوەو ئەوەی پەیوەندی بەوەوە بوو بۆیانی ئەنجامدا، شێخ پیرۆت دەڵێ:

چەند ناوێکیان بۆ یانەکە پێشنیار کرد وەك (بابە گورگور، خاڵخاڵان، نەوت، سۆلاف) لەناو ئەو ناوانەدا ناوی سۆلاف لە هەمووی گونجاوتر بوو، شێخ پیرۆت نووسراوەکە دەبات بۆ وەزارەتی ناوخۆو رەزامەندی وەزارەت بۆ دامەزراندنی یانەی سۆلاف دێنێتەوەو پێش پێکهێنانی دەستەی ئیداری یانەکە، یەکێك لە دوکانەکانی مام قادر حەمامچی لە سەر خاسە دەگرن، دواتر بە ئامادەبوونی دادوەر ئەحمەد زرنگ کە ئەو کاتە حاکمی بەدائەی کەرکوك بوو لە بارەگای یانەکە دەستەی ئیداری هەڵدەبژێرن، کە بەم شێوەیە بوو:

١. شێخ پیرۆت شێخ فازڵ تاڵەبانی – سەرۆك.
٢. شێخ ستار سەید عەبدوللا – جێگری سەرۆك.
٣. سەلاح سالح – سکرتێر.
٤. خەلیل عەبدولکەریم – ئەمین سەندوق.
٥. خورشید عوسمان رابی – ئەندام.
٦. مەجید کەریم – ئەندم.
٧. مامۆستا فاتیح نەقشەبەندی – ئەندام.
٨. عەبدولخالق عەبدولرەحمان – ئەندام.
٩. ستار محەمەد رەسوڵ – ئەندام.

دوای هەوڵ‌و کۆششێکی زۆری شێخ پیرۆت‌و هاورێکانی کورد بووە خاوەن یانەیەکی وەرزشی‌و رۆژ لە دوای رۆژ یانەکە گەشەی کردو بووە یانەیەکی ناوداری کەرکوك‌و مێژوویەکی پڕ لە سەروەری بۆ کوردو کەرکوك تۆمار کرد.

هەر لە یەکەم رۆژی راگەیاندنی دامەزراندنی یانەی سۆلاف، لە هەموو لایەکەوە خەڵك‌و ناوەندو یانەکان، سەردانی یانەی سۆلاف دەستی پێکرد کردو خەڵکێکی زۆر داوایان پێشکەشکرد بۆ ئەندام بوون لە یانەکە، یانەی (سەوره) بە سەرۆکایەتی (عەزەدین قۆجەواو ئەندامێتی قادر قۆزو قاسم دێوو محەمەد بەلا) بۆ پیرۆزبایی سەردانی یانەی سۆلافیان کردو دیاری دەستیان بریتی بوو لە مێزێکی ئاسن‌و چەند کورسیەك، بۆ ئەو رۆژگارە دیارییەکی گەورەو زۆر بوو، شێخ پیرۆت دەڵێ: پارەمان کەم بوو، ئەوەی هەمان بوو تەنها (١٢) دینار بوو، ئەو (١٢) دینارەش لە نێو خۆماندا کۆمانکردبووەوە، پێشترو لە کاتی هاتووچۆکردنی بەغداد بۆ وەرگرتنی مۆڵەت، خۆم ئەو خەرجییانمان دەدا.

شێخ پیرۆت دەڵێ:

لە ماوەیەکی کەمدا ژمارەی ئەندامانی یانەی سۆلاف گەیشتە (٧٠٠) ئەندام، یانەکە بەئابوونەی ئەندامان بەڕێوەدەچوو، ئابوونەی ئەندامان مانگانە لە (١٠٠) فلس بۆ سەرەوە بوو.

یانەی سۆلاف، لە سەرەتاوە بە تیپی تۆپی پێ دەستیپێکرد، لەو چوارچێوەیەدا تیپی پلە یەك‌و پلە دووو پلە سێمان دامەزراند، تیپی پلە یەك بریتی بوون لە (نوری حەسەن کوردی راهێنەری تیپ بوو، یاریزانەکان، جەبار کوردی، ستار کوردی، غەنی کوردی، حەسەن محەمەد ئەمین، ئەنوەر عارف، بەکر شوکر، عەدنان عەبدولقادر، تاریق عەبدولقادر)، تاریق کاپتن بوو، هەر بە کاپتن بانگدەکرا، تاریق یەکێك بوو لە یاریزانە باشەکان‌و خاوەن هەڵوێستی جوامێرانە بوو، هەروەها مالیك میرزا، سەرگۆن، عەبدولوەهاب، یاسین هیلال، فەخرەدین سەراج گوڵچی بوو) یەکێك لە کەسایەتی‌و یاریزانەکان عومەر خەتاب بوو، کە تائێستا بواری وەرزشی جێنەهێشتووەو ناوێکی دیاری دونیای وەرزشی کەرکوك‌و کوردستانە. لە پاڵ تیپەکانی یانەی سۆلافدا، تیپە میللییەکان هەربوونیان لە گەڕەکەکان هەبوو، لە ئیمام قاسم، شۆریجە، رەحیماوا، دووبز، یەکێك لە تیپە میللییە ناودارەکانی کەرکوك، تیپی بەرزان بوو، کە ناوەندێك بوو بۆ پێگەیاندنی یاریزانان، تیپی ئاسۆش لە رەحیماوا یەکێك بوو لە تیپە گرنگەکانی رەحیماواو کەرکوك.

شێخ پیرۆت لە درێژەی بیرەوەرییەکانیدا سەبارەت بە یانەی سۆلاف باسی چەندین یاری دەکات لە گەڵ تیپ‌و یانەکانی عێراق‌و دەڵێ: یاریکردن لە گەڵ هەڵبژاردەی حەبانیە کە سێ یاریزانی هەڵبژاردەی عێراقی تێدا بوو شەدراك یوسف، گلبرت ئەویقەم، گۆرگیس ئیسماعیل، لەم یارییەدا یانەی سۆلاف دوو بەرانبەر بەسفر، یانەی سۆلاف براوە بوو، یانەی ئاشوری بەغدا، یەکێك لە یانە گرنگەکانی بەغدا بوو، بەرپرسی ئەم یانەیە (ئارام ئەکرەم) بوو، ئەنجامی ئەم یارییەش دوو بە یەك بە قازانجی یانەی سۆلاف یارییەکە کۆتایی هات، جگە لەو یانانە سۆلاف لەگەڵ تەندروستی موسڵ‌و یانەی هەولێرو سلێمانی، براوە بوو.

لە یارییەکدا بەرامبەر تیپی فیرقەی سێی عێراق کە ئەنجامەکەی یەکسان بوو، یەکێك لە یاریزانە ناودارەکانی عێراق یاری بۆ فیرقەی سێ دەکرد، ئەویش جەبار رەشەك بوو.

دوای بەیاننامەی (١١)ی ئادار، دەستوەردانی سیاسی کەوتە ناو یانەکەوە، هەوڵێکی زۆر درا شێخ پیرۆت لە یانەکە دوور بخرێتەوە، چ بە دژایەتیکردن‌و چ بە پێشنیارکردنی خەڵکی تر بۆ جێگاکەی، لە ئەنجامی ئەو دژایەتیکردن‌و دەستێوەردانانەدا، هەڵبژاردن بۆ دەستەیەکی ئیداری نوێ کرا، جارێکی تر شێخ پیرۆت بەزۆرینەی دەنگ بووەوە بە سەرۆکی یانەی سۆلاف، بەڵام دەستێوەردان‌و دژایەتیکردن کۆتایی نەهات، سەرەڕای ئەو دژایەتییەش، یانەی سۆلاف هەڵوێستی کوردانەی خۆی لەدەستنەداو تا دوارۆژی داخستنی یانەکە لەلایەن رژێمی بەعسەوە شێخ پیرۆت سەرۆکی یانەی سۆلاف بوو، ئەوەی شێخ ستار



ئافرەتە یاریزانەکانی یانەی سۆلاف لە حەفتاکاندا

سەید عەبدوڵڵا لەو کتێبەکەی کە لەسەر یانەی سۆلاف نووسیویەتی باسی ئەوە دەکات، کە ئەحمەد حاجی جەبارو فاتیح حەمەبەگ سەرۆکی یانەی سۆلاف بوون، لە ڕاستیدا ئەو دوو بەڕێزە پاڵێوراوی پارتی بوون بۆ سەرۆکی یانەی سۆلاف دوای بەیاننامەی (١١) ئازار، بەڵام ئەو دوو بەڕێزە بەشداری هەڵبژاردنیان نەکردو هیچ ڕۆژێکیش سەرۆکی یانەی سۆلاف نەبوونە، خوالێخۆشبوو ئەحمەد حاجی جەبار لەهەڵبژاردنەکە کشایەوە، فاتیح حەمە بەگیش ئامادەی هەڵبژاردنەکە نەبوو، بۆیە پێم باشە بۆ مێژوو ئەو هەڵەیەی شێخ ستار سەید عەبدوڵڵا تێکەوتووە ڕاستبکەمەوە.

لە فیستیڤاڵێکی پارێزگای کەرکوکدا، یانەی سۆلاف لە بەشداریکردنی خۆپیشاندانێکدا ڕازی نەبووونەی سەدام بەرز بکاتەوە، ئەم هەڵوێستەی سۆلاف بووە مایەی دەست لێخۆشکردن و بارزانی ڕەحمەتیش بە دیاری (کاسێکی) بۆ ناردن کە تا ئێستا لای شێخ پیرۆت پارێزراوە. دوای ئەو دەستێوەردانانە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ یانەکە بەرەو لاوازی دەڕۆیشت تا ساڵی (١٩٧٨)، بە بڕیارێکی پارێزکاری کەرکوك (محەمەد حەمزە ئەلزوبەیدی) یانەی سۆلاف هەڵوەشێنرایەوە بەشێك لە کەل و پەلی یانەکە گواسترایەوە بۆ یانەی (سەورە). پێش هەڵوەشانەوەی یانەکە چەند بەعسییەك کرابوونە ئەندامی یانەکە.

جگە لە تیپی تۆپی پێی، چەندین تیپی جۆراو جۆر دامەزرا، لەوانە:

١. پاسکیلسواری، یەکێك لە وەرزشوانانی پاسکیل سواری، کە دواتریش بووە ئەندامی دەستەی ئیداری یانەی سۆلاف مامۆستا بەکر سالح شۆڕاوی بوو، مامۆستا بەکر جگە لە وەرزشوانی پیاوێکی دڵسۆزو نیشتمان پەروەرو کورد پەروەر بوو، لە ڕاپەڕینی (١٩٩١)، کوڕێکی شەهید بوو.



تیپی باسکەی ئافرەتانی سۆف

۲. یارییەکانی ئاسنو لەشجوانی.
۳. تێنسو بالەو چەندین تیپی جۆراو جۆر، جگە لەو تیپانە، تیپی بالەی کچانیش هەبوو، لە یاریزانە دیارەکانی یانەی سۆلاف عالیە محەمەد ئەمین بوو، کچێکی ئازاو سەربەستو وەرزشوان بوو.

ئەو کەسایەتییانەی کە بە بەردەوامی هاوکاری مادی یانەی سۆلافیان دەکرد، چەند کەسایەتییەکی دیاری کەرکوک بوون، لەوانە (کاکەی حاجی مەحموود، کوردە قەساب، شێخ فازڵ تاڵەبانی، شەهید غازی تاڵەبانی، کۆگای فاروق).

دکتۆر عومەر دزەیی، یاریزانەکانی بە خۆرایی چارەسەر دەکردو بەردەوام نۆرینگەکەی خستبووە خزمەتی یاریزانانی یانەی سۆلافەوە.

یانەی وەرزشی سۆلاف، ناوو ێستگەیەکی گرنکی وەرزشە لە کەرکوک، دامەزراندنی یانەی وەرزشی سۆلاف، خاڵیو وەرچەرخانی وەرزش بوو لە کەرکوک، سۆلاف بوو بەناوەندێك دەیان وەرزشوانو شارەزای لە بوارەکانی وەرزش پێگەیاند، جگە لە وەرزشو چالاکی وەرزشی سۆلاف بووە ناوێك بۆ هەڵوێستی کوردایەتیو نیشتمانی، سۆلاف بە جۆرێك گەشەی کردو خۆی سەپاند، کەسایەتیو لایەنە سیاسیەکانیش بە شێوازی جۆراو جۆر هەوڵیاندەدا خۆیان لە یانەکە نزیکبکەنەوە. جگە لە مانەش کەسانێکی زۆر بۆ خۆشەویستی یانەی سۆلاف ناوی سۆلافیان لە کچەکانیان نا.



ئازاد کاکل یاریزانی تۆپی سەر مێز



یاری دامە لە چالاکییەکانی یانەی وەرزشی سۆلاف

*** وەرزش لە یاداشتەکانی ( محەمەد فالیح )ی وەرزشواندا :**
**زاهیر شکور**

محەمەد فالیح وەرزشوانی دێرین و کادرو ئەندامی جارانی پارتی دیموکراتی کوردستان باڵی مەکتەبی سیاسی، لە دایکبووی ساڵی (١٩٤٠)، کەرکوک گەڕەکی موسەڵڵا، بەهۆی بنەماڵەکەیەوەو نزیکی باوکی لە شێخ مەحموودی حەفید، شێخ مەحموود ناوی محەمەدی لێدەنێت، باوکی محەمەد ئیمام تابوری بووە لە سوپای عێراق، لە شەستەکان بە پلەی عەقید خانەنشین کراوە.

لە ناوەڕاستی سەدەکانی سەدەی ڕابردوو، محەمەد فالیح ژیانی قوتابخانەو خوێندنی لە قوتابخانەی شەرقییەی تێکەڵاو، بەرامبەر مزگەوتی حاجی عابید لە موسەڵڵا دەستپێدەکات، گەڕەکی موسەڵڵا یەکێکە لە گەڕەکە دێرینەکانی کەرکوک، دانیشتووانی گەڕەکی موسەڵڵا کورد و تورکمان بوون، لەدایکبوون و گەورەبوونی محەمەد لە گەڕەکێکی تێکەڵاوی وەك موسەڵڵا، لەڕووی سایکۆلۆژییەوە کاریگەری بەسەر محەمەدا جێهێشتووە، بەتایبەتی میانڕەوی و لێبوردەیی و پێکەوە ژیانی ئاشتییانەی نێوان کورد و تورکمان، قوتابییەکان پێکهاتبوون لە کوردو تورکمان، دواتر چووەتە قوتابخانەی قەڵا، قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی قەڵا و شۆڕیجە و هاشمییە تەواو کردووە.

ئەو عەیامە کەرکوک بچووك بوو، گەڕەکی پریادی بەدەم گەڕەکی موسەڵڵاوە بوو، لە چلەکان زۆربەی دانیشتووانی گەڕەکی پریادی جولەکە بوو، ئۆتۆمبیل کەم بوو، خەڵکی دەوڵەمەند بە عەرەبانە هاتووچۆیان دەکرد، فەتاح سەید خەلیل سەرۆکی عەشیرەتی کاکەیی بە عەرەبانە ئەهات بۆ موسەڵڵا، لە قوتابخانەی شۆڕیجە یەکێك لە مامۆستاکان جولەکە بوو ناوی شامیل بوو، مامۆستای وەرزش و زمانی عەرەبی بوو، محەمەد ئەفەندی شێخانی بەڕێوەبەر بوو، قوتابخانەکە لە خانووەکەی حاجی غەفور گلی باپیرەی چۆپی فەتاح بوو، دوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی چووەتە ئامادەیی پیشەسازی کەرکوك لە دوا قۆناغی خوێندنی سەرەتاییەوە، خولیای وەرزش بووە، سەرەتا بە گۆڕەپان و بازدان دەستی پێکرد، دواتر لە بواری تۆپی پێ چووە یانەی وەرزشی فەیسەل. لە ساڵی (١٩٥٥)، یانەکە بەناوی مەلیك فەیسەڵەوە ناونرابوو، یانەی فەیسەل لە گەڕەکی ساری کەهیە لە خانوویەکدا بوو، دواتر لە سەردەمی جمهورییەتدا ناوی گۆڕا بۆ یانەی سەورە، لەو سەردەمەدا یاریزانەکانی کەرکوك بریتی بوون لە عادل عەبدوڵڵا، کەریم ئەفەندی، کەموش، خەتاب یاسین، محەمەد فاتیح، سەرکیس سەگا، گەگۆ، قاسم دێو. ساڵی (١٩٦٦)، لە بەغدا، تیپی کارەبای (ناوەڕاست) مەبەست ناوەڕاستی عێراق دامەزرا لەگەڵ عادل جەرجیس لەو تیپە بووە، یارییان لەگەڵ یانەی میناء بەسرەو یانەی کارەبای جنوب، کارەبای شیمال لە دوویز، یارییان کرد.

محەمەد لە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ: "لە ڕاکردنی ماراسۆن دووجار لە بەیروت و دووجار لە سلێمانی بەشداریم کردووە، لە هەموو ئەو بەشدارییانەدا خەڵات کراوم، لە کۆمپانیای نەوت لە جوملازیوم بەشداریم کردووە، ڕاهێنەرەکەمان لە کۆمپانیای نەوت ئەڵمانی بوو، ناوی (هێرکریمەر)بوو، لە فیستیڤاڵی ساڵانەی پەروەردە لە ساڵانی (١٩٥٩)و (١٩٦٠)و (١٩٦١)، بەشداریم کردووە لە بواری (القفز العالي)و ڕاکردنی (١٠٠م)و (٢٠٠م)، لە پێنج یاریدا یەکەم دەردەچووم، سێ ساڵ بەشداریم لە دیدەوانی(کەشافە) کردووە".

محەمەد فالیح لە درێژەی بیرەوەرییەکانیدا باس لە قۆناغی سەرەتایی دەکات و دەڵێت: "مانگانەم شەش پەنجایی (٣٠٠) فلس بوو، هاتووچۆکردن بە عەرەبانە بوو، لە پەنجاکان گەڕەکەکانی کەرکوك بریتی بوون لە پریادی، ئیمام قاسم، شۆڕیجە، موسەڵڵا، زێوبە، بولاغ، چواریاخ، بەرتەکییە، قەڵا، سەید سەروەر، ئاخوور حوسێن، ساری کەهیە، تەپەی مەلا عەبدوڵڵا، شاترلو، عەرەفە، بەگلەر، ئەڵماس، قۆرییە، بازارەکانی بریتی بوون لە خان خورما، قۆرییە، ئیمام ئەحمەد، بازاری کاکەییەکان، جووت قاوە، زەرەنگەرەکان، لە پەنجاکان ئەم چێشتخانانە هەبوو، کەباب دەروێش، کەباب عوسمان، کەباب ڕەشید، سینەما خەیام لەسەر خاسە لە دامێنی قەڵا لەلایەن حاجی خورشید حەلواچییەوە دروستکرا، چەندین حەمام هەبوون لەوانە: شۆڕحەمام، حەمام عەلی بەگ، حەمام قۆرییە، حەمام سەرای، حەمام دەدە حەمدی، حەمام بولاغ، حەمام تۆقات، جەودەت، حەمام حاجی باقی، حەمامی حاجی حوسێن.

لە پەنجاکاندا ئەم مەلایانە هەبوون (مەلا مەجید قوتب، مەلا ڕەزای واعیز، مەلا ئەحمەد مەلا حەکیم، مەلا عەلی فەتحوڵا، مامۆستا مەلا سەعدوڵڵا، مەلا خورشید سیامەنسوری، مەلا ئەحمەد حەمدی نەقشەبەندی، مەلا سەید محەمەدی پریادی، مەلا سەید قادر دزەیی، مەلا محەمەد ئەحمەد سیامەنسوری، مەلا ئەحمەد فەرقان، مەلاکانی کەرکوك لەو ڕۆژگارەدا هەمووی کورد بوون، تەنها مەلایەکی عەرەب نەبوو لە کەرکوکدا، تەنانەت مەلا مەجید قوتب کە لە ماڵەوە بە تورکمانی قسەیان دەکرد کورد بوو، لە قەڵا سێ مزگەوت و دانیال پێغەمبەر هەبوو، لە قۆرییەو تەپە پێنج مزگەوت هەبوو، پێکهاتەکانی کەرکوك، لە چلەکان و پەنجاکان بریتی بوون لە کوردو تورکمان و مەسیحی و جولەکە، لە خوارووی کەرکوکیش چەند ماڵێکی عەرەبی گامێشەوان هەبوو، لەناو کەرکوکیش بەهۆی کۆمپانیای نەوتەوە چەند ماڵە عەرەبێك لە موسڵەوە هاتبوونە کەرکوك، لە نزیك (بەهو بەلەدیەی ئێستا) چەند بنەماڵەیەکی حەدیدی هەبوو.

جادەی کەرکوك - بەغدا قیرتاو نەکرابوو، ڕێگای کەرکوك - سلێمانی زۆر خراپ بوو، لۆرییەکان شاگردیان هەبوو (سەکن)، بەردی گەورەیان لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرت، چونکە لۆرییەکان لە قەدپاڵەکان سەرنەدەکەوتن، بەردەکانیان دەخستە پشت تایەکان، ئۆتۆمبیلی نەفەر هەڵگر، پاسی دار بوو، لە قەدپاڵەکان نەفەرەکان دادەبەزین و پاڵیان بە پاسەکەوە دەنا.

محەمەد فالیح باسی ڕۆژگاری سەرەتای پەنجاکانی کەرکوك دەکات و دەڵێت: "ساڵی (١٩٥١) ماڵمان لە گەڕەکی موسەڵڵاوە باریکرد بۆ گەڕەکی شۆڕیجە، ماڵەکەمان بە تەنیشت مزگەوتی مەلا سەعدوڵڵاوە بوو، ساڵی (١٩٥١) ئۆتۆمبیل زۆر کەمبوو، خەڵك زیاتر بە عەرەبانە هاتووچۆی دەکرد، بە کەروبار هەموو جۆرەکانی میوە (هەنجیر، ترێ، قۆخ، هەڵوژە، تەماتە و.. تاد) لە ناوچەی قەرەحەسەنەوە بۆ ناوشار دەهات، ناوچەی قەرەحەسەن داهاتی بەروبومی کشتوکاڵی تەنها لە وەرزی هاویندا لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی رابردوو زیاتر لە یەك ملیۆن دیناری ئەو عەیامە بوو، گوندەکانی قەرە وەیس، خاڵۆ بازیانی، شێخ جیری بە میوە بەناوبانگ بوون، بۆیە زۆرترین میوە لە قەرە حەسەنەوە دەهات بۆ خانەکانی کەرکوك، ئەو خانانەی کە بەرووبوومی قەرەحەسەنیان بۆ دەهات بریتی بوون لە (خان خورما، سەید جەلیل، عەزیز چەلەبی، عومەر حاجی ئەحمەد) ئەمانە جوملەچییەکانی کەرکوك بوون، ئەو عەیامە لە زۆربەی گەڕەکەکان کارەبا نەبوو، ماڵان سەلاجەیان نەبوو، بۆیە خەڵکی ڕۆژانە شتیان دەکڕی و هەر لەو ڕۆژەدا دەیانخوارد، لەو ڕۆژگارەدا، گۆشت لەسەر سەبەتە دەفرۆشرا، قەسابەکان بە گەڕەکەکاندا و بە گوندەکانی دەورووبەری کەرکوکدا گۆشتیان دەبردو دەیانفرۆشت، ئەو عەیامەی ئێمە لە شۆڕیجە بووین، پشتی شۆڕیجە بەرەو باکوور هەمووی کانی بەردی سپی بوو، لەو بەردانە گەچ دروست دەکراو بە شەڵتە دەبرا بۆ ناوشار بۆ دروستکردنی خانووبەرە، خانوەکانی کەرکوك بە گڵ یان بە بەردو گەچ دروستدەکرا.

لە ساڵی (١٩٥١)، یەك قوتابخانە هەبوو، لە موسەڵڵاش قوتابخانەیەکی تێکەڵاو هەبوو، جولەکەکانیش لە گەڕەکی پریادی قوتابخانەی تایبەت بە خۆیان هەبوو".

هەر لەبارەی دۆخی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییەکانیانی خەڵکی کەرکوکەوە فالیح بەم شێوەیە باسی کەسایەتییەکانی شۆڕیجە دەکات و دەڵێ: "ئەو عەیامە کەسایەتییەکانی بریتی بوون لە (مەلا ئەحمەدی نەقشبەندی ئیمام تابور، مەلا سەید محەمەد پریادی، مەلا محەمەد ئەحمەد سیامەنسوری، حاجی جەمیل، مامۆستاکان (محەمەد ئەفەندی، بەڕێوەبەر بوو، عەونی ئەفەندی)، حەساری حاجی جەمیل باخێکی گەورە بوو، سەید نورەددین و سەید عەزەدین دەوڵەمەندی شۆڕیجە بوون، ئەو عەیامە کەس ئۆتۆمبیلی نەبوو، سەرەتای پەنجاکان عەبدولکەریم قاسم ئەفسەر بوو لە کەرکوك، باوکیشم ئیمام تابوری سوپا بوو، عەبدولکەریم لەگەڵ باوکمدا برادەربوون، تازە ئۆتۆمبیلی جۆری (کۆمەر) هاتبوو بۆ سوپا، ڕۆژانە یەکێك لەو ئۆتۆمبیلانە دەهات بۆ بردنی ئەفسەرەکان، باوکیشم یەکێك بوو لەو ئەفسەرانەی کە ئۆتۆمبێلی کۆمەر دەهات و دەیبرد بۆ دەوام، پێش هێنانی ئەو سەیارانە، ئەفسەرەکان بە سواری ئەسپ و ماین دەچوون بۆ دەوام.

جگە لە عەبدولکەریم قاسم ئەم ئەفسەرانەش برادەری باوکم بوون (سالح زەکی تۆفیق، عەقید شێخ سالح بەرزنجی، مستەفا راغیب پاشا).

ڕۆژێك باوکم ئەم حیکایەتەی بۆمان گێڕایەوە (بەیانییەك زوو تاریك و ڕوون بوو، لەنێوان شۆڕیجەو موسەڵڵا بەو بەیانی زووە سەعید قەزازم بینی کە موتەسەریفی کەرکوك بوو، لەو سەردەمەدا بەرزانییەکان حجز کرابوون لە مەکتەبی جولەکەکان، سەعید قەزاز حەلانە خورمای لە ئۆتۆمبیلێکەوە هەڵگرت وتی: وەرە مامۆستا با خورما بەرین بۆ ئەم بەرزانییە لێقەوماوانە، باوکم وتی: چووم لەگەڵ سەعید قەزاز خورمامان برد بۆ بەرزانییەکان.

لە ساڵانی (١٩٥٣ - ١٩٥٤)، ماڵمان لە گەڕەکی شۆڕیجەوە باری کرد بۆ گەڕەکی ساری کەهیە نزیك قۆریە لەوێ چوومە قوتابخانەی هاشمییە، ئەوی تریان فەیسەڵییە، قوتابخانەکە لە خوار (یانەی کرێکاران)وە بوو لە گاورباغی.

قوتابخانەی شەرقییەش لە موسەڵڵاش قوتابخانەیەکی تێکەڵاو بوو، ئەم قوتابخانەیە بەرامبەر مزگەوتی مەلا عابید بوو، مەلا عابید مەلایەکی ناسراوو بەناوبانگی کەرکوك بوو، لە بنەڕەتدا جولەکە بوو، دواتر بووە موسوڵمان و خوێندنی حوجرەی تەواو کردبوو، لە حەفتاکان نزیك مزگەوتەکەی مەلا عابید، سەروپێخانەیەك هەبوو، ئەوەندە بەتام و بە لەزەت بوو، بەیانیان زوو پێش سەعات (٨)ی بەیانی خواردنی تەواو دەبوو.

ئەو عەیامە شارەوانی بە کەرو شەڵتە ناو شاری پاك دەکردەوە، لە گەڕەکەکانیش کرێکار هەبوو، جۆگەو کۆڵانەکانی پاك دەکردەوە، یارییە میللییەکانی ئەو عەیامە بریتی بوون لە یاری (هەلوکێن، مزراحێن، هەڵماتێن) و کچەکانیش یاری قاچێن و خەنەخەنەیان دەکرد.

ئەو عەیامە من لە قوتابخانە بووم سیستمی (تەغزییەی مەدرەسی) هەبوو بریتی بوو لە پێدانی شیرو نۆکی کوڵاوو سەموونی گەرم و ڕۆنی ماسی).

مامۆستاکانمان لە ساری کەهیە بریتی بوون لە ئامیق ئەفەندی بەڕێوەبەر بوو، مامۆستاکان ئیبراهیم ترکەڵانی، ئیستیفان مامۆستای وەرزش بوو، مامۆستا پترۆس) و چەند مامۆستایەکی تر.

لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)، لە دواناوەندی پیشەسازی کەرکوك درێژەم بە خوێندندا، دواناوەندی پیشەسازی کەرکوك، یەکێك بوو لەو قوتابخانانەی کە لە زۆربەی شارەکانی عێراق نەبوو، بۆیە خوێندکاران بۆ درێژەپێدانی خوێندن لە شارەکانی دەورووبەری کەرکوکەوە دەهاتن بۆ تەواوکردنی قۆناغی دواناوەندی پیشەسازی لە کەرکوك، لە سلێمانیش پۆلی سێ و چوارو پێنجی پیشەسازی نەبوو، خوێندکارانی ئەو پۆلانە لە سلێمانییەوە ئەهاتن بۆ ئامادەیی پیشەسازی کەرکوك، بۆ خوێندکارەکانی دەرەوەی کەرکوك حکومەت بەشی ناوخۆی کردبۆوە، ناوەندییەکەمان کەوتبووە نێوان گەڕەکی شۆڕیجەو گەڕەکی موسەڵڵاوە، خوێندکارەکانی بریتی بوون لە کوردو تورکمان و مەسیحی، بەشی ناوخۆیی نزیك قوتابخانەکە بوو، جگە لە قوتابیانی سلێمانی کە لە بەشی ناوخۆیی دەخەوتن، خوێندکارانی کفری و پردێ و لەیلانیش لە بەشی ناوخۆیی دەمانەوە، یەکێك لەو خوێندکارانەی لە چلەکانی سەدەی ڕابردوولە کفرییەوە

هاتبوو بۆ کەرکوک بۆ تەواوکردنی خوێندن و دواتریش لە کەرکوک بو بە مامۆستا نووسەر وروناکبیر موستەفا نەریمان بوو، تەواوکردنی خوێندن لەو عەیامەدا کارێکی ئاسان نەبوو.

یەکەم سینەما لە کەرکوک، سینەمای غازی بوو، بە تەنیشت مزگەوتی حاجی عەبدولرەزاقەوە بوو لە شەقامی غازی، سینەما غازی لە چلەکانی سەدەی رابردوو دروستکرابوو، لە ساڵی (١٩٥٧) ئەم سینەمایە رووخێنرا، هۆکاری رووخانەکەشی ئەوە بوو، کە بەهۆی شۆرتی کارەباوە گڕی گرتبوو، دوای سینەما غازی، سینەما حەمراو سینەما قاهیرە دروستکرا، ئەم دوو سینەمایە لە شەقامی بابەگوڕگوڕ بوو، لە ساڵی (١٩٥٥)، سینەما خەیام لە دامێنی قەڵا دروستکرا، ئەم سینەمایە حاجی خورشید کەریم ئیسماعیل دروستیکرد، لە حەفتاکانی سەدەی رابردوو، مام خورشید چوو بۆ حەج، کە گەڕایەوە سینەماکەی رووخاند، سینەما خەیام بە تەنیشتییەوە سینەما خەیامی هاوینە هەبوو، بەرامبەر سینەما خەیام، سەیرانگای جەژنەکان بوو، دواتریش لە شەقامی ئەوقاف سینەما عەلەمێن دروستکرا، فیلمەکانی ئەو سەردەمە لە سینەما حەمراو سینەما قاهیرە فیلمی میسری نمایشدەکرا، لە سینەما خەیامیش فیلمی هندیو فارسی نمایشدەکرا، ریکلامکردنی فیلمەکان بریتی بوو لە تابلۆیەکی گەورە، دوو کەس دەیانگێڕا بەناو بازاڕدا، بلیتی سینەما (٢٠) فلس بوو، زۆر جار بێ ئەوەی بلیت ببڕین بە یەك عانە دەچووینە ژوورەوە، عانەیەك چوار فلس بوو، لە ساڵانی (١٩٥٦-١٩٥٧) ژنە هونەرمەندی میسری فاتن حەمامە، هاتە کەرکوکو لە سینەما ئەتڵەس خەڵکێکی زۆری کەرکوك بەتایبەتی ئەوانەی لە ڕێگەی فلیمەوە (فاتن حەمامە)یان بینی بوو هاتن بۆ دیداری.

پێش دروستکردنی سینەماکان، سینەمای گەڕۆك هەبوو، زیاتر فەرمانگەی تەندروستی بەکاری دەهێنا بۆ هۆشیارکردنەوەی خەڵك، سینەمای گەڕۆك ئینگلیزەکان هێنایان بۆ کەرکوك، ئێستا تەنها سینەمایەکیش لە کەرکوك نەماوە.

کۆمەڵێك مەلا هەبوو مزگەوتیان نەبوو، ئەمانە ئیمام تابوور بوون لەسەر میلاکی سوپای عێراق دامەزرابوون، لەوانە (مامۆستا مەلا ئەحمەد حەمدی نەقشەبەندی، مامۆستا مەلا محەمەد ئەحمەد سیامەنسوری، مامۆستا مەلا محەمەد پریادی، مامۆستا مەلا قادر دزەیی، و چەند مەلایەکی تر، مەلای مزگەوتەکان بریتی بوون لە (مامۆستا مەلا رەزای واعیز لە مزگەوتی پیریادی بوو، مامۆستا مەلا حەکیم لە مزگەوتی خۆیان لە ساری کەهیە بووو، مامۆستا مەلا عەلی فەتحوڵلا لە مزگەوتی بەگلەر بوو، مامۆستا مەلا رەحیم لە مزگەوتی خەلیفە کەریم لە نزیك حەمام عەلی بەگ بوو، مەلا عەزیز شیلەخانی لە مزگەوتی حاجی عەبدولرەزاق بوو، مەلاکان ڕۆژانی هەینی، سەر لە بەیانیەکەی، لە دیوەخانەکەی سەید خانەقا دادەنیشتن بۆ گفتوگۆو موناقەشەی ئاینی، دیوەخانەکەی سەید ئەحمەد خانەقا، شوێنی کۆبوونەوەی زانایانو کەسایەتییەکانی کوردستان بوو، لە هەموو شارەکانی کوردستانەوە، بەردەوام خانەقا میوانی هەبوو، لەسەر دەرگای خانەقا لە بەردێکی مەرمەڕ نووسرابوو، ((ئێرە پایتەختی شارەزوورە))، هەموو مەلاکان کورد بوون بە مەلا مەجیدی قوتبیشەوە.

ناوی چەندین پیشەو پیشەوەر لەو سەردەمەدا هەبوو، کە ڕۆژگارێك بازاڕیان گەرم بوو، چونکە زۆربەی پێداویستییەکانی ماڵو جوتیاران لەلای ئەو پیشەوەرانە دابین دەکرا، لەو پیشانە دروستکردنی (شەربەو گۆزەو کوپەی ئاوو پینەدۆزیو ناڵبەندیو دروستکردنی بێشكو کورتانو هەوجاڕو گاسنو نیلەو رەشکەو گوریسو کڵاشو دەیان پیشەی تر، کە ئێستا بە دەگمەن ئەو پیشانە ماونو بازاڕو رەواجیان نەماوە زۆربەی وەستاکانی ئەم پیشانە لە بازاڕی جووت قاوە بوو".

محەمەد فالیح وەرزشوانێکی دێرینی کەرکوکە، لە زۆربەی چالاکییە وەرزشییەکانی کەرکوك بەشداری کردووەو خەڵاتو پلەی بەدەستهێناوەو لە چالاکییە وەرزشییەکانی دەرەوەی وڵاتیش بەشداری کردووە. محەمەد فالیح ژیانی وەرزشی بەم جۆرە دەستپێکردووە: لە چلەکانی سەدەی رابردوو، ماڵیان لە گەڕەکی موسەڵلا بوو (شەقامی سەلاحەدینی ئێستا) ئیحسان فایەق یەکێك بوو لە وەرزشوانانی ئەو عەیامە، دراوسێی ماڵی محەمەد فالیح بوو، لێرەوەو لەژێر کاریگەری ئیحسان فایەقی کاکەیی ئاشنای دنیای وەرزش دەبێت، ئەو عەیامە کە ئاوی رووباری خاسە لە ئاست گەراجی حەویجەی ئێستا ئەبێت، کە ئەو کاتە شتێك نەبوو بە ناوی گەراجی حەویجە بێت، ئیحسان فایەق مێرد منداڵانی گەڕەکی موسەڵلای دەبرد بۆ قەراغی خاسەو بە قامیش فێری یاری بازدانیانی دەکرد، محەمەد فالیح لەوێوە لە قەراغی خاسەوە دەستی پێکرد تا گەیشتە ئاستی ئەوەی لە (القفز العالی) ١٩٨ سم باز بداتو ببێتە یەکەمی کەرکوك لە (القفز العالی). لە درێژەی قسەکانیدا محەمەد باسی گەشەکردنی وەرزش لە شاری کەرکوك دەکاتو دەڵێ: ساڵی ١٩٥٤ وەرزش لە کەرکوك تەکانێکی بە خۆیەوە بینی، پێش هەموو شتێ کۆمپانیای نەوتو ئینگلیز بە تایبەتی گرنگی زۆریان بە یانەی وەرزشی کۆمپانیای نەوت دەدا، ئەو عەیامە (مستەر تیسۆ) بەڕێوەبەری کۆمپانیای نەوت بوو، مستەر تیسۆ ئەو ساڵانەی بەفری زۆر بباریبایە دەچو بۆ لای کەریم خان لە سیدەکان بۆ یاری خلیسکانییەی بەفر، دوای مستر تیسۆ (قەدری ئەرزەلومی) کرایە سەرۆکی یانەی وەرزشی کۆمپانیای نەوت. ئینگلیز گەورەترین ڕۆڵیان هەبوو لە هێنانی وەرزشو دامەزراندنی یانەی وەرزشی لە عێراقو کەرکوکدا، سەلاح شوکری برای شاکر شوکری بەڕێوەبەری (مەسلحەی نەقل روکاب) بوو سەرپەرشتیاری گۆڕەپانو یاریگای کۆمپانیای نەوت بوو لە عەرەفە، سابیر عەلی سەرپەرشتیاری دیدەوانی کەرکوك بوو، جگە لە ئینگلیزەکان ئەمانە هەموو کورد بوون.

ساڵی ١٩٥٥، لە گەڕەکی (ساری کەهیە) بەرامبەر گۆرستانی سەید عەلاوی خانوویەکیان بە کرێ گرتبوو، لەو خانووەداو لەو ساڵەدا یانەی (فەیسەلی وەرزشی) دامەزرا، دوای (١٤) ی تەموزی ساڵی (١٩٥٨)، ناوی یانەی فەیسەلی گۆڕا بۆ

یانەی سەورە، محەمەد فالیح دەڵێ: "خۆم‌و فاتیح یاریزانی ئەو یانەیە بووین لە یاری گۆرەپان‌و تەنانەت تۆپی پێش، لە پێنج یاری گۆرەپان محەمەد یەکەم دەرچووە"، محەمەد دەڵێ: "ساڵی ١٩٦٤ لە قەزای داقووقەوە بەشداری پێشبڕکێی پاسکیل سواریم کرد، وەرزشوانانی کەرکوک ئەمانەبوون (لە موسارەعە، هێرکریمەر ئەڵمانی بوو ڕاهێنەری کۆمپانیای نەوت بوو، دواتر مەهدی وەحید هات، یاریزانەکان، تەلعەت محەمەد گلی، نەوزاد غەفور، ئیبراهیم مەجید، ڕەبیع عەلی، ئۆروهان ئۆریان، نامیق ڕەفیق، محەمەد فاخیر)، ئیبراهیم مەجید لە ئاستی دەوڵەتە عەرەبییەکان پلەی یەکەمی بەدەستهێنا، تەلعەت محەمەد گلی لە ئاستی عێراقدا یەکەمی بەدەستهێنا، یاری باڵە یاریزانەکانی بریتی بوون لە (شێخ ستار عەبدوڵڵا، لوتفی مەزهەر بەگ، محەمەد فالیح، جەبار تۆما، کەمال عەبدولقادر)، یاری تۆپی پێ، یاریزانەکان (عادل عەبدوڵڵا، کەریم ئەفەندی، محەمەد فالیح)، لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو، یانەی زەمالیك لە میسرەوە هاتن بۆ کەرکوک لەگەڵ هەڵبژاردەی تیپی دووی پیادە یارییان کرد، یاریزانەکانی تیپی پیادەی کەرکوک بریتی بوون لە (عادل عەبدوڵڵا، کەریم ئەفەندی، کەموش، تەحسین نامیق، کازم یاسین) ڕاهێنەری تیپی پیادەی کەرکوک لیوا کەمال موفتی بوو، ئەو کاتە مولازم بوو لە یەکێك لە یارییەکانی تیپی دووی پیادەی سەربازی کەرکوک لە بەغدا، کەرکوک یارییەکەی بردەوەو مەلیك فەیسەل لەو یارییەدا خەڵاتی کەمال موفتی کرد.

لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو ساڵانە چەندین میهرەجانی وەرزشی ئەنجام دەدرا، لەوانە میهرەجانی تیپی پیادەی کەرکوک، میهرەجانی کۆمپانیای نەوت، میهرەجانی پەروەردە، زۆربەی میهرەجانەکان لە یاریگای کۆمپانیای نەوتی کەرکوک ئەنجام دەدرا، لەم دواییەشدا لە یاریگای تیپی دووی کەرکوک دەکرا، لە میهرەجانەکان ئەم یارییانە دەکرا، ڕاکێشانی گوریس، هەڵدانی قورس، ڕاکردن لەناو گونیەدا، پێشبڕکێی ماتۆر سواری‌و پاسکیل سواری‌و ئەسپ سواری، جگە لە یارییەکانی دیکەی گۆرەپان وەك ڕاکردنی (١٠٠م)و (٢٠٠م)و (١٥٠٠م)و یەك بازو سێ بازو یاری ئاسن‌و دەیان یاری تر، کە ساڵانە لە کەرکوک ئەنجام دەدرا".

محەمەد فالیح باسی جوڵانەوەی دیدەوانی دەکات‌و دەڵێ: "سابیر عەلی یەکێکە لە دامەزرێنەرانی دیدەوانی کەرکوک، دیدەوانی هەرچەندە پەیوەندی بە وەرزشەوە هەیە بەڵام زیاتر بەلای دیسپلین‌و بواری سەربازیدا دەڕوات‌و ئینگلیز دیدەوانی هێنایە عێراق.

جگە لەو جۆرانەی وەرزش کە باسمانکرد لە کەرکوك، زۆرخانە (زۆرانبازی) هەبوو، یەکێ لە پاڵەوانەکانی بواری زۆرخانە شوکور پاڵەوان بوو.

## * بیرەوەرییەکانی نوری فەقێ لە کەرکوک:-



لە ساڵی (١٩٢٧)دا لە تەکییەی تاڵەبانی لەدایکبوومە، کە ناوی تەواوم (نوری محەمەد عەبدوڵڵا کوڕی محەمەد کوڕی مەحموود کوڕی ئەحمەدی مەنگوڕی)یە لە تیرەی بڵباسە، هەر لە کۆنەوە مەلازادە بووینە، کە هەریەکە لە (مەلا عەبدوڵڵا)و (مەلا ئەحمەد)و (مەلا محەمەد) کە مەلا بوونە مامیشم هەر مەلا بووە بەناوی (دەروێش عەبدوڵڵا)، لە خێزانێکی مام ناوەندی ئاینیی گەورە بوومە.

لەنێوان ساڵی (١٩٣٧ ــ ١٩٣٨) دەخرێمە بەر خوێندن تا کۆتایی ساڵی (١٩٤٠) لەمزگەوتی گەرەکی (بڵاخ)، لەلای مامۆستا شێخ محەمەد کوڕی شێخ نەجمەدینی شۆڕیجە. لە سەرەتادا لەخوێندنەوەی (جزو عەممە)وە دەستمان پێکرد. لەدوای ئەوە قورئانمان دەخوێند تا سی جزمەکەی، ئینجا هەریەکێك کە تەواوی دەکرد زیاتر ئەوانەی کە ئیمانیان هەبووایە مەولودیان دەکردو دەیانبەخشانەوە، بانگی مامۆستاو قوتابییەکانی دەکرد بۆ بەشداری لەنان خواردن.

لەمزگەوت کە دەرسمان دەخوێند، یەکێك هەبوو پێیان دەووت (خەلیفە)، مزگەوتەکەی ڕادەگرت بانگی دەدا، سەرپەرشتی قوتابییەکانی دەکرد.

هەر قوتابییەك کە سزا بدرایە هەردوو پایان دەبەستەوە بەشووڵ لەژێر پێیان دەدا، خۆم لەژیانمدا دوو جار فەلاقە کراوم.

لەدوای قورئان خوێندن هەندێك کتێبی وەکو (پەندی عەتار)و (کتێبی مەولوودنامە بەپیتی تورکمانی) و (ڕفعت) و(ئەحمەدی) و (شێخ سەعدی)و (گولستان و بۆستان سەعدی شیرازی) کە هەمووی باسیان لە حیکمەت دەدا.

وەکو لەبیرم بێت ئاوا دەستی پێدەکرد: -

ئەی خوداوەندی عەزیم و پاشا

رحمەتنردر جملە مخلوقە پەنا

لە ساڵی (١٩٤١) لەقوتابخانە دەرچووم دوای ئەوە نەچوومەوە قوتابخانە.

لە ساڵی (١٩٤٣)دا لە سەرەتای گەنجیم بوو لەنێوان (٣١ و ٤١) ساڵان بوو کە لە شارەوانی (بلدیە) لەبەشی (باخچە) دامەزرام و ئیشم دەکرد ڕۆژانە بە (١٠٠) فلس، کە تا ماوەیەکی چاك لەم ئیشەدا کارم کردوو بژێوی ژیانم دەدا.

لەدوایدا کەوتمە سەر ئارەزووی سێ شت (وەرزش - زۆرخانە)، (گۆرانی)، (سینەما).

لەکەرکوك لەگەڵێك شوێن (زۆرخانە) هەبووە کە یاری پاڵەوانێتییان تێدا دەکرد. لەو کاتەدا لەسەر قەڵا کە ئێستا پێی دەڵێن گازینۆی(تراث) لەکاتی جێژنانان، چاڵێکی گەورەیان دروست دەکرد بەپانایی (٤) مەتر دووجارو بەقووڵی (١,٥)و ئەم چاڵە نزیکەی (٦ – ٧) پاڵەوانی لەخۆی دەگرت.

ئەو پاڵەوانەی ئەو کاتە کە لەبیرم بێت بریتی بوو لە (شوکر پاڵەوان) کە باوکی ناوی (وەلید) بوو، کورد بوو خەڵکی (زێویە) بوو، یەکێك لەپاڵەوانەکان تر ناوی (فەخری نوسرەت)، (جەعاو قەساب)، (قەرە عوسمان)و (فاتح) باوکی قاسم قەساب بوو.

یەکێکیش دوومبەڵەکێکی زۆر گەورەیان پێبوو پێیان دەووت (مرشد)، کابرایەکی سوورە بوو. پێش هاتنی خەڵك بەفارسی مەقامی (سێگا)ی دەخوێند لەگەڵ (چوارگا)، هەر کەسێك بهاتایەتە شوێنەکە پای پەتی دەکردو زەوییەکەیان ماچ دەکرد، دەیانووت ئەمە زەوی (ئیمام عەلی)یە. چونکە لەبەر ئەوەی (زۆرخانە) خۆی هەر لەئێرانەوە هاتبووە کەرکوك و عێراق.

لەزۆرخانە چوار جۆرە یاری هەبوو: -

١- میل (دارێکی وەکو هەرمێ بوو دەسکی هەبوو) زیاتر لەدارگوێز دروست دەکرا.

٢- شیناو.

٣- کەبەر، جملاستیك.

ئینجا ناوبژیوانێك دادەنیشت، دوانیان دەدا بەزۆران، تا بزانن کێ دەیباتەوە، ئینجا هەڵدەستا بەپارە کۆکردنەوە، خۆم لەنێوان ساڵانی (١٩٤٣ـ١٩٤٦) زۆرخانەم هەبوو، لەسەر ڕێگای سلێمانی لەلای شوێنی ئێستای کەبابی (چوارمشقی)، بەدەستی خۆم دروستم کردبوو، دووجار زۆرانم لەگەڵ محەمەد سەعید، جەلیل، گرتووە، تا شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ(میل)ێکم مابوو.

ئەوەی کە بیرم بێت زۆرخانەکانی کەرکوك لەم شوێنانەدا هەبوو: -

١- لەگەڕەکی عاشوور کە (شکور پاڵەوان) سەرپەرشتی دەکرد.

٢- لەشوێنی پێڵاوخانەی دیجلەی ئێستا زۆرخانەیەك هەبوو.

٣- زۆرخانەیەکی تر لەقەراغ مەحکەمەی ئێستا هەبوو.

٤- هەروەها لەتەپەی مەلا عەبدوڵڵای ئێستا هەبوو، کە مەلا عەبدوڵڵا خۆی دروستی کرد لەسەر تەپۆڵکەکە، خۆی یەکێك بووە لە دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتووەکانی کەرکوك. ئەو پاڵەوانانەی تر کە لەبیرم ما بێت: -

(مەعدی پاڵەوان) و (هادی پاڵەوان)، کە هادی وەستا بوو

لە بەلەدییە، منیش ئەو کاتە لەبەلەدیە کارم دەکرد، داوای لێم کرد کە فێری زۆرانبازی بکات وەکو لەبیرم بێت دەیوت مصارعە تەنها هێز نییە لەهەمان کاتدا فەنە. باپیری مەقام زان، حاجی عومەر پاڵەوان کە تەمەنی (١٠٥) ساڵ بوو زۆر بەهێز بوو ئەگەر دەستتی بگرتایە نەت دەتوانی جووڵە بکەیت. لە (حاجی عومەر)م بیستووە دەربارەی مەلا عەبدوڵڵا پاڵەوان: - " بە بنەرەت خەڵکی ئیمام قاسمە، خۆی پاڵەوان بوو لە تەکییەی مەلا عەبدوڵڵا زۆرخانەی هەبوو لەوێندەرێ، پیاوێکی بەئیمان و ماڵێکی چاکی هەبوو. هاتووچۆی ئێرانی دەکرد بۆ بازرگانی و هێنانی ماڵ.

هەروەکو مەلا عەبدوڵڵا گێراویەتەوە، جارێك لەجارەکان کە دەچێتە ئێران دەبینێت کە زنجیرێك لەملی زەلامێکی کەتەیە کە گوایە پاڵەوانە، بانگ دەکەن کە گوایە (غلام کلبی ئیمامی عەلی)، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ خانەکەی و داوا دەکەن پەتێك بکەنە ملی و دەهێننە بەردەم ئەو پاڵەوانەو دەڵێت من (غولام کلبی ئیمام عومەر)م، بۆیە هـــــەردوولا ڕێدەکەون کە پاڵەوانێتی بکەن بۆیە ڕێدەکەون کە ڕۆژی هەینی(جومعە) دابنێن بۆ زۆرانبازی.

هەروەکو دەگێڕنەوە لەکاتی پاشا (نەسرەدین شا) بووە هەروەها دەنگ بڵاودەبێتەوە کە گوایە یاری هەیە لەنێوان دوو پاڵەوان کە تا خەڵك کۆبێتەوە بۆ زۆران بازی، هەروەکو پاڵەوان مەلا عەبدوڵڵا گێڕایەوە: -

پاڵەوانە ئێرانییەکە زۆرکەتەو زل بوو، هەروەها قورس و گران بوو. بەڵام توانی لە کۆتاییدا بەسەریدا زاڵ بێت و زۆرانبازییەکە بباتەوە، دوای ئەوە بیردەکاتەوەو ترسی لێ دەنیشێت کە گوایە نەوەکو بیکوژن، بۆیە داوا لە (نەسرەدین شا) دەکات کە پارێزگاری بکەن تا شتەکانی لە (خانەکە) دەگوازێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی نەسرەدین شا سونە مەزەب بوو ڕەزامەندی دەکات لەسەر پارێزگاری کردنی تا لەئێران دەردەچێت.

بێجگە لەم پاڵەوانانە (مەمەد پاڵەوان)، و(محەمەد پاڵەوان) هەبوو.

لە ساڵی(١٩٥٣)وە دەستمان کرد بەیاری ئاسن، من ئەوکاتە چایخانەم هەبوو، لەشوێنی نەقلیاتی سولەیمانی ئێستا کە بەحەسیر دروستکرابوو. لەتەك مەکینەیەکی ئاردی شێخ فازڵ بوو کە هی باوکی شێخ پیرۆت بوو، دەستەیەکمان دروستکرد بەناوی یانەی (چوارباغ)ەوە، چایخانەش بەناوی چایخانەی چوارباغ و تیپێکی تۆپێنیشمان هەر بەناوی چوارباغەوە دامەزراند بوو، چایخانەیەکیش لە (ساحة طیران) بوو، کە یاری ئاسنیان دەکرد بەڵام توانایان زۆر نەبوو.

ئەوانەی کە یاری ئاسنیان دەکرد وەکو لەبیرم مابێت ئەم زاتە بەڕێزانە بوو: (فەقێ نووری)، (محەمەد سەعید)، (بەکر مەلا عەبدوڵڵا)، (بەهائەدین فەخرەدین)، (وەهبی مەلا محەمەد)، (ئیسماعیل - عەرەب بوو)، (ئەبو حەقی)، (محەمەد عەبدولقادر)، ئەمە پاڵەوانی شمالی، وەرگرت، (ئیبراهیم ئەسوەد)، ئێواران چایخانەکە ئەوەندە قەڵەباڵغ دەبوو، کە جێگەی دانیشتنی نەبوو، بێجگە لەیاری ئاسن ئامانجمان بوو کە هەر پانزە ڕۆژ جارێك کۆڕێکی سیاسیمان ڕێکدەخست بەزمانی کوردی، کە لە ئامانجی حیزبی شیوعی کارمان دەکرد.

هەر لەو کۆڕەدا پیاوی بەتەمەنمان دادەنا بۆ پشتگیری کردنی کۆڕەکان و داوامان دەکرد کە خەڵکەکە هان بدەن



یاریزان نوری فەقێ لەگەڵ کۆمەڵێك یاریزانی تر

دژی شەڕو هەوڵدان بۆ ئاشتی، تا بەوەی لەگەڵ ئامانجەکانی حیزبی شیوعیدا بگونجێت. ئەوەی کە بیرم بێت کە لەیاری ئاسن هەڵگرتندا سێ جۆرە قورسایمان(دۆبلن) بەکار دەهێنا بریتی بوو لە ٣٠ کیلۆگرام، ١٥ کیلۆگرام، ٧ کیلۆکرام.

دەربارەی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی کە لەو کاتەدا دەگەیشتە دەستمان دەربارەی وەرزش، زیاتر ئەو گۆڤارە وەرزشییانەمان پێدەگەیشت کە لە میسری عەرەبییەوە دەهات، کە دەربارەی یاریکردنی کۆرسەکانی تێدا بوو.

ئەو یاریچییانەی کە لەبیرم مابێت کە یارییان دەکرد: – (فاروق نامق)، (عەلی محەمەد)، (عەلی سەعید)، (نەجات محەمەد)، (فاتح حاجی عەبدوڵڵا)، (ناسح حاجی عەبدوڵڵا)، (فەخرەدین).

بەبیرم دێت جارێکیان یارییەك کرا لەنێوان ئەم تیپانەی گەڕەکەکانی کەرکوك وەکو (تیپی چوارباغ)، (تیپی ئیمام قاسم)، (تیپی قەڵا)، (تیپی قەسابخانە). لەدوایدا دوای ماوەیەکی زۆر یاری کردن کە چەند ڕۆژێکی خایاند یاری مایەوە لەنێوان (تیپی چوارباغ)و(تیپی قەڵا) کە لەدوایدا (تیپی قەڵا) بردیانەوە.

ئەو یاریچیانەی کە بەشدارییان کرد: –
(محەمەد قەڵایی)، (محەمەد، ن.چ)، (سەباح ئەحمەد پالاس)، (قەرە نەجمەدین)، (وەستا عەبوو تۆڕنەچی)، (خورشید ئەسوەد نوری).

لەتەمەنی (١٤ – ١٥)ساڵان تا (١٧) ساڵان لەباخچەی بەلەدیە ئیشم دەکرد کە تا ساڵی (١٩٤٦) کە تەمەنم گەییە (١٨) ساڵان بەلەدیەم بەجێ هێشت، کۆمپانیای نەوت لەو ماوەیەدا، چەند دامەزراوێکیان وەکو پالاوگە دانا لەناو کۆمپانیای نەوت لەکەرکوکدا.

لەو ماوەیەدا لەناو بازاڕدا بانگەوازی خەڵکیان دەکرد کە پیاوێك هەبوو بە(سەماعە) بانگی خەڵکی دەکرد بەناوی (سەعید) بەناوبانگ بوو (سەعەدۆش)کە خەڵکی قەڵا بوو. ئەوەی لەو کاتەدا کە کرێی کۆمپانیای نەوت (٢٥٠) فلس بوو، بەڵام کرێکاری گەچکاری (٥٠٠)فلس بوو، لەبەر ئەوە خەڵکەکە نارۆیشتن، ئەو کاتەی کە لەبەلەدیە ئیشم دەکرد، بیرم کردەوە کە لەکۆمپانیای نەوت ئیش بکەم، کە مانگی دەیکرد (٧,٥)دینار، وە پشووەکانی وەکو هەینیش حیساب دەکرا.

لە سەرەتادا چووم بۆ کۆمپانیا(شەریکە) هەموومانیان ڕیزکرد وەکو سەربازو بەڕێوەبەری کۆمپانیا دەهات‌و سەیری خەڵکەکەی دەکرد ئەوەی بەکەڵك بوایە هەڵیدەبژارد، کاتبەکانی ئەوکاتەی کۆمپانیا (مستەفا سابیر) بوو کە باوکی مەقام خوێن بوو بەڵام خۆی لەبنەڕەتدا (لوڕ)بوو کە برای سەیدەلی سوبحی بوو. هەروەها (فەرەج هندی) گاوری قەڵا بوو، کلدانی بوو ئەویش (کاتب) بوو لە (کۆمپانیا).

یەکێك بەناوی (عەبدوڵڵا) منی بردە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك بۆ دامەزراندنم، بەرامبەر ئەوەی کە دوو دیناری بدەمێ، بەڵام من دوو دینارەکەم نەدا پێی.

چووینە (ئۆفیس)، ووتیان بەیانی ناسنامەکانتان لەگەڵ خۆتان بهێنن، منیش لەگەڕەکەمان ئەوەی بێ ئیش بوون هەموویانم کۆ کردەوە بۆ ئەوەی بیانبەم بۆ کۆمپانیا، بەیانی دوای (فحص)، ٢٥ کەس لەکوردو تورکمان وەرگیراین، لەنێو کەرکوکەوە بۆ (ستاف) سەعاتە ڕێگایەك دەبوو، کۆمپانیا هێڵی شەمەندەفەری ڕاکێشا بوو، بەڵام تەواو نەبوو بوو، کاتێکیش کە شەمەندەفەریان دا، بەشەمەندەفەر دەرۆیشتین وە لە (٢١)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦ەوە ژمارەیەکیان بۆ هەریەکێکمان لەفافۆن دروستکردبوو کە سەری مانگیش بەپێی ئەو ژمارەیە پارەی مانگانەمان وەردەگرت.

لەدوای ئەوەی حەوت ڕۆژ ئیشمان کرد لە (٢٩)ی حوزەیران، هەشتی بەیانی بوو نانمان دەخوارد، شووت لێیدا، لەدەرەوەی سیمەکەی کۆمپانیا، دەنگی قەلەبالغی هات، بانگۆی خەڵکەکەیان بەکوردی و عەرەبی و ئاسووری‌و تورکمانی دەکردو بانگیان دەکرد کە ئیش مەکەن‌و دەست لەکار هەڵگرن‌و وەرنە دەرەوە، کە هەر هەموویان کرێکارەکانی دەوروبەر بوون.

بانگەوازەکانیان لەم چەند خاڵەدا چڕ کردبۆوە کە هەر هەمووی لەبەرژەوەندی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك بوون:

١– داواکردن بۆ دەرکردنی ناسنامەی (الضمان الاجتماعي) بۆ کرێکارەکانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك.

٢– باران بارین پەیوەندی بەبڕینی پارەی کرێکارەکانەوە نەبێت، چونکە ئەو ڕۆژەی باران بباریایە کرێکار ئیشیان نەدەکرد، بەڵام بەرامبەر ئەمە کرێکاری کۆمپانیا زەرەرمەند دەبوو ئەویش بڕینی پارەی ئەو ڕۆژە.

٣– بەکارهێنانی دەست کێش‌و شەپقە بۆ ئیش.

٤– بەکارهێنان‌و بەخشینی جلوبەرگی ئیش‌و قۆندەرە بۆ کرێکارەکانی کۆمپانیا.

٥– کردنەوەی چێشتخانەو دانی خواردن بەنرخێکی هەرزان بۆ کرێکارەکانی کۆمپانیا.

٦– داوا کردنی سێ دینار لەجیاتی کرێی هاتووچۆ بۆ کرێکارەکانی کۆمپانیا.

٧– داوا کردنی سێ دینار لەجیاتی کرێی خانوو (اجرة سکن).

٨– مانگی چوار تەنەکە نەوت بدرێ بەکرێکارەکانی کۆمپانیا.

٩– دەرکردنی کرێکار بەکەیفی کۆمپانیا نەبێت، بیانەوێت بەئارەزووی خۆیان دەریان بکەن.

کرێکارەکان وورده وورده کۆبوونەوەو بڕیاری مانگرتنمان داو، کرێکارەکانیان ڕیز کرد بەچوار ڕیزو خۆپیشاندانێکی گەورەیان ساز کرد لەسەر هێڵی شەمەندەفەرەکە تا سەر گەڕەکی (نیو کەرکوك).

گەنجێك زۆر شارەزا بوو ناوی (حەنا ئیلیاس) بوو، بەعەرەبی هوتاف لێیدەدا، یەکێکی تر کورد بوو ناوی (عەبدولکەریم)، یەکێکی عەرەبیش ناوی (فارس)بوو هەروەها ئەوانەی تریش لەبیرم مابێت(ناسیح سەید ئەمین جەباری)و(عەبدوڵڵا جێو) کە تورکمان‌و (دنخا یلدا)کە مەسیحی بوون لەگەڵ (عومەر) ناوێك کە کورد بوو، وابزانم خەڵکی سولەیمانی بوو.

داوایان لەخۆپیشاندانی کرێکارەکان دەکرد، بڕۆنەوە بۆ

ماڵەوەو ئێوارە سەعات چوار لەلای دارەکانی گاورباغی کۆببنەوە.

لە گەڕەکەکەمان پیاوێك هەبوو، ئێمەی تێگەیاند، روونی کردەوە کە ئەم خۆپیشاندانەی کرێکاران، حیزبی شیوعی پێی هەڵساوە. هەروەکو روونی کردەوە کە هەریەکە لە (حەنا یوسف) کە خەڵکی شەقڵاوە بوو، لەگەڵ (ئەبو حیکمەت)، ئەمانە دەستیان هەبوو لەدەرکردنی تەوجیهات بۆ سازدانی خۆپیشاندان. (حەنا یوسف) باوکی قەشەی شەقڵاوە بوو (ئەبو حیکمەت) گەیشتە لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی.

لەچوارو نیوی ئێوارە دەستیان کرد بەقسەکردن دەربارەی خۆپیشاندانی کرێکاران و داواکاری کرێکارەکان و ئامانجەکانی ئەم خۆپیشاندانە لەنێو کەرکوکدا.

لەبەر زۆری خەڵك لەو شوێنەدا ئاو ماستاو چایان دەفرۆشت، لەلای قەبرستانی گاورباغی بەدیوی ماڵەکاندا کە پێی دەڵێن (چرت مەیدان) شوێنی مەکینەی (حەمە بۆزە) کە زۆربەی ماڵەکان تورکمان بوون، ئەو ماڵانەش منداڵەکان دەهاتنە نێو خۆپیشاندانەکەوە گوێیان لەخوتبەکان دەگرت، ئەو رۆژە بەبێ ئاژاوە هاتینەوە کە دەیکردە رۆژی (٣)ی گەلاوێژی ساڵی (١٩٤٦).

لە گەڕەکی خۆمان (ئەحمەد قادر) ناوێك هەبوو، ئێمەی تێگەیاند رۆژ هەڵات و رۆژ ئاوای وولاتانی عەرەبی شەڵەژاندووە.

رۆژی دوایی واتا (٤)ی گەلاوێژی(١٩٤٦) لەسەعات نۆو نیوی سەر لەبەیانی لافیتەیان بە کوردی و عەرەبی و تورکمانی و ئاسوری نووسی بوو بەخۆپیشاندان چووینە نێو بازاری کەرکوك و دەستمان کرد بە سوورانەوە لە گەڕەکی (ئەحمەد ئاغا)و وێستگەی شەمەندەفەرو بۆ بەردەم ئەخۆشخانەی (الجمهوري) کەرکوك، تاوای لێهات گەلێك خەڵك لەناو بازار هاتنە ناو خۆپیشاندانەکە، تا گەیشتینە شوێنی (مدير شرطة)ی کەرکوك، لەنێو خۆپیشاندانەکە ئەم شیعارانەمان بەرز کردبۆوە: –

(نريد خبزو خبز لعوائلنا)

کاتێك گەیشتینە ئەو شوێنە پارێزگاریش لەوێ بوو داوای لەدەستەی خۆپیشاندان کرد بۆ ووتووێژ، لەخەڵکەکەیش داواکرا بگەڕێنەوە بۆ ماڵ و ئێوارە بێنەوە بۆ گاورباغی بۆ ژێر دار زەیتوونەکان.

ئێوارە دەستەکە هاتنەوە، کە سێ کەسیان بۆلای پارێزگار چووبوون ئەوانیش (حەنا ئیلیاس)، (ئاسیح سید ئەمین)، (عەبدوڵلا جێوە)، ووتیان هەشت تا نۆ داوایان داناوە بۆ جێبەجێ کردن، بەڵام رێککەوتووینە لەسەر دەرکردن و ئیجازەی نەقابە، بۆیە ئێمەش بریاری مانگرتنمان دا تا هەموو داواکارییەکان جێبەجێ نەبێت، کە ئەمە درێژەی کێشا تا (٨)ی گەلاوێژی ساڵی (١٩٤٦).

لەبەر درێژە کێشانی خۆپیشاندانەکە، دەستەی خۆپیشاندانەکە بریاریاندا ئەوانەی کە حاڵیان فەقیرە رۆژانەکانیان بدەن، شوێنێکیان دیاری کرد بەرامبەر (مكتب الثقافة الوطنية)کە شوێنەکە هی برادەرێکی عەرەب بوو، وابزانم ناوی (عادل)بوو.

(ئەحمەد قادر)ووتی تۆو فەتاح دێنە ئەو شوێنە وەتەنیا ئیشتان ئەوەیە ئەوەی کە زۆر فەقیرە بۆمان دیاری بکەن ئەوەکو فەقیر نەبن، کە ئەمە تاوەکو ماوەی سێ رۆژ بەردەوام بوو،

لەملاش بەکرێگیراوەکانی کۆمپانیای نەوت کەوتنە نێو خەڵکەکە بۆ گەڕانەوە، بەڵام دەستەی سەرپەرشتی خۆپیشاندان بەخەڵکەکەیان دەوت درۆ دەکەن مەگەڕێنەوە. ئەمە کاریگەری کردە سەر هەندێك لەکرێکارەکان بۆ گەڕانەوە، بۆ سەرپەرشتی خۆپیشاندان چەند کەسێکیان دیاری کرد کە ژمارەیان هەشت کەس دەبوو کە بریتی بوون لەمن (نوری فەقێ)وفەتاح، شێرزاد، شکور(تورکمان) کە کۆبوونەوەیەکیان پێمان کرد لە (مكتب الثقافة الوطنية) کە هەتا دەتوانن بەقسەی خۆش بیانگێڕنەوە، بەڵام ئەگەر سوودی نەبوو، کە هەریەکە دۆنکیەکیان داپێمان بۆ لێدانیان وە داوایان کرد کە تەنها لەقاچیان بدەین، سەرلەبەیانی دووانمان بەقسەی خۆش گەڕاندەوە، لەرۆژانی (١٠)ـ (١٢)ی تەمووز لەگەڵێك کەسیان دابوو، ئەمە بەردەوام بوو تا (١٣)ی تەمووزی ساڵی (١٩٤٦).

ئێوارەی ئەو رۆژە هێزێکی سەربازی (قوە السيارە) یان لەبەغداوە هێنا، وایان تێگەیاندبوو، کە هەر کەسێك ئەرواتەوە بە گوولە لێی بدەن، فرۆکەخانەی سەربازی نزیك بوو لە شوێنەکەوە. ئێمە درەنگ گەیشتینە شوێنەکە، شەر دەستی پێکردبوو، شەر لە هەردوولا دەستی پێکرد بەبەردو بە تەقە، تا بەوەی شەر گەیشتە لای دار زەیتوونەکان.

لەهەموو لاوە شەر دەستی پێکردبوو، (حەیدەرە کەچەڵ) ناوێك و دووانی تر بریندار بوو بوون، هەموویانمان لەگەڕەکی تورکمانەکان شاردەوە لەماڵێك بەناوی (زەینەلعابدین شوکر)، کە دەریان نەکەن تاوەکو دنیا تاریك دەبێت، تا بەوەی خزم و کەس و کاریان بێن و بیانگوازنەوە.

هەواڵێکیان هێنا کە گوایە یەکێك لێدراوە خەڵکی گەڕەکەکەمانە لەچایخانەکەی (چرت مەیدان) لەچایخانەی (عەباس) کە ناوی (ستار عومەر) بوو بەناوبانگ بوو بە (ستار ئۆمەر باغەوان)، لەپشتی دابوو لەپێشەوە هەڵتەکیبوو، هەڵمانگرت و بەکۆڵ هێنامان، عەرەبانەیەکمان بەزۆر راگرت و گەیاندمانە خەستەخانە، ئەو کاتە لەبەردەم کۆشکی (علی مەردان)ی ئێستا بوو کە ئەو خەستەخانەیە هی سەردەمی عوسمانییەکان بوو، سەیرمان کرد حەشاماتێکی زۆر لەوێ بوو، بەڵام ئەو (ستار)ناوە لەوێ چاکەوە بوو.

ژمارەی کوژراوەکانی ئەو پێکدانە (١٣) شەهید لە کرێکارەکان و نزیکەی (٢٠ ـ ٣٠) کرێکاریش بریندار هەبوو.

(١٤)ی تەمووز خەڵکێکی زۆر گەڕایەوە بۆ ئیش بەڵام ئێمە تا (١٦)ی تەمووز نەگەڕاینەوە.

حکومەت هەستا بەخستنە ژوورەوەی دەستەی کاروباری خۆپیشاندان لەبەغداو، لەبەرامبەردا حیزبی شیوعی چوار پارێزەریان گرت بۆیان تا ئازادیان بکەن و بەرگری لەداواکانیان بکەن، ئەو پارێزەرانەی کە دانران بریتی بوون لە موکەرەم تاڵەبانی، شەریف شەریف، کامل قازانچی، عەبدولجەبار عوبێدی لەگەڵ جیهاد وەنداوی.

هەروەها پارێزەرەکان داوای گرتنی پارێزگاری کەرکوك، بەڕێوەبەری پۆلیس(عەبدولرەزاق عەبدولفەتاح)وجێگرەکەی سەعید ڕاوی سەرۆکی وەزیران (ئەرشەد عومەر)، وەزیری ناوخۆ ناڕازیی بوون بۆیە ئیستقالەی پێشکەش کرد.

ئەم داواکاریانە پێشکەش کرا کە بریتی بوو لە: –

١– ئەوەی کوژراوە خوێنیان بدرێت.

٢– لێپرسینەوە لەوانەی دەستیان هەبووە لەم فیتەو ئاژاوەیە.

٣– بنەڕەتی کێشەکە بدۆزرێتەوە.

پاش وتوویژێکی زۆر لە بەرگری لە مافی کرێکارەکان بڕیاری ئەم داوایانەیان درا: –

١– لەڕۆژی باران باریندا مووچەی تەواویان بۆ ببەسترێت چونکە جاران کە باران بووایە تەنها کرێی سێ سەعاتیان بۆ سەرف دەکرا، کە ئەوبڕیارە هەڵگیرا.

٢ – مافی کرێکار بچەسپێت و دیاری بکرێت لەهەموو شتێك کە بەسەری دێت لەکاتی ئیش کردندا.

٣ – سێ دینار پارەیان لەمانگێکدا بۆ سەرف بکرێت بۆ هاتووچۆ.

٤ – سێ دینار پارەیان بۆ سەرف بکرێت لەمانگێکدا بۆ کرێی خانوو.

٥ – لەمانگێکدا هەر کرێکارێك چوار تەنەکە نەوتی بدرێتێ.

٦ – کەمترین مووچەی کرێکار لە (١٥) دینار کەمتر نەبێت بۆ هەر کرێکارێك.

بەڵام ئەم داواکارییانە جێبەجێ نەکرا لەداواکارییەکاندا: –

١– داواکرا کە دەرکردنی کرێکار نەبێت و مافی دامەزراندنی هەبێت و ڕێگەی ئەوە نەبێت کە کاتێك بیانەوێت دەریکرێن.

٢– داواکرا بەوەی مافی خانەنشینی کرێکار هەبێت.

٣– داواکردنی پشوو(اجازة)لە (١٢)ڕۆژەوە بکرێتە(٢٤)ڕۆژ بەڵام جێبەجێ نەکرا..

٤– (اجازە)ی نەخۆشخانە ڕەزامەندی لەسەر نەدرا.

٥– ڕێگە بەدامەزراندنی سەندیکای کرێکاران نەدرا بۆ مافی کرێکاران.

بەڵام لە (١٦)ی تەمووزو لەوەو دووا وردە وردە کرێکارەکان هەموویان گەڕانەوە سەر کارەکانیان.

**هێرشی کوولەو گرانی لەکەرکوکدا**

لەتەمووزی ساڵی (١٩٤٧)دا، هێرشێکی گەورەی کوولە بەسەر کەرکوکدا هات، بوو بەفەوتاندنی زەویوزارێکی زۆری گەنمو جۆو گەلێك زەوی بەتەواوەتی لەناوداو سووتانی هەموو بەرووبوومەکانی کە نرخی یەك قزناغ گەنم بوو بەدوو دینارو ڕوبعێ، ئەمیش کاریگەرییەکی گەورەی دروستکرد لەسەر بەرزکردنەوەی نرخی شتوومەك و وای کرد ببێتە هۆی ئاڵۆزکردنی باری ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەموو چینەکانی نێو نەتەوەکانی کەرکوك، قورسایی ئەو کێشەیەش کەوتە سەر ئەستۆی (موتەسەریف)، سەعید قەزاز لەو ساڵەدا کە توانی دەورێکی گەورە ببینێت لەچارە سەر کردنی ئەو کێشانەدا، (سەعید قەزاز)پێش هاتنی بۆ کەرکوك بەڕێوەبەری بەندەری بەسرە بووە، بەڵام لەبەر سەرهەڵدانی خۆپیشاندانی کرێکارانی بەندەرەکە بوو بەهۆی پشێوی و ئاژاوە کە ئەمە کاریگەری کردە سەر ئەوەی کە سەعید قەزاز بگوێزرێتەوە بۆکەرکوك.

**مانگرتنی کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك**

لەسەروبەندی بڵاوبوونەوەی کوولەو بوونی بەرزبوونەوەی نرخی نان و خواردن و پشێوی لەپارێزگاکە کرێکارەکانی کۆمپانیاکە داوای مانگرتنیان دەکرد بۆ جێبەجێ کردنی داواکارییەکانیان ئەمیش بریتی بوو لە: –

١– دەبێت ئەو فارگۆنی شەمەندەفەرانەی کە بەیانیان کرێکارەکان دەگوازێتەوە دەبێت هەمان فارگۆنی کارمەندەکان بێت و نابێت جیاوازی هەبێت لەجۆری فارگۆنەکان، کە هی کرێکاران بریتی بوو لە ئاسنێکی ڕەق و هی کارمەندەکان کورسی و پوخت ڕازاوە بوو.

٢– فرۆشتنی نان بەهەرزان بەخەڵکی، دروستکردنی تەنوور لەناو کۆمپانیا بۆ بەرهەمهێنانی نان. فرۆشتنی ئەو نانانە بەنرخێکی هەرزان.

٣– کۆمپانیا هەستێت بە دابەشکردنی بەشە خۆراك بەسەر کرێکارەکانی کۆمپانیاکەدا بۆ ماوەی ساڵێك.

حەشاماتێکی زۆر لەکرێکارەکان لەدەوری فارگۆنەکان کۆبوونەوەو یەکێکیان کە ناوی (کامل عەلی تکریتی)بوو کە پیاوێکی سوور ڕەنگ بوو لەسەر فارگۆنەکە بوو قسەی بە تورکمانی دەکرد. لە سەرەتادا بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای نەوت(مستر میلن) هاتە لای خۆپیشاندانەکەو داوای کرد لە (حەیدەر فەیلی) بەڕێوەبەری سەنتەری شەریکەو، داوای بڵاوکردنەوەی لێی کرد بەڵام هێشتا قسەکانی تەواو نەکرد لەلایەن کرێکارەکانەوە بەردەباران کران و نەیتوانی بەرگری هێزی کرێکارەکان بگرن، ئەم(حەیدەر فەیلی)یە پیاوێکی فەیلی بوو، دە پیاوی فەیلی لەگەڵدا بوو، دەستی دەڕۆیی لەئاسایشی کۆمپانیاکە.

پاش نیو سەعات لەو ڕووداوە (سەعید قەزاز) گەیشتە شوێنی ڕووداوی مانگرتنی کرێکارەکان، هاتە پێشەوە لەئەوانەی سەر فارگۆنەکان و ووتی وەرنە خوارەوە تا گوێ بگرن لە داواکارییەکانتان، یەکێکیان ووتی تۆ کێی تا ئێمە بێینە خوارەوە، ووتی من سەعید قەزازم موتەسەریفی کەرکوکم، ئینجا زۆر بە هێمنی کەوتە قسەکردن لەگەڵ کرێکارەکان و بەڵێنیدا کە داواکارییەکان جێبەجێ بکات. لەهەمان کات بەڵێنیدا بەوەی تەنووریان تاکو ئێوارە بۆ دا بنێت و بەڵێنەکانی تری بۆ ماوەی مانگێك جێبەجێ بکات.

بۆیە کرێکارەکان گەڕانەوە بۆ ئیش کردن و ئێوارە کە هاتینەوە دیمان کە تەنوورەکان دانراون و سوور دەکرانەوەو داواکارییەکانی تریش لە ماوەی دوو مانگدا جێبەجێکراو پیتاقەی بۆ بەشە خۆراك کردو نانی بە هەرزان دابەشدەکردو هەموو فارگۆنەکانی وەکو یەك لێکردو کرێکارو کارمەندی بەیەك چاو سەیر کرد.

*** بیرەوەری وەرزشی یاسین عەبدوڵلا**



كوڕێكی كوردی شاری كەركوكم كە لە مێژە یاری تۆپی پێ دەكەمو هەردەم لە هەوڵی ئەوەدام لەو بوارەدا هەنگاوی باشترو سەركەوتنی زیاتر بەدەستبهێنم. لەدایكبووی ساڵی (١٩٥١)م و لە گەڕەكی ئیمام قاسم چاوم بەدنیا هەڵهێناوە.
دەتوانم بڵێم خولیاو ئارەزووم بووە، بۆیە هەر لە تەمەنی منداڵییەوە هۆگری بوومو عاشقی یاریگاو تۆپ بوومو بە تەواوی ساڵی (١٩٦٥) خزامە نێو جیهانی فراوانی وەرزشەوە، ئەو كاتە لە قوتابخانەی ئیمام قاسمی سەرەتاییەوە دەستنیشانكرام، كە ئەمەیش زیاتر هاندانو سوور كردنمی لەسەر یاری تۆپی پێ جێگیر كرد، پاشان لە تیپەمیللیەكانی (برایەتی) كە ئەم تیپە یەكێ لە تیپە بەهێزەكانی كەركوك بوو، ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دروستمان كرد بوو، ساڵی (١٩٦٩) لەگەڵ دامەزراندنی یانەی وەرزشی سۆلاف لەلایەن شێخ پیرۆت تاڵەبانییەوە ئەندام و یاریزانێكی بواری تۆپی پێی یانەكە بووم تا ئەو كاتەی بەعسییەكان دەستیان بەسەرداگرتو ناوەكەیان بۆ یانەی (الكرامة) گۆڕی.
ساڵی (١٩٧٧- ١٩٧٨) بۆ یانەی سوپای (الجیش) بانگ كرام، پاشان ساڵی (١٩٧٨- ١٩٧٩) بۆ یانەی هێزی ئاسمانی (القوة الجوية) داواكارم، بەڵام لەبەر دووریو دەستكورتی نەمتوانی بەدەم داواكەوە بچم، چونكە ئەم دوو یانەیە لەو سەردەمەدا، یەكەم دەروازە بوون بەرەو هەڵبژاردەی عێراق. دووەم لە یانە هەرە ناودارو پێشەنگەكانی عێراق بوون.
لێرەدا پێویستە ئەوە بەبیردا بهێنمەوە كە ساڵی ١٩٧٠ بوومە سەرباز یەكسەر بانگ كرام بۆ تیپی تۆپی پێی تیپی (فق٢) ئەم تیپەش لەو سەردەمەدا بەهێزترینو ناودارترین تیپ بوو لە سوپای عێراقدا. هەر لەو تیپەدا یاریزانانی نێودەوڵەتی (كەریم فەندیو عادل عەبدوڵلا) یارییان دەركرد، هەرچەندە عادل عەبدوڵلا بەتوركمانی قسەی دەكرد، بەڵام بۆ خۆی چەندین جار باسی كردووە كە كوردەو خەڵكی حەسارە.
سەرەتا مامۆستا فاتیح نەقشبەندی لە قوتابخانەی ئیمام قاسمو دواتر مامۆستا سەلاح ساڵح سكرتێری كۆنی یانەی وەرزشی سۆلاف، هەروەها لە فیرقەی دوو، دوو ڕاهێنەری هەڵبژاردەی عێراق عەبدوڵلا حەسەن زۆر شتی تازەی فێركردینو سوودی زۆر باشم لێ بینی، دواتر عەمۆ بابا كە هاتە كەركوكو سەرپەرشتی هەڵبژاردەی كەركوكی كرد لە ساڵانی (١٩٧٨- ١٩٧٩) پێویستە لێرەدا ئەوە بەبیر خوێنەراندا بهێنمەوە كە وەك یاریزانێكی هەڵبژاردەی كەركوك لە ساڵانی (١٩٧٢- ١٩٨٤) یاریم كردووە و لە یانەی سۆلافیش كاپتن بووم بۆ ماوەی ساڵێكیش لە یانەی (الثورة) یاریم كرد ئەوكات نەجات عیزەت سەرپەرشتی ئەكرد.
خۆشترین ڕۆژ كاتێ هەڵبژاردەی كەركوك لە یاریگای (الشعب) لە بەغدا ولە چوارچێوەی خولی كۆماری (بطولة الجمهورية) بەسەرپەرشتی شێخی ڕاهێنەرانی عێراق عەموو بابا لە هەڵبژاردەی عێراقمان بردەوە (٤-٣) گۆڵ.
ساڵی (١٩٧٧) كە هەڵبژاردەی كەركوك لەگەڵ یانەی سیسكای سۆڤییەتی یاری كرد، ئەو كەلوپەلە وەرزشیانەی پێمان درا بوو پێش دەستپێكی یارییەكە بوو، بۆیە ئەوەی من زۆر تەسك بوو نەمدەتوانی بجوڵێمەوە، بە عەموو بابام وت شۆرتەكەم تەسكە ناتوانم یاری بكەم، ئەویش وتی وەرە دانیشەو گۆڕیمی.

*** یادداشتی وەرزشی فەلاح حوسێن عەلی (فەلاح عەجەم).**

ساڵی ١٩٥٤ لە گەڕەكی تەپەی مەلا عەبدوڵلا لەدایكبوومە سەرەتا هەروەك خەڵكانی دیكە لە گەڕەكەكەی خۆمەوە لە (تەپەی مەلا عەبدوڵلاوە) دەستم پێكرد، لە تیپی (ذهب الاسود) كە ئەو كات جەبار كوردی دای مەزراندبوو ئەم تیپە یاریزانی بەهێزی تێدابوو لەوانە:- (تەحسین عەلی، شاكرە درێژ، خالید عومەری موختار، كامیل عەلی)، هەر ئەم تیپە دوواتر ناوی بۆ (الشباب الماس) گۆڕدرا، ئێمە وەك كۆمەڵە گەنجێك چووینە ناو تیپی لاوانی ئەڵماسەوە، دواتر سەرۆكی تیپەكە درا بەمن ولە ئەستۆم گرت.
ساڵی (١٩٧٥) تیپەكەمان شەش یاریزانی لە ڕیزی هەڵبژاردەی كەركوك هەبوو، لەوانە:- (ستار موستەفا، عەونی كوردی، ئیسماعیل ئەحمەد، فوئاد سادق، خالید تۆفیق، وریا عیزەت)، جگە لەوانەش مالیك میرزاو كاكەمەندو حەمە عەلی یاریزانانی تیپەكە بوون، بەڵام ڕەحمەتیی (حەمزە یاسین) چاكترین یاریزانی تیپەكەمان بوو، لە ساڵی (١٩٦٨) بۆ هەڵبژاردەی پەروەردەی كەركوك دەستنیشان كرام كە لەوێش ڕەحمەتی نەجات عیزەت مەشقی پێكردم لەگەڵ حاجی سەباح.
لە زۆر پاڵەوانێتی بەشداریم كردووە بەتایبەتی خولی عێراق، ئەویارییەی چاكترین دەورم تیابینیو ڕۆڵم تیایدا هەبوو یانەی یەكی حوزەیرانو یانەی بەریدی بەغدا بوو كە یەك بە سفر سەركەوتنمان بەدەستهێنا.
پێم باشە كەمێك بگەڕێمەوە دواوەو باس لەیاری گۆڕەپانو مەیدان بكەم كەلە قوتابخانەی سەرەتایی یاریم دەكرد، لەوكاتەدا سێ ساڵ یەكەمی كەركوك بووم. لە ڕاكردنی (١٠٠و ٢٠٠م)دا، پاشان بۆ هەڵبژاردەی پەروەردە بانگ كرام بۆ (٢٠٠م)و یەكەمم لەو یارییەدا بەدەستهێنا.
لە ساڵی (١٩٧١) لە شاری موسڵ بوو كە ڕاهێنەرەكەم عەدنان شوكر بوو،هەروەها لەیاریكردنی ڕاكردنی پۆستە (برید)دا



که بۆ فەیلەقەکانی ئەوکات سازدرابوو یەکەم بەدەستهێنا.

سەرەتا دەکرێ بڵێم که من خۆم مەیلی زۆرم بۆیاری کردن‌و وەرزش هەبووە، بەڵام هەرگیز لە چاکەی جەبار کوردی‌و خوالێ خۆش بووان (نەجات عیزەت‌و فەرەیدون‌و حەمەو بلە دەرناچم چوونکە ئەوان هاندەری بەهێزم بوون بەلای منەوە چاکترین یاریزانی ئەو سەردەمەی کەرکوك لەو کاتەدا ستار کوردی‌و غەنی کوردی‌و کەریم ئەفەندی بوو پاشانیش سەلاح میللە کە لە یانەی (مصلحة الكهرباء)و (الثورة) یارییان دەکرد، لە یاریزانە عێراقیەکانیش بە عەبد کازم‌و عادل عەبدوڵلای ڕەحمەتی کاریگەربووم.

سی‌و هەشت ساڵ بەر لە ئێستا یەکەمجار بوو لە پێشبڕکێی ڕاکردنی ١٠٠ مەتری بەشداری بکەم، ترسم لێ نیشتبوو، کەچی دەرەنجامەکەی پێچەوانەو چاوەڕوان نەکراوبوو، هەموو یاریزانەکانم دایەدواوەو پێش کەوتم، ژمارەی پێوانەییم بەدەستهێناو ئەمڕۆشی لەگەڵ دابێ ئەو ژمارە پێوانەییە بەناوی منەوە لە (١٠٠م) تۆمارکراوە، بۆیە جێی خۆیەتی کە شانازی بەو ڕۆژەو ساتەکانییەوە بکەم، هەروەها شتێکی دیکە لە یادم نەچێت ئەوەیە لە ساڵی (١٩٦٨) یاریزانێکی لێهاتوو بلیمەت هەبوو لە گەڕەکی ئیمام قاسم بەناوی حەمە سێوە، لەم ساڵانەدا ئەم حەمە سێوەیە لەسەر کوردایەتی بەند کرابوو، بەڵام یاریزانی (مصلحه نقل الركات) بوو، بۆ ڕۆژی یاری لە بەندیخانە دەریان کردە دەرەوەو یاری بۆ (مصلحة) کرد، لە ئەنجامدا توانی دوو گۆڵ تۆماربکات، پاشان ڕەوانەی زیندانیان کردەوە.

لەنێوان دووتیپ دا یارییەك هەبوو، یاریزانێك بەناوی سەباح کە تورکمان بوو زۆر بەتوندی سەری بەستونی گۆڵەکەیدا کێشا یەکسەر لە هۆش خۆی چوو بورایەوە، بۆیە بەپەلە ڕەوانەی نەخۆشخانە کرا ئیدی نەهاتەوە هۆش خۆی و گیانی لە دەستدا، زۆر جار ئەم حاڵەتەم بیردەکەوێتەوە و دڵگران دەبم.

زۆرن بەڵام لەسەرەتاوە نوری کوردی بوو لەیانەی یەکی حوزەیران، هەروەها مامۆستا ئیسحاق. بەڵی دوو ساڵ بۆ هەڵبژاردەی کەرکوك یاریم کردووە، کە ئەو کات فەرەیدونی ڕەحمەتی ڕاهێنەر بوو، لەگەڵ یەکێ لە یاریزانەکاندا دۆڕاندمان بە یانەیەکی وڵاتی سووریا، دوای ئەوە ڕۆژگار گۆڕا شەڕی هەشت ساڵەی عێراق- ئێران بەسەردا هات. پەرتەوازەو دەربەدەر بووین، هەریەکەو ڕووی لەلایەك کرد ئەمەش بووە هۆی ئەوەی وەرزش لە شارەکەدا لە ئاستی باڵادا خۆی نەبینێتەوەو بەرزونزمی تێ بکەوێت.

لەگەڵ سامە سەرپان ساڵی (١٩٨٤) تیپی قەندیلمان لە گۆپتەپە دامەزراند، دوای ڕاپەڕینیش بوومە ڕاهێنەری چەندین یانە لەوانە:- شەقڵاوە ئەکاد لە گۆڕەپان‌و مەیدان پاشان یانەی کەرکوك لە سلێمانی‌و قەڵاچواڵان، ئێستاش بەدەرکراوی سیاسی گەڕاومەتەوە سەرکارەکەم و لە یانەی یەکی حوزەیرانی کۆن واتە کەرکوکی ئەمڕۆ پۆستی ڕاهێنەری پیاوان دەکەم.

*** یادەوەری وەرزشی کەریم ئەفەندی**

ناوم کەریم محەمەد ئەمینە بە کەریم ئەفەندی ناسراوم، ساڵی (١٩٣٢) لە گەڕەکی شوانی شاری کەرکوك لەدایکبووم، خێزاندارم‌و خاوەن هەشت منداڵم چوار کچ‌و چوار کوڕ.

لە ڕووی زانستییەوە دەرچووی ئامادەییم کە ئەو کات پۆلی شەش نەبوو، سەرەتاییم لە قوتابخانە یەکەم بووم لە شاترلو کە ناوی ئەمیر عەبدوڵلا بوو لە نزیك (شوکر نەجار) ی ئێستا پاشان چوومە قوتابخانەی غەربیە، ئەم قوتابخانەیە ناوەندی‌و ئامادەیی بوو.

بۆخۆم هەر لە منداڵیمەوە خولیای تۆپی پێم هەبوو، بەڵام لە ساڵی (١٩٤٨) ئەم خولیایە باڵای کرد، لە تیپی هەڵژاردەی مەعاریف وەرگیرام، کە ئێستا (هەڵبژاردەی پەروەردە)ی پێدەگوترێ.

بەواتا لە پۆلی شەشی سەرەتاییەوە بۆ هەڵبژاردەی مەعاریف دەست نیشانکرام‌و وەرگیرام، هەرچەندە لە ڕووی تەمەنەوە منداڵ بووم، بەڵام یاریچییەکی باش بووم، ئەڵبەتە مەبەستم لە هەڵبژاردەی مەعاریف لە سەر ئاستی کەرکوکە، ڕاهێنەرکەمان ئەحمەد جەلال بوو، یارییەکمان لە سلێمانی بۆ دروست بوو، باوکم ڕێگەی پێنەدام بچم، کەچی ئەحمەد جەلالی ڕاهێنەرمان قەناعەتی پێکردو بەشداری ئەو یاریەم کردو سەرکەوتنمان بەدەستهێناو من دوو گۆڵم تۆمار کرد، لە هەولێریشمان بردەوە، دواتر لەگەڵ موسڵدا دۆڕاندمان.

هەروەها بۆ تیپە ئەهلییەکان، کە ئێستا تیپی میللی پێدەڵێن یاریم کردووە، وێرای تەمەن منداڵیم لە تیپی (ذهب الاسود) لە (جرت میدان) لە بازاری قۆریە یاریم کردووە و ئەو کاتە تاکە کورد بووم لە ناویاندا، ساڵی (١٩٥٢)یش بۆ تیپی



(الهلال الأحمر) یاریم كردووە، ئەم تیپانە لەو سەردەماندا ناو وناوبانگیان هەبوو، لەسەر ئاستی شارەكانی دیكەی عێراق حیسابیان بۆ كردووە، ڕاهێنەری ئەم تیپە ناوی عوسمان بوو ئێستا كۆچی دوایی كردووە، خوا بە بەهەشتی خۆی شادی بكات.

هەر لە ڕێگای تیپی (ذهب الاسود)ەوە چوومە ڕیزی هەڵبژاردەی كەركوك، لەلایەن ئەفسەرێكەوە سەرپەرشتی یەكێتی تۆپی پێی كەركوك دەكرا، ڕاهێنەری هەڵبژاردەی كەركوك (كەمال عەبدولقادر)و (ئەحمەد جەلال) بوو، بۆ ماوەی نزیكەی هەشت ساڵێك لە هەڵبژاردەی كەركوك مامەوە.

ئەم كوردانەی لەهەڵبژاردەی كەركوك یاریان دەكرد (ستار كوردی) كە یاریزانێكی لێهاتووو زۆرباش بوو (خورشید نامیق) ستاف بوو لە كۆمپانیای نەوت، هەروەها بەهەشتی (عادل عەبدوڵلا)مان لەگەڵ بوو.

لە هەڵبژاردەی مەعاریفەوە بۆ هەڵبژاردەی تیپی فیرقەی دووی كەركوك بانگكراین، ئەم تیپە لەسەر ئاستی عێراق ناسرا بوو ئەو كاتە یاسین عەبدوڵلا غەنیو ئەنوەر عارف و سەید جەلال پێكەوە بووین، دوایی ئێمەیان كردە (نایب زابت) لەوێ ماینەوە ڕاهێنەرەكان ئەفسەر بوون بە تواناو شارەزا بوون لەوانە (عادل بەشیر) (سەباح عەبدوڵلا).

لەوێشەوە بۆ هەڵبژاردەی سەربازی عێراق داوا كرام و یاریم لە ڕیزی ئەم هەڵبژاردەیە كردووە، لەناوەوە و دەرەوەی وڵات، ساڵی ١٩٦٠ چووینە میسر لە قاهیرەمان بردەوە لەگەڵ ئەسیوت بەرامبەر بووین، بەڵام ٢-١ بەزەمالكمان دۆڕاند.

لە دیمەشقی پایتەختی سوریا بەشداری (پاڵەوانێتی سەربازی عەرەبی)م كرد، لەو پاڵەوانییە سێیەم بووین. ڕاهێنەرەكەمان لە وەزارەتی بەرگری ساڵی (١٩٥٤) لە بەریتانیا وە بۆی دابین كردبووین زۆرلێهاتووو كارامە بوو، پێشتر لە ڕیزی هەڵبژاردەی ئینگلتەرا یاری دەكرد.

لە خولی دۆستایەتی كە لە ڕووسیا و ساڵی ١٩٦٠ دەستی پێكرد بەشداریمان كرد چوار یاریمان ئەنجامدا، یەك بردنەوەو بەرامبەرێكو دوو دۆڕاندن. لە چینی میللیش چوار یاریمان كردووە، دووانیان لە پەكینی پایتەخت و یەك یاری لە شەنگەهایو یەكێكی دیكە لە شاری (تین مسین)، لە كوریاش دوو یاری بەرامبەرێكو دۆڕاندنێك بوو، لە ڤیتنامیش دوو یاریمان ئەنجامدا.

ساڵی (١٩٥٧) لە هەڵبژاردەی سەربازییەوە بۆ هەڵبژاردەی عێراق دەست نیشانكرامو بانگكرام، لە پاڵەوانێتی (خولی دووەمی وەرزشی عەرەبی) لە بەیروت بەشداریم كردووە، هەشت ساڵ لە ڕیزی هەڵبژاردەی عێراق یارییم كردووە، لەو ماوەیەدا چەندین یاری دۆستانەو پاڵەوانێتی جۆراوجۆرمان ئەنجام داوە لەوانە، خولی ئاسیا لە تاران، كە گروپەكەمان بریتی بوو لە (سوریا، ئێران، پاكستان، عێراق، توركیا) ئێمە دووەمو توركیا یەكەم بوو.

لە پاڵەوانێتی پاڵاوتنی جامی جیهانی سەربازی ساڵانی ١٩٦٢و ١٩٦٣ بەشداریم كردووە.

هەڵبژاردەی عێراق یاریزانی زۆر لێهاتووی تێدا بوو لەوانە:- جەمیل عەباس كە بە جەممولی ناسرا بوو بڕبڕەی پشتی تیپەكەمان بوو، عەموو بابە زۆر زەبەلاح بوو، قاسم زوبیە، چاكترین گۆڵچی عێراقیش حامد فوزی لە هەڵبژاردەی عێراق بوو.

لە هەڵبژاردەی توركیا گۆڵكەرێكی زۆر بەهێزو ناودار هەبوو بەچاكترین یاریزانی دەزانمو زۆركاری تێكردووم، ئێستا كاری ڕۆژنامەوانی دەكا ناوی (جان پاركۆ)یە لە ئەستەمبوڵ نیشتەجێیە. ئەمەوێ سەبارەت بە توركیا بڵێم كە ساڵی (١٩٦٢) لە پاڵاوتنی جامی جیهانی سەربازی دوو جار لەگەڵ ئەم وڵاتە یاریمان كرد جاری یەكەمیان لە توركیا كە سەرۆكی سوپا سالار ئامادە بوو دۆڕاندمانو جاری دووەم لە بەغداو بەرامبەر بووین واتا یەكسان بووین یەك بە یەك. سەركەوتنی بەدەستدەهێنا بست بست باڵام دەكرد، ئەو سەركەوتنانە خۆشترین ڕۆژگارم بوو.

ساڵی (١٩٧٣) لە یارییەكی دۆستانەدا لەگەڵ یانەی مانوزو هیگۆی ئەڵمانیا دووجاری شكستێكی گەورە هاتین بەهەشت

گۆڵ دۆڕاندمان ئێمە دوو گۆڵمان کرد، تیپەکەمان لە ڕووی یاریکردنەوە نارێك بووین.
ڕاهێنەر (کۆك)ی ئینگلیزی بوو، زۆرم بەدڵ بوو، بەڕاستی لێهاتوو زانا و پسپۆڕ بوو، هەمیشە ڕاهێنەرێکی داهێنەر بوو، سالآنی ١٩٥٩- ١٩٦٠ تاوەکو ١٩٦٤ لەگەڵ هەڵبژاردەی سەربازی عێراقی مایەوە، لەسەر بودجەی وەزارەتی بەرگری بوو، ناوبراو هەروەکو پێشتر ئامارژەم پێدا یاریزانی هەڵبژاردەی ئینگلترابوو.

* یادەوەری وەرزشی جەلال محەمەد قادر

ساڵی ١٩٥٤ لە پۆلی چواری سەرەتایی بووم خولیای وەرزش بووم‌و زۆر حەزم لێ بوو بە تایبەت یاری تۆپی پێ، ئەو کات لە قوتابخانەی شەرقیە بووم کە لە گەڕەکی جوولەکان (پیریادی) نزیك مزگەوتەکەی مەلا ڕەزای واعز کە ئێستا دەکەوێتە شەقامی سەلاحەدین، هەر لە بەراییدا بە یەدەکی قوتابخانە دەستم پێکرد چونکە زۆر منداڵ بووین، من‌و ئەحمەد عەبدلمەجید برای فازیل عەبدلمەجیدی ڕاهێنەر پێکەوە باسکەو تۆپێنمان دەکرد، پاشان گوسترابینەوە بۆ قوتابخانەی دواناوەندی موسەللا بەڕێوبەری قوتابخانەکەمانیش عوسمان قۆجە قەساب بوو.
ساڵی ١٩٥٩- ١٩٦٠ مامۆستای وەرزشمان سوبحی بیلال بوو دوایی تۆما جومعە وەك مامۆستای وەرزشمان بوو، لەم کاتەدا دەستبەرداری فووت بۆڵ بووم دەستم بە یاری لەشجوانی کرد، لە پۆلی دووی ناوەندی گەرامەوە بۆ قوتابخانەی ئیمام قاسم لەو شوێنەی ئێستا بوو، لێرە دەستم بە یاری باسکەو بالە کرد ئەوانەی لەبیرم مابن (شەهید عیزەدین قەرە محەمەد، فایق فەرەج، عەباس ڕەمەزان، فایق محەمەد، سەردار جونێد تاڵەبانی، عەلی کاکە حەمە)، بەڕێوەبەری قوتابخانەش مامۆستا عەبدولڕەحمان ڕەزا بوو، مامۆستای وەرزشمان تۆما جومعە بوو.
ساڵی (١٩٦٣) چوومە ئامادەیی کەرکوك لەوێ هەر دوو یاری بالەو گۆڕەپانم دەکرد، یاری بالە لە هەموو یارییەکان زیاتر حەزم لێ بوو چونکە تیادا بالآ دەست بووم، لە ئامادەیی کەرکوك مامۆستا لوتفی موزهەر تکریتی مامۆستای وەرزشمان بوو، لە هەشتاکان ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق بوو، دواتر مامۆستا ماهر بەیاتی وەرزشی پێدەکردین، ئەو کاتە وەك ئێستا نەبوو تەنها پێنج قوتابخانەی ئامادەیی هەبوو، هەموو ساڵێ ئێمە یەکەم دەبووین.
ئەو کاتە یانەی کوردی لە کەرکوك نەبوو کەرکوك تەنها چوار یانەی تیابوو (ئەرمەن، ئاشووری، سەورە کەرکوك - شەریکە) ساڵێکیان من‌و شێخ ستار بەرزنجی یاری بالەمان بۆ یانەی سەورە کرد.
لە یاری بالە زۆر باش‌و نایاب بووم، وەك ڕاهێنەریش ڕۆڵی باشم بینبێت، ئەمانە بوون:-
١- لە یاری تۆپی پێ ڕاهێنەری یانەی وەرزشی سۆلاف بووم‌و سێ ساڵ لەسەر یەك پلەی یەکەمان بەدەستهێنا.
٢- ڕاهێنەری یارییەکانی بالەو سەرمێزو ئاسن هەڵگرتن بووم‌و دیسانەوە لە ڕیزی پێشەوەی یانەکان بووین.
٣- لە ٢٧ی نیسانی ساڵی١٩٧٦ وەك یانەی وەرزشی سۆلاف لە گۆڕەپان لەسەر ئاستی عێراق کچان پلەی سێیەممان بەدەستهێنا ئەو یاریزانانەی بەشداربوون‌و ناویانم لە یاد مابێت (عالیە محەمەد ئەمین، عالیە قادر، لەیلا محەمەد نوری، خەدیجە محەمەد تاهیر، ئینتسار قادر)، پاڵەوانێتییەکە بۆ کچان کراوە بوو.
ساڵی ١٩٧٦- ١٩٨٢ ڕاهێنەری یاری سەر مێز بووم لە پەروەردەی کەرکوك لە خولی پاڵەوانێتی هەڵبژاردەکانی عێراق و قوتابخانەکان.



هەموو ساڵێك سەردانی بەغدامان ئەكرد ئەوان زۆر بەهێز بوون هەموو ساڵێ بەرامبەر یەك دەكەوتین شەهید ئەندازیار عارف فەقێ فەتاح یەكێ لە یاریزانە بە تواناكانی هەڵبژاردەی كەركوكو یانەی وەرزشی سوڵاف.

ساڵی ١٩٨٣ بوومە راهێنەری تۆپی باڵەی پەروەردەی كەركوكو پلەی سێیەمم لە ئاستی پەروەردەكانی عێراق بەدەستهێنا، ساڵی ١٩٧٧ بۆ ١٩٨٣ راهێنەری تیپی لاوانی باڵەیش بووم لە هەڵبژاردەی كەركوكو یەكجاریش هەڵبژاردەی پەروەردەی كەركوك لە سەر ئاستی ئاسن هەڵگرتنیش ساڵی ١٩٨٠ پلەی دووەمم لە بڕوانامەی نێوبژیوانی نێودەوڵەتی وەرگرت.

بردنەوەمان لە تیپی باڵەی هەڵبژاردەی هەولێر بە چاكترین دەستكەوتی دەزانمو شانازیشی پێوە دەكەین كە بە دوو گێمی بێ بەرامبەر بوو (١٥- ٤)و (١٥- ٧) بوو، تیپی پەروەردەی هەولێر لە یاری باڵە زۆر لێهاتووو بە توانا بوون، (عامر هەزاع) ئەو كاتە بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی كەركوك بوو زۆر هاندەداینو پشتگیری تەواوی دەكردینو سەردانییەكانی بۆلامان بەردەوام بوو.

ساڵی ١٩٦٤ چووینە شاری كفری بۆ یاریو گەشت بەڕێز مامۆستا ماهیر بەیاتی مامۆستای وەرزشمان بوو، ئەوە خۆشترین یادگاریو بیرەوەرییە لە یادی ناكەم.

ئێمە وەك یانەی وەرزشی سوڵاف بەهۆی بێ شوێنییەوە زوو زوو لە جێگای خۆمان دەردەكراین، لەوانە كە لە خانووەكەی شەهید عیزەدین قەرە محەمەد بۆ شوێنی مەركەزەكە ئیمام قاسم دەركراین كە ئێستا كۆمەڵگای وەرزشییە، لیژنەی ئۆلۆمپی یانەی وەرزشی سوڵافو... تێدایە.

دواتر لەوێش دەكراین بۆ خانووەكەی شەهید عومەر شەریف لە ئیسكان كە ئەویش بووە دوا قۆناغمانو بەیەكجاری ناوی سرایەوەو خرایە سەر یانەی وەرزشی سەورە.

لە پاڵەوانێتی تۆپی پێی كەركوك سەركەوتنمان بەسەر پۆلیس تۆماركرد كە ئەوكات زۆر بەهێز بوونو یەكێك لە تیپە هەرە بەهێزەكان بوو ٤-٣ سەركەوتین، شێخ پیرۆت تاڵەبانی لەسەر بودجەی خۆی نەك تەنها یاریزانەكان بەڵكو دەستەی كارگێڕی یانەكەو جەماوەری هاندەری یانەكەی بانگهێشتی هاوینە هەواری قەشقۆڵی لە دوكان كردو بەزمو هەرایەكی خۆش بوو لەیاد ناچێت، هەرابوو لەوپەڕی خۆشیو كەیفو بەزم بوو هەر كەس لە ئاوازێكی لێ دەدا.

مامۆستا ستار محەمەد رەسول ئەو كاتە مامۆستای وەرزش بوو یەكێك بوو لە دامەزرێنەرانی یانەی وەرزشی سوڵاف داوای لێكردم پەیوەندی بە یانەكەوە بكەم، باشم لە یادە كە داوای ئابوونەی لێكردم منیش یەك دینارمدا.،

ئەویش منی كردە دەستەی گشتی یانەكە، كە هێشتا بە فەرمی دانەمەزرابوو، لە مانگی شەشی ساڵی ١٩٧٠وە پەیوەندیم بە یانەكەوە هەبوو تا دوا قۆناغی لە ماڵەكەی شەهید عومەر شەریف لە ئیسكان. كە بەعس یانەكەی داخست چاكترین راهێنەر ئەمانە بوون:- فایق ئەلجسار، مەعن ئەلبەدری، حیكمەت محەمەد، هەرسێكیان لە بەغدا بوون بەڕاستی جێگای شانازین بە تایبەتی حیكمەت محەمەد كە كابتنی

هەڵبژاردەی عێراق بوو لە باڵە.

ئەم پۆستە وەرزشیانەم وەرگرتووە.

١- ئەندامی یەكێتی تۆپی باڵەی كەركوك.

٢- سەرۆكی یەكێتی لەشجوانی كەركوك.

٣- ئەندامی یەكێتی ئاسن بەرزكردنەوەی كەركوك.

٤- ئەندامی یەكێتی تۆپی دەست لە كەركوك.

٥- مۆڵەتی جیهانیم لە بواری نێوبژیوانیو راهێنانی ئاسن هەڵگرتن هەبوو.

٦- بڕوانامەی راهێنانو نێوبژیوانی پلە یەكم هەیە لە بواری یاری سەر مێز.

٧- بڕوانامەی نێوبژیوانی پلە یەكی تۆپی پێم هەیە ساڵی ١٩٧٢ وەرمگرتووە.

ئەمەوێ بۆ مێژوو ئەوە تۆمار بكەمو ئەو یاریزانە لێهاتووانە تۆماربكەم كەڵە پیاوی یارییەكان بوون لە یانەی وەرزشی سوڵاف، هەر یەكەو بەپێ بواری خۆی:- تۆپی پێ: یاسین عەبدوڵڵا، غەنی كوردی، عەونی كوردی، عەدنان عەبدلقادر، تاریق عەبدلقادر، عەبدوڵڵاكاكە حەمە، دارا، ئازاد فاتیح، مالك میرزا، سەباح محەمەد، عابدین ئیبراهیم، شێروان ئەحمەد، شوان ئەحمەد، (فەخرەدین ئیسماعیلو سامی عەبدوڵڵا موختار) گۆڵچی بوون.

تۆپی باڵە: بورهان محەمەد، سامی ئەمین ساڵح، عەبدوڵلاحسەن، جەمیل نەجمەدین، ئازاد جەرجیس، سەباح فاتیح، نەجمەدین ئەنوەر، هیوا تۆفیق.

تۆپی دەست: ئەحمەد عەبدوڵڵا، باهر عەبدوڵڵا، محەمەد عەبدوڵڵا.

تۆپی سەر مێز: ئازاد كاكل، محەمەد عەبدوڵڵا، شەهید عارف فەتاح، ئەكرەم عەبدولواحید، دلێر حوسێن.

باشترین یاریزانە كچەكان: عالیە محەمەد ئەمین، عالیە قادر.

## * ڕاگەیاندنکارانی وەرزشی لە کەرکوك:-

ڕاگەیاندنکارانی وەرزشی بەو چینە وەرزشییە دەڵێن کە وەکو پەیامنێر کاریان کردووە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە گۆڤارو ڕۆژنامەو تەلەفیزۆن، هەستاون بە گواستنەوەی هەواڵە وەرزشییە جۆر بە جۆرەکانی پارێزگاکە لەسەر ئاستی عێراق کاری ئەم چینە لە ڕابردوو و ئێستادا جیاوازی هەیە، کە لە ڕابردوو تەکنیك‌و کەرەستەی سەرەتایی کارەکانیان ڕاپەڕاندووە، بەڵام لە ئێستادا لەسەر ئاستێکی بەرز کارەکانیان ڕادەپەڕێنن.

لە سەرەتادا ڕاگەیاندنی وەرزشی ئەو بایەخەی خۆی نەبوو، کۆمەڵگەی کەرکوکیش لەو ئاستە نەبوو بایەخ بەو لایەنە بدات، بەڵام لەگەڵ سەر هەڵدانی یانەکانی کەرکوك، ڕاگەیاندنی وەرزشیش دەوری خۆی بینی لە پێش کەوتنی ئەم بوارە.

ئەمانەش بەشێکن لە ڕاگەیاندکارانی کەرکوك:-

١- عەبدولغەفور مستەفا

یەکەم کەسێك بووە کە چالاکییە وەرزشییەکانی کەرکوکی گواستووەتەوە هەفتانە بۆ ڕۆژنامەی (البغدادية)و گۆڤاری (الاخاء)، لەنێوان ساڵانی (١٩٦٨- ١٩٧٠) سەرپەرشتی لاپەرەیەکی وەرزشی کردووە لە ڕۆژنامەی شارەوانی کەرکوك هەروەها هەر لە ساڵی (٢٠٠٤)ەوە بە شداری چالاکی وەرزشی کردووە لە (الصراحة، كركوك، صوت القرى، النبأ، کۆپرو، آينا، پنار)

٢- محەمەد حوسێن داغستانی

هەر لە ساڵی (١٩٦١)ەوە تاکو ئێستادا بەشداری چالاکی وەرزشی کردووەو هەواڵەکانی گواستووەتەوە بۆ (صدى كركوك الرياضي) هەروەها لە بەغداو نەینەوا بەشداری گواستنەوەی چالاکی وەرزشی کردووە.

٣- ئیسماعیل سرت تورکمەن:-

ماوەیەك دەوری بینیووە لە گواستنەوەی هەواڵە وەرزشییەکان لە (صدى كركوك الرياضي)

٤- ئەحمەد محەمەد کەرکوکلی:-

لە گەلێك ڕۆژنامەو گۆڤارو کەناڵی ئاسمانی دەوری بینیووە لە گواستنەوەی هەواڵە وەرزشییەکان

٥- عەباس ئەحمەد بەیاتی:-

لەنێوان ساڵانی (١٩٧٠- ١٩٧٤) دەوری بینیووە لە ڕۆژنامەی (يورد)، (صوت الاتحاد)، لە ڕاگەیاندنی عێراقی کاری کردووە وەکو پەیامنێر.

٦- ستار بەرزنجی:-

وەکو یاریزان‌و پێشکەشکاری وەرزشی‌و وەکو پەیامنێر دەوری گەورەی بینیووە.

٧- د. شەمسەدین کۆزەچی:-

دکتۆرای لە ڕاگەیاندن بەدەستهێناوە، وەکو پەیامنێرو یاریزان‌و ڕاهێنەرو پێشکەکەش کاری بەرنامەی وەرزشی کاری کردووە لە تەلەفیزۆنی کەرکوك‌و ئێستگەی بەغداو ڕۆژنامەی (الوطن التركماني)و وەرگێرانی بابەتی وەرزشی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان.

٨- هیوا نەقشبەندی

٩- سالم ئەمین

١٠- بەهائەددین محەمەد حەسەن خاوەن ستۆدیۆی (دی لۆکس) لە ئەحمەد ئاغا

١١- نازم بەیاتی خاوەن ستۆدیۆی (جنائن المعلقة)

١٢- وێنەگر فوزی فەزیل ئلیاس

١٣- نورەدین سەلاح

١٤- فازڵ محەمەد مەلا مستەفا وەکو پەیامنێری وەرزشی کاری کردووە لە گۆڤاری (اهل النفط)

١٥- عەبدولواحید فەهمی وەکو پەیامنێری وەرزشی کاری کردووە لە گۆڤاری (الاهل النفط)

١٦- جەودەت عەتا ئاوچی

پەیامنێری گۆڤاری (الاخاء)

١٧- تەحسینی بەهجەت

پەیامنێری وەرزشی لە ڕۆژنامەی (العراق)

١٨- شاکر سابیر ئەلزابت

١٩- عەبدولرەحمان مستەفا

پەیامنێری ڕۆژنامەی (التآخي)

٢٠- سەروەت عەبدولرەحمان

پەیامنێر بووە لە ڕۆژنامەی العراق، الملاعب البغدادي

٢١- نورهان عەلی

پەیامنێر بووە لە (وكالة الانباء العراقية)

٢٢- یەحیا قاسم

پەیامنێر بووە لە گۆڤاری (الف باء)، (القادسية)

٢٣- ڕزگار شوانی

پەیامنێر بووە لە (البعث الرياضي)، (صوت التأميم)، الإتحاد.

٢٤- بەشار خالید ڕەوف

٢٥- جەنگیز یاسین

پەیامنێر بووە لە (کۆپرو)، (کرکوك نیون)

٢٦- عیرفان عەبدولرەحمان

پێشکەشکار بووە لە تەلەفیزۆنی کەرکوك

٢٧- ئەمیر داغستانی:-

٢٨- شاکیر مەحموود محەمەد داغستانی

٢٩- مام دەریا

پەیامنێرو سەرنووسەری گۆڤاری دەریا

٣٠- ئامینە کەریم

پەیامنێری وەرزشیی ڕۆژنامەی کەرکوکی ئەمڕۆ، هەواڵ و گۆڤاری بانەڕۆژ.

٣١- شەمسەدین محەمەد

پەیامنێری وەرزشیی لە گۆڤاری بانەڕۆژ

### * یەکێتییەکانی وەرزشی لە کەرکوک:-

#### ١- تۆپی پێ

یەکەم یەکێتی تۆپی پێ پێك هات لەم بەرێزانە:- کەماڵ عەبدولقادر، سابیر عەلی، عیزەدین مەجید، لەگەڵ هەریەکە لە نوێنەری سوپاو کۆمپانیایی نەوت دەورێکی گەورەیان بینی لە بواری تۆپی پێ لەنێوان تیپی کۆمپانیاو (الفرقة الثانية) و پەروەردەو (الطيران) بەناوبانگترین وەرزشییەوانەکانی بریتی بوون لە :- محەمەد کاج، عەلوان، رەمزی عومەر، ئەحمەد جەلال، سابیرە لاڵ، شەوکەت عومەر، عەبدوڵلا چەنەباز، عابدین چۆپان، سوداد عەباس کاکەیی، وداد عەباس حیلمی کاکەیی، دەلود فلیپ، سەلیم عەبدوڵلا، ئاکۆب قەرەبیت، بنیامین ئیسحاق، یارش ئیسحاق، سەرکیس سوڵتان، ستار کوردی، سەرکیس یۆنان، جیوی، گۆرکیس تۆما، فەزیل ئلیاس، عادل عەبدوڵلا، کەریم ئەفەندی، فازڵ مەجید، کەنعان محەمەد، سامی مەحموود، ساڵح ئەسوەد، عادل بەشیر، مەیاس داود، ئیسحاق یەعقوب، کەماڵ موفتی، جەلیل کوردی، خورشید نامق، جەلیل ئەبو نازم.

دادوەرەکانی ئەو ماوەیە بریتی بووە لە:-
مستەر ئوتلی، کەماڵ عەبدولقادر، سابیر عەلی، نامیق بیرقدار، فەخری ئاوچی. لە ساڵی (١٩٦٥) پێکهاتەیەکی تازە بۆ یەکێتی تۆپی پێ دروستکرا لەم یاریزانانە:- سامی محەمەد، سابیر عەلی، نیهاد عەلی غالب، قادر مەجید، ئیسحاق یەعقوب، جەودەت عارف هەر لەو ماوەیەدا یاری تۆپی پێی کردووە لەگەڵ هەڵبژاردەی ئەرارات لە ئەرمیناو هەڵبژاردەی روستوف روسیو هەڵبژاردەی ئەڵمانیای دیموکراتیو هەڵبژاردەی شەنتغهای چینیو هەڵبژاردەی جەزائیر.

هەڵبژاردەی کەرکوك لەو کاتەدا پێك هاتبوو لەم یاریزانانە:- کازم یاسین، غازی محەمەد غەریب، محەمەد حەمید، رێسان مەتەر، قاسم دێو، ستار کوردی، عەلی مەرهون، گۆرکیس تۆما، یۆحەنا یۆشیا (شیشو)، کەریم ئەفەندی، عادل عەبدۆڵلا، سەلاح حەسەن، نامیق خورشید، فەزیل ئلیاس، محەمەد حەکی، ئەنوەر عارف.

### * دادوەرە تازەکانی بریتی بووە لە:-

نیهاد عەلی غالب، حەبیب حوسێن تائی، سەمەد سلێمان بلە، عەونی ئیبراهیم، عەبدولغەفور مستەفا، هیجران ئەحمەد، فازڵ محەمەد ئەمین، رەشید خورشید، عەدنان عومەر، فازڵ محەمەد ئەمین، عەزیز مورشید، محمود نورەدین، قاسم دێو، ستار عەبدۆڵلا، عەبدولسەلام ئەحمەد بەیاتی، محەمەد فاتیح نەقشبەندی، ماهیر بەیاتی.

#### ٢- یاری بالە:-

ئەم یارییە لە قوتابخانەو کۆمپانیای نەوتو یەکەکەکانی (الفرقة الثانية) دەکرا کە بە ناوبانگترین تیپی (المخابرة) بوو، کە یاری کردنی لە سەر ئاستی پارێزگاو عێراق بوو، باشترین سەرکەوتن بۆ تیپی باڵەی کەرکوك، دەگەرێتەوە بۆ ساڵی (١٩٦٠) کە بەسەر هەڵبژاردەی بەغدادا سەرکەوت یاریزانەکانی تیپی کەرکوك بریتی بوو لە: لوتفی موزهر تکریتی، ستار بەرزنجی، نیهاد عیزەت ئەرسەلان، نزار قوتبەدین، عومەر وەهبی، مۆفەق ئەمین لەیلانی، حوسێنی ئیبراهیم دەروێش، عەبدولزەهرە شەنانی، سەلمان، سەباح نوری ئەحمەد، عیزەدین محەمەد نوری، سەلمان قادر، زەکی فەیز.

بەڵام پێکهاتەی یەکێتی بالە لە ساڵی (١٩٦٥) پێك هاتبوو لەم یاریزانانە:- سوبحی بیلال، ئویەقیم جۆرج، ئیسماعیل عەبدوڵلا، سەلاح نەورەس، مونزر میخائیل

لە دادوەرە بە ناوبانگەکانیان بریتی بووە لە :- سوبحی بیلال، قادر مەجید، ئەنوەر عەبدوڵلا هورمزی، حەسەن مەلا عەلی، سەباح خالید.

#### ٣- یاری باسکە:-

لە قوتابخانەکانەوە سەری هەڵدا، هەر لەوێوە فراوان بووە کە بەشێك لە قوتابخانەکان ناوبانگیان پێی دەرکردووە. هەروەها مامۆستا حەسیب محەمەد ئەمین لە رووی هونەرییەوە باشترین راهێنەر بووە.

بەناوبانگترین یاریزانەکانی بریتی بووە لە :- قادر مەجید فاروق، فەزیل فەیسەڵ یونس، عەبدولرەحمان عەبدوڵلا (شەشە)، جەلیل قەیسی، فەخری مەحموود، سەباح کامیل، لەتیف، ئازاد غەفورئاغا، پۆلس عەبدوڵلا ئەحمەد، شمۆئیل شیشۆ، فائیق مروکی، نەجات رەشاد، سەلاح محەمەد فەخری، تیفۆس فلیب، ولیام شارڵ، کونا یۆنان، ئەنوەر لیفی، عەبدولکریم. لە ساڵی (١٩٧٣) یەکێتی باسکەی کەرکوك پێکهاتبوو لەم یاریزانانە:-

نیهاد عەلی غالب، حیسامەدین، رەشید، حەسەن عەلی، مستەفا، فلیپ داود، ئۆها نیسیان، ئیسحاق محەمەد رەجەب، نورەدین عوسمان، هیلال عەبدولرەزاق، لوتفی لەتیف، مارتن مەتی، زادمۆن فلیب، فازڵ عومەر، جومعە عەبدولرەحمان، حافل شاول، محەمەد، خەیروڵلا پیرداود.

لە دادوەرەکانی یاری باسکە بریتی بووە لە: ماهیر بەیاتی، نیهاد عەلی غالب، محەمەد بلە، جەلال عەبدولرەزاق، ئەلدولیان حیسامەدین رەشید، جەمال حەسەن.

#### ٤- یاری تۆپی دەستی:-

یارییەکی تازە بوو هاتە نێو پرۆگرامی خوێندنەوە، لە ساڵی (١٩٧٢)ەوە رێچکەی یاریکردنی گرتووە یەکەم یەکێتی یاری تۆپی دەستی پێك هاتووەلە:- نەقیب خەلیل شێخلی، زیائەدین عەباس، سامی عارف، ڤینۆس فلیب.

یاریکەرەکانی تیپی پەروەردەی کرکوك بریتی بووله:- هیلال عەبدولرەزاق، لوتفی لەتیف، ئەحمەد عەلی، سامی محەمەد ئەمین، فازڵ عومەر، سادق محەمەد ئەمین، نیهاد محەمەد سوبحی، سامی ئەمین ساڵح، جەلیل نەجمەدین، ئۆراهام میهرام، عەونی حەسەن، سەرگۆن گۆرگیس.

یاریزانە کچەکان:- جاویدان عەبدولکەریم، شیرینی عەبدولقادر، پەروین فەتحوڵلا، ئەمیرە سەعدەدین، ویداد جەمال، پاکیزە مەحموود، پەیمان عەبدولقادر، عالیە قادر رەفعەت، فیولیت کنۆ، هەنا محەمەد نەورۆز.

٥- یاری زۆرانبازی:-
ئەم یارییە فۆلکلۆرییە لەگەڵ هاتنی مەهدی وەجد هاتە کەرکوك لە کۆتایی پەنجاکاندا، کە هەستا بەراهێنانی بەشێکی زۆری لاوان لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك، هەروەها بەشێکی چالاکی سوپای راهێنا لەم بوارەدا.
لە یاریزانەکانی:- ئیبراهیم مەجید، عومەر وەهبی محەمەد، ئیحسان محەمەد نوری، بورهان ئەحمەد، سەلاحەدین، خدر واحید، عەبدوڵلا زیاب، ئەمیر عتیتوی، شەوقی فەرەج، ئیحسان پاڵەوان.
لە ساڵی (١٩٧٢) یەکێتی زۆرانبازی لقی لێ کرایەوە لەم یاریزانانە: مەهدی وەحید، عەبدولنەبی جاسم، قادر مەجید، عەبدولموتەلیب عەبدوللائەمیر.

٦- یاری شەترەنج:-
یەکێکە لە یارییە فکرییەکان، ماوەیەکی زۆرە ئەم یارییە لە کەرکوك دەکرێت کە بۆ سەردەمی یانەی (الثورة) دەگەرێتەوە بۆ ساڵی (١٩٧٢).
بۆ یەکەم جار یەکێتی یاری شەترەنج دامەزرا لەم بەرێزانە: عەلی شوکر بەیاتی، حەمەد حەمود عوبێدی، نیهاد عەلی غالب.
لە یاریزانە بەناوبانگەکانی:- سامی مەحموود، یەخنا سیاوش، ئەلبێریت یوئێل، باسم سادق، نەجمەدین محەمەد، جەمال ئیبراهیم، شامیل محەمەد.

٧- یاری مستە کۆڵە:-
ئەم یارییە لەلایەن هەندێك لە یاریزانەوە کراوە بە شێوەی تاك یەکەم یەکێتی مستەکۆڵە لە ساڵی (١٩٧٣) لەم بەرێزانەوە دامەزرا:-
خمیس ئەلروبەیعی، جەمال عەلی شەعبان، مەحموود ئیبراهیم، محەمەد سلێمان بلە.
یاریزانەکانی بریتی بوو لە:- ئەحمەد جەلال، ئەنوەر، فەلاح نادر، جەمال عەلی شەعبان، عومەر نەسرەت وەلی، عەدنان ئیسماعیل عومەر، سەرگۆن ماما ئۆشانا، رۆمل فوانکا، سەرگۆن یوئیل.

٨- یاری پاسکیل سواری:-
یارییەکی جوان بوو لە هەوایەکی خۆش سروشت یاری دەکرا یان لەسەر رێگای گشتی لەنێوان شارو قەزاو ناحییەکان، لقێکی یەکێتی پاسکیل سواری پێك هاتبوو لە:- زامن حوسێنی، یخنا شاول، عەبدولواحید عوسمان، زۆربەی بەشدارەکان لەیانە ئاشوری بوو کە یاریزانە بەناوبانگەکانی:- یۆخەنا شاول، ئارارات داود، یۆلیۆس یوسف، تاور جۆنوسا، سەدرەدین یونس، ئەلفرێد سەعید، مەحموود، ئەمیر محەمەد، نەوزاد نیعمە، نیسان ئابی، سوداد میدحەت.

٩- یاری لەشجوانی و مەلەوانی:-
یاریزانەکانی پێك هاتبوو لە:- سەباح بترۆس یۆنان، عاسی غەفور ئەحمەد، نوری وەلی فەقێ

١٠- یاری هۆکی:-
ئەم یارییە چەند کەسێکی دیاریکراووکەم دەیانکرد، ئەم یارییە ئینگلیزەکان هێنایانە کەرکوکەوە، لە یاریزانەکانی:- رەشید حەمید (خاوەن کۆگای رەشید)، عەبدولعەزیز محەمەد وەیس، خۆشا.

١١- یاری گۆرەپان و مەیدان:-
لە یاریزانەکانی:- ئەنوەر غەفور محەمەد، بورهان رەشید محەمەد، عەدنان شکور، عەلی عەبدولجەبار، عادل عەبدوڵلا، ستراك ئوهانیس.

١٢- یاری تۆپی سەرمێز:-
ئەم یارییە ماوەیەکی چاك رۆڵی بینی لە کەرکوکدا و گەلێك یاریزانی وەکو ئازاد کاکل لە دەرەوەی کەرکوك ناوبانگیان دەرکرد.

* سەرچاوەکان:-
- کرکوك بانۆراما التاریخ والانسان، د. ئیبراهیم خەلیل سەعید، بەرگی دووەم ساڵی ٢٠١٥.

*** (بزووتنەوەی وەرزشی لە كۆمپانیای نەوتی عێراق):-**

**د. ئیبراهیم خەلیل سەعید**

سەرەتاكانی وەرزشی لەم كۆمپانیایە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی كۆمپانیاكە لە سییەكانی سەدەی ڕابردوو، كە لە ماوەی دامەزراندنییەوە گەلێك چالاكی وەرزشی جۆراوجۆرییان ئەنجامداوە.
بۆ یەكەم جار گۆڕەپانی وەرزشی كۆمپانیاكە بۆ تۆپی پێ و گۆڕەپان و مەیدان لە گەڕەكی (ئەلماس) دامەزرا، كە بە ناوبانگ بوو بە گۆڕەپانی كۆمپانیای نەوتی عێراق، لایەكی سەرسووڕهێنەری ئەم گۆڕەپانە لەوەدابوو كەلە جیاتی



ئەوەی بەچایەر فەرش بكرێت، زفت یان نەوتی ڕەشیان بەسەر خۆڵەكەدا كردبوو، سەرپەرشتیاری سەرەكی ئەم گۆڕەپانە مستەر (شێو)بوو كە هەڵگری ڕەگەزنامەی فەرەنسی بوو، هەروەها لە ساڵی (١٩٥٤)یش گۆڕەپانی (گۆڵف)ی لە ناوچەی (بابەگورگور) دامەزراند.
بەپێی بەڵگەنامەكان ساڵی (١٩٣٢) تیپی تۆپی پێی كۆمپانیا دامەزراوە، كە مستەر (هۆجكیس) سەرپەرشتیاری تیپەكە بووە، بەردەوام بوو لە كاركردن تا ١٤ی تەمووزی ساڵی (١٩٨٥).
لە ساڵی (١٩٧٢) ناوەكەی گۆڕا بۆ یانەی یەكی حوزەیران، لە دوایدا ناوەكەی گۆڕا بۆ یانەی كەركوكی وەرزشی، یەكێتی تۆپی پێی كۆمپانیا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٥٤)، كە مستەر (ئورول) سەرپەرشتی دەكرد. هەروەها لەپاڵ ئەمانە تیپی بەشەكانی كۆمپانیاش هەبوو وەكو (الانتاج، الذاتیة، قسم التركین).
ئەوەی جێگەی ئاماژەیە كە (سابیر عەلی هەمەوەندی) دەورێكی گەورەی بینووە لە تیپی كۆمپانیاو لە دامەزراندنی دیدەوانی لە كەركوك كە لە ساڵی (١٩٥٦) تیپی دیدەوانی كۆمپانیای نەوتی عێراقی دامەزراند.
ڕاهێنەرەكانی تیپی كۆمپانیای نەوتی عێراق لەنێو كەركوك بریتی بوو لە: (مەناف محەمەد- عیماد قادر، دارا قادر، عەونی غەنی، فەرەیدون مستەفا) لە دەرەوەی كەركوكیش بریتی بوو لە: (مەعد ئیبراهیم، ئوسامە نوری، حەمید سلێمان) هەموو ساڵێك كۆمپانیای نەوتی عێراق هەڵدەستا بە چالاكی و میهرەجانی وەرزشی كە خەڵكێكی زۆر دەهاتن بۆ بینین و بەشدارییان لەو چالاكییانە دەكرد.
لەم كۆمپانیایە گەلێك وەرزشەوانی بە توانای پێگەیاندووە لە وانە: (كەریم ئەفەندی، عادل عەبدوڵلا، كازم، ئارام كازم، خورشید نامیق، ستار حەسەن، فەزیل ئیلیاس، ویداد، یۆراش ئیسحاق).
یاریزانەكانی كۆمپانیای نەوتی عێراق بریتی بوونە لە:- (شەهاب ئەحمەد، فەخری ئاوچی، خورشید نامیق، نەشئەت محەمەد، كازم یاسین، تەحسین عەبدوڵلا، جەلال عوسمان عومەر، عەدنان عەبدولقادر، عادل عەلی، فەرەیدون مستەفا نائیب، نەجات شێخۆ ئیلیاس، حەبیب تائی، شاكر ڕەشید ڕەئووف، خەتاب یاسین، سەلاح بەهائەدین، سوبحی مەحموود، موئەیەد سەلاحەدین، عادل شوكر، عابدین زەینل، كازم زەینەل، سەلاح ڕەفیق، نورەدین زێدان، سەباح نامیق، نورەدین محێدین، جومعە عەبدولڕەحمان، عەبدولحەمید كەریم، عەلی محەمەد.

### * بزووتنەوەی وەرزشی لە کفری:-

سەلاحەددین عەبدولحەمید

وەرزش یەکێکە لە بنەما هەرە بەهێزەکانی دروستکردنی پەیوەندی لەنێوان خەڵکی بە گشتیو وەرزشوانانو لاوان بەتایبەتی. لەلایەکی تریشەوە وەرزش ئێستا ڕۆڵو کاریگەرییەکی بەهێزی هەیە لەسەر هەموو توێژەکانی کۆمەڵو ڕووی شارستانییەتی وڵاتان دەخاتە ڕوو. هەر بۆیە ئێستا وەرزش وەك واقیعێکی سەپێنراو هەموو وڵاتانی دونیا لە دەرگای وەرزشەوە زۆربەی بەرنامە سیاسییەکانیان جێبەجێ دەکەنو بایەخێکی گەورەیان بە وەرزش داوەو هەموو توانایەکیان خستووەتە گەڕ بۆ پێشخستنی. هەر لەو ڕوانگەیەوە بەپێویستی ئەزانم تیشکێك بخەمە سەر بزووتنەوەی وەرزشی لەم شارە.

چونکە شاری کفری مێژوویەکی پرشنگداری هەیە لەو بوارەدا. مێژووی سەرەتاکانی وەرزشی لە کفری دەگەڕێتەوە بۆ دوای شەڕی جیهانی دووەم. لەو سەردەمەدا لە ڕێگای ئینگلیزو هیندییەکانەوە وەرزش هاتووەتە شارەکەوە، بەڵام لە کۆتایی چلەکاندا، کە ئامادەیی کفری کراوەتەوە وەرزش چووەتە قۆناغێکی ترەوەو بەفراوانی هەموو چالاکییە وەرزشییەکان کراوەو گەیشتووەتە ئاستێکی بەرز، چونکە هەموومان دەزانین وەرزش بەشێوە دروستو زانستییەکەی لە قوتابخانەکانەوە دەستپێدەکاتو گەشە دەکات. لەو سەردەمەدا لە ئامادەیی کفری هەموو چالاکییە وەرزشییەکان (گۆڕەپانو مەیدانو بالەو باسکەو تۆپی پێو هتد..). بەفراوانی کراوەو پێویستیشە بۆ مێژوو ئاماژە بە ڕۆڵی کاریگەری هەرسێ (مامۆستا قادر ئەحمەد سبیلو نەجمەددین ئەحمەد فلەیحو محەمەد خدر دەباغ) بکەین، کە ئەتوانین ڕاشکاوانە بڵێین وەرزش لەم شارەدا لەسەر دەستی ئەو سێ مامۆستا وەرزشییە بناغەکەی دارێژراوەو گەشەی کردووە.

### * (لە بواری گۆڕەپانو مەیدان):-

لە سەرەتای پەنجەکانەوە هەموو ساڵێك ڤێستیڤاڵی وەرزشی ساڵانە کراوەو چەندین وەرزشکاری لێهاتوو لە شاری کفری لەو بوارەدا پێگەیشتووەو گەیشتووەتە ئاستێکی بەرز، وەکو سەلمان قادر، کە لە هەڵدانی قورس یەکەمی ئامادەییەکانی هەموو عێراق بووەو لە پاڵەوانێتی وڵاتانی عەرەبیشدا، کە لە بەیروت کراوە نوێنەرایەتی ئامادەییەکانی عێراقی کردووە. لە بواری بازدانی زانەیشدا ئەحمەد مەحموود عەتارو یونس عەزیز گەیشتوونەتە ئاستێکی زۆر بەرز. لە ساڵی (١٩٥٣) یشدا بۆ یەکەمین جار لە شاری کفری ڤێستیڤاڵێکی گەورە ساز کراوەو تیایدا هەموو قوتابخانەکانی کفریو ناحییەکانی (قوتابیانی کچو کوڕ) بەشدارییان کردووەو هەردوو مامۆستا محەمەد خدرو کاترین، کە مامۆستایەکی ئافرەتی مەسیحی بووە، ڕۆڵی سەرەکیان گێڕاوە لە بەڕێوەبردنی ئەو ڤێستیڤاڵە گەورەیە.

لە بواری بالەشدا تیپی بالەی شاری کفری لەو سەردەمەدا نەك لەسەر ئاستی پارێزگای کەرکوك، بەڵکو یەکێك بووە لە تیپە باشەکانی هەموو کوردستان. چەندین یاریزانی لێهاتووی تیادا هەڵکەوتووە، وەکو (سەلمان قادر، محەمەد حەسەن سالح، فایەق عەزیزو عەبدوەدود - کە خەڵکی کفری نەبووەو باوکی لە کفری فەرمانبەر بووە، ئەحمەد مەحموود عەتار، سەلاح عەلی، تالیب ئاغا، ئیکرام حاجی علی، غالیب ئاغاو صابر سەلمان) تەنانەت سەلمان قادر لەو سەردەمەدا گەیشتووەتە هەڵبژاردەی عێراق. هەموو ساڵێکیش تیپی بالەی کفری یەکەم بووە لەسەر ئاستی پارێزگای کەرکوك.

تیپی باسکەی کفری:- ئەگەرچی لەو سەردەمەدا نەگەیشتووەتە ئاستێکی بەرز، بەڵام لە ئامادەیی کفری، ئەم یارییە بنەمایەکی باشی هەبووەو تیپەکەش لەم یاریزانانە پێکهاتبوو: (قادر بەهجەت، تاهیر سابیر سەراج، حەسەن کازم، مەجید قادر شەمسە، هیدایەت حاجی خالید، سالح خدر، ئیحسان عەبدوڵڵا ئاغا، عەبدولخالق، ئیحسان حاجی محەمەد، ماهیرو زوهدی ئەحمەد بەگو هتد).

### * یاری بۆکسێن (مستەکۆڵە):-

لە ساڵانی (١٩٥٢و ١٩٥٣) مامۆستایەکی ئامادەیی کفری، کە ناوی (فازڵ عەباس ئەللامی)بوو، یەکێك بوو لە پاڵەوانەکانی بۆکسێن لەسەر ئاستی عێراق، کە هاتووەتە کفری دڵسۆزانە توانیویەتی هونەری ئەو یارییە لە کفری بڵاوبکاتەوەو چەندین یاریزانی باشی لەو بوارەدا پێگەیاندووە، وەکو (ئەحمەد مەحموود عەتار، ئەحمەد قەیسوور، ئایدن حەسەنو جەمیل ئەحمەد بەگو.. هتد)و چەندین جاریش لە یاریگای ئامادەیی کفری یارییان ئەنجامداوە، بۆ خەڵکی شارەکە.

### * یاری تۆپی پێ:-

ئەتوانین بڵێین بناغەی بزووتنەوەی وەرزشی لە شاری کفری بە تۆپی پێ بنیاتنراوە. لە سەرەتای پەنجاکانەوە هەڵبژاردەی تۆپی پێی کفری، کە هەڵبژاردەی ئامادەیی کفریش بووە، لەو سەردەمەدا تیپی تۆپی پێی کفری ئاستێکی زۆر بەرزی



هەڵبژاردەی بالەی ئامادەیی کفری ساڵی ١٩٦٢

هەبووەو چەندین یاری بەهێزی لەگەڵ (موانئ البصرة) و (مخيم رقم ٨ی بصره)و (کۆمپانیای نەوتی کەرکوك)و (حەبانییەی بەغدا)و (هەڵبژاردەی کەرکوك)و (خانەقین)و (دووز) ئەنجام داوە.

یاریزانە باشەکانی ئەو سەردەمەش (سەلمان قادرو سەلاح عەلیو ئەحمەد مەحموود عەتارو محەمەد خدرو فاروق حەکیمو محەمەد مستەفا ناسراو بە حەمە فەنانو یونس عەزیزو ئایدن حەسەنو ئیکرام عەلیو جەمال حاجی عەلیو عەلی حەمە خانو یاسین فەقێ عەلی بوون.

لە ناوەراستی شەستەکانیشدا هەردوو تیپی (یۆلدرم) و تیپی (سادە) بزووتنەوەیەکی وەرزشی بەهێزیان خستە شاری کفریو ناوچەکەوەو دەیان یاری بەهێزیان لەگەڵ تیپە ناودارەکانی بەغداو کەرکوكو خانەقینو دووز ساز کردو کاریگەرییەکی گەورەشیان هەبوو لەسەر تیپەکانی دوای خۆیان لە کفری.

تیپی یولدرم:- تیپێکێ بەهێزی ئەو سەردەمە بوو. تیپەکەش لەم یاریزانە لێهاتووانە پێکهاتبوو: بورهان خەلیل، موسلیح عەلی، (دەمیر، قوبلای، شاهین)و (یوکسەل، نەجدەت)و میدحەت محەمەد شەریف، عەبدولخالق، حەسەن پینەچی، نەوزاد حەمید، عەلی حەمید، ئەنوەر مەلا عوسمانو تالیب حاجی خالیدو. هتد).

پێویستە بۆ مێژوو ئاماژە بەوە بکەین، کە دەستەیەکی بەئەمەكو دڵسۆزو وەرزش دۆست کۆمەکی تیپی یولدرمیان دەکردو ئەو دەستەیەش بریتی بوون لە: مامۆستا ئیکرام عەلی، دەمیر محەمەد عەلیو رەزوان محەمەد نوعمان.

تیپی سادە: تیپێکی بەهێزو تۆکمەی شارەکە بوو. تیپەکەش بریتی بوون لەم یاریزانانە: ئیحسان عەبدوڵلا ئاغا، سیروان حاجی ئەمین، حەسەن حەمە خان، مەهدی سەید تۆفیق، ئیسماعیل محەمەد فرسەت، مەحموود ئەحمەد عەلی نەفتچی سیروان خورشید بەگ، موکەرەم عەبدوڵلا ئاغا، ئیکرام مەحموود نەدیم، حەسەن حاجی رەئوف، عەبدوڵلا سابیر،



تیپی تۆپی پێی یەکێتی قوتابیانی کوردستان - کفری ساڵی (١٩٧١): وەستاوەکان لە راستەوە: ئاراز عەزیز، ئازاد فازڵ، فەتحوڵلا عەبدوڵلا، فازڵ عەبدولکەریم، سەلاحەددین عەبدولحەمید، ئەنوەر قادر، حیکمەت قادر، مامۆستا سالار ئیسماعیل. دانیشتووەکان لە راستەوە: جەودەت قادر، عومەر سەعید، حەسەن حەیدەر، حوسێن حاجی رەئوف.



هەڵبژاردەی تۆپی پێی ئامادەیی کفری ساڵی ١٩٦١

نەجات حاجی ئەمینو فایەق ئەحمەد ئەلیاس و.. هتد.

تیپی سادە دەستەیەکی کارگێریی بە تواناو دڵسۆزی هەبوو، بۆ راپەراندنو بەرێوەبردنی کاروباری تیپییەکە، دەستەکەش بریتی بوون لە: ئیحسان عەبدوڵلا ئاغا، محەمەد کەریم دورسنو مەهدی سەید تۆفیق. هەروەها پێویستە بۆ مێژوو ئاماژە بە ناوی هەندێ کەسایەتی دەستڕۆی شارەکە بکەین، کە بە بەردەوامی کۆمەکی تیپی سادەیان دەکردو ئەو کەسایەتییانەش ئەمانە بوون: ئیحسان عەبدوڵلا ئاغاو محەمەد کەریم دورسنو حاجی حەسەن فیشەکچیو فەقێ محەمەد سەعاتچیو سەید تۆفیقو مەلا عەولو حەسیب حاجی رەئوفو حەبیب محەمەد سەلیم ئاغاو حاجی عەلی.

لەو سەردەمەشدا لە کفری تیپی (ئازادی)یش هەبوو، کە بریتی بوون لە: (بەهزادو سەباحو حیکمەت)و عەدنان سەید قادرو سالار ئیسماعیلو ئیسماعیل جەبارو فازڵ محەمەد ئەمین ناسراو بە چریو سەردار کاملو.. هتد، بەڵام ئاستو چالاکی ئەوتۆیان نەبوو. لەسەرەتای حەفتاکانیش تیپی یەکێتی قوتابیانی کوردستانیش، کە بریتی بوون لە: حیکمەتو جەودەتو ئەنوەرو فەتحوڵلا عەبدوڵلاو ئاراسو حوسێن حاجی رەئوفو فازڵ عەبدولکەریمو سەلاحەدین عەبدولحەمیدو ئازاد فازڵو قادر محەمەدو عومەر سەعید شەریفو حەسەن حەیدەرو هتد. باشترین تیپی تۆپی پێی ئەو سەردەمە بووو دواتر لەگەڵ چەن یاریزانێکی تری شارەکە، وەکو عەلی حەمیدو تالیب سەعیدو سەمیر عەبدوڵلاو فازڵ عەباسو سیروان جاسم، تا کۆتایی حەفتاکان هەڵبژاردەی کفرییان پێکهێنابوو.

## *مێژووی (لەشجوانی) لە عێراق:-

عیماد محەمەد شەریف جەباری

سەرەتای ئەم یارییە لە عێراق، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو، کە لە بەغدا لە ناوچەی (ئەبی نەواس) یاری هەڵگرتنی قورساییان دەکرد کە جوولەکەکان لە سەرەتادا لەسەر ڕووباری دیجلە دەستپێشخەربوون لە پەرەپێدانی ئەم یارییە لە پاڵ یارییە وەرزشییەکانی تر.
ئەو شوێنەی کە وەرزشی هەڵگرتنی قورساییان تێدا دەکرد پێیان دەوت (چەرداغ) وەکو شێوە یانەیەکی وەرزشی دا بوو کە کۆمەڵێك گەنجی لە خۆی گرتبوو، یەکێك لەوانە (سەبری هیلالی) بوو، کە دەورێکی باڵای هەبوو، لە هێنانی کەرەستەکانی هەڵگرتنی قورسایی لە دەرەوەی وڵات، خۆشی لە سەرەتادا یەکێك بووە لە یاریزانەکانی (زۆرخانە).
لەدوای ئەویش هەریەکە لە (فازڵ عەبدولجەبار)و (جەعفەر سەلباسی) ڕۆڵی باڵایان بینی لە پێشکەوتنی ئەم وەرزشە.
لە سەرەتادا لەبەر زەحمەتی هێنانی کەرەستەکانی هەڵگرتنی قورسای لە دەرەوە، هەڵدەستان بە دروستکردنی ناوخۆیی ئەو کەرەستانە، پارچەکانی هەڵگرتنی قورساییان لە چیمەنتۆو خۆڵ و ڕەساس و تەرزینە دروست دەکرد.
سەرەتاکانی ساڵی (١٩٤٣)، هەرچەندە بە تەواوەتی سەری نەگرد، بەڵام بناغەی دامەزراندنی یەکێتی هەڵگرتنی قورسایی بوو لە عێراق و بناغەی بیری ئەو یەکێتییە چەکەرەی کرد.
هەر ئەمەش بوو وایکرد کەلە ساڵی (١٩٤٤) بیری چالاکی وەرزشی هەڵگرتنی قورسایی سەری هەڵداو، پاڵەوانێتی ئەم یارییە برەوی وەرگرت، یەکەم پاڵەوانێتی لەسەر ئاستی عێراق ئەم یاریزانانە بەشدارییان تێدا کرد:- (فازڵ عەبدولجەبار، ئەرشافیل ئاغاباب، ناسر ئەلغافقی، محەمەد ئەریاتی، موسا ئەلعەعزەمی، فەیزی زەهاوی، عەزرا داود، مەجید لولو، زیا حەسەن، جاسم محەمەد، عەبدولکەریم ئەیوب).
نێوان ساڵانی (١٩٤٥- ١٩٥٨) چەند جارێك پاڵەوانێتی هەڵگرتنی قورسایی و لەشجوانی ئەنجام درا. هەر لەو ساڵانەش یەکتێیەکانی لەشجوانی و قورسایی، هەڵبژاردنی خۆی کردووەو لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو لە چوارچێوەی عێراق چووەتە دەرەوەو بەشداری پاڵەوانێتی وڵاتانی دەوروبەری کردووە.

### * لەشجوانی و قورسایی هەڵگرتن لە کەرکوك:-

لەدوای ئەوەی لە بەغداو دەوروبەری بڵاوبووەو برەوی خۆی سەند پارێزگاکانی تری عێراق، هەنگاوی خێرای نا بەرەو گرنگی دان بەوەرزشی لەشجوانی، بەتایبەتیش لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان بایەخدان پێی زیادی کردو، لەسەر بارێکی پێشکەوتووتر ڕێچکەی خۆی وەرگرت.
بۆیە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو بزووتنەوەی وەرزشی لەشجوانی و ئاسن هەڵگرتنی لێرەو لەوێ برەوی خۆی سەندو گەلێك یانەو تیپی وەرزشی لەشجوانی کرایەوە لە ناوچەکانی کەرکوك بە تایبەتی لە گەڕەکی (بەرتەکیە)و (ڕێگای بەغدا) (نوری فەقێ) کە یەکێکە لە یاریزانەکانی لەشجوانی لە بیرەوەرییەکانیدا ئاوا باسی ئاسن هەڵگرتن و لەشجوانی دەکات:-
(لە ساڵی (١٩٥٣)وە دەستمان کرد بەیاری ئاسن، من ئەو کاتە چایخانەم هەبوو، لە شوێنی نەقلیاتی سلێمانی ئێستا کە بە حەسیر دروستکرابوو. لە تەك مەکینەیەکی ئاردی شێخ فازڵ بوو کە هی باوکی شێخ پیرۆت بوو، دەستەیەکمان دروستکرد بەناوی یانەی (چوار باغ)ەوە، چایخانەش بەناوی چایخانەی چوار باغ و تیپێکی تۆپێنیشمان هەر بەناوی چوارباغەوە دامەزراند بوو، چایخانەیەکیش لە (ساحة طیران) بوو، کە یاری ئاسنیان دەکرد بەڵام توانایان زۆر نەبوو.
ئەوانەی کە یاری ئاسنیان دەکرد وەکو لەبیرم مابێت ئەم زاتە بەڕێزانە بوو: (فەقێ نوری)، (محەمەد سەعید)، (بەکر مەلا عەبدوڵڵا)، (بەهائەدین فەخرەدین)، ( وەهبی مەلا محەمەد)، ئیسماعیل - عەرەب بوو)، (ئەبو حەقی)، (محەمەد عەبدولقادر)، ئەمە پاڵەوانی شمالی، وەرگرت، (ئیبراهیم ئەسوەد).
ئێواران چایخانەکە ئەوەندە قەرەباڵغ دەبوو، کە جێگەی دانیشتنی نەبوو، بێجگە لە یاری ئاسن ئامانجمان بوو کە هەر پانزە ڕۆژ جارێك کۆڕێکی سیاسیمان ڕێکدەخست بەزمانی کوردی، کەلە ئامانجی حیزبی شیوعی کارمان دەکرد.
هەر لەو کۆڕەدا پیاوی بەتەمەنمان دادەنا بۆ پشتگیری کردنی کۆڕەکان و داوامان دەکرد کە خەڵکەکە هان بدەن دژی شەڕو هەوڵدان بۆ ئاشتی، تا بەوەی لەگەڵ ئامانجەکانی حیزبی شیوعیدا بگونجێت. ئەوەی کە بیرم بێت کە لە یاری ئاسن هەڵگرتندا سێ جۆرە قورسایمان (دۆبلن) بەکاردەهێنا بریتی بوو لە ٣٠ کیلۆ گرام، ١٥ کیلۆ گرام، ٧ کیلۆ گرام.
دەربارەی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی کە لەو کاتەدا دەگەیشتە دەستمان دەربارەی وەرزشی زیاتر ئەو گۆڤارە وەرزشییانەمان پێدەگەیشت کە لە میسری عەرەبییەوە دەهات، کە دەربارەی یاریکردنی کۆرسەکانی تێدا بوو.
ئەو یاریچییانەی کە لەبیرم مابێت کە یارییان دەکرد:-
(فاروق نامق)، (عەلی محەمەد)، (عەلی سەعید)، (نەجات محەمەد)، (فاتیح حاجی عەبدوڵڵا)، (ناسح حاجی عەبدوڵڵا)، (فەخرەدین).
بەبیرم دێت جارێکیان یارییەك کرا لەنێوان ئەم تیپانەی گەڕەکەکانی کەرکوك وەکو (تیپی چوار باغ)، (تیپی ئیمام



بەدیع كوردی

قاسم)، (تیپی قەلا)، (تیپی قەسابخانە).

لە دوایدا دوای ماوەیەكی زۆر یاریكردن كە چەند ڕۆژێكی خایاند یاری مایەوە لەنێوان (تیپی چوار باغ) و (تیپی قەلا) كە لە دوایدا (تیپی قەلا) بردیانەوە.

ئەو یاریچیانەی كە بەشدارییان كرد:-

(محەمەد قەلایی)، (محەمەد، ن. چ)، (سەباح ئەحمەد پالاس)، (قەرە نەجمەدین)، (وەستا عەبوو تۆرنەچی)، (خورشید ئەسوەد نوری).

بەلام لە شەستەكان‌و حەفتەكانی سەدەی ڕابردوو ئەم وەرزشە گەشەی خۆی كردوو گەلێك یاریزانی بەناوبانگ ناوبانگیان سەند لە نموونەی شەستەكان:-

تۆفیق عەبدوللا، لەفتە كازم، عەلە تەرمزان، ستار حەمادی، نوری حەمدی حەنە، گونە (محەمەد عەلی)، عادل عەبدوللا، عەزیز كەرەم.

لە حەفتاكانیش نموونەیان بریتی بووە لە :-

بەدیع كوردی، تۆفیق عەبدوللا، ئیبراهیم خەلە، جەوهەر عوبێد، ئایدن ڕەشید، عەبدوللا ڕەشید، ئیبراهیم خەلەف، عیماد، غازی فاتیح، عادل عەبدوللا، سلێمان زێدان، حوسێن عەلی، محەمەد حەمزە، لەفتە كازم، ستار حەمزە، یوسف فەتاح، یوسف ئەبو عومەر.

*** حەفتاكانی سەدەی ڕابردوو گەلێك یەكێتی لەشجوانی كرایەوە بەتایبەت لە ساڵی (١٩٧٢) كە بەسەرپەرشتی:-**

١-سەبری ڕەماحی، سەرۆك.

٢-ئەحمەد سەعید ئەلهاشمی، سكرتێر

٣-عادل عەبدوللا جومعە، ئەندام، مامۆستای ڕەسم بوو لە قوتابخانەی ئەیوبییە.

*** لە ساڵی (١٩٧٤) یەكێتی لەشجوانی لە كەركوك پێكهاتبوو لە :-**

١-دانیال ئەنۆ یوسف، سەرۆك

٢-عادل عەبدوللا، سكرتێر

٣-ڕافع جۆمەر فەتاح، ئەمینی دارایی

*** لەساڵی (١٩٨٠) یەكێتی لەشجوانی لە كەركوك پێك هاتبوو لە :-**

١- عادل عەبدوللا

٢- جەلال محەمەد قادر

٣- سابیر عەلی

*** لەساڵی (١٩٨٣) یەكێتی لەشجوانی لە كەركوك پێك هاتبوو:-**

١- عیماد محەمەد شەریف

٢- جەمال ئەمر

٣- موحی عەبدولجەبار.



حەسەن عەبدوڵڵا غەریب



ئیبراهیم قەهوەچی - موسەڵڵا



ئیبراهیم خەڵەف تاڵیب - سدیق - عەزیز کەرەم



**یاریزان نوری فەقێ لە کاتی کردنەوەی هۆڵێکی لەشجوانی بۆ ڕاهێنەر عیماد شەریف**

*** یاریزانەکانی لەشجوانی لە کەرکوك:-**



ئایدن ڕەشید

سەبار ئیسماعیل خەلیل، هانی سەلاحەدین، فازڵ فەیسەڵ محەمەد، دانا محەمەد نورەدین، نەشئەت ئیبراهیم حوسێن، محەمەد ئیحسان، مازن ئەمین زەکی، زیاد جۆزیف مەنبەر، محەمەد شەمسەدین، فازڵ حەمە حەسەن، نافع سەلاح، جەنگیز ئەحمەد ڕەشید، عیماد محەمەد شەریف، حەمید مەجید کاری، حوسێن عەلی، وەلید ئیسماعیل، خالید ئیسماعیل، زەکی عەبدوڵلا، لەفتە کازم، ئیبراهیم خەڵەف، غازی فاتیح، جەوهەر عوبێد، ئایدن ڕەشید، نەجات عەبدولڕەحمان محەمەد جەباری، ئەحمەد مەریوان غەریب، ئەیاد عاسی عوبێد، زەکەریا زوهێر نادر، مەولود فەخرەدین نەریمان، عیماد عومەر سالح، کاروان ئەکبەر عومەر جەباری، پشتیوان سالح، جونێد محەمەد عەباس، حازم فاتح ئەلحەمدانی، تاریق حەمید محەمەد، سەرتیب مەزهەر محەمەد، محەمەد شەماڵ، ئاکۆ محەمەد جەمیل، ئەنوەر عەلی، عومەر عەبدولباری، عەبدولحەکیم کەریم، عومەر محەمەد، حازم فالح، هێمن سەید محەمەد، شەهاب ئەنوەر، مەولود فەخرەدین، شوان محەمەد، هاوسەر محەمەد، بەهجەت نەجمەدین، بابان عەلی، ئالان محەمەد، سالم محەمەد، سالم محەمەد، محەمەد نازم، نەبەز عەبدولکەریم، دڵشاد محەمەد، عەبدوڵلا مەولود، یوسف جەودەت، حەسەن نەجم عەبدوڵلا، کاروان سدیق ئەحمەد، عادل عەبدوڵلا جومعە، مستەفا عەبدولکەریم داودی، کاروان حەسەن ئەحمەد، عەبدولوەهاب سدیق ڕەشید، ئەحمەد عەبدولحەمید، عەبدوڵلا تاها، دیلان محەمەد، حەسەنێن محەمەد، محەمەد نازم، سەرتیپ موزهر، هاوژین، عەبدولجەبار، حوسێن محەمەد، هانی سەلاحەدین، محەمەد ئیبراهیم، محەمەد غەنی، دڵشاد محەمەد، حامد عەتار، جاسم خالید، حوسێن محەمەد، کاروان عوبێد، کاروان ئەمیر، ئەحمەد خەلیل، عەلی دەروێش، ئەحمەد عەبدولحەمید، حەسنێن قەیس، ئەنوەر عەلی، حەمدی حەمودی، هێمن عەلی، وسام کەریم، محەمەد فەتحی، ئەیاد عاسی، لەتیف کەریم، میهرەبان کەریم، ئیبراهیم فاروق، دانانورەدین، ئومێد جەبار، دیار ئەحمەد، ئەشرەف حوسێن، عەبدوڵلا نەجم عەبدوڵلا، هاشم محەمەد یاسین، حازم ئەکرەم، یاسین قەلەندەر، ئەحمەد عاسی، تاریق عەزیز، راجی کازم، نازم غالب، محەمەد نوری نەجمەدین، ئەشرەف حوسێن، یوسف کەریم، ئوسامە سەلام، نەبیل مۆفەق، مەریوان مەجید وەلی، لەبیب بەهائەدین، حەمزە قاسم، ئایدن ڕەشید، محەمەد شەمسەدین، موارد فاروق، نیران خەتاب، سەنگەر جومعە، موراد عیرفان، عادل عەبدوڵلا، شاکر مەحموود غە



ئەیاد عاسی عوبێد

**جونەید محەمەد عەباس**



**سەبیار ئیسماعیل خەلیل**



**سەرتیپ مەزهەر محەمەد**



سەرکەوتنی کەرکوك بەسەر هەموو تیپ و یانەکانی عێراق ساڵی ٢٠١٣



سلێمان ڕەمەزان وەهاب



عەلی دەروێش




عیماد شەریف لە پاڵەوانێتی کەرکوك ساڵی ١٩٧٦ براوەی دووەم بووە

عیماد عومەر ساڵح



عیماد محەمەد شەریف ١٩٧٥



عیماد محەمەد شەریف ١٩٧٦



عیماد محەمەد شەریف



کۆمەڵێك لەشجوانانی خورماتوو



مەولوود فەخرەدین نەریمان



محەمەد ئیحسان ئەکبەر




عەزیز عەبدوڵڵا



عەزیز عەبدوڵڵا



ڕاوەستاوان لە ڕاستەوە:- کاروان - کنعان - ئاری - نەهرۆ- شاکر - ئاری
دانیشتووان لە ڕاستەوە:- عەزیز عەبدوڵڵا - دەوەن - ئەردەڵان - ئامانج



ڕاوەستاوان لە ڕاستەوە:- نەهرۆ - سلێمان - سابیر - عەزیز
دانیشتووان:- کاروان - عادل




عەزیز عەبدوڵڵا



لە چەپەوە عەزیز عەبدوڵڵا و کاروان حەسەن



لە چەپەوە:- عەزیز کەرەم - عیماد محەمەد شەریف - عەزیز عەبدوڵڵا



جەنگیز و سەرتیپ ناسیح



ڕاهێنەر هێمن نەسرەدین



ڕاهێنەر عەزیز عەبدوڵڵا



هێمن نەسرەدین لە پاڵەوانێتی پارێزگا بۆ هێزی لەش



**هێمن نەسرەدین لە پاڵەوانێتی پارێزگا بۆ هێزی لەش**



**هێمن نەسرەدین، کاروان حەسەن، سلێمان ڕەمەزان لە پاڵەوانێتی پارێزگا بۆ هێزی لەش**

*** (عیماد محەمەد شەریف - عیماد جەباری):-**
- ساڵی (١٩٥٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٠)ەوە پەیوەندی بەیانەی سۆلاڤەوە کردووە.
- ئێستا ڕاهێنەرو کاروباری کارگێڕی یانەکە دەباتەڕێوە.
- یاری لەشجوانی لە باوکیەوە فێربوو، کە یەکێك بووە لە یاریزانەکانی لەشجوانی لە زۆر خانەکان.
- لەبار خراپی گوزەرانیان و شەهید بوونی باوکی لە (سەماوە) وازی لەشجوانی هێناوەو لە ساڵی (١٩٧٨)ەوە، وەکو ڕاهێنەر کار دەکات.
- ئێستاش خاوەنی یانەیەکی وەرزشیە بۆ لەشجوانی.
- بەکالۆریۆسی لە پەروەردەی وەرزشی تەواو کردووە.
- دەرچووی پەیمانگای (القوى لإعداد القادة في مجال الشباب في الجامعة العربية).
- بڕوانامەی ئەکادیمای بەدەستهێناوە لە (البناء الاجسام والتربية البدنية).
- ڕاهێنەری نێودەوڵەتییە بۆ لەشجوانی.
- ڕاهێنەری نێودەوڵەتییە بۆ قورسایی هەڵگرتن.
- ڕاهێنەری نێودەوڵەتییە بۆ هەڵگرتنی لەش
- بڕوانامەی نێودەوڵەتی هەیە لەسەر ڕاگەیاندن
- ساڵی (١٩٨٤) بڕوانامەی بەدەستهێناوە لە (رفع الاثقال).
- ئەندامی دەستەی کارگێڕی یانەی (سۆلاڤە)
- لە ساڵی (١٩٩١ - ٢٠٠٨) ئەندامی (الاتحاد العراقي المركزي)یە.
- دامەزرێنەری یانە ئەهلییەکان بووە لە عێراق
- ساڵی (١٩٩٧) سەرۆکی وەفدی عێراقی بوو لە تورکیا
- لە ساڵی (٢٠٠٠) سەرۆکی وەفدی عێراقی بوو لە پاڵەوانێتی عەرەبی لە (لازقیە).
- ماوەیەك پەیامنێری گۆڤاری (النجوم)ی وەرزشی بووە.

*** هاشم محەمەد یاسین:-**
- ساڵی (١٩٨٤) لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) لەدایکبووە.
- سەرەتای دەست پێکردنی بۆ ساڵی (١٩٩٧) بۆ یانەی سۆلاڤ دەگەڕێتەوە لەژێر دەستی ڕاهێنەر (عیماد شەریف).
- هەر لە ساڵی (١٩٩٨)ەوە پاڵەوانی پارێزگاکە بووە، لە ساڵی (٢٠١٠) لەسەر ئاستی کوردستان پلەی دووەمی بەدەستهێناوە لە قورسایی (١٠٠) کیلۆ گرام.
- دەرچووی بەکالۆریۆسی زمانی ئینگلیزییە.
- خاوەنی هۆڵی لەشجوانییە لە گەڕەکی یەکی ئادار بەناوی (رافدین)

*** حازم ئەکرەم:-**
- هەر لە ساڵی (١٩٨٢)ەوە لە بواری لەشجوانی و هەڵگرتنی قورسایی کاری کردووەو لەژێر دەستی ڕاهێنەر (ئیحسان نوری، تەها عەزین).
ڕاهێنانی کردووە.
- ساڵی (١٩٨٣- ١٩٨٤) پلەی چوارەمی عێراقی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٨٢- ١٩٨٣) پلەی یەکەمی پارێزگای بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٨٥- ١٩٩٩) پلەی دووەمی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٩١- ١٩٩٢) پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە.
- ساڵی (١٩٩٢- ١٩٩٤) پلەی دووەمی بەدەستهێناوە.
- هەر لە ساڵی (١٩٨٢- ٢٠٠٩) گەلێك پلەی دەست خۆشکەری بەدەستهێناوە.

*** ئایدن ڕەشید:-**
- هەر لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووە لەژێر سەرپەرشتی ڕاهێنەر ئەحمەد سەعید ئەلهاشمی، ڕاهێنانی کردووە لە یانەی (الجيش)، یانەی (الشباب).
- بۆ ماوەی بیست ساڵ وازی لە یاری لەشجوانی هێناوەو دووبارە گەڕاوەتەوە ئەم بوارە.
- ساڵی (٢٠٠٩) خەڵاتی برۆنزی لە ئاسیا بەدەستهێناوە لەژێر دەستی ڕاهێنەر (عیماد شەریف).
- پێوانەی قورسای ٩٠ کیلۆ گرام، دەست ٤٦ سم، سنگ ١١٥سم، ڕان ٦٥سم .

*** محەمەد شەمسەدین عەلی:-**
- ساڵی (١٩٧٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە ساڵی (١٩٩٧)ەوە لە بنکەی ئۆلۆمپیاد لەژێر چاودێری ڕاهێنەر (عیماد شەریف) ڕاهێنانی کردووە.
- لە ساڵی (٢٠٠٥) بەسەر یاریزانی عێراقی (بەشار عەبدولرەحماندا) زاڵ بووە.
- پێشبڕکێی کردووە لە کێشی ١٢٥و+ ١٢٥ کلیۆ گرام.
- ئەندامی هەڵبژاردەی (شرطة كركوك)ە

*** فازڵ فەیسەڵ محەمەد:-**
- ساڵی (١٩٨٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی لەشجوانییە کە لە بنکەی ئۆلۆمپیاد ڕاهێنانی کردووە، لەسەربنەمای پێوانەی، ٧٠ کیلۆگرام لە دەست، ٤١سم لە سنگ، ١٠٥سم ڕان، ٥٨سم ناوەند، ٦٥سم، گۆلف ٣٢.

*** هانی سەلاحەدین:-**
- ساڵی (١٩٨٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی یانەی سۆلاڤە بۆ لەشجوانی.
- هەر لە ساڵی (١٩٩٨)ەوە دەستی بە ڕاهێنانی لەشجوانی کردووە، بە پێوانەی ١٨٠سم درێژە، قورسایی ٨٥کیلۆ گرام، دەست ٤٥سم، سنگ ١١٨سم، ڕان ٦٨سم، گولف ٣٨سم.

*** دانا محەمەد نورەدین:-**
- ساڵی (١٩٨٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی لەشجوانی یانەی سۆلافە.
- پێوانەی درێژی ١٨٥، قورسایی ٩٦، دەست ٤٨، سنگ ١٢٠، ڕان٧٠، ناوەند ٧٥سم.

* ئەشنەت ئیبراهیم حوسێن:-
- ساڵی (١٩٨٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی لەشجوانی یانەی سوڵافە
- پێوانەی درێژی ١٨٥سم، قورسایی ٩٠ کیلۆگرام، سنگ ١١٥، ڕان ٦٨، دەست ٤٦، گولف ٤٠.

* محەمەد ئیحسان ئەکبەر:-
- ساڵی (١٩٨٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی بنکەی ئۆلۆمپیادی نێودەوڵەتییە.
- پێوانەی درێژی ١٩٥سم، قورسایی ١١٥کلیۆگرام، سنگ ١٢٠سم، دەست ٥١سم، ڕان ٧٢سم، ناوەند ٨٠سم، گولف ٤٥سم.

* مازن ئەمین زەکی:-
- ساڵی (١٩٨٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی یانەی سوڵاڤە بۆ یاری لەشجوانی.
- پێوانەی درێژی ١٦٨سم، قورسایی ٨٠ کیلۆ گرام، دەست ٤٥سم، ڕان ٦٥سم، سنگ ١١٢/٥سم.

* زیاد جۆزیف مونیر:-
- لەسەر ئاستی کەرکوك و عێراق یاری لەشجوانی کردووە.
- ئێستا لە لیژنەی دادوەرانی کەرکوکە.

* فازڵ حەمە حەسەن:-
- ساڵی (١٩٧٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٩٨) پلەی یەکەی لە پاڵەوانێتی پارێزگا بەدەستهێناوە بۆ تازە پێگەیشتیووان.
- ساڵی (١٩٩٩) پلەی یەکەمی لە پالەوانێتی (بطولة المنطقة الشمالية) بۆ تازە پێگەیشتیووان بەدەستهێناوە.
- ساڵی (٢٠٠١- ٢٠٠٢)، هەڵسەنگێنراوە وەکو یاریزانی لەشجوانی

* نافیع سەلاح:-
- ساڵی (١٩٧٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە ساڵی (١٩٩٤)ەوە لە بنکەی ئۆلۆمپیاد ڕاهێنانی لەشجوانی کردووە.
- ساڵی (١٩٩٧) چووەتە ئەوروپا ولە هۆڵەندا جێگیربووە.
- دوای چەند ساڵێك پلەی یەکەمی بەدەستهێناوە لە قورسایی (٩٠)کیلۆ گرام وبەدەستهێنانی کارتی سەوز بوو لە یەکێتیەکانی هۆڵەندا
- پێوانەی درێژی (١٧٨)سم، قورسایی ١٢٠کیلۆ گرام، دەست (٥٤)سم، سنگ (١٢٥)سم، ڕان (٧٤)سم، کولف (٤٥) سم.

* حەمید مەجید کاری:-
- ساڵی (١٩٤٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٧) پێشکەوتنی بەدەستهێنا بەسەر (ئیبراهیم خەڵەف).
- هەروەها خەڵاتی بەدەستهێناوە لە هەموو پاڵەوانێتیەکان.

* حوسێن عەلی:-
- هەر لە ساڵی (١٩٧٠)ەوە لە یانەی سوڵاڤ یاری کردووە لەسەر دەستی ڕاهێنەر: عیماد محەمەد شەریف، وەلی عوسمان، کەماڵ محەمەد.

* لەفتە کازم:-
- ساڵی (١٩٤٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرکەوتنی پاڵەوانێتیەکانی لەسەر ئاستی پارێزگا بەدەستهێناوە لە ساڵانی (١٩٧٢- ١٩٨٠).

* ئیبراهیم خەڵەف:-
- ساڵی (١٩٥٢) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی (١٩٧٧) پاڵەوانی پارێزگا و پارێزگاکانی کوردستان بووە.
- ڕاهێنانی کردووە لە یانەی (الثورة) لە پێوانی (١١٥) کیلۆ گرام، لە فراوانی سنگی بە پێوانەیی (١٢٥)سم.

* غازی فاتیح:-
- ساڵی (١٩٥٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- پاڵەوانی پارێزگاو کوردستان بووە لە ساڵی (١٩٧٢).
- پێوانەکانی بەم شێوەیە کە قورسایی (٩٥) کیلۆ گرام، سنگ (١٢٥)سم، ڕان (٦٣)سم، دەست (٤٧)سم، کولف (٤٢) کیلۆ گرام.

* جەوهەر عوبێد:-
- ساڵی (١٩٥٦) لە گەرەکی (ئیمام قاسم) لەدایکبووە.
- ڕاهێنانی کردووە لە یانەی (سوڵاڤ).
- پاڵەوانی سەر ئاستی پارێزگاو دەرەوەی پارێزگا بووە.

* ئەحمەد مەریوان غەریب:-
- ساڵی (١٩٨٨) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی یانەی سوڵاف بووە بۆ قورسایی (٨) کیلۆ گرام بۆ لاوان.
- پێوانەی درێژی (١٧٨)، قورسایی (٨٥) کیلۆ گرام، سنگ (١١٨)سم، دەست (٤٤)، ڕان (٦٣)سم، ناوەند (٦٨)سم.

* ئەیاد عاسی عوبێد:-
- ساڵی (١٩٨٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریکەری هەڵبژاردەی پارێزگا بوو بۆ قورسایی (٦٥)کلیۆ گرام.
- لەیانەی (سوڵاڤ) کاردەکات، بەپێوانەی قورسایی ٦٥کیلۆ

گرام، سنگ (١٠٨)سم، دەست (٤٢)سم، ناوەند (٦٥)سم، ڕان (٦٠)سم.
- یەکەم بووە لە ساڵی (٢٠٠٤) لە پاڵەوانێتی لەشجوانی لە موسڵ.

* زەکەریا زوهێر نادر:-
- ساڵی (١٩٧٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی یانەی سۆلاڤ و هەڵبژاردەی پارێزگایە.
* مەولود فەخرەدین نەریمان:-
- ساڵی (١٩٩١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی هەڵبژاردەی لاوانە.
- هەر لەساڵی (٢٠٠٧)ەوە لەیاری لەشجوانی کاردەکات.
- لە بەرزکردنەوەدا: دبنی (١٢٠)، بنج بریس (٧٥)، دیدلفت (١٦٥).

* عیماد عومەر ساڵح:-
- ساڵی (١٩٧٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی یانەی سۆلاڤەو ڕاهێنان لە بنکەی ئۆلۆمپیادی نێودەوڵەتی دەکات.
- پێوانەکانی:- قورسایی (٨٠) کیلۆ گرام، دەست (٣٩)سم، سنیگ (١١٢)سم، ڕان (٦٧)سم، گولف (٣٥)سم.

* کاروان ئەکبر عومەر جەباری:-
- ساڵی (١٩٨٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی هەڵبژاردەی پارێزگایە بۆ قورسایی (٧٥)کیلۆ گرام، هەر لە ساڵی (٢٠٠٤)ەوە تاکو ئێستاکە، درێژی (١٧٠) سم، قورسایی (٧٥)کیلۆ گرام، سنیگ (١١٤)سم، دەست (٤٥)سم، ڕان (٦٥)سم.
- پاڵەوانی پارێزگا بوو لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٦- ٢٠٠٧).

* پشتیوان ساڵح:-
- ساڵی (١٩٨٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی هەڵبژاردەی پارێزگایە بۆ قورسایی (٨٥)کیلۆ گرام.
- لە ساڵی (٢٠٠٧) یەکەمی سەرپارێزگاو چوارەمی سەر کوردستان بووە لە پاڵەوانێتی لەشجوانی.

* جونەید محەمەد عەباس:-
- ساڵی (١٩٧٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی یانەی سۆلاڤەو ڕاهێنان دەکات لە بنکەی ئۆلۆمپیاد، لە پێوانەی درێژی (١٨٠)سم، قورسایی (٩٠) کیلۆ گرام، سنیگ (١٢٥)سم، دەست (٤٧)سم، ڕان (٧٢)سم.
- سێ جار یەکەمی عێراق بووە.

* حازم فالح ئەلحەمدانی:-
- ساڵی (١٩٧٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی سۆلاڤو هەڵبژاردەی پارێزگایە،
- بۆ ماوەی دەساڵ پاڵەوانی پارێزگاو عێراق بووە بۆ قورسایی زۆر لە پێوانەی سنیگ (١٢٧)سم، دەست (٥١)سم، ڕان (٧٠)سم، ناوەند (٧٢)سم.

* تاریق حەمید محەمەد:-
- ساڵی (١٩٦٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی هەڵبژاردەی پارێزگا بووە بۆ پێشکەوتووان.
- سێیەمی سەر پاڵەوانی عێراق بووە لە قورسایی (٦٥) کیلۆ گرام.
- پێوانەکانی درێژی (١٦٧)سم، قورسایی (٦٥) کیلۆ گرام، سنیگ (١١٨)سم، دەست (٤٢)سم، ڕان ٦١سم، ناوەند (٧٠) سم.

* ئیبراهیم جومعە ڕەجەب:-
- یەکێکە لە یاریزانەکانی لەشجوانی لەسەر ئاستی پارێزگاو لە ماوەی ژیانیدا گەلێك پێشکەوتنی وەرزشی بەدەستهێناوە، ڕاهێنانی لەشجوانی لەسەر دەستی (عیماد محەمەد شەریف) بەدەستهێناوە.

* سەرتیب موزهر محەمەد:-
- ساڵی (١٩٨٠) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی یانەی سۆلاڤە.
- یاریزانی هەڵبژاردەی پارێزگا بووە لەنێوان ساڵانی (٢٠٠١- ٢٠٠٧)، پاڵەوانی کوردستان بووە لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٣- ٢٠٠٤).

* محەمەد شەماڵ:-
- ساڵی (١٩٨٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- یاریزانی هەڵبژاردەی یانەی سۆلاڤ.
- پێوانەی درێژی (١٧٠)سم، قورسایی (٧٥)سم، دەست (٤٥)سم، سنیگ (١١٠)سم، ڕان (٦٩)سم، ناوەند (٧٢)سم.
- ساڵی (٢٠٠٧) پلەی یەکەمی لەسەر ئاستی کوردستان بەدەستهێناوە.

* ئاکۆ محەمەد جەمیل:-
- ساڵی (١٩٨٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ئەندامی هەڵبژاردەی کەرکوکە بۆ قورسایی (٧٥)کیلۆ گرام.
- پلەی سێیەمی لەسەر ئاستی کوردستانو چوارەم لە پاڵەوانێتییەکانی تر بەدەستهێناوە.

* کاروان سدیق ئەحمەد:-
- ساڵی (١٩٨١) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- سەرەتاکانی یاریزانی بۆ ساڵی (١٩٩١) دەگەڕێتەوە لە بنکەی ئۆلۆمپیادی نێودەوڵەتی، یاریزانی یانەی سۆلاڤە.
- دەرچووی پەیمانگای هونەرییە.
- پاڵەوانی پارێزگا بووە لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٠- ٢٠٠٢) و کوردستان (٢٠٠١- ٢٠٠٢)و سێیەم لەسەر عێراق لە (٢٠٠٢) لە دیالە

* حەسەن نەجم:-
- ناوی حەسەن نەجم عەبدوڵڵایە.
- ساڵی (١٩٧٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە ساڵی (١٩٩٦)ەوە لەبواری لەشجوانی یاری دەکات. سەرکەوتنی بەدەستهێناوە لە پارێزگا لە ساڵانی (١٩٩٧- ٢٠٠٠)و کوردستان (٩٨- ١٩٩٩)و سێیەم لەسەر عێراق (١٩٩٨).

* مستەفا عەبدولکەریم داودی:-
- ساڵی (١٩٨٦) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لەساڵی (٢٠٠٠)ەوە ڕاهێنەری لەشجوانییە.
- دەرچووی کۆلیژی زانست بەشی جیۆلۆجیە.

* کاروان حەسەن:-
- ساڵی (١٩٨٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لەساڵی (٢٠٠٤)ەوە لەیانەی سوڵاڤ ڕاهێنانی دەکات بە سەرپەرشتی (سلێمان ڕەمەزان).
- ساڵی (٢٠٠٥) پلەی یەکەمی لەسەر پاڵەوانی پارێزگا بەدەستهێناوە و پلەی سێیەمی لەسەر ئاستی کوردستان بەدەستهێناوە.
- بەشداری پاڵەوانی عەرەب و ئاسیای کردووە.

* عەبدولوەهاب سدیق ڕەشید.
- ساڵی (١٩٦٧) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- پاڵەوانی پارێزگا بووە بۆ ماوەی دە ساڵ بۆ لەشجوانی، هەروەها بۆ ماوەی حەوت ساڵ لە هەرێمی کوردستان و پلەی دووەم و سێیەمی بەدەستهێناوە بۆ ماوە پێنج ساڵ لە پاڵەوانێتی عێراق.
- بەشداری گەلێك خولی لەشجوانی پارێزگای کردووە.
- ئێستا ڕاهێنەری هەڵبژاردەی (الشرطة) لە کەرکوك.

* فەرهاد حەسەن شەریف:-
- ئەندامی هەڵبژاردەی (اشبال)ی پارێزگایە.
- گەلێك پاڵەوانێتی بەدەستهێناوە لەبەغدا و هەولێر.

* سەبار ئیسماعیل خەلیل:-
- ساڵی (١٩٨٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە ساڵی (٢٠٠٣)ەوە یاری لەشجوانی دەکات.
- پاڵەوانی یەکەم و دووەم بووە لەسەر ئاستی پارێزگا، پلەی دووەمی بەدەستهێناوە لەسەر ئاستی کوردستان، پلەی چوارەمی بەدەستهێناوە لەسەر ئاستی عێراق.

* عەلی دەروێش:-
- ساڵی (١٩٨٥) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە هەشت ساڵییەوە لەسەر دەستی ڕاهێنەران شەوقی فەرەج و عەبدوڵڵا زیاب فێری هەموو هونەرەکانی زۆرانبازی بووە و ئێستا لە کێشی (٦٦)کیلۆی ڕۆمانی یاری دەکات و دوو ساڵە پاڵەوانی عێراقە و دوا بەشداریی لە پاڵەوانێتی ئاسیا بوو کە لە وڵاتی ژاپۆن بەڕێوەچوو لە کێشی خۆیدا، سی پاڵەوان بەشداری کرد بوو، دوای ئەوەی لە دووەمی ئاسیای بردەوە کە (کازاخستانیە)و هەروەها لە پاڵەوانی هنیدی بردەوە و لە یاریی پێش کۆتایدا لەگەڵ پاڵەوانی ئۆلۆمپی کۆریا دۆڕاندی و پلەی چوارەمی ئاسیای بەدەستهێناوە.

* محەمەد شەمسەدین:-
- ساڵی (١٩٧٩) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- لەسەردەستی ڕاهێنەر (عیماد جەباری) فێری هونەرەکانی ئاسن بەرزکردنەوە بووە و ئێستا پاڵەوانی عێراقە لە کێشی (١٢٥) کیلۆ گرام، لە ماوەی مانگێکدا دووجار ژمارەی پێوانەی عێراقی شکاند بە (٧٠/٢٠) کیلۆ. لە دوا چالاکییدا بەشداریی پاڵەوانێتی وڵاتە عەرەبییەکانی کرد کە لە لوبنان بەڕێوەچوو، پلەی یەکەمی پاڵەوانێتییەکەی بەدەستهێنا بەکۆکردنەوەی (٧٩٠) کیلۆ لە (٣١٠)دبنی، (٣٠٠) ڕاکێشان، (١٨٠) پێنج پرێس.

* سەرتیب ناسح ئەسعەد:-
- ساڵی (١٩٧٤) لە کەرکوك لەدایکبووە.
- دەرچووی پەیمانگای تەکنەلۆژیایە.
- یاریزانی هەڵبژاردەی کەرکوك و یانەی سوڵاڤە.
- هەر لە ساڵی (١٩٩٠)ەوە یاری لەشجوانی دەکات.
- پاڵەوانی پارێزگا بووە لەنێوان ساڵانی (١٩٩١- ١٩٩٥)و پاڵەوانی کوردستان (١٩٩٢- ١٩٩٥).

* عومەر ئیبراهیم سەعید:-
- ساڵی ١٩٥٧ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- هەر لە ساڵی ١٩٧٢ دەستی بە یاری لەشجوانی کردووە لە یانەی سوڵاف، بەسەرپەرشتی محەمەد سەعید و عیماد محەمەد شەریف و عەبدوڵڵا نەجم.
- ساڵی ١٩٧٦ لە فیرقەی یەك لە دیوانییە یاری ئاسن هەڵگرتنی کردووە.
- ساڵی ١٩٨٠ لەسەر ئاستی فەیلەقی سێ بە یەکەم دەرچووە.
- ساڵی ١٩٩٥ هۆڵی لەشجوانی لە کەرکوك کردووەتەوە.
- هەر لە ساڵی ١٩٧٤ تا ١٩٨٠ بەشداری گەلێك پاڵەوانێتی کردووە لەسەر پارێزگا و کوردستان و عێراق.

* شاکر مەحموود غەفوور:-
- ساڵی ١٩٨٦ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ٢٠٠١-٢٠٠٣ یاری تایکواندۆی کردووە.
- ساڵی ٢٠٠٤ لە یانەی سوڵاف یاریی لەشجوانی کردووە.
- ساڵی ٢٠٠٥ بەشداریی پاڵەوانێتی لەشجوانی کردووە بۆ پێشکەوتووان و پلەی دووەمی بەدەستهێناوە.
- ساڵی ٢٠٠٧ بەشداریی پاڵەوانێتی هێزی لەشی کردووە.
- لە ساڵی ٢٠٠٧ەوە سەرپەرشتی هۆڵی لەشجوانی دەکات لە کەرکوك.



ئیسماعیل حەسەن لەگەڵ مەهدی وەحید باوکی ڕوحی زۆرانبازانی قورسایی



عیماد شەریف لە پاڵەوانێتی کەرکوك ساڵی ١٩٧٧ ئەوکات براوەی یەکەم بووە



یانەی شەریکە کۆمپانیای نەوت یوسف و ئیسماعیل حەسەن



یانەی سەورە بۆ لەشجوانی



یانەی شەریکە



هەڵبژاردەی کەرکوك ساڵی ١٩٩٤



هەڵبژاردەی یانەی سوڵاف ۱۹۹۰



پاڵەوانێی کەرکوک



پاڵەوانانی کەرکوك لە شاری موسڵ



پاڵەوانێتی کەرکوك



هەڵبژاردەی یانەی سۆلاف بەرزکردنەوەی قورسایی و لەشجوانی



هەڵبژاردەی یانەی سۆلاف



هەڵبژاردەی کەرکوک براوەی یەکەمی پێشکەوتووانی عێراق بۆ ساڵی ٢٠٠١ بۆ یەکەم جار لە شارەکەدا بە سەرپەرشتی ڕاهێنەر عیماد شەریف



پاڵەوانێتی کەرکوک



هەڵبژاردەی کەرکوک



هەڵبژاردەی یانەی سۆلاف بەرزکردنەوەی قورسایی و لەشجوانی



هەڵبژاردەی کەرکوك




هەڵبژاردەی کەرکوك یەکەمی عێراق بۆ ساڵی ٢٠٠١

*** یانەکانی لەشجوانی لە کەرکوك:-**

هەر لە سەرەتایی بڵاوبوونەوەی لەشجوانی لە کەرکوك هەریەکە لە یانەی (سۆلاف)و یانەی (الثورة) رۆڵێکی سەرەکییان دەبینیی لە پێشکەوتنی ئەو وەرزشە بەتایبەتی یانەی (سۆلاف) کە زۆر بایەخێکی گەورەی دەدا بۆ پێشکەوتنی ئەم یارییە لەسەر ئاستی کەرکوك.

*** راهێنەرەکانی یاری وەرزشی لەشجوانی:-**

١-عیماد شەریف
٢-عەبدوللا نەجم عەبدوللا
٣-عومەر ئیبراهیم سەعید
٤-سعود عەبدولوەهاب
٥-سلێمان رەمەزان وەهاب
٦-محەمەد خدر ئیبراهیم
٧-سەباح مەحمود فەخری
٨-جەودەت عەلی حەبیب
٩- سەرتیپ ناسیح

*** هۆڵەکانی لەشجوانی لە کەرکوك:-**

١-هۆڵی ئۆلۆمپیاد، ساڵی ١٩٨٦، خاوەنەکەی عیماد شەریف.
٢-هۆڵی نەجاح، ساڵی ١٩٩٨، عەبدوللا نەجم، لە (ساحە العمال).
٣-هۆڵی (ابطال)، ساڵی (١٩٩٨- ١٩٩٩)، عومەر ئیبراهیم سەعید، لە (ئەحمەد ئاغا)
٤-هۆڵی (عومەر ج)، لە گەرەکی (القدس).
٥-هۆڵی (ئاشتی) لە شارۆچکەی داقوق.
٦-هۆڵی (عەبدولرەحمان)، سەرتیب موزهەر، گەرەکی (حیسابات)
٧-هۆڵی (حیسابات)، عەبدولرەحمان حوسێن جەباری، گەرەکی (حیسابات).
٨-هۆڵی (ئیمام قاسم)، (هێمن نەسرەدین)، گەرەکی (ئیمام قاسم)
٩-هۆڵی (کمال)، ئیلخیان عەدنان، پردی چوارەم.
١٠- هۆڵی (قاسم الماس)، ئالان عومەر.
١١- هۆڵی (نمور)، عەممار عەبدولعەزیز، گەرەکی رەحیماوا.
١٢- هۆڵی (کرکوك)، گەیلان عەبدولقادر، گەرەکی (العسکری)
١٣- هۆڵی (همر) سیروان ئیبراهیم، گەرەکی (قادسیە).
١٤- هۆڵی (بۆدی پاوەر)، گەرەکی (العلماء)، عومەر عاسی.
١٥- هۆڵی (سای بێکس)، تاریق حەمید، گەرەکی (راپەرین).
١٦- هۆڵی (عەرەفە) سائر عەدنان، گەرەکی (عرەفە).
١٧- هۆڵی (سلام)، فوئاد فاروق، گەرەکی (الأسری والمفقودین).
١٨- هۆڵی (ئایرن مان)، محەمەد خدر، گەرەکی (الخضراء)
١٩- هۆڵی (صقور)، سعود عەبدولوەهاب، گەرەکی (واسطي).
٢٠- هۆڵی (ئازاد عەبدولمەجید)، ئازاد عەبدولمەجید، تۆپزاوە.
٢١- هۆڵی (ئۆکسجین)، دارا محەمەد، پەنجا عەلی.
٢٢- هۆڵی (پلاتنیوم)، مستەفا ئیبراهیم.
٢٣- هۆڵی (ابطال)، ئەمیر عیرفان، (ئەحمەد ئاغا).
٢٤- هۆڵی (ئارنۆ کلاسیك)، سەلام وەلی گوێ پان، گەرەکی (الأسری والمفقودین)
٢٥- هۆڵی (الصحة والقوة) عیماد محەمەد شەریف.
٢٦- هۆڵی (عەبدولرەحمان)، سەرتیب موزهەر، گەرەکی (حیسابات).
٢٧- هۆڵی (قمة)، عیماد محەمەد شەریف، گەرەکی (الضباط).
٢٨- هۆڵی (سترۆنگ)، عەلی عادل، بەرامبەر یانەی (الثورة)
٢٩- هۆڵی (بابەگورگوڕ)، جەبار عەرەب، گەرەکی (حي الواسطي).
٣٠- هۆڵی (رافدین)، هاشم محەمەد، گەرەکی (یەکی ئادار).
٣١- هۆڵی (واشنطون)، هەڤاڵ عەلی، گەرەکی (رەحیماوا).
٣٢- هۆڵی (کوردستان)، جەودەت عەلی.
٣٣- هۆڵی (ابطال الشرق الأوسط)، تاریق یاسین، گەرەکی (عسکري)
٣٤- هۆڵی (لیلان)، عامر سادق.
٣٥- هۆڵی (ماکس جیم)، ئاسان قەیس، گەرەکی (رەحیماوا).
٣٦- هۆڵی (رەشید)، عومەر فاروق، گەرەکی (دۆمێز).
٣٧- هۆڵی (خضراء)، ئەحمەد ئیسماعیل.
٣٨- هۆڵی (عیماد)، عیماد شەریف، (باجوان).
٣٩- هۆڵی (کرکوك)، عادل عومەر، گەرەکی (ئیمام قاسم).
٤٠- هۆڵی (گۆڵدن جیم)، پشتیوان ساڵح، پەنجا عەلی.
٤١- هۆڵی (سەرتیپ)، سەرتیپ ناسیح، ئازادی

* سەرچاوەو پەراوێزەكان:-

- ڕۆژنامەی (العراق غدا) ژمارە (٢٢٤) لە ڕۆژی ١٠ی كانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا) ژمارە (٢٢٣) لە ڕۆژی ٣ی كانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢١٧)، لە ڕۆژی ١٢ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٧).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢١٨)، لە ڕۆژی ٢٩ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٧).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢١٥)، لە ڕۆژی ٨ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٧).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢١٦)، لە ڕۆژی ١٥ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٧).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٠٧)، لە ڕۆژی ١٣ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٧).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٠٨)، لە ڕۆژی ٢٠ی ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٧).
- ڕۆژنامەی (التآخي)، ژمارە (٥٢٢٥)، ٢ی شوباتی، ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٧٢)، ڕۆژی ١٠ی كانوونی یەكەمی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٤٠)، ڕۆژی ١ی ئایاری ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٣٥)، ڕۆژی ٢٧ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٤١)، ڕۆژی ٨ی مایسی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٤٣)، ڕۆژی ٢٢ی ئایار ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٥٤) ڕۆژی ٧ی ئابی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٥٥)، ڕۆژی ١٤ی ئابی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٣٠)، ڕۆژی (٢١)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٣٣)، ڕۆژی (١٣)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٤٦)، ڕۆژی (١٢) حوزەیرانی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٢١)، ڕۆژی (٢٠)ی تشرینی ساڵی یەكەمی ساڵی (٢٠٠٧).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٦١)، ڕۆژی ٢٤ی ئەیلول (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢١٩)، ڕۆژی (٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٧).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٢٥)، ڕۆژی (١٧)ی كانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٢٠)، ڕۆژی (١٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٧).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٣١)، ڕۆژی (٢٨)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٣٢)، ڕۆژی (٦)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٣٧)، ڕۆژی (١٠)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٢٧)، ڕۆژی (٣١)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٢٢)، ڕۆژی (٢٧)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٧).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٢٨)، ڕۆژی (٧)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٧٤)، ڕۆژی (٢٤)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٨).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٧٨)، ڕۆژی (٢١)ی كانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٩).
- ڕۆژنامەی (العراق غدا)، ژمارە (٢٨١)، ڕۆژی (١١)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٩).
- ڕۆژنامەی (باسەرە)، ژمارە (١٣٦)، ڕۆژی ١٠ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٦).
- گۆڤاری (بانە ڕۆژ)، ژمارە (٦) مایس ساڵی (٢٠٠٤).
- الكمال الجسماني (التربية البدنية)، جەمیل ئەلتائی، الملكية الاهلية، بەغدا، ١٩٦٥.
- الكمال الجسماني، جەمیل ئەلتائی، هەمان نووسەر كە پێشتر بڵاوكراوەتەوە بەڵام ناوی كتێبەكە دیار نییە.
- ڕۆژنامەی (كۆپرو)، ژمارە (٥١) ڕۆژی (١٥)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (٢٠٠٩).
- ڕۆژنامەی (ئاوێنە سپۆرت)، ژمارە (٣٠٤).

*** مێژووی وەرزشی (کاراتی):-**

**م. عەلی کاراتی**

ئەم یارییە (کاراتی شوتوکان) لە شاری کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی ساڵانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردووە.
لەملاوئەولاوە خەریکی ڕاهێنانی ئەم یارییە بوونە، بەڵام بەهیچ شێوەیەکی فەرمی، ئەم یارییە ڕێگەی پێنەدراوە لە ڕابردوودا لەلایەن حکومەت و دەوڵەتەوە.
بۆ یەکەم جار مامۆستا کاوە توانی بەشێوەیەکی فەرمی و نووسراو لە یەکێتی کاراتێتی بەغداوە لە ساڵی (١٩٨٣) بۆ ماوەیەکی زۆرکەم ئەم یارییە بێنێتە کەرکوك.
لە ساڵی (١٩٨٣- ١٩٨٤) مامۆستا کاوە بانگهێشت نامەیەکی یەکێتی کاراتی عێراقەوە هێنا بۆ بەشداری کردووە لە کۆبوونەوەکان، بۆیە لە ساڵی (١٩٨٤)، لەژێر سەرپەرشتی (عەلی حوسێنی محەمەد) بۆ ماوەی دوو هەفتە بەشداری ڕاهێنانی کاراتی کردووەو لە دوایدا بووە بەڕاهێنەری کاراتی لە کەرکوك.
لەو مێژووەوە بەدواوە، دوورو نزیك یاری وەرزشی کاراتی برەوی سەندو تارادەیەکی چاك جێپەنجەی خۆی کردەوە.
لەنێوان ساڵانی (١٩٩٢- ٢٠٠٤) بەدوو شێوە یاریزان و ڕاهێنەرە بەشدارەکان برەودان و گەشەیان بەم یارییە دا.
بەشێکیان لە کەرکوك خزمەتی ئەم یارییەیان کرد، بەشێکی تریان بەئاوارەیی لە کوردستان خزمەتی کاراتیی کەرکوکیان کردووەو لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە هاتوونەتەوەو یارمەتی دەربوون لە پێشکەوتنی لە شارەکەدا.
ئەو بەشەی کوردستان بە ئاوارەیی لە ساڵی (١٩٩٢)ەوە هەستان بە دروستکردنی تیپی لاوانی کەرکوك لە (چەمچەماڵ) و (ڕانیە) لەژێر سەرپەرشتی (عەلی حوسێن محەمەد) و (چالاك هیوا) کە لە ساڵی (١٩٩٣)دا بەشداری پاڵەوانێتی کوردستانیان کردووەو پلەی یەکەمیان بەدەستهێناوە.
لە ساڵی (١٩٩٧)دا خولێکی ڕاهێنان کرایەوە بۆ ڕاهێنەرەکان لە هەڵبژاردەی کەرکوك لەژێر سەرپەرشتی (ڕائید فائیق)، هەر لە ماوەیە دووبارە خولێکی تری ڕاهێنان کرایەوە، کە خۆشبەختانە کەرکوك سەرکەوتنی باشی بەدەستهێنا.
لە دوانزە ساڵەی ئاوارەییدا یاریزانەکاندا گەلێك یاریزان و ڕاهێنەری بەرچاویان بەدەستهێناوەو بەشداری چەندان فیستیڤاڵ و سیمینارو خوولیان کردووە.

*** کارو چالاکییەکانی یەکێتی کاراتیای کەرکوك.**
(١٩٩٢- ٢٠١٦)

لە ساڵی (١٩٩٢- ٢٠٠٤) لە یانەی (الثورة) لەژێر سەرپەرشتی مامۆستا (فەلاح حەسەن) تیپێکی کاراتیان دامەزراندووە بەشداری چەندین خول و ڕاهێنانیان کردووە، لە ساڵی (١٩٩٦)دا بەشداری پاڵەوانێتی عێراقیان کردووە، توانیوویانە پلەی دووەم بە دەست بهێنن لەسەر ئاستی پێشکەوتووان لە ساڵی (٢٠٠٠) بەشداری خولی ڕاهێنانیان کردووە لەژێر سەرپەرشتی (ڕائید فائیق عەبدولجەبار)، لە ساڵی (٢٠٠٣)دا بەشداری پاڵەوانێتی عێراقیان کردووەو یاریزانێك بەناوی (قاسم محەمەد موسا) هەڵبژێردراوە بۆ هەڵبژاردەی عێراق.
لە ٢٤- ٢٥ ی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٥ پاڵەوانێتی یانەکانی کوردستان کرایەوە بۆ منالان و تازە پێگەیشتووان کە یانەی (خاك) پلەی دووەمی لەو پاڵەوانێتییە بەدەستهێنان.
لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥) خولێکی ڕاهێنان و دادوەری کرایەوە بەسەرپەرشتی یەکێتی کاراتیی عێراقی کە لە کەرکوك چەندین ڕاهێنەرو دادوەر بەشداربوون.
لە ٢٣- ٢٥ی تشرینی ئاواری ساڵی (٢٠٠٦) کەرکوك بەشداربوو لە تاقیکردنەوەی پشتێنەڕەشەکان کە چەندین ڕاهێنەرو یاریزان بەشداربوون لەژێر سەرپەرشتی لێزانی نێودەوڵەتی دکتۆر (تیرس عودشیر).
لە ٢١ی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٦ پاڵەوانێتی کەرکوکیان ئەنجامداوە بە بەشداری هەریەکە لە یانەکانی خاك، (ثورة)، سۆلاڤ نوێ و یانەی خاك پلەی یەکەمی بەدەستهێنا، (ثورة) پلەی دووەمی بەدەستهێنا. هەر لەو ماوەیە هەر یەکە لە (قاسم محەمەد موسا) و (عومەر عەلی حوسێن) هەڵبژێردرا بۆ پاڵەوانێتییەکانی کوردستان.
لە ١ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٧)دا پاڵەوانێتی یانەکانی کەرکوك بۆ لاوانی پێشکەوتووان بەسترا لەژێر ناوی پاڵەوانێتی شەهید (حوسێنی چالاك) کە هەریەکە لە یانەکانی:- خاك، ثورة، سۆلاڤ نوێ، سۆلاف، بەشدارییان کردووە خاك بەپلەی یەکەم دەرچوو، سۆلاڤ نوێ بەپلەی دووەم دەرچوو.
لە ١٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٨) پاڵەوانێتی پارێزگای کەرکوك بەسترا کە حەوت یانە بەشدارییان کردووە.
خاك، ثورة، سۆلاف، حەمرین، کوردستان، سۆلاڤ نوێ، شۆڕیجە. خاك پلەی یەکەم، کوردستان پلەی دووەم، حەمرین پلەی سێیەمیان بەدەستهێناوە.
لە ساڵی (٢٠٠٨) پاڵەوانێتی جیهانی لە ئێران بەسترا کە کەرکوك، بەسێ یاریزان بەشداری هەڵبژاردەی کوردستانیان کردووە ئەوانیش:- قاسم محەمەد موسا، کارزان عەلی حوسێن، عومەر عەلی حوسێن، عومەر عەلی مەدالیای زیووی بەدەستهێناوە.
لە ٢٥- ٢٧ی نیسانی ٢٠٠٩ کە پاڵەوانێتی کوردستان لە سلێمانی ئەنجامدرا، کەرکوك بەسێ یانە بەشدارییان کردووە. خاك، ثورة، حەمرین، کە خاك پلەی یەکەم و ثورة پلەی دووەمی بەدەستهێناوە.
لە ٢٦- ٣٠ی کانوونی دووەم لە ساڵی (٢٠٠٩) کردنەوەی کەمپی وەرزشی لە یانەی وەرزشی شۆڕیجە بۆ یانەکانی کەرکوك.
لە ٢٦- ٢٧ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٩) کردنەوەی خولێکی دادوەری بۆ دادوەرەکانی کەرکوك بەسەرپەرشتی (بەرزان فەتاح).
لە ١٤ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٩)، پێنج یانە بەشداری پاڵەوانێتی کەرکوکیان کردووە:- سۆلاڤ نوێ، خاك، چەمچەماڵ، ثورة، کوردستان کە سۆلاڤ نوێ پلەی یەکەمی



بەدەستهێناوە بەشداری خولێکی راهێنان لە شاری سلێمانی لەژێر سەرپەرشتی راهێنەری نێودەوڵەتی (محەمەدی بەهرامی).

لە ٣٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠١٠)دا بەشداری پاڵەوانێتی عێراق کردووە کە بۆ پارێزگاکانی عێراق سازکرابوو، کەرکوك توانی پلەی دووەم بەدەست بهێنن، کە لە شاری نەجەف رێکخرا.

لە ٢ی تەمووزی ساڵی (٢٠١٠)دا خوولێکی دادوەری کرایەوە بەسەرپەرشتی (ئارام فیدائی) لە یەکێتی کاراتیای کوردستان کە کەرکوکیش بەشداری کردووە.

لە رۆژانی (٢٠- ٢١)ی مایسی ساڵی (٢٠١١)دا یەکێتی کاراتیی کەرکوك لە هەولێر بەشداری خوولی راهێنانی کردووە کە بە سەرپەرشتی یەکێتی کاراتیەی کوردستان سازکرا.

لە رۆژانی (١- ٢)ی نیسانی ساڵی (٢٠١١)دا کەرکوك بەشداری لیژنەی دادوەری کردووە کە بەسەرپەرشتی یەکێتی کاراتیەی کوردستان لە سلێمانی بەسترا.

لە (١٣- ١٤)ی مایسی ساڵی (٢٠١١)دا یانەکانی کەرکوك بەشداری پاڵەوانێتی کەرکوکیان کرد کە هەریەکە لە:- خاك، ثورة، سولاف نوێ، شۆریجە، کەیوان، کە یانەی خاك بە پلەی یەکەم دەرچوو، سۆلاف نوێ بەپلەی دووەم، یانەی شۆریجە بەپلەی سێیەم.

لە ٧ی تشرین یەکەمی ساڵی (٢٠١١)، پاڵەوانێتی یانەکانی کوردستان لە کەرکوك سازکرا بۆ پێشکەوتووان، کەرکوك بە پێنج یانە بەشدارییان کردووە. خاك، ثورة، سۆلافیی نوێ، شۆریجە، کەیوان)، کە خاك پلەی دووەمی بەدەستهێنا لەسەر ئاستی کوردستان.

لە ٢٠ی نیسانی ساڵی (٢٠١٢)دا بەشداری پاڵەوانێتی یانەکانی کوردستانی کردووە بۆ تیپە پێشکەوتووەکان کە (١٦) یانە بەشداری کردوو خاك بەپلەی دووەمو یانەی شۆریجە بەپلەی سێیەم دەرچوو.

لە ٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠١٢)دا پاڵەوانێتی یانەکانی کەرکوك لە یانەی خاك بەرێوەچوو کە بەم شێوەیەبوو:-

١- یانەی (سۆلاف)، پلەی یەکەم لە شەڕ، یانەی خاك پلەی یەکەم لە کاتا

٢- یانەی (خاك)، پلەی دووەم لەشەڕ، یانەی (شۆریجە) پلەی دووەم لە کاتا.

٣- یانەی (الثورة)، پلەی سێیەم لە شەڕ، یانەی (کەیوان) پلەی سێیەم لە کاتا.

لە رۆژانی (١١- ١٢)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠١٢) بەشداری پاڵەوانێتی پارێزگاکانی عێراقی کردو، کە کەرکوك



پلەی دووەمی بەدەستهێنا.
لە ڕۆژانی (٢٠ - ٢٤)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (٢٠١٢)دا بەشداری پاڵەوانێتی جیهانی کردووە لە تاران بەبەشداری هەشت وڵات کە کەرکوك وەکو نوێنەرایەتی عێراق بەشداربوو، توانیان پلەی دووەم بەدەست بهێنن بەم بەشێوەیە:-
١- کارزان عاسی-ئالتون
٢- عەلی حوسێن ٢ برۆنز
٣- عومەر عەلی حوسێن ٢ برۆنز
٤- هونەر ناسح عەزیز ٢ برۆنز
لە (١٣)ی (ئەیلولی) ساڵی (٢٠١٢)دا بەشداری پاڵەوانێتی کراوەی یانەکانی عێراق کردووە بۆ کچان، لە شاری هەولێر کە یانەی (خاك) پلەی سێیەمی بەدەستهێناوە لە تەمەنی نێوان (١٢ -١٤) ساڵ.
لە (٧)ی تەمووزی ساڵی (٢٠١٣)دا یانەکانی کەرکوك بەشداری پاڵەوانێتییەکانیان کرد کە بەم جۆرە بوو:-
١- یانەی خاك، یەکەم، کات یانەی خاك، یەکەم شەڕ.
٢- یانەی سۆلاف نوێ، دووەم، کات یانەی سۆلاف نوێ، دووەم، شەڕ.
٣- یانەی شۆڕیجە، سێیەم، کات یانەی شۆڕیجە، سێیەم، شەڕ.
لە (٩)ی ئابی ساڵی (٢٠١٣)دا بەشداری پاڵەوانێتی یانەکانی کوردستانی کردووە بۆ پێگەیشتووان لە شاری کەرکوك کە یانەی خاك لە کاتا پلەی یەکەمی بەدەستهێنا، یانەی خاك دووەمی بەدەستهێنا لە شەڕ.
لە (٢٢)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠١٣)دا، پاڵەوانی یانەکانی کەرکوك کە لە کەرکوك بەسترا، یانەی خاك بەپلەی یەکەم دەرچوو، یانەی سۆلاف نوێ، پلەی دووەم، یانەی



(شۆڕیجە) پلەی سێیەم.
لە (٧)ی تەمووزی ساڵی (٢٠١٣)دا کۆتاییەکانی خوولی پێشەنگی عێراق لە کەرکوك بەڕێوەچوو بۆ قۆناغی یەکەم کە یانەی (خاك) بەپلەی یەکەمو یانەی (سۆلاف نوێ) بەپلەی دووەم دەرچوو، هەردووکیان هەڵبژێردران تا بۆ ئەوەی لە بەغدا بەشداری بکەن.
بۆیە لە قۆناغی دووەم کە لە بەغدا بەسترا لە ڕۆژی (٢٤) ی ئابی ساڵی (٢٠١٣)دا هەریەکە لە یانەی (خاك)و یانەی (سۆلاف نوێ) بەشدارییان کرد.
قۆناغی سێیەم لە ڕۆژانی (١٠ - ١٢)ی تشرین یەکەمی ساڵی (٢٠١٣) بەسترا، لە نەجەف، کە یانەی (خاك) پلەی سێیەمی بەدەستهێنا.





لە (٧)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٤)دا، پاڵەوانێتی یانەکانی عێراق و هەولێرو کەرکوک بەسترا کەرکوک بە پێنج یانە بەشدارییان کرد کە یانەی (خاك) پلەی دووەمی بەدەستهێناو هەریەکە لە (عومەر عەلی حوسێن) و (ڕزگار جەبار جەرجیس) هەڵبژێردران بۆ هەڵبژاردەی عێراق کە (عومەر عەلی) بەشداری پاڵەوانێتی ڕۆژئاوای ئاسیا بوو لەگەڵ هەڵبژاردەی عێراق.

لە (١٧)ی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠١٤) پاڵەوانێتی جیهانی کرایەوە لە ئێران، کەرکوک وەکو هەڵبژاردەی عێراق بەشداری کردو پلەی دووەمی بەدەستهێنا، کە ئەنجامەکان بەم شێوەیە بوو:-

١- کارزان عاسی- ئاڵتون
٢- عومەر عەلی-برۆنز
٣- کارزان عەلی-برۆنز
٤- ڕزگار جەبار-برۆنز
٥- ڕێبین محمود-برۆنز
٦- هەڵوێست بورهان برۆنز

لە (١٣)ی ئاداری ساڵی (٢٠١٥)دا، پاڵەوانێتی یانەکانی عێراق بۆ پێشکەوتووان لە دهۆك بەسترا، کە یانەی (خاك) پلەی سێیەمی بەدەستهێنا.

لە (١١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠١٥)دا پاڵەوانێتی یانەکانی عێراق تازە پێگەیشتووان ڕێکخرا کە یانەی خاك پلەی سێیەمیان بەدەستهێنا.



**یاریزانەکانی یاری کاراتێ لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو لە پارێزگای کەرکوك**







یاریزان محەمەد عەلی دەرچووی پلەی یەکەمساڵی ٢٠١٦



یاریزان عومەر عەلی میدالیای زیوین لە شاری تاران ٢٠٠٨



تاقیکردنەوەی پشتێنی ڕەنگاوڕەنگ ساڵ ٢٠١١



تاقیکردنەوەی پشتێنی ڕەنگاوڕەنگ ساڵ ٢٠١١



تاقیکردنەوەی پشتێنی ڕەنگاوڕەنگ ساڵ ٢٠١٥



بەدەستهێنانی پلەی سێیەم لە شاری سلێمانی



یاریزانانی کەرکوك لە بەغدا ساڵی ٢٠١٣



یاریزان عومەر عەلی و خەڵاتی بەدەستهێنانی پلەی یەکەم



یاریزانانی تیپی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١٣



یاریزانانی تیپی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١٣



تیپی کاراتی منداڵان ساڵی ٢٠١٥



خولی ڕاهێنەری نێودەوڵەتی لە شاری تاران بەسەرپەرشتی ڕاهێنەری جیهانی کاکاوا ساڵی ٢٠١٣، بەبەشداریی م. کارزان و کاپتن عومەر



خەڵاتکردنی دکتۆر هونەر



دڵزار-ئامانج-بەڵێن-ئاراز



ڕاوەستاوەکان لەڕاستەوە:-شکار، ئەحمەد، عەبدوللەتیف ،عەبدولقادر، ئەحمەد، عەلی




یاریزانی بەتوانای کەرکوك ڕزگار جەبار ساڵی ٢٠١٤ تاران



ڕێناز -کاپتن عومەر -بەڵێن



یاریزانانی پشتێنی ڕەنگاوڕەنك ساڵی ٢٠١١



یاریزانانی كەركوك لە شاری سلێمانی ساڵی ٢٠١٣



پاڵەوانێتی یانەكانی كەركوك ساڵی ٢٠١٤



یاریزانانی كاراتی شاری كەركوك ساڵی ٢٠١٤




یاری دۆستانەی كاراتی كەركوك و هەولێر ساڵی ٢٠١٤



هەڵبژاردەی كەركوك شاری تاران ساڵی ٢٠١٢



سەمەد، ڕەوا، محەمەد، شوان، عەبد، ئیبراهیم، محەمەد، محەمەد، ساڵح



فیستیڤاڵی پێشمەرگە ساڵی ٢٠١٤



کاپتن عومەر ساڵی ٢٠١٦



یاریزان عومەر ساڵی ٢٠١٦




کاپتن عومەر لە پاڵەوانێتی یانەکانی کوردستان ساڵی ٢٠١٣ لەکاتی بەدەستهێنانی پلەی یەکەم




کاپتن عومەر ساڵی ٢٠١٤ لە شاری سعودیە



کاپتن عومەر م. کارزان، کارزان، هونەر ساڵی ٢٠١٢ تاران



کاپتن ماجید، ڕزگار، توانا، هەڵوێست ساڵی ٢٠١٢ تاران



کاپتن عومەر، ڕزگار، م. عەلی، هونەر، ڕێناز ساڵی ٢٠١٢ لە شاری نەجەف



کاراتی شاری کەرکوك ٢٠١٤



کاپتن ماجیدو کۆمەڵێك یاریزانی شاری کەرکوك لە فیستیڤاڵی پێشمەرگە ساڵی ٢٠١٤



کاراتی کەرکوك ٢٠٠١٤



یاریزانانی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١٢
لەگەڵ سانسی کاسۆیا



یاریزانانی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١٣یانەکانی کوردستان




یاریزانانی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١٤ لە مەریوان




یاریزانانی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١٤ لە تاران یانەکانی کوردستان




یاریزانانی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١٤ لە شاری تاران



یاریزانانی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١٤ لە شاری هەولێر



یاریزانانی کاراتی کەرکوک ساڵی ٢٠١٤



یاریزانانی کاراتی کەرکوک پلەی دووەم لە شاری کەرکوک



یاریزانانی کاراتی کەرکوک سالی ٢٠١٢



کارزان، کاپتن ماجیدو کاپتن عومەر لە یانەکانی کوردستان




کارزان -رزکار -کاپتن عمر



یاریزان کارزان عومەر لەکاتی خەڵاتکردنیدا




کاروان، م. عەلی، م. محەمەد ساڵی ٢٠١٢



یاریزانانی کەرکوك سالی ٢٠١١



یاریزانانی کەرکوك ساڵی ٢٠١٠



یاریزانانی کەرکوك ساڵی ٢٠١١



یاریزانانی کاراتی کەرکوك ٢٠١٣



لەلای ڕاستەوە ڕزگار، محەمەد، کارزان، هەرێم، م کارزان محەمەد، بەڵێن، کاپتن عومەر، توانا ساڵی ٢٠١٦ کەرکوك



نمایشی کاراتی لە ڕۆژی جلوبەرگی کوردی و پێشمەرگە لە کەرکوك ساڵی ٢٠١٦



لەلای ڕاستەوە م. کارزان، م عەلی، م. محەمەد ساڵی ٢٠١١



م. عارف-م. علي - لەگەڵ ڕاهێنەری جیهانی کاسۆیا ساڵی ٢٠١٢ شاری تاران



م. کارزان، م. علی، کاپتن عومەر ساڵی ٢٠١٤ لە پاڵەوانێتی ڕۆژئاوای ئاسیا لە وڵاتی سعودیە



م کارزان و کاپتن عومەر لەگەڵ نوێنەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ کاراتی ساڵی ٢٠١٣ لە شاری تاران



م. کارزان، کاپتن عومەر، کارزان-هونەر لە پاڵەوانێتی نێودەوڵەتی شاری تاران ساڵی ٢٠١٢ و بەدەستهێنانی پلەی دووەم



هەڵبژاردەی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١٤ لە شاری هەولێر




هەڵبژاردەی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١٤



هەڵبژاردەی کاراتی کەرکوك لە بەغدا ساڵی ٢٠١٣



هەڵبژاردەی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١٠ لە شاری نەجەف



هەڵبژاردەی کاراتی کەرکوك ساڵی ٢٠١١



ئاسۆ خالید



هەڵبژاردەی کاراتی کەرکوك لە شاری کەرکوك ساڵی ٢٠١٠




هەڵبژاردەی کاراتی کەرکوك و هەولێر ساڵی ٢٠١٤



هەڵبژاردەی کەرکوك ساڵی ٢٠١٤



یاریزان هەرێم دلێر لە کاتی خەڵاتکردنیدا



ئاسۆ، محەمەد، ئاراز، هەستی، ئەحمەد














**کۆمەڵێک یاریزانی تایکواندۆ لە کەرکوک کە لەنێویاندا ڕاهێنەر: م. بەهاددین و دیار عەبدولخالق و بەهاددین عەبدولقادر دەرکەوتووە**



* وەرزشکارە دێرینەکانی کەرکوك..

رزگار شوانی

کەرکوك.. شاری ئاڵتونی زێرین.. کەرکوك ئەو شارە دێرینەی کە ساڵانێکی زۆرە بە دەیان و سەدان وەرزشکاری دێرینی لەخۆگرتووە کە لەسەر دەستی ئەوان دەستکەوتی گەورە لەسەر ئاستی ناوخۆو جیهانیدا بەدەستهێنراوە.. بێگومان لەم شارە دێرینەدا ناوی پرشنکدار هەڵکەوتوون کە نەوەکانی داهاتوو بە شانازییەکی گەورەوە یادیان دەکەنەوە، لەوانە کەریم ئەفەندی و سابیر عەلی و عادل عەبدوڵڵا و کازم یاسین و ستار کوردی و فازڵ عەبدولمەجید و حیلمی شەوکەت و هەمزە یاسین و عومەر خەتاب و فازڵ عومەرو شێخ ستار بەرزنجی و نیهاد عەلی غالیب و مەهدی وەحید و ئەحمەد جەلال و عەبدوڵڵا چەنەباز و ویداد سوداد و عەدنان عەبدولقادرو عیماد محەمەد شەریف و خەلیفە ئەسوەد و عەدنان عومەرو مەحموود نورەدین و دکتۆر ماهیر بەیاتی و عەونی غەنی و محەمەد سلێمان بەلە و.. ئەوانی تر لە ناودارانی وەرزشی.. ئەم ناودارانە ئامانجی سەرەکیان ئەوەبوو کە ئینتیمای راستەقینەیان هەبێت بوو شارەکەیان (کەرکوك) هەروەك ناوی کەرکوکی خۆشەیست لە خولە قارەمانێتییەکانی نێودەوڵەتیدا بەرزو شکۆدار بێت، بەڵێ ئەوان هەوڵ و کۆششی بەردەوامیان دەدا بوو ئەوەی باشترین ئەنجام لەو خولانەدا بەدەستبهێنن ..

ئێمەش لەم کەیسەدا تیشك دە خەینە سەر ژیان و بەسەرهاتی ژمارەیەك لەو وەرزشکارە دێرینانەی شاری کەرکوك و رۆڵیان لە بەرەوپێشچونی وەرزش لە عێراق و کوردستان بەشێوەیەکی گشتی و کەرکوك بەشێوەیەکی تایبەتی..

* یاریزانی تۆپی پێی نێودەوڵەتی (کەریم ئەفەندی)

عەبدولکەریم محەمەد ئەمین ناسراو بە (کەریم ئەفەندی) لە ساڵی ۱۹۳۰ لە گەرەکی (شوان)ی شاری کەرکوك لەدایکبووە، یەکێك بوو لە باشترین یاریزانی هێڵی بەرگری تیپی هەڵبژاردەی سەربازی عێراق.. هەر لە تەمەنی منداڵییەوە خولیای تۆپی پێ بووە، تاکو لە ساڵی ۱۹٤۸ بوو بە باشترین یاریزانی هەڵبژاردەی کەرکوك و هەڵبژاردەی کۆمپانیای نەوتی باکوورو هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك و تیپی فیرقەی دووی سەربازی، لە ساڵی ۱۹٥٤ هەڵبژێردرا بۆ یاریکردن لە ریزی تیپی هەڵبژاردەی سەربازی عێراقی، بۆ جاری یەکەم بەشداری کرد لە دووهەمین خولی وەرزشی عەرەبی نێودەوڵەتی کە لە شاری دیمەشقی پایتەختی سوریا بەرێوەچوو، لە ساڵی ۱۹٥٥ لە خولی ئاسیای نێودەوڵەتی کە لە تارانی ئێران بەرێوەچوو بەشداری کرد، هەر لە ساڵی ۱۹٥۹دا بەشداری کرد لە سێ یاری نێودەوڵەتی کە لە (قاهیرەو ئەسیوت و تەنتای) میسر بەرێوەچوو، لە ساڵی ۱۹٦۰ بەشداری کرد لە ۹ یاری نێودەوڵەتی کە لە رووسیا و ڤێتنام و کۆریا و چین ئەنجام درا، هەروەها بەشداری کردووە لە زیاتر لە (۱۰) یاری نێودەوڵەتی خولی جامی جیهانی سەربازی کردووە کە لە ولاتانی یۆنان و تورکیاو سوریا ساڵی ۱۹٦۲ بەرێوەچوو، ئەمە جگە لە بەشداریکردنی خولەکانی نێودەوڵەتیدا کە لە ناوەوەی عێراق و کەرکوك بەرێوەچوو، کەریم ئەفەندی یاریزانێکی زۆر بەهێز بووە و توانیویەتی دەستکەتی زۆرباش بۆ ئەو تیپەی بۆی یاریکردووە بەدەست بهێنێت و نازناو بۆخۆی دەربکات، لە ساڵی ۱۹٦۷ بەئێجگارەکی واز لە تۆپی پێدەهێنێت لە یارییەکی دۆستانەی نێوان تیپی هەڵبژاردەی بەغدا و تیپی هەڵبژاردەی کەرکوك.. ناوبراو ئاشنایەتی لەگەڵ دەیەها یاریزانی عێراقی و نێودەوڵەتیدا هەبووە لەوانە (عادل عەبدوڵڵا و ئارام کەرەم و وداد سوداد و عەبدوڵڵا چەنەبازو فازڵ عەبدولمەجید و کازم یاسین و عەدنان عەبدولقادر و.. ئەوانی تر) مەخابن رۆژی ۲۰۱٦/۱۰/۲٦ بەهۆی نەخۆشییەوە کۆچی دوایی کردوماڵئاوایی لە دونیای وەرزشدا کرد..

* یاریزانی تۆپی پێی نێودەوڵەتی (عادل عەبدوڵڵا)

یاریزانی نێودەوڵەتی (عادل عەبدوڵڵا) لە ساڵی ۱۹۳٥ لە گەرەکی قەڵای شاری کەرکوك چاوی بەدونیا هەڵهێناوە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکوك تەواو کردووە، لە پاشاندا لە ساڵی ۱۹٥۳ وەك جێگری ئەفسەر لە فیرقەی دووهەمی سەربازی دادەمەزرێت و بۆ ریزی تیپی فیرقەی دوو وەك یاریزانێکی لێهاتووی تۆپی پێ یاری دەکات.. یەکەم جار لە قوتابخانەی سەرەتایی قەڵای یەکەم مامۆستای وەرزش ئەحمەد جەلال بەهرەکانی ئاشکرا دەکات و لە ساڵانی ۱۹٤۸ و۱۹٤۹ دا بەهرەی وەرزشی زیاتر دەردەکەوێت بەتایبەتی لە یارییەکانی تۆپی پێ و باڵە و راکردنی ۱۰۰ و ۲۰۰ مەتر، هەر بۆیە دەستنیشان کرا لە ریزی تیپی هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك و یەکەمین یاری تیپەکەی لەگەڵ تیپی هەڵبژاردەی موسڵ ئەنجام درا و یارییەکە لە بەرژەوەندی تیپی هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك کۆتایی هات و گۆڵەکەش لەلایەن یاریزان کەریم ئەفەندی تۆمارکرا، عادل



عەبدوڵڵا لەگەڵ یاریزانی خوالێخۆشبوو کەریم ئەفەندی بۆ تیپی هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك یاریان دەکردو توانیان ئەنجامی باش بۆ تیپەکەیان دەستەبەر بکەن، عادل عەبدوڵڵا لە مەرکەزی هێرشبەری ناوەراست یاریدەکرد و نازناوی بۆخۆی وەك یاریزانێکی لێهاتوو بەتوانا لە کەرکوك و عێراق و دەرەوەی عێراق دەرکرد، ئەمە جگە لەوەی کە یاریزانێکی بەهێز بوو لەنێو یاریگادا جموجوڵی زۆر بوو تەنانەت یاریزانانی تیپی بەرانبەر نەیاندەتوانی پێشی لێ بگرن، باشترین گۆڵەکانی عادل عەبدوڵڵا ئەو دوو گۆڵەی کە لە تیپی هە ڵبژاردەی میسری کرد ساڵی ١٩٥٤ کە کۆتایی هات بە ئەنجامی (٣-٢) لە بەرژەوەندی تیپی میسر.. ئەم یاریزانە ناسراوەی کەرکوك رۆژی ١٩٩٦/٢/١٤ کۆچی دوایی کردو لە گۆرستانی موسەڵلا بە خاك سپێردرا..

*** یاریزانی تۆپی پێی نێودەوڵەتی فازڵ عەبدولەجید**

یاریزانی نێودەوڵەتی فازڵ عەبدولمەجید لە ساڵی ١٩٣٥ لە گەرەکی چای کەرکوك لەدایکبووە و دەرچووی ئامادەییە هەر لە منداڵییەوە خولیای وەرزش بووەو لە رێگای حەسەن عەبدولمەجیدی برای فێری یاری زۆرانبازی و تۆپی پێ بووە، ئەم یاریزانە توانی خزمەتێکی زۆر بە وەرزش بگەیەنێت، بەتایبەتی لە یاری تۆپی پێدا، لە ساڵانی ١٩٥٠ تاکو١٩٥٣ بۆ تیپی تۆپی پێی (المعارف)ی پەروەردەی کەرکوك یاریکرد، لەپاشاندا هەڵبژێردرا لەگەڵ یاریزانان عادل عەبدوڵڵا و فریش خورین بۆ یاریکردن لە ریزی تیپی هەڵبژاردەی (المعارف)ی عێراق ساڵی ١٩٥٣ هەروەها بۆ تیپەکانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك و فیرقەی دووی سەربازی یاریکرد، دوابەدوای ئەوە لە رۆژی ٢٣ی کانوونی دووەمی ساڵی١٩٥٦ گواسترایەوە بۆ شاری بەغدا و لەوێ بۆ تیپی (مصلحە نقل الرکاب) یاریکرد کە ئەو دەمە ئەو تیپە باشترین و بەهێزترین تیپ بوو لە تیپەکانی بەغدا، لە ساڵی ١٩٥٥ بۆ تیپی هەڵبژاردەی عێراق یاریکرد و لە خولی ئاسیا بەشداریکرد کە لە تارانی پایتەختی ئێران بەرێوەچوو، تیپەکەیان توانی ئەنجامی باش لەگەڵ تیپەکانی هیندستان و پاکستان و سوریا و ئێران و تورکیا بەدەست بهێنێت، هەروەك لە ساڵی ١٩٥٧ وەك یاریزانی سەرەکی تیپی هەڵبژاردەی عێراق لە خولی عەرەبی بەشداریکرد کە لە بەیروتی پایتەختی لوبنان بەرێوەچوو، عادل عەبدوڵڵا لە ساڵی ١٩٥٩ نیشانەی سەرۆکی تیپی هەڵبژاردەی عێراقی ئەهلی پێ سپێردرا، ئەو تیپە توانی ئەنجامی باش لە ١٨ یاری نێودەوڵەتی دا بەدەست بهێنێت، هەروەها تیپی هەڵبژاردەی عێراق کە عادل عەبدوڵڵا یەکێك بوو لە یاریزانە باشەکانی توانی لە (٤٠) یاری نێودەوڵەتیدا بەشداری بکات، هەروەها کاتێ کە یاریزانی تیپی (مصلحة نقل الرکاب) بوو تیپەکەیان توانی چەندین جار ببێت بە پاڵەوانی جامی خولی عێراقی کە ٨تیپ، جگە لە تیپی (مصلحة نقل الرکاب) تیپەکانی جەویەو فیرقەی دوو و فیرقەی سێ و کۆلێژی سەربازی و ئالیاتی شورتەو هێزی سەیارەو مینای بەسرە بەشدارییان تێداکرد، فازڵ عەبدولمەجید وەك یاریزانی بەتوانا لە ساڵانی (١٩٥٦-١٩٦٧) بۆ ریزی تیپی هەڵبژاردەی (مصلحة نقل الرکاب) یاریکردو دواتر بۆ یەکجارەکی وازی لە یاری تۆپی پێ هێنا، دوای ئەوە بەشداری چەند خولێکی راهێنان بوو، یەکەمین خولی راهێنانی نێودەوڵەتی کە بەشداری تێدا کرد لەلایەن یەکێتی تۆپی پێی عێراق بەرێوەچوو، توانی پلەی (نایاب) بەدەست بهێنێت، لە پاشاندا بەشداریکرد لە خولی راهێنانی نێودەوڵەتی کە بۆ ماوەی هەشت مانگ لە ئەڵمانیا بەرێوەچوو، دوای ئەوە بەشداریکرد لە خولی ئەنجوومەنی نێودەوڵەتی سەربازی کە لە ساڵی ١٩٧٤ ئەنجام درا، فازڵ عەبدولمەجید شەرەفی راهێنەرێتی پێ بەخشراو یەکەم تیپی تۆپی پێ کە بوو بە راهێنەری تیپی (مصلحە نقل الرکاب) بوو کە بۆ ماوەی دوو ساڵ ١٩٦٨ و١٩٦٩ راهێنەری بوو، تیپەکەی توانی لە خولی دەوری عێراقی دا پلەی دووهەم بەدەست بهێنێت، لە ساڵی ١٩٧٠ وەك فەرمانبەر لە (مصلحە نقل الرکاب) گواسترایەوە بۆ وەزارەتی لاوان لە بەغدا و لەوێ ئەرکی راهێنەرێتی تیپی مەڵبەندی لاوانی کازمیەی پێ سپێردرا، هەروەها بوو بە راهێنەری هەڵبژاردەی لاوانی بەغدا ساڵی (١٩٦٩-١٩٧٠) ئەوەبوو تیپەکەی توانی پلەی یەکەم لە خولی کۆماری هەڵبژاردەکان بەدەست بهێنێت، دواتر لەلایەن یەکێتی تۆپی پێی عێراقی بانگهێشت کرا تاکو پەرە بە تۆپی پێی کەرکوك بدات، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٧٤ تاکو ساڵی ١٩٨٠ ئەرکی راهێنەرێتی تیپی هەڵبژاردەی پارێزگای کەرکوکی پێ سپێردرا، دوای پرۆسەی ئازادی عێراق بۆ ماوەی چوار ساڵ راهێنەری یانەی سەورە بوو، هەروەها بۆ ماوەی دوو ساڵ راهێنەری تیپی یانەی کەرکوك بوو ..

*** گۆڵپارێزی تۆپی پێی کەرکوك (کازم یاسین)**

یادگارییەکانی لەگەڵ تۆپی پێ دا زۆرە و زیاتر لە (٢٠) ساڵ گۆڵپارێزی تۆپی پێ بوو لە شاری کەرکوك، لەو ماوەیەدا لە هیچ یارییەکدا لە کورسی یەدەگ دانەنیشتووە، ئەویش گۆڵپارێزی نێودەوڵەتی کازم یاسین کە بە (پشیلەی رەش) و ( جنی رەش) ناسرابوو لەنێو یاریگاکاندا، ئەم یاریزانە لە ساڵی ١٩٣٧ لە کەرکوك لەدایکبووە، سەرەتای دەستپێکردنی



وەرزش لە ریزی تیپی هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك ساڵانی ١٩٥٦ و١٩٥٧ بوو، دواتر چووە ریزی تیپی فیرقەی دووی سەربازی دوای ئەوەی پلەی جێگری ئەفسەری پێدرا، ئەو کاتە تیپی سەربازی فیرقەی دوو بەهێزترین تیپی وەرزشی بوو، لەپاشاندا بانگهێشت کرا بۆ یاریکردن لە ریزی تیپی هەڵبژاردەی کەرکوك کە بەهێزترین تیپ بوو لە تیپە هەڵبژاردەکانی عێراقدا، لە ساڵی ١٩٥٩ گۆڵپارێز کازم یاسین بۆ تیپەکانی هەڵبژاردەی سەربازی و هێزە چەکدارەکانی عێراق یاریکرد، باشترین یاریزانەکانی ئەوکاتە بریتی بوون لە جەمولی و عەموبابا و هیشام عەتا عەجاج و محەمەد سامرو عادل عەبدوڵڵا و ئارام کەرەم و ناسر جەکۆ و حامید فەوزی و کەریم ئەفەندی و جەلیل شەهاب و حوسێن هاشم و عەباس حومادی و فەخری عەباس و قاسم زوبە و.. ئەوانی تر..
لە ساڵانی ١٩٥٧ تاکو ١٩٧٧ وەك گۆڵپارێزێکی بەهێز بۆ تیپی یانەی سەورەی شاری کەرکوك یاریکرد، لە ساڵی ١٩٦٤ لەلایەن ڕاهێنەری یوغسلافی (کوستا) دەستنیشانکرا بێت بە گۆڵپارێزی تیپی هەڵبژاردەی عێراق لە یاری نێوان عێراق و بەلجیکا.. کازم یاسین لە دەیان یاری ناوخۆیی و نێودەوڵەتیدا بەشداری کردووە لەوانە خولەکانی جیهانی سەربازی و کە لە وڵاتانی تورکیا و یۆنان و بەلجیکا و سوریا بەڕێوەچوون، یەکەمین یاری نێودەوڵەتی کە بەشداری تێدا کرد لە ریزی تیپی هەڵبژاردەی عێراق بەرانبەر تیپی هەڵبژاردەی تونس کە ساڵی ١٩٦١ بەڕێوەچوو و ئەنجامەکەی بە یەکسانبوونی هەردوو تیپ (١-١) کۆتایی هات..
کازم یاسین لە ساڵی ١٩٧٧ بۆ ئێجگارەکی وازی لە یاری تۆپی پێ هێنا، دوابەدوای ئەوە توانی بەشداری لە خولی ڕاهێنەری نێودەوڵەتی بکات کە بەسەرپەرشتی یەکێتی تۆپی پێی عێراق بەڕێوەچوو بڕوانامەی ڕاهێنەری بەپلەی (باش)ی بەدەستهێنا، لەپاشاندا بەشداری خولێکی پێگەیاندنی کرد کە بەسەرپەرشتی ڕاهێنەرانی یوغسلافی ئەنجام درا..

*** وەرزشکاری دێرینی تۆپی باڵەی کەرکوك حەسەن عەلی مستەفا:**

– وەرزشکاری دێرینی تۆپی باڵە حەسەن عەلی مستەفا لە ساڵی ١٩٤٣ لە شاری کەرکوك لەدایکبووە و بەکالۆریۆسی پەروەردەی وەرزشی بەدەستهێناوە، لە ساڵی ١٩٦٣ وە خولیای وەرزش بووە لە پۆلی چوارەمی ئامادەیی مۆسەڵڵای کەرکوك، یەکێك بوو لە ئەندامانی تیپی هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك لە تۆپی باڵەو باسکەدا، هەروەها یەکێك بوو لە یاریزانەکانی تیپی تۆپی باسکەی یانەی سەورەی کەرکوك، لە ساڵی ١٩٦٤ چووەتە کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی و لە ساڵی ١٩٦٨ بڕوانامەی بەدەستهێناوە، لە ساڵی ١٩٦٩ لە ئامادەیی پیشەسازی کەرکوك وەك مامۆستای پەروەردەی وەرزشی دامەزرا، بۆ یەکەم جار ئەرکی ڕاهێنەری تیپی باڵەی هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوکی پێ سپێردرا، لە خولی تۆپی باڵەی پەروەردەکانی ناوچەی باکوور بە بەشداری هەڵبژاردەکانی کەرکوك و سلێمانی و هەولێرو موسڵ بەشداری کرد.
ساڵی ١٩٧١ بۆ یەکەمجار بەشداری کرد لە خولی ناوبژیوانی تۆپی باڵە کە لە شاری کەرکوك بەڕێوەچوو و توانی بڕوانامەی ناوبژیوانی بەدەست بهێنێت.
لە ساڵی ١٩٧٣ بەشداری کرد لە خولی پلەیەکی ناوبژیوانی تۆپی باڵەدا کە لە شاری هەولێر ئەنجام دراو توانی بڕوانامەی پلەیەکی ناوبژیوانی بەدەست بهێنێت، دواتر وەك ناوبژیوانی تۆپی باڵە ئەرکی ناوبژیوانێتی دەیان خولی پێ سپێردرا کە لەلایەن یەکێتی ناوەندی تۆپی باڵەی عێراق بەڕێوەچوون.
لە ساڵی ١٩٨٣ بەشداری کرد لە خولی پەرەپێدانی ناوبژیوانانی تۆپی باڵە کە لە وڵاتی کوێت بەڕێوەچوو، لە



ساڵی ١٩٨٥ هەڵبژێردرا بۆ بەشداریکردن لە خولی ناوبژیوانی نێودەوڵەتی تۆپی باڵەدا کە لە بانکۆکی وڵاتی تایلەند بەسەرپەرشتی یەکێتی ئاسیای تۆپی باڵە بەڕێوەچوو و لەو خولەدا توانی بڕوانامەی ناوبژیوانی نێودەوڵەتی بەدەست بهێنێت، حەسەن عەلی مستەفا دوا ئەوەی بوو بە ناوبژیوانی

نێودەوڵەتی بەشداریکرد لە چەندین خولی نێودەوڵەتی تۆپی بالەدا چ لە ناوەوەی عێراق، چ لە دەرەوەی عێراق بەتایبەتی لە خولەکانی وڵاتانی عەرەبی و وڵاتانی تری دەرەوەی عێراق، وەك ناوبژیوانێکی بێ لایەن تاکو ساڵی ٢٠٠٤ کاری کردووە. لە ساڵی ٢٠٠٦ ئەرکی سەرۆکی یەکێتی ناوەندی تۆپی بالەی کوردستانی بۆ ماوەی شەش ساڵ پێ سپێردرا، هەروەها ئەندامێتی یەکێتی ناوەندی تۆپی بالەی عێراقی پێ سپێردرا ئەویش ماوەی شەش ساڵی خایاند، وەك وەفدی عێراقی و کوردستانی بەشداری لە خولەکانی نێودەوڵەتی تۆپی بالەدا کرد، حاڵی حازر سەرۆکی لقی کەرکوکی یەکێتی تۆپی بالەی کەرکوکە، لە هەمان کاتیشدا وەك وانەبێژی بەتوانا وانەی وەرزشی بالە لە کۆلێژی پەروەردەی کەرکوکی سەر بە زانکۆی کەرکوك دەڵێتەوە..

* وەرزشکاری دێرین گۆڵپارێزی کەرکوك حیلمی شەوکەت:

گۆڵپارێزی کەرکوك حیلمی شەوکەت لە ساڵی ١٩٥٤ لە گوندی گومەتلەری شاری کەرکوك لەدایکبووە، هەر لە منداڵییەوە لە



گەڕەکی بەگلەر خولیای وەرزش بووە، یەکەمجار بۆ تیپە میللییەکانی کەرکوك یاریکردووە، بەتایبەتی لە گەڕەکی تسعین چووەتە ریزی تیپی میللی (یشیل ئارماق) پێشتر لە قۆناغی سەرەتاییدا مامۆستای وەرزش ئەحمەد جەلال بەهرەی وەرزشی ئەم یاریزانەی ئاشکرا کردو هەڵیبژارد تاوەکو بۆ تیپی پەروەردەی کەرکوك یاری بکات، هەروەك لە ریزی تیپەکانی تسعینی سەرەتایی و ناوەندی (الولید) یاریکردووە، حیلمی شەوکەت دوای ئەوەی قۆناغی خوێندنی ناوەندی تەواو دەکات دەچێتە ریزی تیپی فیرقەی دووی سەربازی وەك گۆڵپارێزی تیپەکە بەسەرپەرشتی عادل عەبدوڵڵا و کازم یاسین.

لە ساڵی ١٩٧٣ هەڵدەبژێردرێت بۆ یاریکردن لە ریزی تیپی هەڵبژاردەی سوپای عێراق، دواتر لە ساڵی ١٩٧٤ هەڵدەبژێردرێت بۆ یاریکردن لە ریزی تیپی هەڵبژاردەی کەرکوك، لە ساڵی ١٩٧٧ بۆ تیپی یانەی سەورەی کەرکوك یاری دەکات، هەروەها بۆ تیپی یانەکانی سەلاحەدین و یەکی حوزەیران و چەیش و هەڵبژاردەی سەربازی یاریکرد، حیلمی شەوکەت گۆڵپارێزێکی تۆپی پێی بەهێز بوو، لە چەندین یاری بەهێزدا توانی وەك پلایین پارێزگاری لەو تیپانە بکات کە بۆی یاریکردوون، دوای خزمەتێکی زۆری تۆپی پێی کەرکوك حیلمی شەوکەت لە ساڵی ١٩٧٧ واز لە گۆڵپارێزی دەهێنێت و مێژوویەکی دێرین لە ئاسۆی وەرزشی کەرکوك تۆمار دەکات..

* وەرزشکاری دێرینی کەرکوك شێخ ستار بەرزنجی:

هەر لە سەرەتای دامەزراندنی یانەی وەرزشی سۆلاف ساڵانی شەستەکانی سەدەی پێشوو یەکێك بوو لە دامەزرێنەری تیپی یانەکە بەسەرپەرشتی شێخ پیرۆت تاڵەبانی، پێشتریش وەك مامۆستای وەرزشی توانی خزمەتێکی زۆری وەرزش لە شاری کەرکوك بکات.. ئەویش (شێخ ستارعەبدوڵڵا بەرزنجی) ە، شێخ ستار بەرزنجی نموونەی سەرکردەی وەرزشی قوتابخانەکانی کەرکوك بوو، لە دیدەوانیشدا خزمەتێکی زۆری کردووە لەگەڵ برادەرانی تەمەنیدا، ئەوەبوو نیشانەی تەختەی لە بواری بزووتنەوەی دیدەوانیدا وەرگرت، ئەمەش زیاتر هانی دا بۆ زیاتر برەودان بە بواری وەرزش لە شارە دێرینەکەی کەرکوك.



شێخ ستار لە تەمەنی لاوێتیدا یەکێك بوو لە هەرە یاریزانە باشەکانی تیپی پەروەردەی یاری بالە دا، هەروەها رۆڵێکی گرنگی هەبوو لە بەرەوپێشچوونی یاری تۆپی بالەدا تاوەکو

توانی بڕوانامەی پلەیەکی ناوبژیوانی باله بەدەست بهێنێت، شێخ ستار ڕۆڵی هەبووە لە ڕاهێنەرێتی تیپەکانی پەروەردەی تۆپی بالە و مەلەوانی و گۆڕەپان و مەیدان و سەربازی، بەشداری زۆریشی لە خولەکانی پەروەردەی وەرزشی کردووە، لە ساڵی ١٩٨٦ تاکو ١٩٩٢ وەك ئامادەکارو پێشکەشکاری بەرنامەی (وەرزش و لاوان) کە لە کەناڵی کوردی تەلەفزیۆنی کەرکوك پەخش دەکرا، ڕۆڵێکی باشی هەبوو توانی لە ماوەی ئەو ساڵانەدا بەدەیان یاری خولی تۆپی پێی عێراقی وەك (معلق)ی کوردی بگوێزێتەوە، ئەمە جگە لە پەخشکردنی چالاکییە وەرزشییەکانی تری ناو شاری کەرکوك و شارەکانی تری کوردستان.. شێخ ستار لە بواری پلەی لێپرسراوێتی وەرزشیدا ڕۆڵی هەبووە وەك سەرۆکی یەکێتی تۆپی باڵەی کەرکوك و سەرۆکی ئەنجوومەنی یانەکانی کەرکوك و پسپۆڕ لە نوێنەرایەتی لیژنەی ئۆلۆمپی کەرکوك لە بواری وەرزشدا، لەپاڵ پلەکەی خۆی وەك سەرۆکی یانەی وەرزشی سۆلاف تاوەکو ئیمڕۆ.. لە بواری ئەدەبیشدا شێخ ستار بەرزنجی هەر لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی نووسەران و ئەدیبانی کورد ئەندامی کارای ئەو یەکێتییەیە، هەروەها بەدەیان وتارو نووسینی لە بواری وەرزشیدا لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی عێراقی و کوردستانیدا بڵاوکردووەتەوە، ئەمە جگە لە چاپکردنی پەرتوکێکی وەرزشی تایبەت بە یانەی وەرزشی سۆلاف، ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر سەیری خزمەتەکانی وەرزشی شێخ ستار بەرزنجی بکەین بێگومان پڕن لە ئەزموونێکی پرشنگدار کە نەوەکانی داهاتووی وەرزشی کەرکوك شانازی پێوە دەکەن ..

*** وەرزشکاری دێرینی کەرکوك نیهاد عەلی غالیب**

مامۆستا (نیهاد عەلی غالیب) یەکێکە لە وەرزشکارە ناسراوە دێرینەکانی شاری کەرکوك کە تاوەکو ئیمڕۆ وەك پسپۆڕێکی شارەزا لە بواری وەرزشدا لە هەوڵ و کۆششی بەردەوامدایە لە پێناوی خزمەتکردنی وەرزش لەم شارە دێرینەدا.. ناسراوە بە پێشەوای وەرزشی هەر لە وەرزشی خوێندنگاکان تاوەکو وەرگرتنی پلە و پایەی سەرۆکی ڕابیتەی وەرزشکارە دێرینەکانی کەرکوك، نیهاد عەلی غالب بەردەوامە لە ئامادەبوونی کۆبوونەوەو کۆنگرەی وەرزشیدا.. وەرزشکاری دێرین نیهاد عەلی غالیب لە ساڵی ١٩٣٨ لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، بڕوانامەی بەکالۆریۆسی پەروەردەی وەرزشی لە کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی زانکۆی بەغدا ساڵی ١٩٦٢ بەدەستهێناوە، سەرەتای وەرزشی لە ڕیزی تیپەمیللیەکانی تۆپی پێ دا دەستپێکردووە، ساڵانی (١٩٥٦ – ١٩٥٨) وەك یاریزانی تۆپی پێ بۆ تیپی پلەیەکی ئیعاشە لە خولی کەرکوك یاریکردووە، لە ساڵی ١٩٥٨ چووەتە کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی زانکۆی بەغدا تاکو ساڵی ١٩٦٢ بڕوانامە بەدەست دە هێنێت، دوای ئەوە دەچێتە کۆلێژی ئەفسەرانی یەدەگ ( خولی ١٧) لە ساڵی ١٩٦٥ وەك مامۆستای ناوەندی لە ناوەندی (الغربیە)ی کەرکوك دادەمەزرێت، لە ساڵانی ١٩٦٦ تاکو ١٩٧٢ لە پەیمانگاو خانەی مامۆستایانی کەرکوك وانەی وتووەتەوە، ساڵانی ١٩٦٩ تاکو ١٩٧٠ لە مەککەی



پیرۆزی میرنیشینی عەرەبی سعودیە وانەی وتووەتەوە، لە ساڵانی ١٩٧٢ تاکو ١٩٨٤ وەك بەڕێوەبەری چالاکی وەرزشی ودیدەوانی کەرکوك کاری کردووە، لە ساڵی ١٩٨٤ تاکو ١ی کانوونی دووەمی ساڵی٢٠٠٢ سەرپەرشت یارییەکەی پەروەردەی وەرزشی سەر بە پەروەردەی کەرکوك بووە، دواتر خانەنشین کراوە، مامۆستا نیهاد عەلی غالیب پلەی ئەندامی دەستەی گشتی یانەی وەرزشی سەورەی کەرکوك بووە هەر لە دامەزراندنی یانەکە ساڵی ١٩٦٣ تاکو ساڵی ٢٠٠٣ هەروەك ئەندامی دەستەی کارگێڕی یانەکە بووە ساڵانی ١٩٨١ تاکو ٢٠٠٣ هەروەها لە ساڵانی ١٩٦٥ تاکو ١٩٧٢ سکرتێری یەکێتی تۆپی پێی کەرکوك بووە، لە ساڵانی ١٩٧٢ تاکو ١٩٨٧ سەرۆکی یەکێتی تۆپی باسکەی کەرکوك بووە، ساڵانی ١٩٦٥ تاکو ١٩٨٧ ڕاهێنەری تیپی هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوکی گۆڕەپان و مەیدان بووە، ساڵانی ١٩٦٢ تاکو ١٩٧٩ ناوبژیوانی پلەیەکی تۆپی پێ بووە، ساڵانی ١٩٦٥ تاکو ١٩٨٧ ناوبژیوانی پلەیەکی تۆپی باسکە بووە، لە ساڵی ١٩٧٩ بەشداریکردووە لە خولی ئۆلۆمپی پێشەواکان وەك نوێنەری یەکێتی عێراقی باسکە کەلە ئەسینای یۆنان بەڕێوەچوو، لە ساڵی ٢٠٠٤ تاکو ئێستا سەرۆکی ڕابیتەی وەرزشکارە دێرینەکانە لە کەرکوك، هەروەها سەرۆکی لقی کەرکوکی یەکێتی شەترەنجی عێراقییە ..

*** یاریزانی نێودەوڵەتی تۆپی باسکە فازڵ عومەر**

– یاریزانی نێودەوڵەتی فازڵ عومەر لە ساڵی ١٩٥٧ لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، وەك یاریزانی تۆپی باسکە لە چەندین خول و قارەمانییەتی ناوخۆو دەرەوەی وڵات بەشداری کردووە، لە ساڵی ١٩٧٧ بەشداری خولی نێودەوڵەتی عەرەبی خوێندنگاکان کردووە کە لە وڵاتی لیبیا بەڕێوەچوو، لەو خولەدا تیپەکەی توانی پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت.. لە هەمان ساڵدا لە ڕیزی تیپی هەڵبژاردەی سەربازی عێراقی



بەشداری خولی سەربازی کرد کە لە وڵاتی لیبیا ئەنجام درا، لە ساڵی ١٩٧٨ لە خولی ئاسیای نێودەوڵەتی کرد کە لە وڵاتی تایلاند بەڕێوەچوو تیپەکەی توانی پلەی حەوتەم بەدەست بهێنێت، لە ساڵی ١٩٧٩ وەك یاریزانی تیپی هەڵبژاردەی سەربازی عێراقی بەشداری لە خولی جیهانی سەربازی کرد کە لە شاری بەنغازی لیبیا ئەنجام درا، هەرلە ساڵی ١٩٧٩ وەکو یاریزانی تیپی هەڵبژاردەی نیشتیمانی عێراقی بەشداری کردووە لە خولی نێودەوڵەتی تۆپی باسکە کە لە وڵاتی ژاپۆن بەڕێوەچوو، لە ساڵی ١٩٨٣ بەشداری کرد لە خولی عەرەبی نێودەوڵەتی کە لە وڵاتی ئەردەن ئەنجام درا تێیدا تیپی هەڵبژاردەی عێراق توانی پلەی سێهەم بەدەست بهێنێت، لە ساڵی ١٩٨٤ لەگەڵ تیپی یانەی جەیش بەشداری کرد لە هەفتەی وەرزشی برادەریی عێراق و میسر، لە ساڵی ١٩٨٥ وەك یاریزانی تیپی هەڵبژاردەی عێراق بەشداری کرد لە خولی نێودەوڵەتی کەلە شاری بەغدای پایتەخت بەڕێوەچوو، لەوخولەدا تیپی هەڵبژاردەی عێراق پلەی دووەمی بەدەستهێنا، لە ساڵی ١٩٨٨ وازی لە تیپی هەڵبژاردەی عێراق هێنا، لە ساڵی ١٩٩٤ چووە ریزی تیپی یانەی یەکی حوزەیران (کەرکوك) کە لە خولی پلە نایابی عێراقی بەشداربوو، ئەوەبوو تیپەکەیان توانی پلەی دوهەم لەوخولەدا بەدەست بهێنێت، فازل عومەر لە ساڵی ١٩٩٥ بوو بە ڕاهێنەری تیپی یانەی سەورەی کەرکوك و تیپەکە توانی لەخولی عێراقدا پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت، لە ساڵی ١٩٩٦ تاکو ساڵی ٢٠٠٧ بەشداری کرد لە خولەکانی نێودەوڵەتیدا کە لە شارەکانی بەغداو سلێمانی و وڵاتی سوریا بەڕێوەچوو، لە ساڵی ٢٠٠٨ لەگەڵ تیپی هەڵبژاردەی تازەپێگەیشتووانی عێراقی وەك یاریدەدەری ڕاهێنەر لە خولی ڕۆژئاوای ئاسیا کە لە تارانی پایتەختی ئێران بەڕێوەچوو بەشداری کرد.. لە ساڵی ٢٠٠٩ بوو بە ڕاهێنەری تیپی هەڵبژاردەی عێراقی درێژبالاکان، لە ساڵانی ٢٠١٠ و٢٠١١ لە دوو خولی نێودەوڵەتی بەشداری کرد کەلە شاری بەغدا ئەنجام دران..

*** وەرزشکاری دێرین عیماد محەمەد شەریف جەباری**

– عیماد محەمەد شەریف جەباری یەکێکە لە وەرزشکارە دێرینەکانی کەرکوك، کوڕی یاریزانی زۆرخانە و هەڵگری قورسایی محەمەد شەریف جەبارییە کەلەلایەن پاشای عێراق دووجار ڕێزلێنانی وەرگرتووە، عیماد جەباری لە ساڵی ١٩٥٨ لە گەڕەکی ئیمام قاسمی شاری کەرکوك لەدایکبووە، لە ساڵی ١٩٧٠ پەیوەندی کرد بە یانەی وەرزشی سۆلاف و هەتاکو ئیمرۆ ئەندامی دەستەی کارگێڕی یانەکەیە، لە ساڵانی ١٩٧٣ تاکو ١٩٧٧ یاریزانی سەرەکی تیپی هەڵبژاردەی کەرکوکی لەشجوانی و هەڵگرتنی قورسایی بوو، لە ساڵانی ١٩٧٤ تاکو ١٩٧٧ قارەمانی لەشجوانی و هەڵگرتنی قورسایی بوو، لە ساڵی ١٩٨٤ یەکەمین بڕوانامەی ڕاهێنەری بەدەستهێنا، بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژێردرا بۆ لیژنەی باڵای هەڵگرتنی قورسایی و هێزی لەش، بڕوانامەی ڕاهێنەری و ناوبژیوانی نێودەوڵەتی لەشجوانی و هەڵگرتنی قورسایی و هێزی لەشی بەدەستهێناوە، ناوبژیوانی چەندین خول وقارەمانێتی نێودەوڵەتی کردووە، لە ساڵی ٢٠٠٥ پلەی باشترین ناوبژیوان لە خولی عەرەبی بەدەستهێنا، لە ساڵی ١٩٨٣ وە تاکو ئیمرۆ سەرۆکی لقی کەرکوکی یەکێتی لەشجوانی کەرکوکە، هەروەك پلەی سەرۆکی لیژنەی ڕاهێنەری مەرکەزی لەشجوانی هەیە، لە ساڵی ١٩٨٦ دامەزرێنەری یەکەمین هۆڵی ئەهلییە لە



عێراقدا، هەروەها ڕێکخەری یەکەم خولی (فتنس)ە لە عێراق ساڵی ٢٠١٥ هەروەها یەکەمین سەرۆکی وەفدی کەرکوك و کوردستان بوو لە خولی جیهانی کە لە ساڵی ١٩٩٧ لە تورکیا بەڕێوەچوو، لە ساڵی ٢٠٠١ سەرۆکی وەفدی کەرکوك بوو لە خولی پێشکەوتووانی عێراق، لەسەر دەستی ئەو بەدەیان یاریزان وپاڵەوانی کەرکوکی نێودەوڵەتی کەرکوك پێگەیشتن و ئەنجامی باشیان لە خولەکانی ناوخۆو دەرەوەی عێراق بەدەستهێناوە وەکو سەردارئیسماعیل، عادل کەمال، حوسێن جومعە، مستەفا کامل، عومەر ڕیاز، عومەر عەبدولباری، پشتیوان، پێشکەوت، محەمەد شەمسەدین ( قارەمانی ئاسیاوعەرەب)، جەنگیزئەحمەد، ئایدن ڕەشید، پاڵەوانانی

عێراق حازم فالیح، ئەوس سابت، هاشم محەمەد، مازن ئەمین، فازڵ حەمە، ئەزهەد، ئەیاد عوبێد، حەکیم کەریم.. ئەوانی تر، ئەندامی یەکێتی مەرکەزی لەشجوانی بوو لە ساڵی ١٩٩٢ تاکو ٢٠٠٨.

### * یاریزانی دێرینی تۆپی پێ ستار کوردی



یاریزانی دێرینی تۆپی پێی کەرکوك عەبدولستار حەسەن محەمەد سالەیی کە بە (ستار کوردی) ناسراوە یەکێکە لە یاریزانە نێودەوڵەتییەکانی عێراق بە گشتی و کەرکوك بەتایبەتی، لە ساڵی ١٩٣٧ لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، هەر لە تەمەنی لاوێتی خولیای تۆپی پێ بووە، یاریزانی سەرەکی تیپی هەڵبژاردەی کەرکوك بوو لە ساڵانی شەستەکاندا، باوکی یاریزانی تۆپی پێ بووە لە شاری حەبانییە، براکانیشی نوری حەسەنی رەحمەتی کە ڕاهێنەری یانەی وەرزشی سوڵاف بوو ئەویش خزمەتی زۆری وەرزشی کەرکوکی کردووە، هەروەها خوالێخۆشبوو جەبار کە ئەویش یاریزانی یانەی سوڵاف بوو، براکەی تریشی غەنی کە یاریزانی هەڵبژاردەی کەرکوك و فیرقەی دووی سەربازی بوو..

### * یاریزانی نێودەوڵەتی تۆپی پێ عەدنان عەبدولقادر

سەرەتای وەرزشی لە ساڵی ١٩٥٩ لە ڕیزی تیپی تۆپی پێی تازە پێگەیشتووانی کەرکوك بووە، کە ئەوکاتە خوالێخۆشبوو سابیر عەلی ڕاهێنەری تیپەکە بوو، دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٦٤ چووەتە ڕیزی تیپی یانەی سەورەی کەرکوك، دواتریش بۆ تیپی یانەی سوڵاف یاریکردووە، دوای ئەوە بۆ تیپی فیرقەی سێی سەربازی یاریکردووە، لە ساڵی ١٩٦٦ لەگەڵ تیپی هەڵبژاردەی عێراق و تیپی هەڵبژاردەی سەربازی عێراق لە




خولی جامی عەرەب و خولی جیهانی سەربازی بەشداری کردووە دوای ئەوەی بۆ تیپی هەڵبژاردەی کەرکوك لە یاری لەگەڵ هەڵبژاردەی سەربازی عێراقی یاریکرد هەڵبژێردرا بۆ یاریکردن لە خولی تۆپی پێی عێراق لەلایەن ڕاهێنەری یۆغسلافی، لە یەکێ لەو خولە نێودەوڵەتییانەدا بەشداری کرد کە لە وڵاتی کوێت ئەنجام درا، لەو خولەدا هەریەك لە ئەستێرەکانی عێراق عەموبابا و جەمیل عەباس و هیشام عەتا عجاج بەشدارییان کرد، عەدنان عەبدولقادر دوا تیپ یاری بۆ کرد تیپی یانەی هێزی ئاسمانی بوو، ئەمە جگە لە بەشداریکردنی دەیان خولی ناوخۆو دەرەوەدا، تاکو ساڵی ١٩٧٠ بە ئێجگاری وازی لە تۆپی پێ هێنا..

### * وەرزشکاری دێرینی کەرکوك سامی هەورامی

لە ماوەی ساڵانی هەشتاکانی سەدەی پێشوودا ئەو کاتەی کە پێشمەرگە بوو لە ڕیزی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، وەرزشکاری دێرینی کەرکوك سامی هەورامی کە دەکاتە برای شەهیدی ئەمر ئازاد هەورامی لە هەوڵ و کۆششی بەردەوامدابوو تاکو لەشاخ دا پەرە بەوەرزش بدات، کاك سامی خۆی وژمارەیەك لە پێشمەرگە دێرینەکانی شاخ ئەوانەی وەرزشکاربوون، توانیان تیپێکی تۆپی پێ لە ڕۆژانی خەبات دژی دیکتاتۆرییەت دابمەزرێنن، لە ساڵی ١٩٨٤ لەکاتی گفتوگۆی نێوان (ی.ن.ك) وحکومەتی عێراقی کاك سامی و هەڤاڵانی گەڕانەوە بۆ ناوچەی گۆیتەپە و لەوێ تیپێکی میللی تۆپی پێیان دامەزراند بەناوی تیپی (قەندیل) ئەو بوو بە سەرۆکی تیپەکە، ئیتر تیپەکە لە چەندین خول و قارەمانێتیدا بەشداری کردو ئەنجامی باشی بەدەستهێنا، یەکێ لەو خولانەی کە کاك سامی هەورامی لەو کاتەدا دەستپێشخەری کردنەوەی کرد بەناوی خولی (شەهیدانی چیمەن) بوو، کە تێیدا نزیکەی (٣٠) تیپی میللی سەربە



گوندە کوردییەکانی شاری کەرکوک بەشدارییان کرد، لەدوای جینۆسایدی (ئەنفال) کە لەلایەن رژێمی دیکتاتۆری عێراقەوە ئەنجام درا ئەو وەرزشکارانە لە پێشەوەیاندا کاک سامی هەورامی بەرەو ناوچە سنوورییەکانی ئێران بەرێکەوتن و لەو ناوچانەدا توانیان سەرلەنوێ تیپی میللی تۆپی پێی قەندیل پێک بهێننەوەو بەشداریان لە چەند خول و قارەمانێتییەک کرد لەگەڵ تیپە میللییەکانی ئێراندا، هەر لەو ناوچانەی ئێراندا بەتایبەتی لە ناوچەی سەقز توانیان خولێکی تۆپی پێ بەناونیشانی خولی (شەهیدانی هەڵەبجە) رێک بخەن کە تێیدا (١٢) تیپی ناوچەکانی بۆکان و سەقز جگە لە تیپی قەندیلی کاک سامی هەورامی بەشداریان کرد و ماوەی مانگێکی خایاند، لە ماوەی خەباتی (ی.ن.ک) بۆ بەدیهێنانی مافە رەواکانی گەلی کوردمان هەڤاڵی تێکۆشەر مام جەلال لە سەردەمی شاخ دا پشتگیریی زۆری لە وەرزش دەکرد بەتایبەتی تیپی میللی قەندیل.. بێگومان دوای پرۆسەی ئازادی عێراق وەرزشکاری دێرینی کەرکوک سامی هەورامی هەڵبژێردرا ببێت بەسەرۆکی یانەی وەرزشی خاک و تاکو ئیمرۆ لەسەر دەستی ئەو تیپەکانی سەربە یانەکە لە خول و قارەمانێتییەکانی عێراق و کوردستاندا توانیان ئەنجامی بەرچاو بەدەست بهێنن، حاڵی حازریش لێپرسراوی لیژنەی وەرزشییە لە مەڵبەندی دووی رێکخستنی کەرکوکی (ی.ن.ک)ە.

*** وەرزشکاری دێرینی یارییە بەهێزەکانی کەرکوک ئەبوبەکر نەریمان**

– وەرزشکاری دێرینی یارییە بەهێزەکانی کەرکوک ئەبوبەکر نەریمان لە ساڵی ١٩٥٤ لە کەرکوک لەدایکبووە، دەرچووی پەیمانگای مامۆستایانی هەولێرە ساڵی ١٩٧٩، لە قۆناغی سەرەتاییدا بەشداری چالاکیە وەرزشییەکانی قوتابخانەی ئیمام قاسمی سەرەتایی لە یارییەکانی تۆپی پێ و یارییە بەهێزەکان کردووە، لە ساڵی ١٩٦٩ پلەی دووهەمی لە پێشبرکێی راکردنی ماوە (١٠٠) مەتر و ماوە (٢٠٠) مەتر بەدەستهێناوە، هەروەها لە ریزی تیپە میللییەکانی تۆپی پێی سۆران و مەلاعیب و دەرسیم و هەندرێن و ئاسۆ یاریکردووە، هەروەک لە ریزی تیپی تۆپی پێی تازەپێگەیشتووانی یانەی سوڵاف بەشداریکردووە، هەروەها لە ساڵانی ١٩٧٢ تاکو ١٩٧٦ بۆ تیپەکانی یارییە بەهێزەکانی هەڵبژاردەی کەرکوک و هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوک یاریکردووە، پلەی یەکەمی لەپێشبرکێی راکردنی (١٠٠مەتر و٢٠٠ مەتر) بەدەستهێناوەو تاکو ئیمرۆ خاوەنی ژمارەی پێوەری



راکردنی (١٠٠) مەتری نزیکەی (١٠,٨) بەناوی ئەوەوە تۆمار کراوە، ئەبوبەکر نەریمان یەکێک بوو لە قارەمانی یارییە بەهێزەکانی قوتابخانەی ئامادەیی بوو لە ساڵانی هەفتاکانی سەدەی پێشودا، ساڵی ١٩٧٥ لەخولی پاڵەوانێتی عێراق بەشداریکردووە کە لە شاری بەغدا ئەنجام درا، ساڵانی ١٩٧٧ و١٩٧٨ و١٩٧٩ بۆ تیپی یارییە بەهێزەکانی تیپی هەڵبژاردەی هەولێر یاریکردو تیپەکەی توانی لەسەر ئاستی پارێزگای هەولێردا پلەی یەکەم لە پێشبرکێی راکردنی (١٠٠ مەترو ٢٠٠ مەتر) بەدەست بهێنێت، هەروەها بۆ تیپی یانەی هەولێر یاریکرد کە بەشداریکرد لە خولی یانەکانی عێراق کە لە شاری نەجەف بەڕێوەچوو، هەرلە ساڵی ١٩٧٩ لە خولی ناوچەکانی باکووری عێراق لە پێشبرکێی (١٠٠ مەترو ٢٠٠ مەتر) بەشداریکردو توانی پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت کە ئەو کاتە قوتابی بوو لە پەیمانگای مامۆستایانی هەولێر، حاڵی حازر خاوەنی بڕوانامەی (NTO)ی ناوبژیوانی نێودەوڵەتی یارییە بەهێزەکانە، هەروەها بڕوانامەی هەرێمایەتی ئێرانی یارییە بەهێزەکانی بەدەستهێناوە..

*** یاریزانی دێرینی زۆرانبازی کەرکوك سەلاحەدین سەعید مەجید**
– یاریزانی دێرینی زۆرانبازی سەلاحەدین سەعید مەجید لە ساڵی ١٩٥٧ لە گەڕەکی بەگلەری شاری کەرکوك لەدایکبووە، هەرلە تەمەنی منداڵییەوە خولیای وەرزش، لە ساڵی ١٩٧٤ چووەتە نێو ڕیزی یانەی وەرزشی سەورەی کەرکوك و لەوێ دەستی بە مەشق و ڕاهێنانی یاری زۆرانبازی کردووە بەسەرپەرشتی مەهدی وەحیدوئیبراهیم مەجید، دوای پێنج ساڵ خزمەتکردندا لە یانەی وەرزشی سەورەدا لە ساڵی ١٩٧٧ چووە نێو ڕیزی سوپا و بۆ ماوەی ١٦ ساڵ لە تیپی زۆرانبازی جۆری ڕۆمانی و سەربەخۆی سوپا خزمەتی وەرزشی کردووە، دوابەدوای ئەوە لە ساڵی ١٩٨٩ پەیوەندی کرد بە تیپی یانەی هێزی ئاسمانی عێراقی، بەشداری زۆری کردووە لە خول و قارەمانێتییەکانی ناوخۆو دەرەوەی وڵات کردووە، هەروەها چەندین بڕوانامەو میدالیاو خەڵاتی بەدەستهێناوە، لە ساڵانی ١٩٧٧ تاکو ١٩٩٨ قارەمانی زۆرانبازی بوو لەسەر ئاستی عێراقدا، هەروەها قارەمانی سوپا لە ساڵانی ١٩٧٧ تاکو ٢٠٠٢، لە ساڵی ١٩٧٥ نیشانەی ئاڵتونی لە فیستیڤاڵی لاوانی عەرەبی کە لە وڵاتی لیبیا بەڕێوەچوو بەدەستهێناوە، ساڵی ١٩٧٨ بەشداری کردووە لە خولی نێودەوڵەتی تورکیا و توانی پلەی چوارەم بەدەست بهێنێت، هەر لەو ساڵەدا بەشداری کرد لە خولی ئاسیای نێودەوڵەتیدا کە لە بانکۆك ئەنجام درا، نیشانەی ئاڵتونی لە خولی جەزائیری نێودەوڵەتی بەدەستهێنا کە لە ساڵی ١٩٨٢ بەڕێوەچوو، هەر لەهەمان ساڵدا بەشداری لەخولی ئاسیای نێودەوڵەتیدا کرد کەلە وڵاتی هندستان بەڕێوەچوو، ساڵی ١٩٨٣ نیشانەی ئاڵتونی لە خولی عەرەبی پێشکەوتووان کرد کە لە وڵاتی مەغریب ئەنجام درا، لە هەمان ساڵدا نیشانەی ئاڵتونی لە پاڵەوانێتی بەغدای نێودەوڵەتیدا بەدەستهێنا، ساڵی ١٩٨٥ نیشانەی ئاڵتونی لە خولی بەغدای نێودەوڵەتیدا بەدەستهێنا، هەروەها لە ساڵی ١٩٨٥ نیشانەی ئاڵتونی لە خولی عەرەبی مەغریب بەدەستهێنا، پلەی شەشەمی لە خولی نێودەوڵەتی فەرەنسا بەدەستهێنا کە ساڵی ١٩٨٦ بەڕێوەچوو، هەروەها نیشانەی ئاڵتونی لە یارییەکانی نێوان میسرو عێراق و ئەردەن کە ساڵی ١٩٨٧ بەڕێوەچوو بەدەستهێنا، ئەمە جگە لە بەدەستهێنانی نیشانەکانی تری ئاڵتونی لە خولی عەرەب ساڵی (١٩٨٧)، خولی عەمانی نێودەوڵەتی ساڵی (١٩٩٦)، خولی یانەکانی نێودەوڵەتی کە لە ئەردەن بەڕێوەچوو ساڵی (١٩٩٧) لە ساڵی ٢٠٠٥ ڕاهێنەری تیپی تازەپێگەیشتووانی عێراق بوو کە لە خولی جیهانی لە ئێران بەشداری کرد، ڕاهێنەری وەفدی عێراقی بوو لە یاری دۆستانەی لەگەڵ هەڵبژاردەی لوبنان ساڵی ٢٠٠٦، ساڵی ٢٠١١ توانی پلەی یەکەم لە خولی دێرینەکان کە لە عێراق بەڕێوەچوو بەدەست بهێنێت ..

*** وەرزشکاری دێرینی گۆڕەپان و مەیدان ( بورهان ڕەشید )**
وەرزشکاری دێرینی گۆڕەپان و مەیدانی کەرکوك بورهان ڕەشید یەکێکە لە یاریزانە دێرینەکانی ئەم شارەو خزمەتێکی زۆری وەرزشکردووە و دەستکەوتی گەورەی لە



یاری گۆڕەپان و مەیدان دا لەسەر ئاستی ناوخۆو دەرەوەی وڵاتدا بەدەستهێناوە، بورهان ڕەشید لە ساڵی ١٩٦٣ لە شاری کەرکوك لەدایکبووە و لە یەکەم خولی گۆڕەپان و مەیدانی عێراق کە لە شاری کەرکوك بەڕێوەچوو توانی پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت، لە ساڵی ١٩٨٢ بەشداری لە خولی عێراق کردو توانی پلەی شەشەم لە پێشبڕکێی ڕاکردنی ماوە (١٥٠٠) مەتر بەدەست بهێنێت، هەروەها پلەی دووەم لە پێشبڕکێی ماوە (٣٠٠٠) مەتر بەربەست، لە ساڵی ١٩٨٤ پلەی چوارەمی لە خولی لاوانی عەرەب بەدەستهێنا، لە ساڵی ١٩٨٥ بەشداری کرد لە خولی عێراقی ڕاکردنی ماوە درێژو توانی پلەی یەکەم بەدەست بهێنێت، لە هەمان ساڵدا و لە خولی عێراق پلەی یەکەمی لە پێشبڕکێی بڕینی ماوە (١٥٠٠) بەربەست و ماوە (٣٠٠٠) مەتر بەربەست بەدەستهێنا، لە ساڵانی ١٩٨٧ و ١٩٨٨ لە دوو خولی نێودەوڵەتیدا بەشداری کرد کە لە شاری موسڵ ئەنجام درا، لەو دوو خولەدا توانیویەتی پلەکانی یەکەمی پێشبڕکێی ڕاکردنی بڕینی ماوە (١٥٠٠) مەتر و پێشبڕکێی ڕاکردنی ٣٠٠٠ مەتر بەدەست بهێنێت، هەروەها پلەی یەکەمی لە خولی نێودەوڵەتی نۆبیلیان بەدەستهێنا کە لە وڵاتی یۆغسلافیا بەڕێوەچوو، بورهان ڕەشید چەندین نیشانەو خەڵاتی لە خول و قارەمانێتییەکانی ناوخۆو دەرەوەدا بەدەستهێناوە کە دەچنە نێوخانەی دەستکەوتە وەرزشییەکانی بواری گۆڕەپان و مەیدانی کەرکوك..

*** وەرزشکاری دێرینی تۆپی باسکە نورەدین عوسمان**



وەرزشکاری دێرینی تۆپی باسکە نورەدین عوسمان مەردان لە ساڵی ١٩٤٦ لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، لە ساڵی ١٩٦٠ لە قۆناغی خوێندنی ئامادەیی ئەو کاتەی خوێندکار بوو لە ئامادەیی موسەڵای کەرکوك دەستی بە یاری تۆپی باسکە کردووە، دواتر چووەتە ڕیزی تیپی هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك، تاکو لە ساڵی ١٩٦٣ پەیوەندی کرد بە یانەی وەرزشی سەورەی کەرکوك و وەك یاریزانێکی سەرەکی بۆ تیپی پێشکەوتووانی یانەکە یاریکرد، هەروەها بۆماوەی ١٥ ساڵ یاریزانی تیپی هەڵبژاردەی تۆپی باسکەی کەرکوك بوو، لە پاشاندا بوو بەڕاهێنەری تیپی تۆپی باسکەی یانەی سەورە و ڕاهێنەری تیپی هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوکی (کچان و کوڕان)، تیپەکانی توانیان ئەنجامی بەرچاو بەدەست بهێنن، لەوانە پلەکانی یەکەمی تیپی پەروەردەی کچان بۆ ماوەی سێ ساڵ لە خولەکانی پەروەردەی کەرکوك، بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ سەرپەرشت یاری وەرزشی بوو لە بەڕێوەبەرێتی چالاکی وەرزشی و دیدەوانی کەرکوك، هەروەك ئەندامی چالاك بوو لە دەستەی ئیدارەی یانەی وەرزشی سەورە، بڕوانامەی ناوبژیوانی پلەیەکی تۆپی باسکەی بەدەستهێناوەو ناوبژیوانی یارییەکانی خولی عێراقی و کوردستانی کردووە، خاوەنی بڕوانامەی ڕاهێنەری یەکەمە و هەڵبژێردرا بۆ وەرگرتنی نیشانەی ناوبژیوانی نێودەوڵەتی کە بڕیار بوو لە وڵاتی یۆغسلافیا بەدەستی بهێنێت، لە ساڵی ٢٠٠٣ تاکو ئیمڕۆ ئەندامی چالاکی لقی کەرکوکی یەکێتی ناوەندی تۆپی باسکەیە..

*** یاریزانی نێودەوڵەتی پێشوی تۆپی سەرمێز زیاد تاهیر باباعەلی**

یاریزانی نێودەوڵەتی پێشووی تۆپی سەرمێزی کەرکوك زیاد تاهیر بابا عەلی، یەکێك بوو لە هەرە باشترین یاریزانەکانی یاری تۆپی سەرمێز لەوشارە دێرینەدا، کەیسی ئەم یاریزانە دیارە لەنێو خولەکانی ناوخۆو دەرەوەدا، خاوەنی بڕوانامەی



(بەکالۆریۆس)ی پەروەردەی وەرزشییە لەزانکۆی بەغدا، لە ساڵی ١٩٧٩ نیشانەی زیوینی لە خولی نێودەوڵەتی خەلیجی عەرەبی و بیابانی عەرەبی بەدەستهێنا، هەروەها نیشانەی ئاڵتونی لە خولی مەلیك حوسێن کە ساڵی ١٩٨٧ لە ئەردەن بەڕێوەچوو بەدەستهێنا، نیشانەی برۆنزی لە خولی وەرزشی عەرەبی بەدەستهێنا کە ساڵی ١٩٩٩ لە عەمان بەڕێوەچوو، لە ساڵی ١٩٨٠ لە خولی نێودەوڵەتی تورکیا بەشداری کردو ئەنجامی بەرچاوی بەدەستهێنا، لە ساڵی ٢٠٠٠ نیشانەی ئاڵتونی لە خولی نێودەوڵەتی محەمەد دورە بەدەستهێنا کە لە بەغدای پایتەخت بەڕێوەچوو، پلەی یەکەمی لە خولەکانی دەوری عێراقی بەدەستهێناوە، ساڵانی ١٩٨٥ و ١٩٨٦ پلەی یەکەمی لە خولی زانکۆکانی عێراق بەدەستهێنا، ساڵی ١٩٩٤ پلەی یەکەمی لە خولی کۆماری بەدەستهێنا، چەند ساڵێکیش پلەی یەکەمی لە خولەکانی پەروەردەی وەرزشی بەدەستهێنا، هەروەها بەشداری کرد لە چەندین خولی ڕاهێنەری و ناوبژیوانیدا، پسپۆڕی وانەوتنەوەی یاری تۆپی سەرمێزە، چەند ساڵێك ڕاهێنەری یانەی وەرزشی کەرکوك بوو، هەروەها ڕاهێنەری تیپی یانەی شەعبی شاریقەی وڵاتی ئیمارات بوو، ڕاهێنەری یانەی ئەهلی ئیمارات بوو، ڕاهێنەری تیپی یانەی قەتەر بوو لە وڵاتی قەتەر.. ئەمە جگە لەو دەستکەوتانەی کە بۆ شاری کەرکوك لە بواری یاری تۆی سەرمێزدا بەدەستهێناوە..

*** دوو بیرۆکە بۆ دامەزراندنی رێکخراوێك بۆ رۆژنامەنووسانی وەرزشی**

**زاگرۆس نانەکەلی**

گومان لەوەدانییە کە بەر لە دامەزراندنی هەر رێکخراو دەزگایەکی وەرزشی، پێویستە بیرۆکەو پلانی بەر لە دامەزراندنت هەبێت، مامۆستا حەسەن عەلی بەگ ناسراو بە (حەسەن جاف) کە رۆژنامەنووسێکی وەرزشی بە ئەزموونی ناوچەی گەرمیانە، ساڵی ۱۹۹۹ لە پێشنیازێکدا بیرۆکەی دروستکردنی رێکخراوێکی بۆ رۆژنامەنووسانی وەرزشی کوردستان بە پێویست زانیوەو بیرۆکەکەشی لە ژمارە ۱۸٦۸ی رۆژی چوارشەممە ۲٦ی ئایاری ساڵی۱۹۹۹ی لاپەرەی (وەرزشی هەفتە)ی رۆژنامەی کوردستانی نوێ-دا بلاوکردووەتەوە بەناونیشانی (کاتی دامەزراندنی سەندیکای رۆژنامەنووسانی وەرزشی هاتووە).

دیارە ئەوکات بەهۆی ململانێ و کێشەو نائارامی و بارودۆخی خراپو ناجێگیری کوردستان، نەتوانرا کار لەسەر ئەو بیرۆکەیە بکرێتو ئەو خەونەی رۆژنامەنووسانی وەرزشی کوردستان بهێنرێتە دی.

پاش حەوت ساڵ هەمان بیرۆکە زیندووکرایەوەو ئەمجارەیان لەلایەن زانا قادر عەزیز رۆژنامەنووسی وەرزشی لە وتارێکیدا کە لە ژمارە ۸ی رۆژنامەی چاودێری وەرزشی-ی رۆژی دووشەممە ۲٤ی نیسانی ساڵی ۲۰۰٦ بلاویکردەوە، بەناونیشانی (لە یادی ۱۰۸ ساڵەی رۆژنامەگەریی کوردیدا.. دامەزراندنی یەکێتی رۆژنامەنووسانی وەرزشی کوردستان بە ئەرکی گشت لایەك دەزانین).

ئەوەبوو بیرۆکەی دووەم کاری لەسەرکرا بۆ پێکهێنانی رێکخراوێکی تایبەتمەند بۆ رۆژنامەنووسانی وەرزشی.

چۆن کۆمەڵەی رۆژنامەنووسانی وەرزشی کوردستان لەدایکبوو؟

دوای خستنەرووی بیرۆکەکەی زانا قادر، راستەوخۆ کار لەسەر ئامادەکردنی پرۆژەی پێکهێنانی رێکخراوەکە کراو هەریەکە لە زانا قادرو سەنگەر زرار لەگەڵ خەسرەو گوروونو ئالان عەلی سەردانی لقی سلێمانی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان دەکەنو لەوێ بیرۆکەکەیان دەخەنە بەردەم مستەفا سالح کەریم جێگری نەقیب، لەگەڵ فەرید زامدار سەرۆکی لقی سلێمانی سەندیکا، ئەوانیش پێشوازی لەو پرۆژەیە دەکەنو جێگری نەقیبی سەندیکا بەڵێنیان پێدەدات کە پرۆژەکە بگەیەنێتە سەندیکا لە هەولێرو ئەوەبوو پاش گەیشتنیو گفتوگۆکردن لەسەری لەلایەن ئەنجومەنی سەندیکاوە، رەزامەندی لەسەر پیشاندەدرێتو بریاری دانیشتنو کۆبوونەوەو گفتوگۆکردن لەسەر پێکهێنانی رێکخراوەکە دەدرێت.

دوای بریارلێدانی سەندیکا لە دروستکردنی رێکخراوەکە، رۆژی ۱۰ی حوزەیرانی ساڵی۲۰۰٦ لە بارەگای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان لە هەولێر، یەکەم کۆبوونەوە لەنێوان ۱٥ رۆژنامەنووسانی وەرزشی شارو شارۆچکەکانی کوردستان (سدیقی گچکە، یاوەر نامیق، سەباح شوکر، بۆتان جەلال، زانا قادر، ئاسۆ عادل، ئیحسان حەسەن، جەلال پەرێشان، فارس سدیق، ئالان عەلی، سەردار حەسەن، سەنگەر زرار، دلێر فازل، سەنحاریب یوسف، ئەرکان محەمەد) وەك دەستەی دامەزرێنەر رێکخراو تیایدا لیژنەیەکی ئامادەکاریی لە ٦ کەس پێکهات بۆ بەستنی کۆنفرانسی ناوخۆیی لە شارەکانی هەولێرو سلێمانی و کەرکوكو دهۆكو دیاریکردنی نوێنەرانی شارەکان بە هەڵبژاردن تا هەر شارەی بە هەڵبژاردنی (٥) ئەندام بەشداری لە کۆنفرانسی فراوانی دامەزراندنی رێکخراوەکە بکات.

*** کۆنفرانسی ناوخۆیی رۆژنامەنووسانی وەرزشی کەرکوك.**

دوای ئەوەی رۆژی (۱۸ی حوزەیرانی ساڵی ۲۰۰٦) لە بارەگای لقی کەرکوکی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان، بەچاودێریو ئامادەبوونی سکرتێرو جێگری سکرتێرو ژمارەیەك لە ئەندامانی لقو (۱۷) رۆژنامەنووسی وەرزشی شارەکە، کۆنفرانسێکی ناوخۆیی بۆ دیاریکردنی ئەو (٥) رۆژنامەنووسە بەرێوەچوو کە بەشداری لە یەکەمین کۆنفرانسی رۆژنامەنووسانی وەرزشی کوردستان دەکەن، دواجار لە پرۆسەیەکی ئازادداو بەرەزامەندیو دەنگی تێکرای بەشداربووان، هەریەکە لە (ئامینە کەریم، حوسێن عەلی عەبدولکەریم، عومەر حەمە ئەمین، سەنگەر کاکۆ عومەر، رەعد نەجمەدین حوسێن) کە ئەندامی سەندیکان، ئەو شەرەفەیان پێدرا.

*** یەکەم کۆنفرانسی رۆژنامەنووسانی وەرزشی چۆن بەسترا؟**

رۆژی ۱۲ی تەمموزی ساڵی ۲۰۰٦ بە دروشمی (لەپێناو پەرەپێدانی رۆژنامەگەریی وەرزشی لە کوردستان) یەکەم کۆنفرانسی رۆژنامەنووسانی بواری وەرزشی لە شاری هەولێرو لە هۆڵی ریستۆرانتی هەولێر لە کۆی ٤۳ ئەندام، بە بەشداری ٤۲ ئەندام رێکخراو تیایدا کۆمەڵەی رۆژنامەنووسانی وەرزشی کوردستان لەدایکبوو و کۆمەڵەکەش دەستەیەکی ۱۱ کەسی بۆ دیایکرا: ئالان عەلی، یاوەر نامیق، حوسێن عەلی، وەلید ئەنوەر، جەلال سەعید، ئەرکان محەمەد، عەباس حەمید، ئامینە کەریم، جەمیل خەلیل، هۆزان رۆستەم، سەلام عەرەب دۆسکی.

- دەبوو لە موسڵ (ئەحمەد غەسوب) ئامادەبێت، بەڵام لە شوێنی ئەودا (سەلام عەرەب دۆسکی) بەشداریکرد، (عیماد ناسر)یش لە بەغدا ئامادە نەبوو.

- هەرچەندە بەبیانووی لەبیرچوون بانگهێشت نەکرابوون، بەڵام لە هەولێر هەریەکە لە (زاگرۆس نانەکەلیو هێرش سایرو ئەحمەد مستەفا) ئامادەی یەکەم کۆنفرانس بوون.

لەژێر دروشمی (لەپێناو پەرەپێدانی رۆژنامەگەریی وەرزشیی کوردستان) رۆژی (۷/۱۲) لە شاری هەولێری پایتەخت، رۆژنامەنووسانی وەرزشی کوردستان یەکەم کۆنفرانسی خۆیان لە هۆڵی ریستۆرانتی هەولێر بەرێوەبرد، ئەمەش بەبەشداریی (٤۲) رۆژنامەنووسی سنووری شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، کەرکوك، دهۆك، گەرمیان، سۆران،

بەغدا، موسڵ)و فەرهاد عەونی نەقیبو مستەفا ساڵح كەریم جێگیری نەقیبو ئەندامانی ئەنجوومەنی سەندیكاو نوێنەرانی وەزارەتی وەرزشو لاوان، لیژنەی ئۆڵۆمپی كوردستان، ئەنجوومەنی باڵای وەرزشو كەناڵەكانی ڕاگەیاندنی كوردستانو عێراق.
سەرەتا ئەكاد موراد ئەندامی ئەنجوومەنی سەندیكاو لیژنەی ئامادەكار، وێڕای بەخێرهێنانی بەشداربووان، داوای لە ئامادەبووان كرد دەقیقەیەك بەبێدەنگی بۆ گیانی پاكی شەهیدانی ڕۆژنامەنووس بووەستن، پاشان نەقیبی ڕۆژنامەنووسان وتاری ئەنجوومەنی سەندیكای پێشكەشكردو جێگری نەقیبی ڕۆژنامەنووسانیش لە وتەیەكی كورتدا چەند ڕوونكردنەوەیەكی خستەڕوو.
دانیشتنی یەكەم كۆتاییهاتو پاش پشوویەكی كورتیش دانیشتنی دووەم بۆ دیالۆگو خستنەڕووی پێشنیازو بۆچوونەكان ئەنجامدراو پاش گۆڕینەوەی هەموو ڕاوبۆچوونەكانیش كە لەسەر ناوو دیاریكردنی دەستەی بەڕێوەبردن بوو، بەزۆرینەی دەنگ بڕیار درا (كۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسانی وەرزشیی كوردستان) دابمەزرێتو دەستەیەكی (١١) كەسیشی بۆ دیاریكرا كە بەمشێوەیەیە:-
* هەولێر: یاوەر نامیق، وەلید ئەنوەر.
* سلێمانی: ئالان عەلی، هۆزان ڕۆستەم.
* كەركوك: حوسێن عەلی، ئامینە كەریم.
* دهۆك: جەمیل خەلیل.
* گەرمیان: ئەركان محەمەد.
* بەغدا: عەباس حەمید.
* سۆران: جەلال سەعید.
* موسڵ: ئەحمەد غەسوب.
بەهەڵبژاردنی ئەم (١١) كەسە كۆتایی بە كۆنفرانس هاتو ئەم دەستە هەڵبژێردراوەش ڕۆژی شەممە (٧/٢٢) یەكەم كۆبوونەوەی خۆیان لە بارەگای سەندیكا لە شاری هەولێر ڕێكدەخەن.
دواجاریش لە چوارچێوەی یاسای سەندیكای ڕۆژنامەنووسانی كوردستانو پەیڕەوی ناوخۆی یەكێتیی نێودەوڵەتی ڕۆژنامەگەریی وەرزشی (AIPS)، ئەم كۆمەڵەیە پێكهێنراوە كە دەبێتە چەترێك بۆ كۆكردنەوەی تەواوی ڕۆژنامەنووسانی وەرزشی لە شارو شارۆچكەكانی كوردستاندا.
ڕۆژنامەنووسە بەشدارەكان
ناوی ئامادەبووانی یەكەم كۆبوونەوە.

*** ناوی ئامادەبووانی كۆبوونەوەی یەكەم كە ڕۆژی (١٠ی حوزەیرانی ساڵی٢٠٠٦) لە هەولێر بەسترا.**
جەلال پەرێشان، ئاسۆ عادل، بۆتان جەلال، سدیقی گچكە، یاوەر نامیق، ئالان عەلی، زانا قادر، سەنگەر زرار، ئیحسان حەسەن، سەباح شوكر، دلێر فازل، فارس سدیق، سەردار حەسەن، سەنحاریب یوسف، ئەركان محەمەد.
ناوی نوێنەرانی لقەكانی سەندیكا.
* هەولێر: مەحمود عەزیز، سامان عەبدوڵڵا، سەردار كامل، سالار جەلال، وەلید ئەنوەر.
* سلێمانی: ڕزگار كەمال، توانا ئەنوەر، هۆزان ڕۆستەم، سدیق عەلی، ئازاد خدر.
* كەركوك: ئامینە كەریم، حوسێن عەلی، عومەر محەمەد، سەنگەر كاكۆ، ڕەعد نەجمەدین.
* دهۆك: جەمیل خەلیل، هۆگر محەمەد، عەبدولستار محەمەد، محەمەد سادق، كەیفی ڕەجەب.
* گەرمیان: حەبیب فەرەجوڵڵا - خانەقین، هیوا عەلی - كفری، سەباح ئەحمەد دەربەندیخان.
* سۆران: جەلال سەعید، دڵشاد سادق.
* بەغدا: عەباس حەمید، عیماد ناسر ئامادە نەبوو.
* موسڵ: ئەحمەد غەسوب.
مێژووی گواستنەوەی یارییەكانو كۆمێنتاری وەرزشی كوردی
مێژووی كۆمێنتاری وەرزشی لە كوردستاندا بۆ دوو قۆناغ یان بۆ دوو سەردەمی جیا دەگەڕێتەوە كە لێرەدا تیشكی دەخەینەسەر.

*** قۆناغی پێش ڕاپەڕین**
پێش ڕاپەڕین مامۆستا (ستار بەرزنجی) كە لە تەلەفزیۆنی كەركوك كارمەندبوو، وەكو ئامادەكارو پێشكەشكاری بەرنامەی وەرزشو پاشانیش وەك كۆمێنتاری وەرزشی كاریكردووە، دەتوانین بڵێین بۆ یەكەمجار كۆمێنتی وەرزشی بە كوردی لەلایەن مامۆستا ستار بەرزنجی بووە لە ڕێكەوتی (٢٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٦)دا
مامۆستا ستار لەو ڕێكەوتەدا یەكەمین كاری كۆمێنتاری وەرزشی ڕاستەوخۆی لەنێو یاریگادا ئەنجامداوە، بەڵام پەخشەكە ڕاستەوخۆ نەبووە، هەمووی تۆماركرابووە، بەڵكو دوای كۆمێنتارییەكەی، فیلمەكە بە تۆماركراوی چووەتە تەلەفزیۆنی كەركوكو دواتر پەخشكراوە، هەرچەندە ئەوكات تەلەفزیۆنی كەركوك سانسۆری زۆری لەسەر بووە، بەڵام وەكو سەرەتایەكو تۆماركردنی مێژوویەك لەم بوارەدا بووەتە سەرقافلە.
ئەوكات یارییەكان لە ئاستی تیپی پلەیەكی یانەكانی عێراق بوو، بەڵام وەك ئاماژەمان پێداوە، گواستنەوەی یارییەكان لەلایەن مامۆستا (ستار بەرزنجی) وەكو كۆمێنتاری وەرزشی، ڕاستەوخۆ نەبووەو تۆماركراوبووە، نموونەی زیندوو هەیە، ساڵی (١٩٨٧) لە یاریگای خۆجێییەتی ئەوكاتی هەولێر، یاری نێوان (هەولێرو زەوراء یان شورتە) بووە، هەروەها یاری نێوان (هەولێرو تەیەران) كە ناوبژێوان (سەلاح محەمەد كەریم) بەڕێوەیبرد، ساڵی (١٩٨٩) یاری هەولێرو كەركوك كە هەولێر ١- ٠ یارییەكەی بردەوە، ئەم یاریانە بە تۆماركراوی لە تەلەفزیۆنی كەركوك پیشاندرانو شێخ ستار بەرزنجی كۆمێنتی یارییەكانی كردەوەو وەكو مێژووش یەكەمین كۆمێنتاری وەرزشی كوردییە كە ئەم كارەی ئەنجامداوە.

*** بێژەرانی وەرزشی لە تەلەفزیۆنە کوردییەکاندا.**

* پێش ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١: بێگومان بێژەری تەلەفزیۆنی لە وێستگەی تەلەفزیۆنی کەرکوك دەستپێکردووە، بەهەمان شێوە سەرقافڵەکەی (شێخ ستار بەرزنجی)یە، کە بۆ جاری یەکەم لەم تەلەفزیۆنەدا بەرنامەی (وەرزش‌ولاوان)ی پێشکەش کردووە.

یەکەمین ئەڵقەی ئەم بەرنامەیە لە ڕێکەوتی (٢٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٥) بووە، سەرەتا ئەم بەرنامەیە سێ تەوەری لە خۆگرتووە (هەواڵەکان، یاسای یارییەکان، نامەی بینەران)، دواتر ساڵ لە دوای ساڵ دەوڵەمەندتر کراوە، ئەم بەرنامەیە لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩٩٤) وەستاوە، واتا ماوەی (١٩) ساڵ بەردەوام بووە.

*** مێژووی میدیاو میدیاکارانی وەرزشی کوردی**

مێژوو لەهەر بوارێکدا بێت، بەرپرسیارێتی و ئەرکێکی قورسە، بۆیە بەهۆی نەبوونی کیانێکی کوردی، مێژووەکان چەند دیدوبۆچوون و ڕای جیاوازی لێدروست دەبێت، ڕاگەیاندنی وەرزشی کوردی بەتایبەتی نووسەرو میدیاکارانی وەرزشی دوورنین لەو کێشەیە، چونکە بەر لە هەموو شتێك کوردستان دەزگایەکی ڕاگەیاندنی وەرزشی کوردی بەهەر چوار بەشەکانی (بینراوو نووسراوو بیستراووچەسپاو) نەبووە تا دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١، کەواتە لە کوێ مێژوو و ئەرشیف خۆی کۆدەکاتەوەو هێلانەیەکی خۆماڵی بۆخۆی ڕێکدەخات‌و پشت بەبەرهەم‌و بڵاوکراوەکان دەبەستێت‌و ماڵی ڕاگەیاندنی وەرزشی کوردی دادەمەزرێنێت؟

ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) لە ڕێکەوتی (٢ی حوزەیرانی ساڵی١٩٢١) یەکەم بابەتی وەرزشی بەناوی (ئەسپ تاودان) بڵاوکردەوە، دواتر هەمان ڕۆژنامە لە ڕێکەوتی (١٦٢ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢١) بابەتێکی لەژێر ناونیشانی (لە عەسکەریدا یاری)، هەرچەندە نووسەری ئەم دووبابەتە وەرزشییە نەناسراوە، بەڵام دەکرێ بڵێین نووسەرانی وەرزشی ڕۆژنامەی پێشکەوتن لە مێژوودا دەستپێك‌و سەرهەڵدان‌و یەکەمەکانی ڕۆژنامەنووسی وەرزشی کوردی بوون، یەکەم ڕۆژنامەنووسی وەرزشی کە ناوی بەدیارکەوتووە لەنێو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی کوردی‌و بابەت‌و هەواڵی وەرزشی بڵاوکردووەتەوە، خوالێخۆشبوو (عەلی ئەحمەد تەها) بووە، کاتێك لە ساڵی (١٩٦٠)دا لە گۆڤاری ڕۆژی نوێ یەکەم دیمانەی لەگەڵ سکرتێری یانەی سلێمانی ئەوکات ئەنجامداوە لەژێر ناونیشانی (وەرزش)، سەبارەت بە ڕۆژنامەی کوردی کە لاپەڕەیەکی تەرخان کردبێت بۆ وەرزش، ڕۆژنامەی (برایی) بووە ولە ڕێکەوتی (٦ی ئایاری ساڵی١٩٦٧) لە ڕێگەی ئاگاداری بۆ خوێنەرانی کە هاوکاریان بن بۆ ناردنی بابەتی وەرزشی هەمەجۆر، دواتر ئەم ڕۆژنامەیە بابەتی جۆراوجۆری وەرزشی بڵاودەکردەوەو لاپەڕەیەکی بۆ چالاکی وەرزشی ناوەوەو دەرەوە بەڵام مێژوو پێمان دەڵێت کە ساڵی (١٩٧٥) دەستپێکی کارکردنی میدیاکارانی وەرزشی کورد بووە لە بواری تیڤیدا، کاتێك بۆ یەکەمجار مامۆستا شێخ ستار عەبدوڵڵا بەرزنجی بەرنامەی وەرزش‌ولاوانی لە تەلەڤزیۆنی کەرکوك بە زمانی شیرینی کوردی ئامادەو پێشکەشکردووە، بۆیە ئەم مێژووە دەبێتە دەستپێك‌و سەرهەڵدانی میدیای وەرزشی کوردی بەگشتی‌و میدیای بینراو بەتایبەتی.

لە ناوەڕاستی هەشتاکان، دوای دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامەی وەرزشی کوردی بەناوی (کاروانی وەرزش)، لە (٣٠ی تەمووزی ساڵی١٩٨٥)دا، هەروەها بوونی لاپەڕەی وەرزش لە ڕۆژنامەکانی هاوکاری‌و ئاسۆو عێراق‌و بزاڤو گۆڤاری ڕەنگین کە بە کوردی دەردەچوون، هەروەها سەرهەڵدانی ڕاپەڕین لە بەهاری ساڵی (١٩٩١)و دەرچوونی چەندین ڕۆژنامەو کردنەوەی چەندین تەلەفزیۆنی لۆکاڵی لە کوردستان، لەو کاتەوە واتا لە ناوەڕاستی هەشتاکان تا ناوەڕاستی نەوەدەکان، ئەو کەسایەتییانەی کاریان لە بواری ڕۆژنامەو تەلەفزیۆندا کردووە، ئەمانەن:-

* لە شاری سلێمانی/ عەلی ئەحمەد تەها، هەڵگورد عارف، کۆچکردوو، شەهاب عوسمان، بەڵێن ئەحمەد، نەبەز محەمەد عەلی، محەمەد عەلی سەعید، حەمە بچکۆل، عەبدولی حەمە جوان، ڕزگار کەمال، شێخ ئیسماعیل مەحمود، سەلاح حامید ئەسعەد، جەمیل نوری، جەمیل مەدفەعی، کەمال نوری، تالیب سەید عەلی، ئومێد محەمەد فەرەج، د.عاسی فاتیح وەیس، خەسرەو گورون قەساب، ئاسۆ حەسەن، زانا قادر، ڕێبوار محەمەد یوسف، نیازی حەمە عەزیز، عەبدولڕەحمان ئەحمەد، ئالان قادر.

* لە شاری کەرکوك/ ستار عەبدوڵڵا، شێخ ستار بەرزنجی، عەبدولستار جەباری، ڕزگار شوانی، عومەر حەمەدەمین، حەربی خالید.

* لە شاری دهۆك/ جەمیل خەلیل، سەگڤان یوسفی، بێشوار مستەفا عەبدوڵڵا، دلێر فازیل، ئازاد گولەیی، عەبدولحەکیم مستەفا ڕەسوڵ، ئیحسان حەسەن، سەمیر بەرواری.

* لە ناوچەی گەرمیان/ عەلی حەسەن بەگ، حەسەن جاف، حامید محەمەد عەلی، حیکمەت محەمەد کەریم، مەلا بەختیار، سەلاحەدین عەبدولحەمید، سەلاح پەرلەمان، خەلیل حوسێن حەسەن، خەلیل زەهاوی، عەباس حەمید ڕەشید، هەوراز کاوە، ئەرکان محەمەد ڕەشید.

*** ڕاگەیاندنکارانی وەرزشی ئیدارەی گەرمیان و دەوروبەری.**

* ئەرکان محەمەد ڕەشید، کامەران عەلی یاروەیس، تەلعەت سەعدوڵڵا حەسەن، سەنگەر حەمید ئەحمەد، ڕەسوڵ بارام، گەرمیان عەزیز، هونەر خەلیل، هادی ئەحمەد، بەهائەدین کەمال، نیزام شبیب عەسکەر، سۆران سالح عەزیز، سەباح ئەحمەد محەمەد، لایەق فایەق، هەردی حەسەن ڕەشید، محەمەد تالیب، هەردی جەلال، شاهۆ ئیبراهیم، شەماڵ قادر، ئیڤان عەبدوڵڵا، ئەیوب عەلی، کامەران پالانی، مەرشوان عەلی جوامێر، عیسا سالح، ئالان ئەرکان، جەلال عەلی، محەمەد ئەحمەد عەلی، ئەیاد ئەحمەد محەمەد، هەواڵ خالید، فریاد شوانی، عەبدولواحید چراخ مەندەلاوی، باسل یەحیا، هیوا عەلی، جەلال عەلی.

*** میدیاکارانی وەرزشی باشووری کوردستان**

*** شێخ ستار بەرزنجی**



ستار عەبدوڵڵا ئەحمەد ناسراو بە (شێخ ستار بەرزنجی) مامۆستاو کۆمێنتارو پێشکەشکاری بەرنامەو ڕۆژنامەنووسی وەرزشی لە ساڵی (١٩٤١) لە گەرەکی ئیمام قاسمی کەرکووك لەدایکبووە، ساڵی (١٩٥٤) وەکو هەموو مناڵانی کورد لە کۆڵانەکانی ئیمام قاسم وەرزشی کردووە، ساڵی (١٩٦١- ١٩٦٢) خانەی مامۆستایانی بەشی وەرزشی تەواو کردووە، دەستەی دامەزرێنەری یانەی وەرزشی سۆلاڤەو بڕوانامەی پلە یەکی یارییەکانی تۆپی پێو باڵەی وەرگرتووە، لە ساڵی (١٩٧٥) تا ساڵی (١٩٩٤) ئامادەکارو پێشکەشکاری بەرنامەی وەرزش و لاوان بووە لە تەلەفزیۆنی کەرکووك، لە ساڵی (١٩٨٦)ەوە تا ئێستا ئەندامی یەکێتی نووسەرانی عێراقە، چەندین بڵاوکراوەو هەواڵو ڕاپۆرتو ستوونی لەسەر وەرزش بڵاوکردووەتەوە، یەکەمین پەرتووکی لەسەر یاسای تۆپی پێ چاپکردووە، ماوەی ١٣ ساڵ جێگری سەرۆکی لقی کەرکووکی یەکێتی تۆپێ پێو ١٢ ساڵێش سەرۆکی لقی کەرکووکی یەکێتی باڵە بووە، ماوەی ٢٧ ساڵە سەرۆکی یانەی وەرزشی سۆلاڤە.

مامۆستا ستار بەرزنجی یەکەمین ئامادەکارو پێشکەشکاری بەرنامەی وەرزشی بووە کە بۆ یەکەمجار لە ڕێکەوتی (٢٧ی تشرینی دووەمی ساڵی١٩٧٥) پەخشکراوە، هەروەها بۆیەکەمجار لە ڕێکەوتی (٢٩ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٦) کاری کۆمێنتاری وەرزشی کردووە لە کوردستان ئەمە جگە لەوەی یاریزان و ڕاهێنەریش بووە.

*** د. عاسی فاتیح وەیس**

د. عاسی فاتیح وەیس ساڵی (١٩٤٦) لە گوندی کنگربانی سەر بەشارۆچکەی کفری لەدایکبووە و لە ساڵانی (١٩٧١- ١٩٧٢) کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی زانکۆی بەغدادی تەواوکردووەو ساڵانی ١٩٧٤ تا ١٩٩٥ مامۆستای وەرزش بووە لە دواناوەندی هەڵەبجەو ئامادەیی سلێمانی، ساڵانی ١٩٨٢- ١٩٨٤ ڕاهێنەری تیپی باسکەی یانەی سلێمانی بووە، ساڵانی ١٩٨٥- ١٩٩٢ ڕاهێنەری تیپەکانی گۆڕەپانو مەیدانی یانەی وەرزشی سلێمانیو هەڵبژاردەی سلێمانیو هەڵبژاردەی پەروەردەی سلێمانی بووە، بەشداری چەندین خولی ڕاهێنەریو ناوبژیوانی یارییەکانی تۆپی پێو تۆپی دەستو گۆڕپانو مەیدانی کردووەو خولی نێودەوڵەتی لە ڕاهێنانی گۆڕەپانو مەیداندا بینیوەو بووەتە ڕاهێنەری هەڵبژاردەی عێراقیش، هەروەها ساڵانی (٢٠٠٤- ٢٠٠٨) ئەندامی یەکێتی گۆڕەپانو مەیدانی عێراق بووە.

ساڵی (١٩٩٥) ئەندامی یەکەم کۆنگرەی دامەزراندنی لیژنەی ئۆلۆمپی کوردستان بووە، لە لیژنەی ناوبراودا ئەندامی یەکێتی گۆڕەپانو مەیدانو سەرۆکی یەکێتی تۆپی دەست بووەو وەك ڕاوێژکاریش کاریکردووە، ساڵانی (١٩٩٥- ١٩٩٨) بەڕێوەبەری چالاکی وەرزشو دیدەوانی بووە لە پەروەردەی سلێمانی، ساڵی ٢٠٠١ بڕوانامەی ماستەرو ساڵی (٢٠٠٨) بڕوانامەی دکتۆرای لە پەروەردەی وەرزشی زانکۆی سلێمانی بەدەستهێناوە.



لە ساڵی (١٩٧٥)ەوە تا ئێستا بابەتی وەرزشی و ڕۆشنبیری لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی عێراق و کوردستاندا بڵاودەکاتەوەو خاوەنی چەند کتێبێکیشە، (یاسای نێوەدەوڵەتی تۆپی پێ، فەرهەنگی وەرزشی، بنەما زانستییەکانی یارییە بەهێزەکان، کاسی جیهانی تۆپی پێ ١٩٣٠ ٢٠٠٦ ، زانستی ڕاهێنانی وەرزشی، زاراوە وەرزشییەکان، یاسای نێودەوڵەتی تۆپی پێ، گۆڕەپان و مەیدان لەنێوان فێربوون و فێرکردندا)، ئێستاش سەرقاڵی نووسینەوەی کتێبێکە لەسەر مێژووی یاری گۆڕەپان و مەیدانی کوردستان.

* حەسەن جاف



حەسەن عەلی سەلیم ناسراو بە حەسەن جاف، ساڵی ١٩٥٣ لەشارۆچکەی کەلار لەدایکبووە، لە قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی بۆ هەڵبژاردەی تۆپی پێ و باڵەی کەلار یاریکردووە، ساڵی (١٩٧٧) لە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جوتیاران دامەزراوەو ماڵی ڕۆشنبیری کەلاری دامەزراندووەو تیپی تۆپی پێ و باڵەو تۆپی سەرمێزی دامەزراندووە، ساڵی (١٩٨٨) یەکەم بابەتی وەرزشی بڵاوکردووەتەوە، لەسەر ئەم بابەتە (٣) مانگ لە دائیرەی ئەمن گیراوە لەگەڵ دامەزراندنی لیژنەی ئۆلۆمپی دەبێتە نوێنەری کەرکووك بۆ پەیوەندی و ڕاگەیاندن، ساڵی (١٩٩٢) یەکێك بووە لە دەستەی دامەزرێنەری یانەی وەرزشی شێروانە، حەسەن جاف لەگەڵ عەدالەت عەبدوڵڵاو خەلیل ڕەفعەت ساڵی (١٩٩٣) یەکەم بڵاوکراوەی وەرزشیان دەرکردووە بەناوی (وەرزش و گەرمیان) و سەرنووسەری بڵاوکراوەکە بووە، هەروەها چەندین بابەتی وەرزشی لە ڕۆژنامەکانی کوردستانی نوێ و ئۆلۆمپیکدا بڵاوکردووەتەوە.

* سەردار کامیل میراخوور.



سەردار کامل عەلی میراخوور ساڵی (١٩٥٣) لە کفری لەدایکبووە، دەرچووی کۆلێژی پەروەردە بەشی زمانی عەرەبییە، سەرەتای حەفتاکان یاریزانی تیپی میللی ڕزگاری شاری کفری بووە، دواتر یاری بۆ یانەی کفری کردووە، پاشان دەبێتە ڕاهێنەری تیپی تۆپی پێی یانەی کفری و دوای ئەوە دەبێتە دادوەری تۆپی پێ لە کفری، لەگەڵ (سەلاح پەرلەمان) یەکەم دەستەی کارگێڕی یانەی وەرزشی کفری بووە، ئەندامی بەشداری لیژنەی ئۆلۆمپی سلێمانی بووە، ساڵی (١٩٧٣) بۆ یەکەمجار لە ڕۆژنامەی (التآخي) بابەتی وەرزشی بە زمانی عەرەبی بڵاودەکاتەوە، پەیامنێری ڕۆژنامەکانی وەرزشی (الرياضي الجديد والملاعب) بووە، ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی (ڕۆژانەی پاڵاوتنەکانی ئاسیا) بووە، جگە لە نووسینی بابەتە وەرزشییەکانی بەزمانی عەرەبی، ساڵی (٢٠٠١) بابەتی وەرزشی بەزمانی کوردی نووسیوە لە ساڵانی (٢٠٠٠تا ٢٠٠٤)دا، بەرپرسی ماڵپەڕی یانەی وەرزشی هەولێر بووە، ئێستاش ناوە ناوە بابەتی وەرزشی بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی لە ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییەکان بڵاودەکاتەوە.

* عەبدولستار جەباری



عەبدولستار عەزیز عەبدوڵڵا، ناسراو بە عەبدولستار جەباری، ساڵی (١٩٦٤) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، دەرچووی پەیمانگای باڵای گەیاندنەکانە لە ساڵی ١٩٨٨دا.
هونەرمەندی خۆشنووس و نووسەرو ڕۆژنامەنووسی وەرزشی (عەبدولستار جەباری) ساڵی (١٩٨٤) لە ڕۆژنامەی هاوکاری بابەتی وەرزشی بڵاوکردووەتەوە، بەوتەی خۆی ویستی ئەوەبووە، بۆچی ڕۆژنامە یان لاپەڕەیەکی وەرزشی نییە، بۆیە سەرەتا لە ڕۆژنامەی هاوکاری بووە، دواتریش لە یەکەمو دووەم ژمارەی کاروانی وەرزشدا بابەتی بڵاودەبێتەوە، چەندین بابەتی وەرزشی وەکو هەواڵو ڕاپۆرتو دیمانەی تێدا بڵاوکردووەتەوە، بەڵام لە ڕاپەڕینی بەهاری (١٩٩١)دا ماڵیان لە کەرکوك تاڵان دەکرێتو هیچ ئەرشیفێکی نامێنێت.
عەبدولستار جەباری لە ساڵانی (١٩٨٣ تا ٢٠١٥) پێنج پەرتووکی بڵاوکردووەتەوە (دیاری، هونەری خۆشنووسی، خۆشنووسانی کوردستان، ژووانگەی هونەر، بژی نیشتمان، ئەو هەتیوەی نابێت بە پیاو). عەبدولستار جەبار بەشداری چەندین خولو وۆرك شۆپی دەرەوەو ناوەوەی وڵات بووە، لە زۆربەری ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بەزمانەکانی کوردیو عەرەبی بابەتەکانی بڵاوبووەتەوە، بۆ چەند جارێکیش خەڵاتو ڕێزلێنانی بۆ سازکراوە، ماوەیەك بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری(گزنگ)بوو.

* خەبات کەرکوکی.
خەبات قادر فەتاح ناسراو بە خەبات کەرکوکی، ساڵی (١٩٦١) لە شاری کەرکووك لەدایکبووە، سەرەتای ساڵی (١٩٩٢) دەچێتە نێو کاری ڕاگەیاندنو دەبێتە پەیامنێری ڕۆژنامەی کوردستانی نوێو زۆربەی زۆری هەواڵو ڕاپۆرتو دیمانە وەرزشییەکان ڕووماڵ دەکات، لە ساڵی (١٩٩٨ تا ساڵی



٢٠٠١) بابەتەکانی لە لاپەڕەی وەرزشی ڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان بڵاودەکردەوە کە لە سلێمانی دەردەچوو، پاشان نووسینو بابەتە وەرزشییەکانی لە هەفتەنامەکانی کەرکووکی ئەمڕۆو پاسەرە بڵاودەکردەوە، وەکو میدیاکارێکی وەرزشی (٢١) ساڵ لەم بوارەدا بەردەوام بووە، بەڵام بەهۆی نەخۆشیو پیشەی فەرمانبەری ماوەیەکە دووركەوتووەتەوە.

* حەربی خالید
حەربی خالید تاهیر ساڵی ١٩٦٦ لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، ساڵی ١٩٨٢ لە تیپە میللییەکانی شاری کەرکوك دەست بەوەرزش دەکات. دواتر دەبێتە یاریزانی تۆپی سەرمێز تا ئاستی هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك یاری دەکات، ساڵی ١٩٨٥ ڕژێمی بەعس دەستگیری دەکاتو لە وەرزش دووردەکەوێتەوە ساڵی ١٩٩٢ ڕۆژنامەنووسی وەرزشی دەبێتە پیشەی، بۆ یەکەمجاریش بابەتی وەرزشی لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ بڵاودەکاتەوە، لە هەمان ساڵدا لە بنەسڵاوەی شاری هەولێر لە ئاوارەیی لەگەڵ هەڤاڵەکانی یانەی وەرزشی کەرکوك دادەمەزرێنن، ساڵی ١٩٩٦ پلەی سکرتێری نووسینی ڕۆژنامەی (ئۆلۆمپیك)ی هەبووە، لە ساڵی (٢٠٠٣)وە تا ئێستا سەرۆکی نوێنەرایەتی کەرکوکی لیژنەی ئۆلۆمپی عێراقو ئەندامی کۆمیتەی تەنفیزی لیژنەی ئۆلۆمپی کوردستانو ماوەیەکیش لێپرسراوی ڕاگەیاندنی لیژنەی ئۆلۆمپی هەرێم بووە، لە ساڵی (٢٠٠٤)ەوە لقی کەرکوکی یەکێتی پایسکلسوارییان دامەزراندووە. لە ساڵی (٢٠٠٧)ەوە ئەندامی یەکێتی پاسکیلسواریی عێراقەو لەپلەی جێگری سەرۆکی یەکێتییەکە دایە، بەشداری چەندین کۆڕو



کۆبونەوەو خولو قارەمانێتی نێودەڵەتی کردووە.

* سەباح شوکر
سەباح شوکر عوسمان ساڵی ١٩٥٩ لە شاری کەرکوک لەدایکبووە، خانەی مامۆستایانی هەولێر/ بەشی وەرزشی تەواوکردووە، لە منداڵییەوە خولیای وەرزشی دەبێتو لە



تیپە میللییەکانی شاری هەولێر لە سەنتەری سێتاقان یاری دەکات، دواتر دەبێتە مامۆستای وەرزشی، ساڵی (١٩٨٣ تا بەهاری ١٩٩١) دەچێتە شاخو دەبێتە پێشمەرگە، ساڵی (١٩٩٢) ڕوو لە بواری ڕاگەیاندن دەکات، ساڵانی ١٩٩٤ تا ١٩٩٦ لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێو بەشی وەرزشی کاردەکات، دواتر لە شاری سلێمانی بۆ گۆڤاری ئۆلۆمپیك دەنووسێو لە بەشی وەرگێڕانی فارسیش کاردەکات، دواتر دووبارە لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ وەك پەیامنێری وەرزشی کاردەکاتەوەو ئێستاش وەك پەیامنێری وەرزشیو هونەری بەردەوامە، هەروەها لە زۆربەی زۆری ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی کوردی بابەتی وەرزشیو جۆراوجۆری بڵاوکردووەتەوە، ئێستا لە کاری ڕۆژنامەنووسی بەردەوامەو کاری پەیامنێری بۆ ڕۆژنامەی الاتحاد- یش دەکات.

* سەردار بابان
سەردار عەبدولسەلام ناسراو بە سەردار بابان، ساڵی (١٩٦٦) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، دەرچووی کۆلێژی زانستەو خاوەنی بڕوانامەکانی بەکالۆریۆسی بایۆلۆجیو



بەکالۆریۆس ئەندازەی بۆ ماوە، دبلۆمی کیمیای زیندەگی، خوێندنی پزیشکی وەرزشی، دبلۆم لە خواردنی وەرزشیو توانای جەستەیی.
ساڵی (١٩٩٩)کراوەتە ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ئۆلۆمپیكو لە هەفتەنامەی یاریگاو ڕۆژنامەی کوردستانی نوێو ستادیۆمی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ چەندین بابەتی تایبەتمەندی لەسەر پزیشکی وەرزشیو توانای جەستەییو پێکانی یاریزانانو چارەسەرکردن بڵاوکردووەتەوە.
ساڵانی (١٩٩٨- ١٩٩٩) وەك پزیشکی چارەسەرکەر لەگەڵ یانەکانی کەرکوك لە سلێمانی کاریکردووە، ساڵی (٢٠٠٠)

خولێکی ڕۆژنامەنووسی بڕیوەو لە هەمان ساڵدا کتێبێکی بەناونیشانی (لەشساغیو چارەسەری وەرزشی، بنەماکانی پزیشکی وەرزشی).

*** رزگار شوانی**

ڕزگـار کاکەمیر محەمەد نـاسراو بە ڕزگـار شوانی، ساڵی (۱۹٦۳) لە شاری کەرکووك لەدایکبووە، دەرچووی ئامادەییە لە ساڵی (۱۹۸۳)دا ساڵی (۱۹۸۹) دونیای ڕۆژنامەنووسی



وەرزشی هەڵدەبژێرێتو دەبێتە ڕۆژنامەنووسی وەرزشی.
لەگەڵ دەستپێکردنیدا، دەبێتە پەیامنێری گۆڤاری ڕەنگینو ڕۆژنامەکانی هاوکاریو بەعس ئەلریازی) کە بەهەردوو زمانی کوردیو عەرەبی دەردەچـوونو چەندین هـەواڵو بابەتو ڕاپۆرتی وەرزشی بڵاوکردووەتەوە، ساڵی (۱۹۹٤) دەبێتە پەیامنێری بەرنامەی (ڕاپـۆرتـی وەرزشـی) لە تەلەڤزیۆنی کەرکووك، کارەکانی تا ساڵی ۲۰۰۳ لە ڕۆژنامەو گۆڤارو تیڤیدا بەردەوام دەبێت.
دوای ساڵی ۲۰۰۳ دەبێتە پەیامنێری ڕۆژنامەی کوردستانی نوێو پاشکۆی ستادیۆم لە شاری کەرکووك، هەروەها لە ساڵی ۲۰۰۳ەوە تا ئێستا پەیامنێری ڕۆژنامەی (الاتحاد)ەو ئێستاش بەرپرسی ڕاگەیاندنی لقی کەرکووکە سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقە.

*** عومەر وەرتێ**

عومەر محەمەد ئەمین عومەر، ناسراو بە عومەر وەرتێ، ساڵی (۱۹٦۲) لە شاری کەرکووك لەدایکبووە، دەرچووی بەشی پـەروەردەی وەرزشـی پەیمانگای مامۆستایانی موسڵە لە ساڵانی (۱۹۸۵– ۱۹۸٦)دا، لە دوای دەرچوونی تا ساڵی (۱۹۹۱) مامۆستای وەرزش بووە لە یانەی جەیش.
ساڵـی (۱۹۹۱) لـە ڕۆژنـامـەکـانـی هـاوکـاریو عـێراق وەکو



پەیامنێری وەرزشی شاری کەرکووك کاردەکات، ساڵی (۱۹۹۲) یەکەم نووسینی لەسەر پاڵەوانێتی ئاسیا بڵاودەکاتەوە، لە دوای ساڵی (۲۰۰۳)ەوە دەبێتە پەیامنێری وەرزشی لە ڕۆژنامەکانی کوردستانی نوێ والاتحاد، ساڵی (۲۰۰٦) لە شاری هەولێر بەشداری لە یەکەم کۆنفرانسی دروستبوونی کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسانی وەرزشی کوردستان دەکات.
عومەر وەرتێ چەندین بابەتو هەواڵو ڕاپۆرتی وەرزشی بە زمانەکانی کوردیو عەرەبی بڵاوکردووەتەوە، دوای ئەوە لە تەلەڤزیۆنی ناوخۆیی کەرکووك دەبێتە ئامادەکاری بەرنامەی (وەرزشو لاوان)، پـاشـان وەك ئـامـادەکـاری بـەرنـامـەی (ئۆلۆمپیك) لە کەناڵی ئاسمانی کەرکووك کاریکردووە.

*** ئەرکان جاف**

ئـەرکـان محـەمـەد ڕەشـیـد نـاسراو بە ئـەرکـان جـاف، ساڵی (۱۹۷۹) لە کەلار لەدایکبووە، دەرچووی پەیمانگای تەکنیکی سلێمانی بەشی تەندروستیو کۆمەڵە لە ساڵانی (۲۰۰۰–۲۰۰۱)دا، سـەرەتـای ساڵی (۱۹۹۲) لە تیپە میللییەکانی کەلارو پاشانیش لە ڕیزی تیپەکانی لاوانو پێشکەوتووانی تیپی تۆپی پێی یانەی شێروانە یاریکردووە.
کـاری میدیای وەرزشـی ئەرکان محەمەد جۆرواجۆر بووە، لە کەناڵە لۆکاڵییەکانو ڕۆژنامەکانی (ئایندەو ڕۆژنامەی بەرەو شارو ئاسۆی وەرزشیو پێگەی خەندانو ستادیۆمی کوردستانی نـوێو ئاوێنـەو هـاوڵاتـیو ئـاسـۆ)و گۆڤاری شـێروانـە، هـەروەهـا سـەرنـووسـەری هـەردوو ڕۆژنـامـەی گەرمیانی وەرزشـیو وەرزشـکـاران بـووەو وتـارو بابەتو هـەواڵو ڕاپۆرتـی وەرزشـی بـڵاوکـردووەتـەوە، لە چەندین کەناڵی تیڤیو ڕادیۆیی وەکو (ئایندەو ئـازادیو تـەوارو مەشخەڵانو کۆمەڵ) وەك میدیاکارێکی وەرزشی گەرمیان کاری بەدواداچوونو شرۆڤەی وەرزشی کردووە.
ئـەرکـان جـاف بـەشـداری یـەکـەم کۆنفرانسی کۆمـەڵـەی



ڕۆژنامەنووسانی وەرزشی کوردستانی کردووەو بووەتە ئەندامی کۆمەڵەکە لە (١٢ی تەمووزی ساڵی٢٠٠٦)، ئێستاش بەرپرسی ڕاگەیاندنی یانەی وەرزشی شێروانەیە.

*** یەکەمەکانی نێو میدیای وەرزشی مێینە.**

ئەگەر باس لە مێژووی ڕۆژنامەنووسانی وەرزشی مێینە بکەین، دەبێت ڕووەو لاپەڕەکانی وەرزشی گوزەر بکەین، ڕۆژنامەی کاروانی وەرزش‌و پاشکۆی مۆندیالی وەرزشی، دوو ڕۆژنامەی وەرزشین، کە دەتوانین وەك سەرچاوەو پاڵپشتی بۆ کارەکانمان پشتیان پێببەستین، چونکە کاروانی وەرزشی ساڵی (١٩٨٥) بەر لە ڕاپەڕین دەرچووەو پاشکۆی مۆندیال-یش ساڵی (١٩٩٤) دوای ڕاپەڕین دەرچووە، بۆیە چەند ناوێکی خاتوونی ڕۆژنامەنووسی وەرزشی لە (کاروانی وەرزشی) هاتووە، نازانرێت کە بەشێکیان تەنها بۆ ناو بابەتیان بڵاوکردووتەوە یاخود وەکو ڕۆژنامەنووسی وەرزشی لەم ڕۆژنامەیەدا کاریان کردووە.

ئەو خاتوونانەی کە لە ڕۆژنامەی (کاروانی وەرزش)ی بابەتیان بڵاوکردووەتەوە، ئەمانەن (پێری محەمەدی، زوبێدە محەمەد، دایکی ڕەگەز، زیلان، شەپۆل، ناسکە محەمەد دزەیی)، بەڵام بەهۆی دەست نەکەوتنی تێکڕای ژمارەکانی (کاروانی وەرزش) تەنها ئەو ناوانەم بڵاوکردەوە کە دەستم کەوتووە.

سەبارەت بە پاشکۆی وەرزشیی (مۆندیالی کوردستانی نوێ) تەنها خاتوونێك بابەتەکانی بڵاوکردووەتەوە ئەویش (نەجیبە کەریم)ە.

*** یەکەمین کچە ڕۆژنامەنووس‌و بێژەری وەرزش دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١**

بێگومان لە دوای ڕاپەڕین خاتوو نەجیبە وەکو مێژوو بە یەکەم میدیاکاری مێینەو پێشکەشکاری وەرزشی لە ڕادیۆ ئەژمار دەکرێت، چونکە لە سەردەمی ڕژێم پێشکەشکاری بەرنامەی تیڤی‌و ڕادیۆیی نەبوو، دوای ڕاپەڕینیش بەتایبەتی لە ساڵی (١٩٩٣) خاتوو نەجیبە کەریم بابەتی لە لاپەڕەی وەرزشی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ بڵاوکردووەتەوە، دواتر ساڵی (١٩٩٤) لە پاشکۆی مۆندیال بەرهەمەکانی بڵاوکراوەتەوە، بۆیە وەکو مێژوو و سەرەتا لە شاری هەولێر (نەجیبە کەریم حەمەد) بەیەکەمین ڕۆژنامەنووس‌و پێشکەشکاری بەرنامەی وەرزشی لە ڕادیۆ ئەژمار دەکرێت، هەروەها تریفە فەرەیدون لە شاری سلێمانی‌و ئامینە کەریم لە شاری کەرکوك‌و ئاڤان جەمیل خەلیل لە شاری دهۆك.

*** ڕۆژنامەنووس‌و بێژەرانی وەرزشی مێینە.**

لەبەر نەبوونی ڕێژەیەکی باش لە ڕۆژنامەنووسان‌و بێژەرانی وەرزشی مێینە، بۆیە پانۆرامایەکم بەنێو ناو و کارەکانی خانمانی ڕاگەیاندنکارانی وەرزشی مێینەی کوردستان ئامادەکردووە، هەروەها لەبەر کەمیی ڕێژەی میدیاکارانی وەرزشی مێینە، نەکرا ڕیزبەندی‌و مەرجی ساڵی کارکردنیان بۆ دابنێین، بۆیە سیڤی هەر هەموویانمان داناوە.

*** د. ئامینە کەریم.**

د. ئامینە کەریم حوسێن ساڵی (١٩٦٨) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، ساڵی (١٩٩٣- ١٩٩٤) کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی موسڵی تەواو کردووە، ساڵی (٢٠٠٨- ٢٠٠٩) بڕوانامەی ماستەری لە بواری وەرزش وەرگرتووە،



ساڵی (۲۰۰۳- ۲۰۰٤) کاری ڕۆژنامەنووسی وەرزشی کردووە، لە زۆربەی ڕۆژنامەکانی کەرکوك بەتایبەتی لە ڕۆژنامەی (هەواڵ)و پاشکۆی وەرزشی هەمان ڕۆژنامەدا کارو بەرهەمەکانی بڵاوکردووەتەوە، ساڵی (۲۰۰٦) لەگەڵ خاتوو هۆزان ڕۆستەم تەنها دوو خاتوون بوونە بەشداری یەکەم کۆنفرانسی ڕۆژنامەنووسانی وەرزشییان کردووەو بە ئەندامی دەستەی کارگێڕی هەڵبژێردراون‌و تا ساڵی (۲۰۰۸) کاریکردووەو دواتر ساڵانی (۲۰۰۸ تا ۲۰۱۲) وەك تاکە خاتوون لە دەستەی کارگێڕی لیژنەی ڕۆژنامەنووسانی وەرزشی کوردستان کاریکردووەو تا ماوەیەك بەردەوام بووە لە کاری ڕۆژنامەنووسی وەرزشی‌و خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە لەسەر (ڕێگاکانی وتنەوەی وانەی وەرزشی).

*** نیشتمان سدیق**

نیشتمان سدیق حەسەن، ساڵی (۱۹۸۲) لە شاری کەرکوك



لەدایکبووە، دبلۆمی لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە بەشی شانۆ (بیستن‌و بینین) وەرگرتووە، ساڵانی (۲۰۰۳تا ۲۰۰۵) لە ڕادیۆی مەڵبەندی دووی کەرکوکی (ی، ن،ك) بێژەرو پێشکەشکاری بەرنامە بووە، لە ساڵی (۲۰۰۵) ەوە وەکو بێژەری هەواڵەکانی وەرزشی بەزمانی عەرەبی لە کەناڵی سپۆرتی کەرکوك‌و کەناڵی ئاسمانی کەرکوك کاردەکات‌و ئێستاش بەردەوامە.

*** فرمێسك تاڵەبانی.**



فرمێسك یاسین کەرەم ئەحمەد، ناسراو بە فرمێسك تاڵەبانی،



ساڵی (۱۹۹۰) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، دەرچووی کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی زانکۆی سلێمانییە لە (۲۰۱۱-۲۰۱۲)دا.

فرمێسك بەهۆی خولیای بۆ وەرزش، لە منداڵییەوە ئەم ئارەزووەی ون نەکرد، تاوەکو خوێندکارێك لە کۆلێژی پەروەدەی وەرزشی وەرگیرا، دوای تەواوکردنی کۆلێژ بەهەمان شێوە ئەمجارەیان لە وەرزش دوورنەکەوتەوە، هەنگاوی بەرەو میدیای وەرزشی هاوێشت.

فرمێسك تاڵەبانی لە ساڵی (۲۰۱۲)ەوە تا ئێستا وەکو بێژەری هەواڵی وەرزشی کوردسات دەستی بەکاری میدیای وەرزشی کردووە، یەکەم هەنگاویشی هەر لەو کەناڵە بوو، ئێستاش بەهەمان شێوە بێژەری کەناڵی (کوردسات نیوز HD)یە.

***یاداشتی بەشێك لە یاریزانە دێرینەکانی کەرکوك**

*** ئەحمەد عەبدوڵڵا جاف**



– ئەحمەد عەبدوڵڵا رەزا جاف لە ساڵی ١٩٦٠ لە کەرکوك لەدایکبووە، لە قوتابخانەی سەرەتایی پیرەمێرد و ناوەندی کاوەو ئامادەیی ئیمام قاسم، پاشان موسەڵڵا بەشی وێژەیی دواتر گەڕاینەوە بۆ ئیمام قاسم لە پەیمانگای هونەری کەرکوك.

– ساڵی ١٩٨٠ بەشی کارگێری دبلۆمم وەرگرت، سەرەتا لە قوتابخانەی پیرەمێرد وەك سەرەتایی وەرزش کردن کە مامۆستا شێخ ستار شێخی وەرزشەوان مامۆستامان بوو پاشان لە قوتابخانەی کاوە بەشداریم کرد لە قورسایی فڕێدان کە یارییەکە لە یارییەکانی گۆڕەپان و مەیدان هەر لە ٢ی ناوەندی تا شەشی ئامادەیی هەر یەکەم بووم، لە مامۆستاکانی ئەو کاتە لە ناوەندی کاوە (مامۆستا محەمەد رەزا لە ئیمام قاسم، مامۆستا عەدنان شوکر لە موسەڵڵا، مامۆستا ئیحسان ناوبژیوانی نێودەوڵەتی بوو لەزۆرانبازی).

– لە یانەی وەرزشی سۆلاف فێری یاری تۆپی دەست بووین لەگەڵ باسکە ئەو کات لەناو کورد بڵاونەبوو، تۆپی دەستیش هەر نەبوو یەکەم کەس ئەو یارییەی لە یانەی سۆلاف دروست کرد مامۆستا عەبدولرەحمان شەشە بوو توانی تیپی باسکەو تۆپی دەست دامەزرێنێ لەگەڵ مامۆستایەکی زۆر بەرێز و خۆشەویست مامۆستا (کەمال) ئێمە وەك تازە پێگەیشتووان مامۆستا کەمال راهێنەر بوو پاشان چووینە قۆناغی پێشکەوتووان سێ خوول لە هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك یاریم کردووە، ساڵی یەکەم راهێنەر مامۆستا وڵسن بوو، ساڵی دووەم مامۆستا عەونی بوو، ساڵی سێ یەم مامۆستا مارسیس داود بوو لە قادسیە کوژرا ئێستا یانەی ئەرمەن بە ناوی ئەوەوە نراوە، یارییەکانی یەکەم لە رومادی بوو، دووەم لە موسڵ، سێ یەم لە کەرکوك، پاڵەوانێتی پەروەردەی عێراق بۆ گۆڕەپان و مەیدان لە هەولێر بوو لە ئاستی عێراق چوارەم بوو.

لە شەڕی ئێران–عێراق زۆربەی ماوەی سەربازییە کە لە (العاب) بووم یاری تۆپی دەست و ساحەو مەیدان یاریم کردووە پاشان بۆ یانەی تەیەران یاری تۆپی دەستم کردووە، لە سەرەتای ساڵی هەشتاکان بەعسییەکان کودەتایان کردە سەر وەرزش لە کەرکوك یەکەم هەنگاویان لە نادی سۆلافەوە





دەست پێ کرد، دەستەی کارگێڕی بە دەنگدانی شەرعی بە ئامادەبوونی دادوەر لە پۆستەکانیان مانەوە بەڵام دوای چەند ڕۆژێ کۆمەڵێ کەسانی بەعسی دوور لە وەرزش وەك کودەتا ئەو مامۆستا بەڕێزانەیان دوورخستەوە، کۆمەڵێ پیاوی خراپی بەعسیان هێنایە جێگای ئەوان ئەمەش هۆکارێ بوو بۆ ئەوەی وەرزش لە کەرکوك دوا بکەوێ و دوای پرۆسەی ئازادی عێراق نەمانی زوڵمی بەعسی و دەرکەوتنی خۆری ئازادی جارێکی تر لە ناوچە کوردییەکان کۆمەڵێ یانە سەریان هەڵدا یەکێ لەو یانانە یانەی وەرزشی پێشەوا بوو کە دامەزرێنەر و دروستکەری بووم مۆڵەتی بەغدا و کوردستانم وەرگرت تا ئێستا بەردەوامە و بوونی هەیە و من سەرۆکایەتی ئەکەم تاوەکو نووسینی ئەم بابەتە، لە ساڵی ٢٠٠٨ وە ئەندامی ئەنجوومەنی شاری کەرکوکم سەرۆکی لیژنەی وەرزش و پەروەردەم تاوەکو ئەمڕۆ لە هەموو پرۆژە وەرزشی و پەروەردەیی کەرکوك بەبێ جیاوازی بەشداریم تیا کردووە.



- ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامەنوسانی کوردستان، زنجیرەیەك چاوپێکەوتنی زیاتر لە ٢٠ زنجیرە لەگەڵ یاریزانە دێرینەکانی شاری کەرکوك ساز داوە ئەو کاتەی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری باوە گوڕگوڕ بووم، هەروەها لە ڕادیۆ زیاتر لە ٣٠ ئەڵقە بەرنامەی ناودارانی مێژووم پێشکەش کردووە.

لەگەڵ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی NGO کارم کردووە وەك ڕێکخراوی (فوگا)ی ئەمریکی زیاتر لە سێ ساڵە ڕێکخراوی (میرسی کۆر)ی ئەمریکی لە چەندەها خولە سیمینارێیان سازداوە بەشداریم کردووە و ٣ ساڵیش ڕابیتەی ئیسلامی کورد.

* حەسەن عەبدولکەریم شێخانی

- ناوم حەسەن عەبدولکەریمە، سەر بە ساداتی شێخانم،



ساڵی ١٩٣٠ لە قادر کەرەمی سەر بە شاری کەرکوکی کەرکوك لەدایکبووم، خێزاندارو خاوەن ٥ کوڕ و ٢ کچم.

- ساڵی ١٩٤٩ کاتێ بوومە سەرباز پەیوەندیم بە بەشی وەرزشی بەغدادەوە کرد، ئەو سەردەمە زۆرانبازی ناسرا و کەسایەتی دیاری عێراق و جیهان (عەدنان قەیس) لە یانەی ئەعزەمیە ڕاهێنەر بوو، لەگەڵ ئەودا مەشقم دەکرد هەروەها هەردوو ڕاهێنەری ئاسن هەڵگرتن (کازم عەبدل) و (ناسر غافق) لەگەڵیاندا مەشقم کردووە.

- دوای ئەوەی لە بەغدا گواسترامەوە بۆ سەربازگەی غزلانی لە موسڵ یەکسەر پەیوەندیم بە یانەی - ملعب موسڵ کرد هەردوو یاری مەلەوانی و ئاسنم دەکرد لە بواری مەلەوانی یەکەمم بە دەستهێنا، ڕاهێنەرەکانی موسڵ بریتی بوون لە (ئیسماعیل ئەلحەجار) پاڵەوانی عێراق بوو لە ئاسن هەڵگرتن و (محەمەد تاهیر) و (ئەبو تاهە) بوون.

- دوای تەواوکردنی ڕاژەی سەربازیم گەرامەوە شاری کەرکوك وە پەیوەندیم بە یانەی کۆمپانیا - ناوی الشرکە- کرد، ڕاهێنەرێکی ئینگلیزی بە توانا لە یانەکە بوو، دەستێکی نەبوو بەڵام زۆر هونەری تازەی ئاسن هەڵگرتن شارەزایی لە بوارەکانی مەلەوانی و بۆکسێن هەبوو، و لە ژمارەی ٢٠١٣٠ ی ڕۆژنامەی (فتی العراق) لە ساڵی ١٩٥٨ باس لە دەرچوونم بە پلەی یەکەم دەکات.

*هەڵگرتنی کێشی ١٠٥ کگم . خەخیف

* ١٣٠ کگم نەتر

* ١١٠ کگم زەغت

کە سەرجەمی دەکاتە ٣٤٥ کگم لە کێشی سووك سەرکەوتنم تیا هێناوە

هەروەها پاشکۆی گۆڤاری کاروان بە ناوی وەرزش لە ژمارە ٨ و لاپەرە چواردا لە ساڵی ٢٨ / ١٠ / ١٩٨٥ باسی منی کردووە.

- یەکێك لەو پاڵەوانانەی لەگەڵیدا یاریم دەکرد (محەمەد تاهیر) موسڵاوی بوو، بەڕاستی کەسێکی زۆر بەهێز بوو، کاتێ لە گرتووخانەی کەرکوك بەند دەبێت منیش ئەو دەمە



سەربازبووم (هیدایەت) ناوێك جێگری فەرماندەی ڕێککاری (امر الانزبات) بوو پێش ئەوەی بەندییەکان بۆ ڕەواندز بەرێ داوای خواردنیان کرد ئەویش واتا (هیدایەت) بە ئەنزولاسایییەکەوە داواکەیانی جێبەجێ نەکرد بەڵام کاتێ کە خواردنیان بۆ ئامادە نەکردن ئەم (محەمەد تاهرە) بە بەرچاوی هەمووان و جێگری امر ئینزیبات کەلەپچەو زنجیری زۆر بە ئاسانی بچراند پەلاماری دان ئەمەیش بووە جێگای سەرەنجی هەموو لایەکی وە منیش هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە.

لە پاڵەوانێتی ئاسن هەڵگرتن ناوچەی باکوور ساڵی ١٩٥٨ یەکەم بەدەست هێنا پارێزگاکانی کەرکوك و موسڵ و سلێمانی و هەولێر بەشداریان تێدا کردبوو من ئەو کاتە لای (قستەنتین خوری) شۆفێر بووم، کارگەی بلۆکی هەبوو داوای مۆڵەتم لێکرد کە بۆ ئەم پاڵەوانییە دەچم کە لە موسڵ ئەنجام درا، زۆری هاندام و وتی ئەگەر یەکەمت بەدەست هێنا موچەی یەك مانگت بە خەڵات پێ دەدەم، ئەگەر نا موچەی ١٥ ڕۆژ لای منەوە دیاری بێت.

جگە لە ئاسن هەڵگرتن لەگەڵ عەدنان قەیسی زۆرانبازیم کردووە، هەروەها لەگەڵ چەندین دۆست و برادەر لە شاری کەرکوك توانیمان (یانەی فەسیل) دابمەزرێنین لقی ناوی (هواە)مان دامەزراند ئەوانەی لە یادم ماین (ئەحمەد جەلال، کەمال ئەفەندی، فەخری ئاوچی، ئەحمەد بلە، ئیبراهیم عزی) ئەم یانەیەمان بۆ یەکەمین جار لە نزیك گۆڕستانی سەیید عەللاوی لە گەڕەکی قۆریە دانا، دواتر گواستمانەوە بۆ پشت سینەما ئەتڵەس، دوای ڕوخاندنی ڕژێمی پاشایەتی و هاتنە سەر حوکمی عەبدولکەریم قاسم ناوی یانەی بۆ یانەی (قورە) گۆڕا ئەو یانەیەیە کە ئەمڕۆ هەیە.

پەیوەندیم بە زۆربەی یانەکانی کەرکوکەوە کردووە ڕاهێنەری یانەی (ئاسووری) بووم، ئێستاشی لەگەڵدا بێت سەرباری زۆری تەمەن، لە وەرزشی ڕۆژانە کۆڵ نادەم و لێی بێزار نابم، بەتایبەت لەگەڵ ئامێرە ئازاکانیش هەموو ڕۆژێ وەرزش دەکەم.

زۆر گلەییم لە لایەنە پەیوەندیدارەکانی بواری وەرزشی هەیە، کە ئاور لە یاریزانە کۆنەکان نادەنەوە، پاش چاوەڕوانییەکی زۆر وەك خێر مانگانە ١٠٠ سەد هەزار دیناریان بۆ بڕیوەتەوە.

*سەلاح ساڵح

ناوم سەلاح ساڵح ئەحمەدەو لە تیرەی جافم، ساڵی ١٩٤١ لە گەڕەکی شوان شەقامی ئەوقافی ئێستا لەدایکبووم، خێزاندارم و کوڕو کچێکم هەیە، لە ساڵی ١٩٩٤ خانەنشین کراوم، لە قوتابخانەی سەرەتایی لە مەرکەزییە بووم، کە ئێستا شوێنی کۆمپانیای ئەمریکی کۆنە بەرامبەر چاپخانەی مەجیدییە، ناوەندیم لە شەرقیە تەواو کردووە، لە ئامادەیی کەرکوکیش دەرچووم و لە کۆلێژی پەروەردەی وەرزشی لە بەغدا ساڵی ١٩٦٥ وەرگیراوم، ساڵی ١٩٦٩ بەکالۆریۆسم بەدەستهێناوە، هەر هەمان ساڵ لە ئامادەیی حیکمە لە کەرکوك بە مامۆستا دامەزرام، یەکێك لەو تێکۆشەرەی لە گەڵما بوو، یان چاکتر وایە بڵێین بە یەکەوە بووین شەهید محەمەد نەجیب ساڵح



بوو برای ئەندازیار حەسیب ساڵح.

ئەوەی لە یادم بێت دەستەی دامەزرێنەری یانەکە بریتی بوو لە شێخ ستار، پیرۆت تاڵەبانی فەوزی محەمەد نوری، عیرفان محەمەد، ساڵح ڕەسوڵ، عەزیز تاهیر، فاتیح نەقشبەندی،مەجید کەریم، خێرۆ پیرداودی، بەهەشت محەمەد نەجیبی خوالێ خۆش بوو.

ڕۆژێکیان شێخ ستار و پیرۆت تاڵەبانی و محەمەد نەجیب هاتنە ماڵمان و ووتیان بە نیازین یانەیەکی وەرزشی بۆ کوردان بنیاتبنێین و، پێویستە دوو دەرچووی کۆلێژی پەروەردە وەرزشی لە دەستەی دامەزرێنەرەکە هەبێت، من یەکەمیان و تۆش دووەمیان یەکسەر ڕەزامەندیم نیشان دا چونکە یانەیەکی تەواو کوردیانە بوو، بزواندنی هەستی نەتەوەیی تێدا بوو، سەرەتا لە حەمامەکە بووین لە ئیمام قاسم ژوورێکمان بە کرێ گرت هەموومان لەو ژوورە بووین.

ئەوەندەی لە بیرم مابێت چەند کۆبونەوەیەکمان لە ماڵی شێخ پیرۆت تاڵەبانی ئەنجام دا، چەند ناوێ پێشنیار کرا (سۆلاف، هەندرێن، ئیمام قاسم و...) دوای ئەنجامدانی تیروپشك لە ناوەکان، یانەی وەرزشی سۆلاف وەرزشی جێگیر بوو، هەنگاوی دووەمان مۆڵەت وەرگرتن بوو لە ڕێگای پارێزگای کەرکوکەوە داواکاریمان پێشکەش کرد، کە ئەو کات لە هۆبەی (جمعیات) کۆمەڵەکانەوە بوو سەر بە وەزارەتی ناوخۆ بوو، بەڵگەنامەو پێویستییەکانمان پێشکەش کرد، دوای چەند مانگێك ڕەزامەندیمان وەرگرت و بووین بە یانەیەکی فەرمی، شتێکی دیکە کە زۆر گرنگە ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە کە یانەی سۆلاف تەنها لە بواری وەرزشییەوە کاری نەدەکرد بەڵکو چالاکی هونەریشمان ئەنجام دەدا، تیپی موزیکی سۆلافمان هەبوو کە هونەرمەندی خوالێی خۆش بێت (شەوکەت ڕەشید) سەرپەرشتی دەکرد و، ئەوەی لەبیرم مابێت ڕەمەزان زامدار و عەلی عەزیز ئەندامانی ئەو تیپە موزیکییە بوون.

ئێمە بۆ مەشق کردنیش پێویستیمان بە یاریگا هەبوو، بەڵام بە هۆی نەبوونی و بێ توانایییەوە پەنامان بۆ یاریگا میللییەکانی ئەو سەردەمە لە یاریگای خلود و ئیسکان و قوتابخانەکان دەبرد، لە کاتی جەژنانیش دا ماڵ و منداڵمان جێدەهێشت و کەرنەڤاڵمان ساز دەدا بۆ ئەوەی ڕەوشی دارایی یانەکە باش بێت، هەوڵ و کۆششی زۆرمان دا

لە ڕێگای بەڕێز حەسیب سالحەوە سەردانی وەزیری ئاوەدانکردنەوەی ئەو کات بەڕێز ئیحسان شێرزادمان کرد بۆ ئەوەی حکومەت پارچە زەوییەکمان بۆ دابین بکات و دواتر بیکەینە بینا بۆ یانەکەمان، بەداخەوە هەوڵەکەمان بێ ئاکام بوو، لە سەردەمی محەمەد هەمزە هەوڵێکی تر درا کە پارێزگای کەرکوك بوو لە ساڵی ١٩٨٨ من لە یانەکە دەرچووم و پەیوەندیم پێوە نەما چونکە پێشتر بە پیلانێکی دژ بە کورد و سڕینەوەی ناسنامەی کوردی لە شارەکەدا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە یانەی سۆلاف ناوەکەی گۆڕدراو کرا بە (کەرامە) و لەگەڵ یانەی (الثورة) بوونە یەك و هەموو شتومەکەکانی کرایە سەر یانەی (الثورة)

سەرەتا لە تیپە میللییەکانەوە دەستم پێکرد و رووم کردە تیپی (شباب الحسينية) و پاشان تیپی (نهرین) کە تیپێکی زۆر بەهێز بوو وە شوێن و پێگەی دیار و بەرچاوی لە ناو تیپە میللییەکانی شاری کەرکوکدا هەبوو، چاکترین یاریزان لەم تیپەدا بوو، دواتر چوونە ڕیزی هەڵبژاردەی عێراقەوە، لەوانە (ئەنوەر عارف)ی ڕەحمەتی، کە لە هەڵبژاردەی کەرکوك یاری دەکرد، لەوانە (عەدنان عەبدولقادر و بەکر شوکر و عەباس عاشور) کە چاکترین گۆڵچی تیپی ٢ ی سوپای عێراقی ئەو کات بوو، مەترسی ئەوەم هەبوو بەهۆی وەرزشەوە خوێندنەکەم لەدەستبدەم بۆیە بە ئاگادارییەوە هەڵسوکەتم دەکرد، ئەوەندە بە تیپی نهرێنەوە پەیوەست بووم کە دوای ٢ ساڵ دامەزراندنیشم لە ئامادەیی حیکمە لەگەڵ ئەم تیپە بەردەوام بووم، کە یانەی سۆلاف دامەزرا لەگەڵیاندا کەوتمە کار و سەرەتا لە ئیمام قاسم بووم پاشان بۆ بەرامبەر قەڵا گواستمانەوە، ئەو شوێنە بنکەی پۆلیس بوو بەڵام موڵکی شارەوانی بوو ئەوان چۆڵیان کرد و ئێمەش چووینە بیناکەوە کە بینا و باخچەکە تێکدرا بینایەکی کەیان تێدا دروستکرد و بوو بە ئەمنی کەرامەی ئێستا لە دوای پرۆسەوە جگە لە یانەی سۆلاف شوێنی چەند دەزگایەکی دیکەی ڕۆشنبیریشە.

لە ناوەندی شەرقییەوە چوومە هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك کە ئەو کات مامۆستا کەمال عەبدولقادر ڕاهێنەرمان بوو، دوای دامەزراندنم خۆم بووم بە ڕاهێنەر، تا خانەنشین کرام هەر لە پەروەردە مامەوە، ٢٤ ساڵ خزمەتی وەرزشی شارەکەم کردووە، ئەگەر بکرێ بگەڕێینەوە بۆ یانەی سۆلاف، مامۆستای چاك هاتن و ئاستی یانەکەیان بەرزکردەوە لە سەر ئاستی عێراق پلە دووە، لە کەرکوك پلە یەك بوو، سەرباری کەم دەرامەتی ئەنجامی باشمان بەدەستدەهێنا، ئەو مامۆستایانەی کە ڕۆڵی بەرچاویان لە یانەکەدا گێڕا ئەمانە بوون (جەلال قادر، خەلیل ئیبراهیمی ڕەحمەتی، کەمال عەلی سالح، عەلی محەمەد سەعید، نوری سەعید، بەکر شوکر، موهوندیس بەهادین)، ئابوونەی ئەو کاتەی یانەکەمان (٥٠ بۆ ١٠٠ فلس) بوو جاری وابوو لەناو خۆماندا پارەمان کۆدەکردەوە بۆ ئەوەی کرێی یانەکەمان بدەین، کە لە یانەکە دوورکەوتمەوە هەر کرێچی بووین، دواتر وەزارەتی لاوان پارەی بۆ یانەکە تەرخان کرد، نوری حەسەن کوردی ڕاهێنەری پلە یەکی بەدەستهێنا و، منیش وەك ڕاهێنەر پلەی دووەم بەدەستهێنا، لەوانەی لە یادکرابوون قادر مەجیدی سکرتێری یانەی (الثورة) مەهدی وەحید چاکترین ڕاهێنەر لە شارەکە، کە یاریزانی زۆرانبازی بۆ کەرکوك و عێراقی پێگەیاند، چۆن دەکرێ خەڵکی وا فەرامۆش بکرێ، بەڕاستی کارێکی لەو جۆرە ناخۆشەو ئازاری دەروونیت دەدات، لە کاتێکدا هەنووکە قادر مەجید لەماڵەوە کەوتووە و پێویستی بە یارمەتی هەیە.

بەهۆی ئەو هەڵوێستەی لەبەرامبەرم نوێنراوە هیچ پرۆژەیەکم لە یاد نییەو مافی خۆمە چیدی بیری لێ نەکەمەوە، بەداخەوە وەرزش بووەتە سیاسەت.

هیواخوازم شارەکەم لە ڕووی وەرزشەوە بگەڕێتەوە دۆخی جارانی خۆی و باشتریش بێت، داوا دەکەم هەردوو یانەی سۆلاف و سۆلافی نوێ یەك بگرنەوە، بە یەك هێز و بازووەوە برەو بە وەرزشی شارەکەمان بدەن، چ بە تەوافوقی یان بە هەڵبژاردن.

*ئەبو بەکر کەریم نەریمان

یەکێك لە یاریزانە دیارو بەرچاوەکانی یارییەکانی گۆڕەپان لەسەر ئاستی عێراق کاك (ئەبو بەکر کەریم نەریمانە) لە ساڵی ١٩٥٥ لە گەڕەکی بەگلەری شاری کەرکوك لەدایکبووە، قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی لە ئیمام قاسم و ناوەندی لە کاوە و ئامادەیی لە زێوەر، لە شاری کەرکوك تەواو کردووە، بڕوانامەی دبلۆمیشی لە پەیمانگای مامۆستایانی هەولێر بەدەستهێناوە، ئێستاش مامۆستایە لە قوتابخانەی ڕەحیماوا و خێزاندارەو خاوەنی دوو جگەرگۆشەیە بە ناوەکانی (سەرمەد و ڕەوەند).

هەر لەو ساتەوەی لە قوتابخانەی سەرەتایی بووم، مامۆستا فاتیح نەقشبەندی کە ئەو کات مامۆستای وەرزشمان بوو، ساڵی ١٩٦٨ دەستنیشانی کردم وەك یاریزانێکی تۆپی پێ بۆ قوتابخانەکەمان یاری بکەم، بەڕاستی ئەمە بۆ من باش بوو، وەك دەروازەیەك وابوو، هەر مامۆستا فاتیح دواتر هانی دام لە یارییەکانی ڕاکرن و گۆڕەپان بەشداری بکەم، ئەوە بوو تیایدا سەرکەوتوو بووم، لێرەدا پێویستە چاکەی مامۆستا شێخ ستار بەرزنجی لە یاد نەکەین هاندەرێکی باشم بوو، دوای ئەوە هەستی کرد کە من دەتوانم لەو یارییەدا سەرکەوتن بە دەست بهێنم، ئەوە بوو زۆر سەرکەوتووانە یارییەکانم ئەنجام دەدا، دەکرێ بڵێین مامۆستا شێخ ستار هاندەر و ڕاهێنەرم بووە، لێرەوە سوپاسی دەکەم و هیوای تەمەن درێژی بۆ دەخوازم، بە ئومێدم هەر لەش ساغ بێت.

– ساڵانی ١٩٦٨ تاوەکو ١٩٧٦ لەگەڵ هەڵبژاردەی پەروەردەی کەرکوك بەشداریم کردووە وە پلەی یەکەمم تیایاندا بەدەستهێناوە، هەروەها ساڵانی ١٩٧٢ بۆ ١٩٧٦ هاوکات لە هەڵبژاردەی کەرکوك بووم و ئەو کات (عبدالرزاق الرماحي) بەڕێوەبەری سەنتەری لاوانی کەرکوك ڕاهێنەر بوو ئەمە ساڵی ١٩٧٥، تەمەنیشم منداڵ بوو، تەنها من قوتابی بووم، ئەو دوای یاریزانەکان هەموویان لە (فرقەی دوو و قوات خالد) بوون، لەوانە فەرەیدون کە پاڵەوانی عێراق و کەرکوك بوو و لە یانەی سۆلاف بوو، هەروەها (جاسم علوان و ماین



الشرجي و فرحان عجە و عباس کازم و علاوی ئەحمەد و عەلی جەیران و خالید دوزلاوی) کە چاکترین یاریزانەکانی کەرکوك و عێراق بوون لە هەڵبژاردەی عێراقیش بوون، لە ۱۰۰ م ی یەکەم یاریم لەسەر ئاستی عێراق پێنجەمم بەدەستهێنا، کە لە یاریگای گەل لە بەغدا بەڕێوەچوو پلەی یەکەم سامی الشیخلی و دووەم فەیسەڵ مەککی سێیەم هادی سالح و لە هەمان یاریدا بە دەستیان هێنا کە پاڵەوانە ناسراو دیارەکانی عێراق و عەرەب بوون.

ئەگەر کەمێك بۆ ڕابردووی خۆمان بگەڕێینەوە، هەروەکو وتم لەسەر ئاستی پەروەردەی کەرکوك، واتا لە قوتابخانەکانی دا لە هەردوو یاری ڕاکردنی(۱۰۰م و ۲۰۰م) ی لەنێو قوتابخانە ناوەندی و ئامادەییەکاندا بەدەستهێناوە، بە تایبەت ساڵی ۱۹۷٤ لە ڕاکردنی ۱۰۰ م ژمارەی پێوانەییم تۆمار کرد، ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت بە ناوی خۆمەوە تۆمار کراوە کەس نەیتوانیوە ئەو ژمارەیە تۆمار بکات کە (۱۰/۸) چرکە بوو.

– سەربووردەیەکی دیکەی ئەو پاڵەوانیەتیانەی بەشداریم تێدا کردووە، کە بە هۆی کێشەوە نەمتوانی یاری تێدا بکەم، ئەویش لە پارێزگای عەمارە بوو ئەو ساڵە یاری پاڵەوانێتی پەروەردەکان لەم شارە بوو، واتا (عەمارە)، مامۆستایەکی کەرکوکی ناوبژیوانی یاری سەبەتە بوو ئێمە هەموومان سەیری یارییەکەمان دەکرد لە کۆتاییدا پەروەردەی عەمارە دۆڕا، ئامادەبوانی یاریەکە لە خەڵکی عەمارە هێرشیان بۆ ناوبژیوانەکە هێنا، ئێمەش بۆ پاراستنی گیانی ئەو مامۆستایەو ئەو بەڕێزانەی لەگەڵیدا بوون، لە گەڵ خەڵکی ئامادەبووی عەمارە چووین بە گژ یەکدا، ویستیان هێرش بکەنە سەر مامۆستا سەلاح سالح، بە بۆرییەکی ئاسنی کورسییە شکاوێك بەرگریم دەکرد و کێشام بەسەر یاریزانێکی ئەوان، ئیدی منیان بە حیمایەی پۆلیس بۆ جێ حەوانەوەی خۆمان گواستەوە، دواتر بڵاوبووەوە گوایە ئەوەی لێمداوە مردووە وەزعم زۆر تێکچوو ئیتر نەمتوانی یاری بکەم، عەدنان شوکری ڕاهێنەر کە دڵسۆز و خەمخۆری وەرزشی شاری کەرکوك بوو بەهۆی تەنگاو کردنی لەلایەن بەعسییەکانەوە کەرکوك و عێراقی بەجێهێشت، ئەم ڕاهێنەرە یاریزان جەلیل نەجمەدین لە جیاتی من یاری پێکرد و پلەی دووەمی هێنا.

لە هەولێریش کاتێ لە پەیمانگای مامۆستایان بووم لەسەر ئاستی هەولێر لە یارییەکانی ۱۰۰ م و ۲۰۰ م یەکەمم بەدەستهێنا، بە ناوی یانەی هەولێریش لە هەڵبژاردەی عێراق ساڵی ۱۹۷۹ بەشداریم کرد و لە ۱۰۰ م دووەمم بەدەستهێنا، بە ۱۰,۹ چرکە و غانم حوسێن لە یانەی دیالە یەکەم بوو کوڕێکیش بە ناوی محەمەد کە لە یانەی فتوەی موسڵ بوو سێیەمی بەدەستهێنا.

هەموو ئەو ڕاهێنەرانەی لە قوتابخانە و یانەی سۆلاف مەشقیان پێکردووم، مامۆستا (شێخ ستار بەرزنجی، مامۆستا فاتیح نەقشبەندی، مامۆستا جەلال قادر، عەلی محەمەد و سەعید) لە پەروەردەی کەرکوك (عەدنان شکور)، لە هەولێریش (مامۆستا سەلاح حەسەن خەسرەو).

هانزی ئەمریکی زۆرم بە دڵە کە کاتێك خۆی ۱۰۰ م ی بە ۹,۹ چرکە بڕی، بەڵام ئێستا کەسێکی دیکە ژمارەی پێوانەیی تۆمار کردووە خەڵکی جامایکایە، لە ئۆلۆمپیادی پەکین ۱۰۰ م ماوەی بە ۹,۷ چرکە بڕی یەکەمی بەدەستهێنا.

هەڵبەتە هەر کەسێ لە بواری خۆیدا دووچاری چەندین ڕۆژانی خۆش و ناخۆش بووەتەوەو هەموویشیم بە ڕوحی وەرزشی وەرگرتووە، ئەم ژمارە پێوانەییە لە ڕاکردنی ۱۰۰م لە خۆجێیەتی بەدەستهێناوە کە تا ئێستا بە ناوی منەوە تۆمار کراوە لە خۆشترین ڕۆژەکانی ژیانی وەرزشیمە و هەرگیز لە یادی ناکەم، ڕۆژی ناخۆشیش ئەو ڕووداوە بوو کە لە شاری عەمارە بە سەرمدا هات، کە وتیان کوڕەکە مردووە و ترسام تووشی شۆك بووم و نەیانهێشت یاری بکەم، پاشان دەمەوێ ئەوە بڵێم کە جێگری پارێزگای عەمارە کەرکوکی بوو، دوای گەڕانەوەم بۆ ماوەیەك لە دادگا داواکرام، مامۆستا مستەفا وەیس غەرقی بەهەشت بێت بانگی کردم و دڵنەوایی کردم و گوتی لە دادگای عەمارە داوات دەکەن، بەڵام خەم مەخۆ پەروەردەی کەرکوك لەگەڵ مامۆستا مومتازی جوملاستیك ڕەوانەی عەمارەیان کردم، پێش وەخت چووینە ماڵە جێگری پارێزگای عەمارە، هەروەك گوتم خەڵکی کەرکوك بوو، بە سوپاسەوە ناردی بە شوێن خێزانەکەیان و لە دیوانی پارێزگا کێشەکەی بۆ چارەسەر کردم و نیوەڕۆ گەڕاینەوە.

ئێستا مامۆستای وەرزشیم و لە قوتابخانەی ڕەحیماوای سەرەتایی و سەرپەرشتیاری تیپی باسکەی یانەی خاك دەکەم وە ئەندامی کارگێڕی یانەکەشم، لەگەڵ ئەوەی ئەو توانایەی جارانم نەماوە هاوکات گیروگرفتی ژیان سەرقاڵی کردوم، وە ئەوەی ئەمەوێ ئاماژەی بۆ بکەم ئەوەیە کە وەرزش دوور بێت لە سیاسەتی حیزبایەتی و هەموومان بە ڕوحی یەك تیپ کار بۆ خزمەتی شارەکەمان کەرکوك بکەین.

*حیلمی شەوکەت

ساڵی ۱۹٥٤ لە کەرکوك لەدایکبووەو هەر لە سەرەتاوە یاریزانی هەڵبژاردەی کەرکوك بووەو یاری لەگەڵ گەلێك لە یانەکانی وەکو یانەی کەرکوك و یەکی حوزەیران و یانەی سەلاحەدین و یانەی سوپا و هەڵبژێردراوە بۆ (المنتخب

الوطني العسكري العراقي).
لە سەرەتادا لە تیپە نێوخۆییەكانی كەركوك لە قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی بەشداری كردووەو هەر لە ساڵی ١٩٧٥ وە وەكو (حارس مرمى) لە یانەی (الثورة ـ كركوك) بەشداری كردووە، كە لەو كاتەدا یەكێك بووە لەو یانە بەناوبانگانەی پلە دووەكان، كە بەشداری گەلێك یاری كردووە لە گەڵ یانەكانی (الطلبة ـ الشرطة ـ الزوراء) و گەلێكی تر.
لە ساڵی ١٩٨٢ بەشداری كردووە لە یانەی (الجیش الریاض) بۆ تۆپی پێ و لە دەرەوەی عێراقیش بەشداری گەلێك یارییان كردووە لە ئەندنوسیا وپۆڵەندا و گەلێك شوێنی تر.
لە ئێستادا ڕاهێنەرە لە یانەی (غاز الشمال) و دەورو ڕۆڵی هەیە لە پێگەیاندنی ئەم نەوەیەی وەرزش.

* هێمن نەسرەددین ڕەحیم:-



- ساڵی ١٩٨٧ لە گەڕەكی ئازادی لە شاری كەركوك لەدایكبووە، لە خێزانێكی هەژار چاوی بەدنیا هەڵهێناوە.
- ئێستا بەردەوامە لە خوێندن و قوتابی ئامادەییە.
- ساڵی ٢٠٠٤ لە یانەی سۆلاف بەسەرپەرشتی مامۆستا سەرتیپ ناسیح و سلێمان ڕەمەزان بووەتە ڕاهێنەر لەگەڵ چەند برادەرێكی تر وەكو شاكر مەحمود و كاروان حەسەن و عەزیز عەبدوڵلا و ئەمرۆ محەمەد و چەندین پاڵەوانی تر كە تا ماوەیەكی باش لە كاری پاڵەوانێتی ئاسندا یاری كردووە یەكەم پاڵەوانێتی هێزی لەش لە شاری كەركوك لە ساڵی ٢٠٠٥ بەشداری كردووە لە ساڵی٢٠٠٦ پلەی سێیەمی بەدەستهێناوە و لە ساڵی ٢٠٠٧ بڕوانامەی ڕاهێنەرایەتی لەشجوانی بەدەستهێناوە و لە ساڵی ٢٠٠٨ سەنتەری لەشجوانی دامەزراندووە و لە گەڕەكی ئیمام قاسم و چەندین چالاكی بۆ یاریزانانی بەتوانا ئەنجامداوە و لە ساڵی ٢٠٠٩ بڕوانامەی پاڵەوانێتی لەشجوانی بە پلەی ڕاهێنەری پلەی یەكەم بەدەستهێناوە.
- ساڵی ٢٠١١ بڕوانامەی ناوبژیوانی هێزی لەش بەدەستهێناوە.
- لە ساڵەكانی ٢٠١٣تا٢٠١٥ بەشداری چەندین پاڵەوانێتی یانەكانی كوردستانی كردووە و بڕوانامەی ڕاهێنەری پێشكەوتووی بەدەستهێناوە.
- تاوەكو ئێستا بەردەوامە لە وەرزش و ڕاهێنەری سەنتەری لەشجوانی ئیمام قاسمە.

*** مستەفا عەسکەری یاریزانی زۆرانبازی لەسەر ئاستی عێراق:-**

عەباس دیك

لە یەکێك لە گوندەکانی کەرکوك گوندێك هەیە، پێی دەڵێن گوندی (عەسکەر) مامۆستایەکی ناییینی تێدا هەبوو پێیان دەوت (عەبدولرەحمانی مودەریس) ئەم مامۆستایە توانایەکی گەورەی هەبوو لە زیرەکی و بەتوانایی و زانایەکی بەرز بوو، خاوەن وشەی بەرز بوو لە هەموو قوتابخانەکانی کەرکوك و دەروووبەری، کورێکی هەبوو ناوی (مستەفا) بوو ئەمە پێش سەد سال.

کاتێك تەمەنی گەیشتە پێویستی باڵق بوونی، بانگ کراوە بۆ سەربازی و چووەتە (بەغدا) لە ماوەی کارکردنی لە سەربازی توانای ئازایی و مەشق و بەردەوامی، لە کارەکانی زمان گۆ دەبێت لە ئاستیدا، بۆیە بەرپرسەکان ئەم توانایان گەیاندە شوێنی بەرز لە ئەستانە و داوای بەرز کردنەوەی پلەی سەربازییان دەکرد تا بەوەی بەرزکرایەوە بۆ ئەفسەر و بەرز کرایەوە بۆ مولازمی یەکەم و لەدواییدا بۆ (رئیس).

لە دوای ئەوەی بووە (رئیس) خێزانی پێکەوەناو چوار شێری بوو بە ناوەکانی هادی، عەلی، جەعفەر، تەحسین هەستا بە مەشق پێکردنیان و رایانی دەهێنا لەسەر وەرزش کردن.

رۆژێك لە رۆژان هەر چواریانی بردە ژێر دارێکی گەورە و داوای لێکردن کە هەر یەکەیان خۆی بەرز و نزم بکاتەوە و وەرزش بکەن و ئەوەی سەرکەوتوو دەبوو خەڵاتی پێدەدا، ئەم کارەی هەموو بەیانییەك دەکرد و فێری زۆرانبازی دەکردن و خەڵاتی بۆ ئەوە دادەنا کە دەیانبردەوە.

هەر لەو ماوەیەدا لەو کاتەی (رئیس) بوو لە سوپای عوسمانیدا یەکێك لە پاڵەوانە ئێرانییەکان سەردانی عێراقی کرد بەناوی (بەخشی گەورە) کە بە (شێر) ناو دەبرا، بۆ شوێنە پیرۆزەکانی کەربەلاو نەجەف، داوای کرد کە گوایە پاڵەوان هەیە بۆ زۆرانبازی خەلکیش گەلێکیان نیشاندا لە کەربەلا و نەجەف و کازمیە، بەسەر هەموو ئەو پاڵەوانانە لە زۆرخانە لەو شوێنانە سەرکەوتوو لە دواییدا سەردانی (بەغدا)ی کرد.

لە کاتی سەردانی بۆ (بەغدا) سەردانی زۆرخانی ئەو شارەی کرد، لە کاتی بوونی لە بەغدا بانگهێشتی زۆرخانەیەك کرا لە گەرەکی (دەهانە) کە مامۆستاکەی (سەید رەمین) بوو، بەڵام ئەم وای دەبینینی کە رەئیس مستەفا گونجاوە و توانای هەیە کە زۆرانبازی لەگەڵ ئەو پاڵەوانە ئێرانییەدا بکات، بۆیە بریاری یاریکردنی دا کە رۆژی سێشەممە بوو، هەردوولا رێککەوتن کە رۆژی هەینی، یان سێشەممە یاری بکەن، چونکە وابوو بوو لەو دوو رۆژەدا زۆرانبازی دەکرا، بۆیە دەنگۆی ئەوە لە بەغدا بڵاوبووەوە کە یاری زۆرانبازی هەیە لەنێوان مستەفا و بەخشی گەورەی زۆرانبازی ئێرانی.

ئەم زۆرانبازییە زۆر ناوازە بوو، لەبەر ئەوەی ئەو زۆرانبازە هەموو جۆرە هونەرێکی بەکار هێنا بۆ ئەوەی یاریکەرەکەی بەرامبەری ببەزێنێت، بەڵام نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، یارییەکە نزیکەی سەعاتێکی خایاند، بۆیە لە دواییدا مامۆستای زۆرخانەکە داوای راگرتنی یارییەکەیان دەکرد، بەڵام رازی نەدەبوو، بۆیە خەلکەکە کەوتنە نێوانیانەوە، بۆیە هەموو دانیان نا بە بەهێزی هەر یەکەی ئەوی تر.

لە پای ئەمەدا هەموو عێراقییەکان توانای ئەم زۆرانبازە عێراقییەیان دەزانی و رێزیان دەگرت، هەواڵ گەیشتەوە پیاوانی دەوڵەت بۆ ئەم سەرکەوتنە، پێشوازییان لێدەکرد و خەڵاتیان دەکرد، چونکە دۆراندنی ئەو یاریزانە ئێرانییە کە زۆر گەورە بوو لە زۆرانبازیدا، خۆی لە خۆیدا گەورەیی خۆی هەبوو، بۆیە پێگەیەکی بەرزی هەبوو لە جیهانی زۆرانبازیدا.

هەواڵی ئەم زۆرانبازە گەیشتەوە بۆ ناوەندە باڵاکان لە ئەستانە و بۆیە دوای ماوەیەك بریاری عوسمانی لە ئەستانە گەیشتە بەغدا دەربارەی بەرزکردنەوەی و بەخشینی مووچەیەکی شایستە بۆی، تا بەوەی بووە یەکەم زۆرانبازی بەغداو هەموو عێراق، لەپاڵ پاڵەوانییەتییەکانی لەسەربازی ئەو بەشداره بە شەرەفخانەی لە شەرەکاندا بەشداری کرد لەو سەردەمانەدا تا بەوەی بووە (ئەمیر لیوا) لە سووپادا بۆ ئەوەی بزانین ژیاننامەی مستەفا کێیە کە بەم جۆرەیە مستەفا کوری عەبدولرەحمان مودەریس، کە دەکاتە باوکی جەعفەر پاشای عەسکەری و عەبدولهادی عەسکەری و عەلی رەزا عەسکەری و تەحسین عەسکەری.

سەرچاوە:-

١- الزورخانة البغدادية، جميل الطائي، منشورات مكتبة النهضة العربية، بغداد، ١٩٨٦.

٢- جريدة المدى، ملحق الجريدة، ذاكرة عراقية، ژمارە (٤٠٧٦) السنة الخامسة عشر، الأثنين ٢٠ي تشريني الثاني ٢٠١٧.

*** کاریگەری سیاسەت لەسەر وەرزش لە کەرکوك:-**

لەم چەند ساڵەی دواییدا لە هەر کات و ساتێکدا کە باری ئاسایش و باری ئەمنی شار و شارۆچکەکانی عێراق ئاڵۆز دەبوو، لەکاتی سەرهەڵدانی مەترسییەکانی کەرت بوونی عێراق و تا رادەیەکی پڕ مەترسیدار و کزبوونی هەستی یەکبوونی تاکەکانی کۆمەڵگەی مۆزایکی بەزۆر بە یەکەوە بەستراوی عێراق، وەرزش و یارییە وەرزشییەکان وەکو دیاردەیەکی شارستانی و چەشنی چالاکی تایبەت، چەندین



جار لە چوارچێوەی ئاسایی وەرزشییانەی خۆی زیاتر ڕۆڵی گەورەتری بەسەردا دەسەپێندرا، یاخود دەشێوێندرا.
وەرزش وەکو ئامرازێکی یارمەتیدەر بە کاریگەرییەکی فراوانەوە ڕۆڵی سیاسییانەی بینی لە بوونە پرد بۆ دروستکردنی یاری دەروونی و هەستی بە عێراقی بوونی خەڵکەکە لە دروستکردنی دیاردەی یەکگرتوویی هەڵوێستی شارەزایانی وەرزش، لەبەرز ڕاگرتنی ڕۆڵی سەربەخۆیی وەرزش و بەرەنگاریکردنی، هەر هەوڵێکی دەست تێوەردانی ئاشکرای حیزبی و تایفەگەریی لە کاروبار و لە کاروانی وەرزشی عێراقدا.
لەگەڵ هاتن و داگیرکردنی عێراق و باشووری کوردستان لەلایەن بەریتانیاوە، یاری تۆپی پێ (فوتبۆڵ) یەکەم ئامرازی کەلچەری بوو کە بەریتانییەکان گواستیانەوە بۆ ناوشار و شارۆچکەکانی عێراق بەتایبەتی بۆ ناو بەغدا، بەسرە، کەرکوك، لەپاش ئەوە ڕاوێژکاری بەریتانی وەزارەتی مەعاریفی حکومەتی پاشایی هەر لە سەرەتای ساڵانی چلەکانەوە لە ڕێگەی قوتابخانەکانەوە، وەرزشی دیدەوانیان کردە هۆگرییەکی ڕۆژانەی منداڵان و هەرزەکاران و لاوانی عێراق.

سەبارەت بە یاری تۆپی پێ مێژوونووسان سوورن لەسەر ئەوەی کە یەکەم یاری فەرمی فوتبۆڵ لە عێراقدا، وەکو لاسایی کردنەوەیەکی یارییەکانی سەربازانی بەریتانی، ڕۆژی ٧ی ئاداری ساڵی ١٩١٨ لە یاریگای شێخ عومەر لە ناوچەی ڕەسافەی بەغدا و لەلایەن دوو تیپی هەڵبژاردەی قوتابخانەکانی ئەوکاتی بەغدا بەڕێوەچووە، پاشان لەگەڵ چەسپاندنی بەشێکی سەرەکیی (کۆمپانیای نەوتی عێراق – ئای – پی – سی) لە کەرکوك و بەسرە، سەرەتای هاندانی فەرمی بزووتنەوەی وەرزشی بە تایبەت یاری تۆپی پێ بوو لە کەرکووکدا، لە دوایشدا لە ٢٥ی نیسانی ١٩٥٠ لە گۆڕەپانی (شەریکە)دا یەکەم تیپی هەڵبژاردەی کەرکوك هاتە ئاراوە.

*** هەڵبژاردەی کەرکوك وەك مۆزایکێکی ڕەنگاوڕەنگ:-**

هەروەکو ئەوەی بینراوە لە ڕەنگدانەوەی تۆپی پێ لەسەر پێکهاتەکانی شاری کەرکوك، جگە لە دوو قۆناغی سەردەمی دەسەڵاتی بەعس نەبێت لە ساڵی (١٩٤٣) و لەپاش (١٩٥٨) ەوە، دەنا تیپی هەڵبژاردەی کەرکوك هەمیشە وەك مۆزایکێکی ڕەنگاو ڕەنگ بووە، بەپێی تواناو لێزانیین، یاریزانی کورد و تورکمان و ئەرمەنی و ئاشووری و عەرەبیشی تێدا هەبووە، بۆیە تیپی هەڵبژاردەی کەرکوك هەمیشە ئامرازێکی سەرەکیی تەبایی کۆمەڵایەتی و بەیەکەوە گرێدانی هەستی خەڵکەکە بووە، هەڵبەتە هەندێ جار، بە تایبەتی لەگەڵ هاتنی بەعس و پەیڕەوکردنی سیاسەتی چەواشەکاری نامۆ بە پێکهاتەکانی شارەکە، بە خەستی پیلانی ئەوەیان جێبەجێکرد کە ڕەنگ و ڕووی کوردی و ئاشووری لە بوارەکانی وەرزشی ئەم شارەدا بشێوێنن و وون و بزری بکەن.
لە سەردەمی سەدام حوسێندا تۆپی پێ گرنگی زۆری پێدرا، سەدامیش ئەم کارەی ڕادەستی عودەی کوڕی گەورەی کردبوو، بەتایبەتی هەڵبژاردەی نیشتمانی عێراقی گرنگی زۆری پێدەدرا.

سەرنجراکێشترین شتیش ئەوە بوو کە عودەی کوڕی سەدام پشتی بە یاسای پاداشت و سزا دەبەست، هەر کاتێك هەلبژاردەی عێراقی بیبردایەتەوە ئەوا پاداشت و خەلاتێکی زۆری دەکردن و ڕۆژنامە و ئیزگە و تەلەفیزیۆنەکان گۆرانییان بەسەردا دەوتن و دیدار و چاوپێکەوتنیان لەگەلدا دەکردن، کاتێکیش بیاندۆڕاندایە ئەوا لە تەلەفیزیۆنەوە ڕەخنەی توندیان لە یاریزانەکان دەگرت و عودەیش سزای قورسی دەدان بۆ نموونە سەر و برۆی دەتاشین، ئەمەش بووە مایەی گالتەجاڕی لە جیهاندا.

*** یانەی سۆلاف کەرکوك:-**

یانەی وەرزشی سۆلاف، ماوەیەکی زۆر لە سالی ١٩٦٧-١٩٧٧، لەژێر پەردەی خۆخەریککردن بە وەرزشەوە، ئەو ناوچە پەرستیی لەنێوان جەماوەری یانە وەرزشییەکانی سلێمانی و هەولێر، بە مەبەستی دابڕاندنی یەك هەستی و سووككردنی بۆچوونی نەتەوەیی لە ناو خەلکانی ئەو دوو شارە هەرە گرنگەی باشووری کوردستان.

*** کاریگەری باری سیاسی لەسەر وەرزش لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە (٢٠٠٣-٢٠١٨):-**

لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە، هەرچەندە حکومەتی عێراق و ڕژێمی بەعس نەما، بەلام گۆڕانکاری یان کاریگەری سیاسی بە جۆرێکی تر و لە بارێکی تر لەسەر وەرزش ڕەنگی دایەوە.

ئەو بارودۆخەی دوای پرۆسە لە عێراقدا، کەرکوك کەشێکی تر و هەندێك لایەن و پارتی سیاسی کوردی کۆنترۆلی



ڕۆلە مەزنەی گێڕا لە کۆکردنەوەی لایەنگرانی بزووتنەوەی کوردایەتی و بەیەکەوە گرێدانی هۆگران و لایەنگرانی ڕەوتی شۆڕشی نوێ و ڕێچکەی کوردایەتی و مارکسییە کوردەکانی شاری کەرکوك.

هەولەکانی حکومەتی بەعسی عێراق بوو، بۆ خەستکردنی گرژی نێوان کورد و تورکمانەکانی ناو شاری کەرکوك، بە بەکارهێنانی وەرزش، بە تایبەت لە بەکارهێنانی یارییەکانی نێوان یانەی (الثورة) و یانەی (سۆلاف)، بەعس هەمیشە هەولی دەدا لە یارییەکانی نێوان ئەو دوو یانەیەدا خەلکانی سەر بەخۆی هان بدات بۆ ئاژاوە و شەڕنانەوە لەنێوان هاندەرانی کورد و هاندەرانی تورکمان، بێگومان بەعس لەناو هەردوو یانەکەدا جەماوەری خۆی دروست کرد بوو بۆ ئاژاوەگێڕی و بەرپاکردنی شەڕ و هەروەها بۆ گواستنەوەی هەوالەکانی ئەو دوو یانەیە، بەتایبەتی هەوالەکانی یانەی سۆلاف.

هەلبەتە بەعس، لە حەفتاکان و سالانی هەشتاو تا سالی ١٩٩١، هەمان ئامرازی بەکاردەهێنا لە قوولکردنەوەی هەستی شارەکەیان کرد و ڕۆلێکی ئەرێنی و نەرێنی خۆیان دروستکرد کە تاوەکو ئێستاکە بەردەوامە، هەر لەم ڕوانگەیەوە یانە و تیپە وەرزشییەکان لەنێوان حیزبە سیاسییەکانی کەرکوك دابەشکرایەوە لەسەر بنەمای بیر و باوەڕە ئاینییەکان دارێژرایەوە بەم شێوەیە:-

١- یانەی وەرزشی ئاشووری- لە ڕابردوودا سەر بە ئاشوورییەکان بوو بەلام لە ئێستا ئەم یانەیە نەماوە.

٢- یانەی وەرزشی ئەرمەن - لە ڕابردوودا سەر بە ئەرمەنەکان بوو، بەلام لە ئێستادا ئەم یانەیە نەماوە.

٣- یانەی وەرزشی یەکی حوزەیران - ئەم یانەیە لە ئێستادا نەماوە.

٤- یانەی وەرزشی (الثورة) - سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو.

٥- یانەی وەرزشی کەرکوك- سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بوو.

٦- یانەی وەرزشی (الأخاء الترکماني)- سەر بە یانەی

(الأخاء التركماني) بووە.
٧- یانەی وەرزشی سۆلاف - سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.
٨- یانەی وەرزشی سۆلافی نوێ - سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانە.
٩- یانەی وەرزشی شۆڕیجە - سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.
١٠- یانەی وەرزشی خاك- سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.
١١- یانەی وەرزشی کەیوان - سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانە.
١٢- یانەی وەرزشی بابە گوڕگوڕ- سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.
١٣- یانەی وەرزشی ئاڵتون کۆپری- سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.
١٤- یانەی وەرزشی دووبز - سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.
١٥- یانەی وەرزشی ئاشتی - سەر پەکگرتووی ئیسلامی کوردستانە و سەرۆکەکەی (ئەحمەد پاڵەوان)ە
١٦- یانەی وەرزشی موسەڵلا - سەر بە تورکمانەکانی کەرکوکە.
١٧- یانەی وەرزشی تورکمان - سەر بە تورکمانەکانی کەرکوکە.
١٨- یانەی وەرزشی حەویجە - سەر بە لایەنە عەرەبییەکانە.
١٩- یانەی وەرزشی تازە - سەر بە تورکمانە شیعەکانی تازەیە.

*** ئۆلۆمپی وەرزشی کوردستان لقی کەرکوك:-**
ئەم دەزگایە لەدوای پرۆسەوە لە کەرکوك دامەزراوە کە سەرۆکەکەی سەر بە پارتییە بە ناوی نەوزاد قادر و جێگرەکەی سەر بە یەکێتی نیشتمانییە و بەرپرسەکەی مامە رەزای شۆڕیجەیە.

*** لیژنەی ئۆلۆمپی عێراق:-**
**ممثلية الأولمبية العراقية في كركوك:-**
سەرۆکەکەی سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانە و ناوی (حەربی خالید)ە و جێگرەکەی (چالاك هیوا سابیر)ە سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانە.

*** مديرية الشباب و الرياضة في كركوك:-**
سەرۆکەکەی بەناوی (ناسح جابر عەلی) سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.

*** ممثلية رواد الرياضة في كركوك**
سەرۆکەکەی ناوی (محەمەد فالح)ە سەر بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.
بەڵام لەدوای پرۆسەی ١٦ی ئۆکتۆبەرەوە لە ٢٠١٧، زیانێکی گەورە بە وەرزش کەوت و تووشی داڕووخان و نووچدانی کرد.

*** سەرچاوە و پەراوێزەکان:-**
١- رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٧٦٢٧، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی تۆپی پێ و سیستەمە فاشیست و دیکتاتۆرەکان، ئەردەڵان عەبدوڵلا.
٢- رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٧٦٤٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی وەرزش و رۆڵی لە سیاسەت و پەیوەندییە نێو نەتەوەییەکان، سەربەست کەرکوکی، بەشی یەکەم.
٣- رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٧٦٥٢، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی وەرزش و رۆڵی لە سیاسەت و پەیوەندییە نێو نەتەوەییەکان، سەربەست کەرکوکی، بەشی دووەم.
٤- رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٧٦٥٨، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی وەرزش و رۆڵی لە سیاسەت و پەیوەندییە نێو نەتەوەییەکان، سەربەست کەرکوکی، بەشی سێیەم.

# پێرست

یەکێک لەو بوارە گرنکانەی کە ژیانی مرۆڤایەتی لە کەرکوکدا دەوری بینیوە تێداو بە یەکێک لەو هەڵویستە گرنگانە دادەنرێت کە ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر بنیاتنراوە ئەوەش باری لەش ساغی مرۆڤەو تەندروستییە. مرۆڤ لە چاخە بەردینەکان لەو سەردەمەدا کەوا ژیان دەستی پێکردوە، کەرکوک یەکێکە بووە لەوەی کەوا پێشەنگی ئەو سەردەمە یا ئەو ناوچانە بووە وەکو شارستانییەکانی (چەرمووو بەردە بەڵکەو مەتارە)و ئەو شوێنە گرنگانەی (قادیشی گەورەو بچووک). مروڤ لە سەرەتادا بەربەرەکانی کردووە لەگەڵ ژینگەی ئەو شوێنانەی کە تێیدا ژیاوە بۆیە لە هەوڵدانی بەو گرنگییەی بایەخی داوە بە ژیانی خۆی بۆ پاراستنی لەشو ئەو ژینگەیەی خۆی بۆ ئەوەی تەندروستی گونجاوە بێت، بۆیە دەبینین هەر لەو ئەشکەوتەی کە تیایا ژیاوە بایەخی داوە هەر لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کەوا هەوڵی داوە دەورووبەری ژینگەکەی خۆی پاک بکاتەوەو ڕێکوپێکی بکات هەروەها هەوڵی داوە پاشەڕۆی ئاوەڕۆکان دروست بکات بۆ ئەوەی کەوا ئەوئاوە نەخۆشی بۆ پەیدا نەکات چونکە بەتەجروبەی ژیان بۆی دەرکەوتووە کە ئەگەر ئەو ئاوە بەرفراوان بێت تووشی نەخۆشیو گەلێک کێشەی تووشی ئەکات دەبینین ئەگەر سەیری ئەو هەڵکۆڵینانە بکەین کەوا لە چاخە بەردینەکان هاتووە شوێنی ئاوەڕۆ هەیەو شوێنی چێشتلێنان هەبووە هەروەها شوێنی ناشتنی مرۆڤەکان هەبوو.




**دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان**
**لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە**
**2023**